عەلی باپیر




# چەند مەسەلەیەکی [نوێی] باوی سەردەم

## سەرنجێکی واقیعییانە و هەڵسەنگاندنێکی شەرعییانە

بنەماکانی تەبایی و پێکەوە ژیان لە قورئانی بەرێزدا

مافەکانی مرۆڤ

جیهانگیری

تیرۆر و توقاندن

سیکولاریزم

دیموکراسی




چاپی شەشەم



# چەند مەسەلەیەکی باوی سەردەم

**نووســــینــی**
عــەلی بـــاپیر

**بڵاوکردنەوەی**
نوسینگەی تەفسیر بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن

**نەخشەسازی ناوەوە و بــەرگ**
ئەردەشێر کاوانی

**خــــــەت**
نــەوزاد کۆیــی

**قەبارەی کتێب**
٢٤×١٧- ( ٥٠١ ) لاپەڕە

**نۆرە و ساڵی چاپ**
شەشەم ١٤٣٨ ك – ٢٠١٦ ز

**تــــیراژ**
١٥٠٠ دانە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان / هەرێمی کوردستان
ژمارەی سپاردنی ( ٦٠٤ ) ی ساڵی ٢٠٠٥ی پێدراوە



**نوسینگەی تەفسیر**
بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن
هەولێر - شەقامی دادگا - ژێر هوتێلی شیرین پالاس
/TafseerOffice
+964 750 818 08 66
www.al-tafseer.com
tafseeroffice@yahoo.com



# چەند مەسەلەیەکی باوی سەردەم

## سەرنجێکی واقیعییانە و هەڵسەنگاندنێکی شەرعییانە

**بنەماکانی تەبایی و پێکەوەژیان لە قورئانی بەڕێزدا**

مافەکانی مرۆڤ - تیرۆر و تۆقاندن - جیهانگیریی -

سیکۆلاریزم - دیموکراسی

**چاپی شەشەم: بەپاڵفتەکردن و لێ زیادکردنەوە**

**نووسینی**

**عــەلی بــاپیر**



بسم الله الرحمن الرحیم

الحمد لله والصلاة والسلام على رسول الله محمد وعلى آله

بەندە د. عەلی باپیر، ڕێگە بە مامۆستا مخلص و

نووسینگەی تەفسیر تەخویل کرد بۆ چاپ و

بڵاوکردنەوەی کتێبەکانم، خوا ئەو کەسانەو ئێوەش زیاتر

بخاتە پێشی و کاریانەوە.

وە جگە لەوان هیچ کەسێکی تر مافی چاپ و

بڵاوکردنەوەی کتێبەکانی بەندەی نیە.

ع

عەلی باپیر

١١ ربیع الثانی ١٤٢٦

٢٠٠٥/٥/١٩

هەولێر

# پێشەکی چاپی شەشەم

إن الحَمْدُ للهِ نَحْمَدُهُ وَنَسْـتَعِينُهُ، وَنَسْـتَغْفِرُهُ، وَنَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْ شُرُورِ أَنْفُسِـنَا، وَمِنْ سَيِّئَاتِ أَعْمَالِنَا، مَنْ يَهْده اللهُ فَلاَ مُضِـلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضلِلْ فَلاَ هَادِيَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَن لاَ إلَهَ إلاّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسولُهُ.

**خوێنەری بەڕێز و خۆشەویست!**

سوپاس بۆ خوا کە بۆجاری شەشەم کتێبی (چەند مەسەلەیەکی باوی سەردەم) چاپ دەکەینەوە و، شایانی باسە کە تەرجەمە عەرەبییەکەیشی تا ئێستا دووجار چاپ کراوەوە و، تەرجەمە فارسییەکەیشی لە ژێرچاپە و، بۆ زمانی تورکیش وەرگێڕراوەو چاپ و بڵاوکراوەتەوە.

**ئەو گۆڕانکارییانەی لەم چاپی شەشەمەش دا، بەسەر ئەم کتێبەدا هاتوون، ئەمانەن:**

١- چەند ڕستە و بڕگەیەکمان گۆڕیون، بەوەی کە بەڕاستتر و باشترمان زانیون، لەهەموو بەشەکان دا.

٢- بەشێکی زۆری ڕستە و بڕگەکانی ئەم کتێبەم لەم چاپی شەشەمەدا، دووبارە دارشتوونەوە، هەروەها چەند گۆڕانکارییەکی فیکریی ڕیشەیی مان لەهەندێك مەسەلەی ئەم کتێبەدا کردوون، پاش دەستکاریی کردنێکی باشی لەچاپی دووەمی عەرەبیی داو، بەسوود وەرگرتن لەو لێکۆڵینەوە تازانەم، کە لەزۆر ڕووەوە کردوومن و، لەهەردووك کتێبی: (الإسلام كما يتجلى في كتاب الله) و (ئیسلام و دەوڵەتداریی)دا، بەدرێژیی تۆمارکراون.

٣- ئاڵقەیەکی تازەمان زیادکردوە بەناوونیشانی: (بنەمایەکانی تەبایی و پێکەوە ژیان لە قورئانی بەرێزدا).

٤- ڕیزبەندیی شەش ئاڵقەکانی ئەم کتێبە بەم جۆرەی لێهاتوە:

١- بنەمایەکانی تەبایی و پێکەوە ژیان لەقورئانی بەرێزدا.

٢- مافەکانی مرۆڤ لەنێوان ئیسلام و ڕۆژئاوادا.

٣- تیرۆر و تۆقاندن لە تەرازووی شەریعەت دا.

٤- جیهانگیریی ڕۆژئاوا و جیهانێتیی ئیسلام.

٥- سیکۆلاریزم: ڕوانینێکی واقیعییانە و هەڵسەنگاندنێکی شەرعییانە.

٦- دیموکراسیی لەبەر تیشکی عەقڵ و شەرع دا.

٥- دوو پاشکۆ (ملحق) بۆ ئاڵقەی دووەم (مافەکانی مرۆڤ..) زیادکراون، کە بریتین لە:

أ- الميثاق العالمي لحقوق الإنسان (پەیماننامەی جیهانیی بۆ مافەکانی مرۆڤ).

ب- الميثاق الإسلامي لحقوق الإنسان (پەیماننامەی ئیسلامیی بۆ مافەکانی مرۆڤ).

٦- هەوڵمان داوە ئەم کتێبە لە هەڵە چاپییەکان و هی دیکەش بژار بکەین.

٧- فەرموودەکانمان بەشێوەیەکی وردتر و بەو ژمارانەوە کە هەیانن لەسەرچاوەکان دا، (تخريج) کردوون.

هیوادارم ئەمجارە ئەم کتێبە ئامانجەکانی خۆی باشتر بپێکێ و، مایەی بەهرە لێوەرگرتنی چاکتری خوێنەرانی بێت.

پڕ بەدڵیش سوپاسی برای بەڕێز و دڵسۆزم کاك هەرێم هادی دەکەم، کە زۆر بەهەڵەچنیی و ڕاستەڕێ کردنەوەی ئەم کتێبەوە لەم چاپی شەشەمەی دا ماندووبوو، خوای بەخشەر بەباشترین شێوە پاداشتی بداتەوە و نموونەی زۆربکات.

والسلام علينا وعلى عبادالله الصالحين.
٢٤ محرم ١٤٣٦ك
٦ تشرینی دووەمی ٢٠١٥ز

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

﴿ ۞ قُلْ إِنَّمَآ أَعِظُكُم بِوَٰحِدَةٍۖ أَن تَقُومُواْ لِلَّهِ مَثْنَىٰ وَفُرَٰدَىٰ ثُمَّ
تَتَفَكَّرُواْۚ مَا بِصَاحِبِكُم مِّن جِنَّةٍۚ إِنْ هُوَ إِلَّا نَذِيرٌ لَّكُم بَيْنَ يَدَيْ
عَذَابٍ شَدِيدٍ ﴿٤٦﴾ ﴾ سباء -٤٦-.



## پێشکەشـــە

بەو کەسانەی کەبەر لە قسەکردن دەربارەی هەر مەسەلەیەك، هەوڵ دەدەن چاك لێی تێبگەن و، پاش لێتێگەیشتنیشی، تەنها لەسەر بناغەی بەڵگە قسەی لەسەر دەکەن و، لەهەر لایەکیشەوە ڕووی گەشی حەقیقەت دەربکەوێ، پێشوازیی لێدەکەن.

# پێشەكی چاپی پێنجەم

الحمد لله حق حمده، والصلاة والسلام على عبده، محمد وآله، والسائرين على دربه، والمنخرطين فـي سلك حزبه.

**خوێنەری بەڕێز و خۆشەویستم!**

لە پێشەكی ئەم چـاپی پێنجـەمی كتێبی: (چەند مەسەلەیەكی باوی سەردەم)دا كە (نووسینگەی تەفسیر) پێی هەڵدەستێ، ئەم چەند ڕوونكردنەوەیە بەپێویست دەزانم:

١- لەم چاپی پێنجەمەدا كە چاپی یەكەمی نوسینگەی تەفسیرە، ئەم كتێبە لە ڕووی نێوەڕۆكەوە، وەك خۆی هێڵراوەتەوەو دەستكاریی نەكراوە، ئەویش لە سۆنگەی سەرقاڵیی و دەستگیراوییەوە و خوا پشتیوان بێ لە داهاتوودا، ئەگەر تەمەن بەبەریەوە مابێ، چی پێویست بێ و بۆمان بلوێ، ئەنجامی دەدەین[١].

٢- خوا پاداشتی هەرەچاكی هەموو ئەو دڵسۆزانە بداتەوە، كە سەروكاری بەستنی كۆڕەكان و، تۆماركردن و، نووسینەوەو ڕێكخستنی وتار و باس و بابەتەكانیان كردوە، لە هەموو لایەكیان دنیایەك سوپاسگوزارم و لێیان مەمنوونم.

---

(١) سوپاس بۆ خوا ئێستاش ئەو ئامانجە هێنرایەدی، لەم چاپی شەشەمەدا دەستكارییەكی باشی ئەم كتێبەمان كردوە.

٣- برای بەڕێزم مامۆستا حەسەن بابەکر، ئەرکی پێداچوونەوەو هەڵەگیریی ئەم چاپەی وەئەستۆ گرتووە، بەئاگاداری خۆشم دەستکاریی چەند وشە و بڕگە و ڕستەیەکی کەمی کردوە[1]، بۆ زیاتر گونجان لەگەڵ حاڵەتی (کتێب بوون)ی باس و بابەتەکاندا، بەڵام بێگومان مۆرکی (وتاربوون) بە سەرجەم ئاڵقەکانەوە هەر دیارە.

٤- هیچ گومانی تێدانیە، کە چاپکرانەوەی ئەم کتێبە بۆ جاری پێنجەم لەماوەی سێ چوار ساڵێکدا و لەبازاڕدا نەمانی نوسخەکانی، دوو ڕاستی گرنگی لێ دەفامرێتەوە:

یەکـــەم:

کە ڕەوتی ئیسلامیی لە کوردستاندا لە گەشەکردن و بەرەوپێش چوون دایە، بەتایبەت لەنێو چین و توێژی هەرەزیندوو و کاریگەری کۆمەڵگای کوردەواریی دا، کە قوتابی و لاوانن، بە هەردووك ڕەگەزەکەوە.

دووەم:

ڕەوتی سیکۆلاریزم و بانگەشەکردن بۆ بیروبۆچوون و فەلسەفە ڕۆژهەڵاتی و ڕۆژئاواییەکان و دووریی گرتن لە ئیسلام، لەگەڵ ئەوەشدا کە هەردووك ئیدارە حیزبییەکەی هەولێر و سلێمانی بەڕەسمیی تەبەننیی یان کردووەو پشتگیریی دەکەن و، مەسرەفێکی زۆریشی لێ دەکەن، بەڵام ڕووەو ئیفلاس و فەشەل و قەیرانێکی بێڕەزا ملی ناوە، هیچ هێزێکیش ناتوانێ لەو ئاکامە شوومەی، کە چاوەڕێی دەکات دەربازی بکات و دەفریای بێت، هۆکارەکەشی ئەوەیە کە عەلمانیەت و فەلسەفە ڕۆژهەڵاتیی و ڕۆژئاواییەکان، زادە و هەڵقوڵاوی زەمینە و ڕۆژگار و بارودۆخێکی دیکەی تایبەت و جیاواز لەوەی کۆمەڵگای ئێمەن و، فاکتەرەکانی بوون و مانیان، لەلای ئێمەمانان - مسوڵمانانی

---

(١) بەڵام لەم چاپی شەشەمەدا، بۆخۆم بەوردیی وشە بەوشە پێیداچوومەوە و، دەستکاریی زۆرم کردەوە.

شوێنكەوتووی قورئان و پێغەمبەری ئاخیرزەمان، صلى الله‌عليه وسلم- نین، بۆیە خۆ پێوە ماندووكردن و مەسرەف لێكردنیان بێهوودەیەو، جگە لە ماندووبوون و، ڕەنج بەزایەچوون هیچی لێ سەوز نابێ.

خوا سبحانە وتعالى بە لوطف و كەرەمی بێسنووری خۆی بەرەكەت و پیێزی زیاتر بخاتە ئەم بەرهەمەوەو، بیكاتە مایەی بەرچاوڕوونی ژمارەیەكی زیاتر لە گەنج و قوتابی و ڕۆشنبیرانی میللەتەكەمان.

**عەلی باپیر** - سلێمانی
١٤/ شەووالی ١٤٢٦



# ئەم زنجیرەیە بۆ؟!

**خوێنەری بەڕێز!**

بەسەرنج دان و تێوەڕامانی مێژووی دوورو نزیكی بەشەر لەسەر خڕۆكەی زەوی، زۆر بەڕوونیی، یاسا (سنة)یەكانی خوا (تبارك وتعالى) كە لە ژیانی مرۆڤایەتیدا دایناون، دەردەكەون، وەك چۆن بەسەرنج دان و لێورد بوونەوەی بوونەوەر، ئەو یاسا گەردوونیی و فیزیایی و كیمیایی و بیۆلۆژییانەی كە خوای زاناو تواناو كاربەجێ (جل جلاله) لە بوونەوەرو سروشت و دەووربەریاندا داینـاون، بۆمان ئاشكرا بوون و دەبن!

هەربۆیەش خوای پەروەردگار لە چەندان ئایەتی قورئان دا فەرمانی پێكردووین كەسەرنجی بوونەوەرو دەوروبەرمان بدەین و، لەدیاردە سروشتییەكان وردبینەوە، تاكو یاسا سروشتییەكانی خوای بێوێنە لەبوونەوەری سروشتێنراو (الكون المطبوع)یدا بەدی بكەین و بدۆزینەوە، وەك فەرموویەتی:

﴿ أَفَلَا يَنظُرُونَ إِلَى ٱلْإِبِلِ كَيْفَ خُلِقَتْ ﴿١٧﴾ وَإِلَى ٱلسَّمَآءِ كَيْفَ رُفِعَتْ ﴿١٨﴾ وَإِلَى ٱلْجِبَالِ كَيْفَ نُصِبَتْ ﴿١٩﴾ وَإِلَى ٱلْأَرْضِ كَيْفَ سُطِحَتْ ﴿٢٠﴾ ﴾ (الغاشية: ١٧-٢٠).

هەروەها لەبارەی سەرنج لێدانی شوێنەواری پێشوان و، تێوەڕامانی بەسەرهات و سەرگوزشتەكانیان، بۆ پەند لێوەرگرتنیان و پەی پێبردنی یاساكانی خوا لە ژیانی ئینساندا، فەرموویەتی:

﴿ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِكُمْ سُنَنٌ فَسِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ فَٱنظُرُوا۟ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُكَذِّبِينَ ﴿١٣٧﴾ هَٰذَا بَيَانٌ لِّلنَّاسِ وَهُدًى وَمَوْعِظَةٌ لِّلْمُتَّقِينَ ﴿١٣٨﴾ ﴾ (آل عمران: ١٣٧-١٣٨).

جا یەکێك لەو یاساو سوننەتانەی خوای کاربەجێ کە لە ژیانی ئینسان و گەلاندا دەبینرێن و (عبدالرحمن ابن خلدون) لەکتێبی نایابی (المقدمة)ی خۆیدا بۆ یەکەمین جار - وەك کۆمەڵناسێکی زەبر دەست - ئاماژەی بۆ کردوە ئەوەیە کەهەمیشە گەل و میللەتانی ژێر دەست و تێشکاو (المغلوب) لاسایی ئەو کۆمەڵ و میللەتانە دەکەنەوەو چاویان لێدەکەن، کەبەسەریان دا زاڵبوونەو خستوویاننە ژێر ڕکێفی خۆیانەوە[١].

جا هەر چەندە ئەوەی (إبن خلدون) گوتوویەتی، پێم وایە لەسەدا سەد ڕاستە، بەڵام بێگومان کۆمەڵ و میللەتانی زیندووو خاوەن عەزم و ئیرادە ئەوانەن کە هیچ کاتێك لەبەرانبەر (قَدَر) و (سنة)کانی خوای پەروەردگاردا کەبەزیانیان تەواو دەبن، تەسلیم نابن و چۆك دانادەن، بەڵکو (عمر بن الخطاب (رضي الله عنه)) گوتەنی: (أَفِرُّ من قَدَرِ الله إلى قَدَرِ الله)[٢]، واتە: لەقەدەری خوا بەرەو قەدەری خوا ڕادەکەم! هەوڵ دەدەن بەو (قَدَر) و (سنة)انەی خوای کاربەجێ کەلە قازانجیانن، خۆیان لەکاریگەریی ئەوانی دیکە بپارێزن، کەزیانیان لێ دەدەن.

جا ئەوەی کەمن دوای ئەم زەمینە سازیی یەی ڕابرد، دەمەوێ لێرەدا بیلێم، ئەوەیە کە بێگومان میللەتی ئێمە بەگشتی کەم و زۆر کەوتۆتە ژێر کاریگەریی ئەهلی کوفرەوە - وەك باقی میللەتانی دیکەی جیهانی ئیسلامیی-، وەکەم و زۆر هەوڵی داوەو دەدات کەلاساییان بکاتەوەو تەقلیدیان بکات، وەك (إبن خلدون) دەڵێ: هەر لە جل و بەرگەوە هەتا بیروڕا!!

ئەوەتا زۆر بەزەقیی دەبینین کەخەڵکێکی خوێندەوارو[٣] خۆ بەڕۆشنبیر زانیشمان لەبواری بیرکردنەوەو بیروبڕوادا، بێ سێ و دوو تەسلیمی سەرجەم ئەو

---

١ بڕوانە: (المقدمة) ص١١٧،١١٦، فصل: (في أن المغلوب مولع أبداً بالإقتداء بالغالب في شعاره وزيِّهِ ونحلته وسائر أحواله وعوائده).

(٢) (بخاري) بەژمارە: ٥٧٢٩، گێراویەتەوە، هەروەها (عبدالقادر الگيلاني)يش قسەیەکی لەو جۆرەی هەیە.

(٣) دیارە سوپاس بۆ خوای بەرزو مەزن، خەڵکی دیکەشمان هەیە کە قەناعەت و هەڵوێستیان وا نیە.

بیردۆزە و بیرۆکانە بوونە، کەئەهلی کوفر - بەتایبەت ڕۆژئاواییەکان - بڕوایان پێیانە، هەرچەندە بیروبۆچون و بیرۆکەکانی ئەوان، هەڵقوڵاوو زادەی واقیع و ژینگەو هەل و مەرجێکی زۆر جیاوازبن، لەهی ئێمەو مانان!

جا بەندە بەپەنابردنە بەر (قدر)ێکی دیکەی خوای کاربەجێ، کەبریتییە لە (سنة تغيير النفس لتغيير الواقع) یاسای: (خۆ گۆڕین بۆ گۆڕینی واقیع)، کە چەند ئایەتێکی قورئان ئاماژەی بۆ دەکەن، بەتایبەت ئایەتی ژمارە (١١)ی (الرعد) کە دەفەرموێ:

﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوۡمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُواْ مَا بِأَنفُسِهِمۡ﴾ .

واتە: بێگومان خوا حاڵ و واقیعی هیچ کۆمەڵێك ناگۆڕێ، تاکو ئەوان حاڵەتی دەروونی خۆیان نەگۆڕن!

بەڵێ، بەندە بەپەنابردنە بەر ئەو قەدەرو سوننەتەی خوا (جل وعلا) دەمەوێ ڕێی دەربازبوون لەحوکم و کاریگەریی قەدەرو سوننەتی:

(لاسایی کردنەوەو چاولێکەریی ژێر دەست بۆ باڵا دەست)، (تقليد وإعجاب المغلوب بالغالب)، بخەمە بەرچاوی کۆمەڵگاو میللەتەکەی خۆم، چونکە خۆم بەدڵسۆزی کۆمەڵگاو میللەتەکەم دەزانم و، دڵنیاشم کە کۆمەڵگای ئێمەو هەر کۆمەڵگایەکی دیکەش، لەسۆنگەی لاسایی کردنەوەو چاولێکەریی و خۆلێبزربوون و دوژمن لە لا زلبوونەوە، سەری لە پووچەڵیی و گەندەڵیی یەوە دەردەچێ، بەتایبەتیش کەتەڕەفی لاسایی کراوەو چاولێکراو (الطرف المقلَّد والمولَع بە) شارستانێتی ئاژەڵیی یانەی پووچ و بێ کاکڵی ئەوروپاو ڕۆژئاوا بێت![1].

شایانی باسیشە کە (إبن خلدون) کۆمەڵناسی مسوڵمانی بەتوانا دیاردەی لەبەین چوونی میللەتی لاساکەرەوە بەیەکی دیکە لەیاساو سوننەتەکانی خوا لە

---

(١) هەڵبەتە ناشڵێم ڕۆژئاوا و ئەوروپا شتی باشیشیان نیە، بەڵام بەداخەوە خەڵکی تێشکاو و هەست بەبێهێزییکەر، بەزۆریی شوێن شتی خراپ دەکەون، وەك گوتراوە:
تەیری گول (گەڕ) عاشقی درەختی ژەقنەبووتە!

ژیان و مێژووی بەشەردا دادەنێ(١).

جابۆ هێنانەدی ئەو ئامانجەش - وێڕای هەوڵ و هەنگاوەکانی دیکەم - بەپێویستم زانی زنجیرە باسێك بنووسم - کە هەر کامێکیان سەرەتا وەك وتار لەکۆڕێك دا پێشکەش کراون -، بەناوو نیشانی: (چەند مەسەلەیەکی باوی سەردەم)، وە هەر کامێکیشیان، خوا پشتیوان بێ، تەرخان دەکرێ بۆ توێژینەوەی یەکێك لەو بابەت و مەسەلە باوانەی کەلەم ڕۆژگارو سەردەمەمان دا، لە نێو سەرجەم، یان تێکڕای چین و توێژەکانی کۆمەڵگاو میللەتەکەماندا لە ئارادان و، کەم و زۆر قسەو باسیان لەبارەوە دەکرێ و مشت و مڕو بگرەو بەردەیان لەسەر دەکرێ.

هۆی هەڵبژاردنی ئەو جۆرە بابەت و مەسەلانەش لەلایەن بەندەوە ئەوەیە کە هیچ کام لەو بابەتانە، زادەو هەڵقوڵاوی واقیعی میللەت و کۆمەڵگای ئێمە نین و، ئەگەر گریمان ئەو مەسەلانە خەڵکی ڕۆژئاواش ناچاریان بووبێ و، لە هەل و مەرجێکی ناسازگارو نەخۆشدا گرفتاریان بووبێت، وە ئەگەر گریمان ئەو جۆرە مەسەلەو بابەتانە ڕۆژێ لەڕۆژان خێرێکیان لێهەڵوەریبێ بۆ خاوەن و پەیداکەرانیان، ئەوە بێگومان میللەت و کۆمەڵگای ئێمە نەبۆیان ئاتاج و ناچارەو، نەهیچ دەردێکیشی چارەسەر دەکەن، بەڵکو هەتا خێرێکیان لێدەبینێ، سەد زیانی پێ دەگەیەنن.

بەڵێ هەرکام لەمەسەلەو بابەتەکانی: [ تیرۆر، سیکۆلاریزم، مافەکانی مرۆڤ(٢)، جیهانگیریی (عەولەمە)] کە خوا یاربێ هەرکامێکیان ئاڵقەیەکی ئەم زنجیرەیە دەبن، کەم و زۆر پەیوەندییان بەواقیع و هەل و مەرجی میللەت و

---

(١) بڕوانە: (المقدمة) ص١١٨،١١٧، (فصل: في أن الأمة إذا غُلِبَت وصارت في ملك غيرها أسرع إليها الفناء).

(٢) مافەکانی مرۆڤ بەو چەمك و واتایەی کە ڕۆژئاواییەکان بەکاریان هێناوە، کەلەکاتی توێژینەوەی (مافەکانی مرۆڤ) دا باسی دەکەین، نەك بەموتڵەقیی، ئەو ڕوونکردنەوەیەشم لەبەر ئەوەیە کەزاراوەی (مافی مرۆڤ) وشەیەکی بەرزو دڵگیرە، ئەگەر بەڕاستیی بێ و جەوهەرو کاکڵێکی شایستەو وەك پێویستی هەبێ.

کۆمەڵگای ئێمەوە نیەو، ئەگەر گریمان دەرمانیش بن، بۆ دەردو نەخۆشییەکانی کەسانێکی دیکەی جیاواز لەئێمە گیراوەتەوەو، هیچ ماقووڵیش نیە ئینسان هەر لەخۆوە دەرمان و چارەسەرێك کە بۆ خەڵك و واقیع و شوێنێکی دیکە دانراوە، بەکاربێنێ! چونکە ئەوە هیچ کە چارەسەری ناکات! بگرە دوور نیە کە ئەو دەرمان لەگۆترە بەکارهێنان و لاسایی کردنەوەو چاولێکەریی یە، سەری بەفەتارەت بدات و بیشیفەوتێنێ!

ئیدی بەهیوای ئەوە کەهەرکام لە ئاڵقەکانی ئەم زنجیرەیە ببێتە مایەی بەرچاوڕوون بوونەوەی خەڵکێکی زۆری کۆمەڵگایەکەمان و دەربازبوون یان پارێزرانیان لە دەردی کوشندەی چاولێکەریی و لاسایی کردنەوەو، بەچاوی خەڵك بینین و بەگوێی خەڵك بیستن و بەعەقڵی خەڵك بیرکردنەوە! بەتایبەتیش خەڵکێکی سەرگەردان و دەردەدارو گرفتاری وەك ڕۆژئاواییەکان، کەهەرچەندە لەڕووی ماددیی و تەکنۆلۆژیاو تێر کردنی لایەنی ئاژەڵیی و غەریزەکانی یەوە پەرێزو شوێنەواریان دیارو بەرچاوە، بەڵام بێگومان هەرکەسێك بەوردبینیی و لەڕوانگەی ئیمان و بەویژدانەوە سەرنج لە ژیان و گوزەران و لایەنی ئینسانی یان بدات، لە پووچەڵیی و گەندەڵیی کۆمەڵگاکانیان دڵنیا دەبێ و، دەزانێ کە لەسەر قەراغی کەندەڵانێکی بن هەڵۆڵی هەڵواسراون!

**کۆتایی پێناسەی ئەم زنجیرەیەش بەم دوو تێبینییە گرنگە دێنم:**

**یەکەم:** شتێکی ڕوون و بێ چەندو چوونە کەبۆ تێگەیشتنی هەر وشەو زاراوەیەك، بەتایبەت ئەوانەی کە بوونەتە ڕەمزو ناوونیشان بۆ مەسەلە گرنگەکان و، ڕێچکەو بیردۆزەکان، پێویستە سەرنجی ڕەگ و ریشەکانیان بدەین و، گوێ بۆ خاوەنەکانیان و ئەوانە بگرین کە بۆ یەکەمجار بەکاریان هێناون، نەك هەر لەخۆمانەوەو بە گۆترە چەمك و واتای دڵخواستی خۆمانیان بۆ دابتاشین! چونکە لەحاڵێکی وادا گیرۆدەی هەڵەو چەواشەبوونی زۆر خراپ دەبین.

**دووەم:** شتێکی بێ جێ و ناماقووڵە، کەپێش لێکۆڵینەوەی وردو قووڵ لەبارەی دین و کلتوورو فەرهەنگ و واقیع و هەل و مەرج و گرفت و کێشەکانمانەوە، بەشێوەیەکی سەرکێڵانەو عاتیفی یانە، ئەو وشەو زاراوەو بیردۆزانە کە پێمان

نامۆن و، زادەو هەڵقوڵاوی واقیعێكی دیكەی جیاواز لە واقعی ئێمەن، یەكسەر لەزاری خەڵكی دیكەوە بیان قۆزینەوە، چونكە وەك پێشتریش گوتمان: ئەوە وەك ئەوە وایە كە كەسێك هەروا لەگۆترە دەرمانی بابایەكی نەخۆش و دەردەدار بەكاربێنێ! هەروەها كەسێكیش لەوەزعی ماڵی خۆی ئاگادار نەبێت داخۆ چی و چی تێدایەو، چی یان هەیەو چییان نیەو، لە خۆوە بكەوێتە سواڵ و سەدەقە لەملاولا، زۆر نێزیكە ئەو پەندە كوردییەی بەسەردا بچەسپێ، كە دەڵێ: (ماڵیان پڕ بوو لەرِزیانەو منداڵیشیان بەزگ ئێشە دەمرد).

خوای بەخشەریش (تبارك وتعالى) هێزو پێزی ئەوە بخاتە ئەم بەرهەمەوە، كە بیكاتە شایستەی پێكانی ئەو نیشانەو ئامانجانەی كەبۆیان نووسراوە.

**عەلی باپیر**/ ئەحمەدئاوا

٢٥ڕەجەبی ١٤٢٣ك، بەرانبەر ٢٠٠٢/١٠/٢ز

## سێ ئاگاداریی:

١- سەرەتا بە تەما بووین ئەم بابەتانە بەزنجیرەیەك و هەرکامێکیان لە ئاڵقەیەکی سەربەخۆدا چاپ بکەین، بەڵام دوایی ئەو ڕایەمان گۆڕی و بەپەسەندمان زانی: هەر پێنج[1] بابەتەکە لە دوو توێی کتێبێك دا چاپ و بڵاو بکەینەوە، بۆیە لە زۆر جێیان بۆ تێکڕایان: وشەی زنجیرە، بۆ یەك یەکیشیان وشەی ئاڵقەمان بەکارهێناوە.

٢- لەسۆنگەی ئەوەوە کە وەك باسمان کردوە: هەرکام لەو بابەت وئاڵقانەی ئەم کتێبە لە ئەسڵ دا وتار بوونەو لەکۆڕێك دا دراون، تارادەیەك شێوەی وتارو دواندن (خطاب)یان پێوە دیارە، بەپێویستیشم نەزانی کە دەستکاریی بکەم، بۆیە با ئەو مەسەلەیەش لە بەرچاو بگیرێ.

٣- هەرکام لەو وتارانەی کە لێرەدان و کراون بە کتێب، لەلایەن ژمارەیەك لە ئامادەبووانی ئەو کۆڕانەوە کەتێیاندا دراون، کۆمەڵێك پرسیارو بەشدارییکردن (مداخلە)یشیان بەدوادا هاتوون، بەڵام بەپێویست نەزانرا کەلەگەڵیان تۆمار بکرێن.

---

(١) لەم چاپی شەشەمەدا بوونە شەش بابەت.

## ئاڵقەی یەکەم

# بنەمایەکانی
# تەبایی و پێکەوەژیان
# لە قورئانی بەڕێزدا

# ڕێ خۆشکردن

ئاشکرایە کە کۆمەڵگای سەرکەوتوو و پێشکەوتوو کۆمەڵگایەکە کە سەرجەم توێژ و پێکهاتەکانی بەئایین و بیرۆکە جیاوازەکانیانەوە، بەڵکو سەرجەم تاکەکانی، لەنێو خۆیان دا بەتەبایی و هاوکاریی پێکەوە بژین و، لەسەر بناغەی دادگەریی و یەکسانیی و ڕێز لەیەکدی گرتنی دووسەرە، پێکەوە مامەڵە بکەن.

**ئنجا لێرەدا دەپرسین:**

ئایا ئیسلام لەبارانی دا هەیە کە کۆمەڵگایەکی ئاوای لەسەر بنیات بنرێ، وە بەڵگەی بە (بەڵێ) وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە، چیە؟!

**لە وەڵام دا دەڵێین: بەڵگە دوو شتە:**

**یەکەم:** واقیعی مێژوویی زیاتر لە سێزدە (١٣) سەدەی دەوڵەتی ئیسلامیی، کە مسوڵمانان و پێکهاتەکانی دیکە لە جوولەکە و نەصرانیی و مەجووسی و بووزایی و صابیئە و. هتد، لە دەوڵەتی ئیسلامیی دا پێکەوە ژیاون و، هەرگیز مسوڵمانانی دەستگرتوو بە قورئان و ئیسلامەوە، لەشوێنکەوتووانی ئایینەکانی دیکە وەتەنگ نەهاتوون، ئەمەش بۆ هەموو کەسێکی شارەزای مێژوو، زانراوە.

**دووەم:** قورئان تێکرای ئەو بنەمایانەی کە بۆ بنیاتنانی کۆمەڵگایەکی پێکهاتە جۆراوجۆر (مُتعَدِّد: Plural) سەرکەوتووی پێکەوە هاوکاری تەبا، پێویستن، گرتوونیەخۆی[١].

---

(١) شایانی باسە من ئەم بابەتە گرنگەم بەدرێژیی لەکتێبی: (الإسلام كما يتجلى في كتاب الله)دا توێژیوەتەوە، کە دەرگای چوارەمم بەناوونیشانی: (الإسلام: نظرة سديدة تجاه

ئنجا ئایا ئەو بنەمایانە چین، کە بیناى کۆمەڵگایەکی ئاوایان لەسەر دەکرێ؟ ئەوە بابەتی ئەم ئاڵقەیەمانە خوایاربێ.

**هەر لەسەرەتاشەوە دەڵێم:**

لە سۆنگەی ئەوەوە کە خوای بەرز کتێبە مەزنەکەی خۆی بۆیە دابەزاندۆتە سەر پێغەمبەری کۆتایی بەڕێزی خۆی (صلى الله عليه وسلم) کە دواییین نوسخەی هیدایەتی بێ بۆ مرۆڤ و جند، هەتا لاپەڕەی ئەم ژیانە دنیایی یە هەڵدەدرێتەوە، کەواتە:

بێگومان دەبێ هەموو ئەو بنەمایانەی کە بۆ بەرپابوونی کۆمەڵگایەکی فرە پێکهاتەی سەرکەوتوو، پێویستن، بگرێتەخۆی: چونکە جگە لەوە لەبەخشندەیی و حیکمەت و بەزەیی خوا ناوەشێتەوە.

ئنجا لەوبارەشەوە پێغەمبەری کۆتایی (صلى الله عليه وسلم) وەك پێناسەی بەرنامەی هەقی خوا، کە بۆ هەموو بەشەرهاتوە، فەرموویەتی:

{أَحَبُّ الدِّين إِلى اللهِ: الحَنِيفِيَّةُ السَّمْحَةُ} أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٢١٠٧)، وَالبُخَارِيّ فِي "الأدب" برقم: (٢٨٧)، وَالبَزَّار برقم: (٧٨)، وَالطَّبَرَانِيّ برقم: (١١٥٧٢)، وَعَبْدُ بْنُ حُمَيْد برقم: (٥٦٩).

واتە: خۆشەویستترین ئایین لەلای خوا: پاکێتیی و تەبایی یە.

وشەی (الحَنيفية) لە (الحَنَفْ)ەوە هاتوە، کە بریتیە لە: (المَيلُ عن الباطل كله الى الحق) لادان لەبەتاڵ و ناهەق بەرەو هەق.

وە (السَّمْحة) لە (سَمْح)ەوە هاتوەو (سماحة)یشی لێوەرگیراوە، ئەمیش بەمانای: (اليُسْر والعطاء والسَّخاء والموافقة والإنسجام)ە، یانی: ئاسانیی و بەخشین و بەخشندەیی و پێکهاتن و پێکەوە گونجان[1].

کەواتە: پێغەمبەری خوا جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە، کە دینداریی خۆشەویست و

---

الناس وتعامل صحيح معهم) کە بەرگی هەشتەمی دەیگرێتە خۆی، بۆ تەرخان کردوە.

(١) بڕوانە: مختار الصِّحاح، ص ١٥١ و ٢٨٠، وە (المصباح المنير) للفيومي، ص ٨٣و١٥٠.

پەسند لەلای خوای بەرز، لەدوو بەشان پێك دێت:

**یەكەم:** خوا بەیەككگرتن و خواپەرستیی ساغ و بێ خڵتە بۆ خوای بەرز، چونكە هەر ئەوە ئامانجی بنەڕەتیی ئایینی حەنیف و ڕێباز و ڕێ و شوێنی پاك و بێگەردە.

**دووەم:** تەبایی و پێكەوە هەڵكردن و، ئاسانیی و لێك تێگەیشتن و گونجان لەگەڵ خەڵك دا.

ئنجا پێویست بەباسكردنیش ناكات، كە مەبەست لە تەبایی و گونجان و سازان لەگەڵ خەڵك دا، ئەوەنیە كە دەستبەرداری بنەما شەرعییەكان ببی و وازیان لێ بێنی!

چونكە بێگومان پرەنسیپ و بنەما شەرعییەكانن، كە وا لەمسوڵمانان دەكەن لەگەڵ غەیری خۆیان دا تەبا و گونجاو و ڕێك بن، لەچوارچێوەی هێنانەدی بەرژەوەندییە هاوبەش و ئامانجە گەورەكانی كۆمەڵگای ئیسلامیی دا!

ئەمە و من ئاگاداریشم، كە لەم ڕۆژگارەدا، چ شێوانێك بەسەر ئیسلام و مسوڵماناندا هاتوە، لەبواری ناوبراودا لەسۆنگەی هۆكارگەلێكی زۆرەوە، دیارترینیان: بوونی چەند گرووپ و كۆمەڵێكی پەڕگیر و كرچ وكاڵ و سەركێڵ، كە بەبەردەوامیی، توندوتیژیی و بەكارهێنانی هێزیان كردۆتەپیشە، بەخەیاڵی خۆیان بۆ گۆڕین و چاكسازیی تێداكردنی كۆمەڵگا ئیسلامییەكان! بۆیەش بە ئەركێكی گەورەی خۆمم زانی، كەهەڵوێستی قورئانی بەپێز لەو بارەوە ڕون بكەمەوە، تاكو بەناهەق، ئیسلام و زۆرینەی هەرە زۆری مسوڵمانان، كە ئەو ڕەفتارە تێپەڕێنەرە بێ سەرەوبەرانانە، ڕەت دەكەنەوە، تۆمەتبار نەكرێن.

ئنجا پاش تێوەڕامانی كتێبی بەپێزی خوا[١] توانیم ئەم پازدە (١٥) بنەمایە هەڵهێنجم، بگرە وەربگرم، كە پێم وایە بەسن بۆ ئەوەی كۆمەڵگایەكی فرە پێكهاتە (مُتعدِّد - Multi - Culture) (Plural)ی سەركەوتووی تەبا و هاوكار، لەسەر بناغەیان بنیات بنرێ:

---

(١) ئەم بنەمایانەم بەدەستكاریی و كەم و زیادكردنەوە لە كتێبی: (چەند بابەتێكی سیاسیی هاوچەرخ لەبەر ڕۆشنایی عەقڵ و وەحی)دا وەرگرتن، كە نووسراوی خۆمە.

## ا- خوا سبحانه و تعالى تەنیا خۆی بەدیهێنەر و پەروەردگار و خاوەنی جیهانەكانە:

مسوڵمانان ڕۆژانە لەپێنج نوێژە فەڕزەكان دا، لە سووڕەتی فاتیحەی موبارەك دا دەخوێننەوە:

﴿ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴾ -٢-، ستایش بۆخوای پەروەردگاری جیهانەكان.

ئنجا یەكسانە: مەبەست لە (العالمین) بەس جیهانی بەشەربێ، بەهەموو وەچە یەك لەدوای یەكەكانی، یان مەبەست جیهانەكانی: فریشتە و جند و مرۆڤ و ژیاندار و ڕووەك و ماددەی بێ ژیان بێ، مسوڵمانان لەبەر ڕۆشنایی ئەم ئایەتەدا هەست دەكەن: كەخوا وەك چۆن بەدیهێنەر و پەروەردگار و خاوەن و پەرستراوی وانە، بەهەمان شێوە هەرئەویش بەدیهێنەر و پەروەردگار و خاوەن و پەرستراوی غەیری وانیشە، وە كە هیچ كەس - هەركەسێك بێ- لەوبوارەدا پلە و زیادیی بەسەر ئەوانی دیكەدا نیە، بەپێچەوانەی ئەوەوە كە جوولەكە لە (پەیمانی كۆن) و (تەلموود)دا ئیددیعای دەكەن كە ( یەهوا) - یانی خوای بەرز - بەس پەروەردگاری جوولەكەیە و تەنیا گرنگیی بەوان دەدات، وە مرۆڤەكانی دیكەی، بەس بۆ خزمەتكردنی وان دروست كردوون، چونكە ئەوان نەتەوەی بژاردەی خوا (شعب الله المختار)ن!

ئنجا بەدڵنیاییی یەوە مسوڵمانێك كە لەكتێبی كۆتایی خوادا، ئەم ئایەتانە دەخوێننەوە:

﴿ فَلِلَّهِ ٱلۡحَمۡدُ رَبِّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَرَبِّ ٱلۡأَرۡضِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٣٦﴾ وَلَهُ ٱلۡكِبۡرِيَآءُ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴿٣٧﴾ ﴾ الجاثیة -٣٦، ٣٧-.

یەکسەر هەست بەنیزیکیی خۆیان لەوانی دیکە و، نیزیکیی ئەوانی دیکە لەخۆیان دەکەن، هەرکەسێك بن و لەهەر کوێیەك بن، لەو ڕووەوە کە بەشەری: دروستکراو و خاوەندار و پەروەردەکراو و ڕۆزیی دراوی، یەك بەدیهێنەر و پەروەردگار و خاوەن و ڕۆزیی دەرن، کە هەموویانی خوڵقاندوە و لەم سەرزەمینەدا کردوونیە جێنشین، تاکو ئەم ژیانە کاتییە تاقیکرانەوەیی یە پێکەوە بگوزەرێنن، وەك خوای بەرز و مەزن فەرموویەتی:

﴿ وَلَقَدْ مَكَّنَّٰكُمْ فِي ٱلْأَرْضِ وَجَعَلْنَا لَكُمْ فِيهَا مَعَٰيِشَ ۗ قَلِيلًا مَّا تَشْكُرُونَ ١٠ ﴾
الأعراف -١٠-

بەڵێ، ئەم هەستە وا لەمسوڵمانان دەکات، ئەوە هیچ کە لەهەڵس و کەوت کردن لەگەڵ نامسوڵماناندا - ئایین و ئاڕاستەیان هەرچییەك بێ- نەسڵەمنەوە، بەڵکو دەستپێشخەریش بن بۆ کارلێکی ئەرێنیی و بنیاتنەر لەگەڵیان و، هاوکاریی کردن لەسەر چاکەکاریی و پارێزکاریی، لەگەڵ تێکڕای جۆرەکانی خەڵك دا، چ لە چوارچێوەی کۆمەڵگادابن، چ لەدەرەوەی دا.

## ٢- مرۆڤایەتیی هەمووی هی خێزانێکە:

وەك خوای بەرز و مەزن فەرموویەتی:

﴿ يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَىٰ وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا ۚ إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ ۚ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ ﴿١٣﴾ ﴾ الحجرات -١٣-.

وە فەرموویەتی:

﴿ يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَاءً ۚ وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي تَسَاءَلُونَ بِهِ وَالْأَرْحَامَ ۚ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا ﴿١﴾ ﴾ النساء -١-.

ئاشکراشە زانینی ئەم ڕاستییە، وا لەمسوڵمانان دەکات کە هەست بە یەکبوونی ڕەچەڵەك و ڕیشە بکەن، لەنێوان خۆیان خەڵکی دیکەدا، ئایین و ڕێبازیان هەرچیەك بێ، دیارە هەر ئەوەش بووە، کە عەلی کوڕی ئەبو طالیب خوا لێی ڕازی بێ، والیێ بکات، کە بە یەکێك لە (والي)یەکانی [الأشتر النخعي] بڵێ لەبواری هەڵس وکەوت لەگەڵ خەڵکی دا:

( الناس إمّا أَخ لك في الدين، وإما نظـيرلك في الخَلْق )[1]

واتە: خەڵك یان براتن لەئایین دا، یان هاوشێوەتن لەمرۆڤایەتیی دا.

منیش زۆرجار بەو نامسوڵمانانەی خاوەن کتێب و هی دیکەش - کە سەردانم دەکەن - دەڵێم: ئێمە و ئێوە لە ڕەچەڵەکی دووردا پێك دەگەینەوە، چونکە هەموومان لە ئادەم و حەووایین - علیهما السلام- وە سەر بەیەك خێزانین.

---

(١) نهج البلاغة، من ٣٣٣-٣٤٨، کە وەصییەتی عەلی خوا لێی ڕازی بێ و ئامۆژگارییەکەی بۆ والییەکەی (الأشتر النخعي) تێدایە، کاتێك میصری پێ سپارد.

وە ئەم ڕاستییە کە کتێبی بەپێزی خوا، بەڕاشکاویی فەرموویەتی، هەرچەندە لەم ڕۆژگارەدا شتێکی بەڵگە نەویستە - ئەگەر بەتیۆرییش بێ - بەڵام لەڕۆژگاری دابەزینی قورئان دا، مشت ومڕی زۆری لەسەربوو، چ لەکۆمەڵگای خێڵەکیی عەرەب دا، چ لەیۆنان و هیند و چینیش دا، دابەشکردنی ئەفلاتوونیش بۆ کۆمەڵگای یۆنان و چواندنی هەرکام لە پێکهاتەکانی بەجۆرێك لەکانزا (معدن)یەکان، وەك زێڕ و زیو و ئاسن[١]، لەکتێبی (کۆماری ئەفلاتوون)دا لەکەس شێرراوەنیە.

وە توێژەرەوانی قورئان باسیان کردوە، کە هۆی هاتنەخواری ئایەتی (١٣)ی (الحجرات)، ئەم بەسەرهاتەبووە:

[لما كان يوم الفتح أَمَر رسولُ الله صلى الله عليه وسلم بلالاً فَصَعد على ظــهر الكعبة، فأَذَّن وأراد أَن يذلَّ المشركين بذلك، فلما أذَّن، قال عتاب بن أُسيد: الحمد لله الذي قبض أسيداً قبل اليوم، وقال الحارث بن هشام: أَما وَجَد محمد غير هذا الغراب الأسود مؤَذِّناً؟ وقال سُهَيل بن عمرو: إِنْ يكره الله شيئاً يُغَيِّرْهُ، وقال أبو سفيان: أما أنا فلا أقول شيْئاً، فإِني ان قلت شيئاً لتشهدنَّ عليَّ السماءُ ولَتُخبِرَنَّ، فنزلت هذه الآية: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَـٰكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَىٰ ... ﴾][٢]

واتە: لە ڕۆژی فەتحی مەککە دا پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمانی بە (بلال) کرد چووە سەربانی کەعبە و بانگی دا - ویستی بەوە هاوبەشدانەرەکان زەبوون بکات - ئنجا کە بانگی دا، (عتاب بن أسيد) گوتی: ستایش بۆ ئەو خوایە، کە (أُسَيْد)ی پێش ئەمڕۆ مراند.

---

(١) فەرموودەی پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم): (تجدون الناس معادن كمعادن الذهب والفضة فخيارهم في الجاهلية خيارهم في الإسلام اذا فقهوا) متفق عليه، البخاري: ٣٣٣٦، ومسلم: ٢٦٣٨. وەك لەدەقی فەرموودەکەوە دیارە، مەبەست پێی جۆراوجۆریی سیفەت و خەسڵەتەکانی خەڵکە، نەك دابەشکردنی چینایەتیی ئەفلاطوونیی!

(٢) بڕوانە: أسباب النزول للواحدي، ٢٢٤، وە: (زاد المسير في علم التفسير) لابن الجوزي ص ١٣٣٥، وە: (الإستيعاب في بيان الأسباب) ج٣ص٢٨٥، کە دوو نووسەرەکانی گوتوویانە: أخرجه البيهقي في (دلائل النبوة) (٥/٧٩) بسند صحيح الى عبدالرزاق، وليس فيه ذكر لسبب النزول، قلنا: وهذا مرسل صحيح الإسناد.

وە (الحارث بن هشام) گوتی: ئایا (محمد) جگە لەم قەلەڕەشە کەسی دیکەی چنگ نەکەوت، بانگبێژبێ؟!

وە (سهیل بن عمرو) گوتی: ئەگەر خوا شتێکی حەز لێ نەبێ، دەیگۆڕێ.

وە (أبو سفیان) گوتی: من هیچ ناڵێم، چونکە هەرچی بڵێم، ئاسمان شایەدییم لەسەر دەدات و هەواڵم لێدەدات.

ئنجا ئەم ئایەتە - لەوبارەوە - هاتە خوارێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَـٰكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَىٰ ... ﴾.

وە لە فەرموودەی خوای بەرزدا: ﴿ ...وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ٱلَّذِى تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلْأَرْحَامَ ... ﴾ پاش فەرموودەی: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُوا۟ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا ... ﴾ ئاماژەیەکی ڕوون هەیە بۆ ئەوە کە مرۆڤایەتیی هەمووی نیزیکیی و خزمایەتیی لەنێوان دا هەیە، وە فەرمانی پێکراوە بیگەیەنێ و نەیپچڕێنێ.

## ٣- هەموو بەشەر بۆیەك حیكمەت دروستكراون، كە پەرستنی خوای بەرزە:

خوای بەرز فەرموویەتی:

﴿ وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ﴾ الذاريات -٥٦-.

**وەك دەبینن:** خوا تبارك وتعالى حیكمەتی خۆی لەهێنانەدی جند و مرۆڤ دا، لە هەڵسانیان بەبەندایەتیی كردن بۆ خوادا، كورت هەڵێناوە، بەمانای گشتگیری وشەی: (عبادة)، كەتێكڕای چالاكییە فیكریی و دەروونیی و كردەیی یەكانی، كە مرۆڤ و جن پێیان هەڵدەستن، دەگرێتەوە.

ڕوونیشە كە پەرستنی خوای تاك لەپابەندیی بەبەرنامە ڕاستەكەی و شەریعەتە پاكەكەیدا، لەسەر ئاستی تاك و كۆمەڵ، بەرجەستە دەبێ، ئنجا لێرەدا پرسیارێك دێتەپێش:

ئایا نەپەرستنی خوا و سەرەنجام پابەندنەبوون بەشەریعەتەكەیەوە، نەهاتنەدی ئەو حیكمەتە ناگەیەنێ كە خوا جند و مرۆڤی بۆ هێناونە دی؟ ئنجا ئایا ئەمە نابێتە پاساوی مسوڵمانان كە دژایەتیی و دوژمنایەتیی ئەو نامسوڵمانانە بكەن، كە حیكمەتی دروستكرانیان ناهێننەدی و، بەبەرنامەی پەروەردگاریانەوە پابەندنابن؟!

**دەڵێین:** نەخێر، هەڵنەستانی نامسوڵمانان بەپەرستنی خوا، یان هەڵسانیان پێی بەشێوەیەكی ناڕاست، پاساو نیە بۆ مسوڵمانان كە دژایەتییان بكەن و لەگەڵیان بجەنگن، چونكە: لێپرسینەوەی بەندەكان و دادگایی كردنیان، تەنیا مافی خوای بەرزە و، خەڵكی هیچ پشكێكیان تێیدانیە، وەك لەكاتی خستنەڕووی بنەمای چوارەم دا ئاماژەی پێدەكەین و، لەكاتی خستنەڕووی بنەمای شەشەمیش دا بەتایبەت لەبارەیەوە دەدوێین.

## ٤- ژیانی دنیا جێگای تاقیکرانەوەیە، نەك پاداشت و سزا:

کتێبی قسە لەجێی خوا ئەم ڕاستییەی لەزۆر شوێنان دا ڕاگەیاندوە، بۆ وێنە:

١- ﴿ إِنَّا جَعَلْنَا مَا عَلَى الْأَرْضِ زِينَةً لَّهَا لِنَبْلُوَهُمْ أَيُّهُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ﴿٧﴾ ﴾ الكهف -٧-.

٢- ﴿ الَّذِي خَلَقَ الْمَوْتَ وَالْحَيَاةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ۚ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْغَفُورُ ﴿٢﴾ ﴾ الملك -٢-.

٣- ﴿ وَهُوَ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ وَكَانَ عَرْشُهُ عَلَى الْمَاءِ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ﴾ هود -٧-.

کەواتە: نەك بەس گۆی زەوی، بگرە هەموو بوونەوەر، وەك هۆڵی تاقیکردنەوە (قاعة امتحان)ی جند و مرۆڤ وایە، ئنجا ئاشکراشە کە قوتابییەك کە دەویسترێ تاقی بکرێتەوە و، دەچێتە هۆڵی تاقیکردنەوەوە، پێویستە سەرجەم پێداویستییەکانی لە: قەڵەم و کاغەز و کاتی پێویستی بۆ دابین بکرێن، پاشان پرســیارەکانی بخرێنە پێش و، ئازادیش بکرێ لەوەڵامــدانەوە و چۆنیەتی وەڵامدانەوە و.. هتد دا.

ئنجا هەر بەو شێوەیەش، خەڵك لەم ژیانە تاقیکرانەوەیەدا، ئازادیی تەواویان پێدراوە، وەك خوا سبحانه وتعالى فەرموویەتی:

﴿ وَقُلِ الْحَقُّ مِن رَّبِّكُمْ ۖ فَمَن شَاءَ فَلْيُؤْمِن وَمَن شَاءَ فَلْيَكْفُرْ ﴾ الكهف-٢٩-[١]

---

(١) هەندێك لەتوێژەرەوان گوتوویانە: (فَمَن شَاءَ فَلْيُؤْمِن وَمَن شَاءَ فَلْيَكْفُرْ ..) لەبواری هەڕەشە لێکردنی کافران دا هاتوە، بەسزای دواڕۆژ!
منیش دەڵێم: بێگومان هەڕەشە لێکردنی کافران بەسزای ڕۆژی دوایی، لەگەڵ ئازادیی یان بۆ هەڵبژاردنی ئیمان و کوفردا، تێك ناگیرێ، مادام هیچ سزایەکی دنیایی نیە، لەسەر هەڵبژاردنی کوفر!

وە لەسەر بناغەی ئەوە كەڕابرد، دەتوانین بڵێین:

بێگومان خوای بەرز لەڕووی ویستی ئازادەوە، مافی هەڵبژاردنی كوفری بەخەڵك داوە، هەرچەندە لەڕووی شەرعییەوە، بڕوا هێنان (إیمان)ی لەسەر پێویست كردوون، بەڵام فشاری نەخستوونەسەر و لەسەر بڕواهێنان ناچاری نەكردوون، بەڵكو هەر لەبنەڕەتەوە (ئیمان) بە ناچاركردن و زۆرلێكردن نایەتەدی.

وە ئێمە لەداهاتوودا هەڵوەستەیەكی درێژ لەبەردەم فەرموودەی خوا، لەبەسەرهاتی (ذوالقرنین)دا دەكەین:

﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ مَغۡرِبَ ٱلشَّمۡسِ وَجَدَهَا تَغۡرُبُ فِي عَيۡنٍ حَمِئَةٖ وَوَجَدَ عِندَهَا قَوۡمٗاۖ قُلۡنَا يَٰذَا ٱلۡقَرۡنَيۡنِ إِمَّآ أَن تُعَذِّبَ وَإِمَّآ أَن تَتَّخِذَ فِيهِمۡ حُسۡنٗا ٨٦ قَالَ أَمَّا مَن ظَلَمَ فَسَوۡفَ نُعَذِّبُهُۥ ثُمَّ يُرَدُّ إِلَىٰ رَبِّهِۦ فَيُعَذِّبُهُۥ عَذَابٗا نُّكۡرٗا ٨٧ وَأَمَّا مَنۡ ءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحٗا فَلَهُۥ جَزَآءً ٱلۡحُسۡنَىٰۖ وَسَنَقُولُ لَهُۥ مِنۡ أَمۡرِنَا يُسۡرٗا ٨٨ ﴾ الكهف -٨٦-٨٨-.

**چونكە وەك دەبینین:**

(ذوالقرنین) ئەو پادشایەی كە خوا سبحانه وتعالی وەك مەدح كردن باسی دەكات، دوای ئەوەی خوا دەستی ئاوەڵادەكات لەبواری دادوەرییدا، وەك سزادانی ستەمكاران و، پاداشت دانەوەی چاكەكاران، بەرنامەی سیاسی خۆی بەم جۆرە ڕوون دەكاتەوە:

هەركەس ستەم بكات، ئێمەش سزای دەدەین، پاشان كە بۆلای پەروەردگاری دەگێڕرێتەوە، سزایەكی خراپی دەدات. بەڵام كەسێك بڕوا بێنێ و كردەوەی باش

---

وە قسەی خوای بەرز: (وَلَوۡ شَآءَ رَبُّكَ لَأٓمَنَ مَن فِي ٱلۡأَرۡضِ كُلُّهُمۡ جَمِيعًاۚ أَفَأَنتَ تُكۡرِهُ ٱلنَّاسَ حَتَّىٰ يَكُونُواْ مُؤۡمِنِينَ ٩٩) یونس-٩٩-. واتە: وە ئەگەر پەروەردگارت ویستبای _زۆریان لێ بكات- هەموو ئەوانەی لەسەر زەوین، تێكڕا بڕوایان دێنا، ئنجا ئایا تۆ زۆر لەخەڵك دەكەی تاكو ببنە بڕوادار؟!

بە ئاشكرا ئەوە دەگەیەنێ، كە خوای بەرز ئازادیی تەواوی داوە بە خەڵك، لە بواری هەڵبژاردنی ئیمان یان كوفردا، چونكە خوا سبحانه وتعالی نكوولیی لە پێغەمبەری بەرێزو كۆتایی خۆی دەكات، كە زۆر لەخەڵك بكات، بۆ ئیمان هێنان!

بکات، ئەوە پاداشتی هەرەباشی هەیە (لەلای خوا). وە ئێمەش لەلایەن خۆمانەوە قسەیەکی ئاسانکارانەی لەگەڵ دەکەین.

وەك دەبینین: بەراورد لەنێوان (مَنْ ظــلم) و (من آمن وعمل صالحاً)دا دەکات، نەك لەنێوان: (من آمن) و (من کفر)دا!

ئەمەش یانی: زولقەرنەین لەسەر ستەم سزای خەڵك دەدات، نەك لەسەر کوفر، وە لەسەر ئیمانیش پاداشتیان دەداتەوە.

**هــۆکاری ئــەوەش:**

یەکەم: خوا سبحانه وتعالى بەمەبەستی تاقیکردنەوەیان، ئازادیی کافربوون و ئیمان نەهێنانی بەخەڵك داوە، وەك فەرموویەتی:

﴿إِنَّا هَدَيْنَـٰهُ ٱلسَّبِيلَ إِمَّا شَاكِرًا وَإِمَّا كَفُورًا ﴿٣﴾﴾ الإنسان -٣-.

ئنجا بۆ جگە لەخوا نیە ئەو مافەیان لێوەربگرێتەوە.

دووەم: دەگونجێ خەڵك بەکوفر و ئیمانەوە پێکەوە بژین، بەڵام ستەم (ظـلم) پەرچی ڕێی پێکەوە ژیانە، هەربۆیەش ڕاستە کەگوتراوە: ( قد یدوم الملك مع الکفر ولا یدوم مع الظـلم)، حوکمڕانیی بەکوفرەوە بەردەوام دەبێ، بەڵام بەستەمەوە دەوام ناکات.

## ٥- خوای کاربەجێ بەویستی خۆی، خەڵکی بۆ خاوەنانی بڕوا و، خاوەنانی کوفر دابەشکردوە:

ئەمیش بنەمایەکی دیکەی گرنگە لەبنەمایەکانی تەبایی و پێکەوە ژیانی نێوان مسوڵمانان و، نامسوڵمانان لەکتێبی خوای مەزن دا، وەك فەرموویەتی:

١- ﴿وَلَوْ شَآءَ رَبُّكَ لَجَعَلَ ٱلنَّاسَ أُمَّةً وَٰحِدَةً وَلَا يَزَالُونَ مُخْتَلِفِينَ ﴿١١٨﴾ إِلَّا مَن رَّحِمَ رَبُّكَ وَلِذَٰلِكَ خَلَقَهُمْ وَتَمَّتْ كَلِمَةُ رَبِّكَ لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنَ ٱلْجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ أَجْمَعِينَ ﴿١١٩﴾﴾ هود -١١٨، ١١٩-.

لەم ئایەتانە و هاووێنەکانیانەوە دیارە کە خوای بەرز ویستی حەکیمانەی وای خواستوە، کە خەڵك لەبواری ئیمان و کوفردا، سەرپشك و ئازاد بکات، وە سەرەنجام بەویستی خۆیان، بوونە دووبەش: بێبڕوایان، وە بڕواداران.

یانی: خوای بەرز بۆ هیچ کام لە کوفر و ئیمان، ناچاری نەکردوون، بەڵکو لەڕووی ویستەوە - نەك لەڕووی شەرعەوە- لەنێوانیاندا سەرپشکی کردوون و، ویستێکی ئازادیشی پێداون، کە هەرکامێکیانیان بوێ، هەڵیبژێرن: ئیمان یان کوفر.

زانراویشە کە ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە کوفر و ئیمان یەکسانن، چونکە خوا سوپاگوزاریی و ئیمانی خۆشدەوێ و، ڕقی لە کوفر و سپڵەیی یە، وەك فەرموویەتی:

﴿.. وَلَا يَرْضَىٰ لِعِبَادِهِ ٱلْكُفْرَ وَإِن تَشْكُرُوا۟ يَرْضَهُ لَكُمْ﴾ الزمر -٧-.

بەڵام خوای بەرز - تاکو تاقی کردنەوە تەواوبێ- لەڕووی ویست و خواستەوە خەڵکی سەرپشك کردوە، لەنێوان ئیمان و کوفردا و، لەسەر هیچ کامیان ناچاری نەکردوون و پێیەوە پابەندی نەکردوون، وە ئەگەر خوا ئازادیی هەڵبژاردنی هەرکامێکیان نەدابانێ و، لەنێوانیان دا سەرپشکی نەکردبان، جگە لەئیمانی

پەسند لەلای خوای بەرز، نەیاندەتوانی هیچ بژاردەیەکی دیکەیان هەبێ، وەك ئەو فریشتانەی کە خوا لەبارەیانەوە فەرموویەتی:

﴿..لَّا يَعْصُونَ اللَّهَ مَا أَمَرَهُمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ ﴿٦﴾﴾ التحريم -٦-.

ئنجا هەندێ لەتوێژەرەوان، فەرمایشتی خوا: (ولذلك خلقهم )یان، لەدوای: (ولا يزالون مختلفين) ئاوا تفسیر کردوە: (وللإختلاف خلقهم) - وە بۆ ڕاجیایی دروستیکردوون -، وەك (القرطبي) گوتوویەتی:

( قال الحسن ومقاتل وعطاء ويمان: الإشارة للإختلاف. أي: وللإختلاف خلقهم )[1].

وە هەندێك لەزانایان گوتوویانە: مەبەست لە (ولذلك) ئەوەیە کە خوای بەرز دروستیکردوون تاکو ڕەحمیان پێ بکات، چونکە قسەی خوای بەرز: (الاّ من رحم ربك) نیزیکترین باسکراوە.

بەڵام من پێم وایە یەکەمیان لەڕاستییەوە نیزیکترە، وە هەرئەویش لەواقیع دا هاتۆتەدی، چونکە خەڵکی ڕاجیان و جۆرا وجۆرن، بەڵام هەموویان بەزەیی لەگەڵ نوێنرا و شایستەی بەزەیی پەروەردگار نین.



---

(١) الجامع لأحكام القرآن، ج٩ص٩٤.

## ٦- خوا سبحانه وتعالى پاداشتی ئیمان و چاکە و سزای کوفر و سەرپێچیی، خستۆتە ڕۆژی دوایی یەوە:

ئەمەش دیسان بنەمایەکی گرنگی دیکەیە لەو بنەمایانەی کتێبی قسە لەجێی خوا لەخۆی گرتوون و، لەسەر بناغەیان دەگونجێ کۆمەڵگا بەهەموو پێکهاتەکانیەوە، لەمسوڵمانان و غەیری وانیش بەتەبایی و لێبوردەیی و دەستبار بۆ یەکدی گرتن، پێکەوە بژین.

هەڵبەتە ئایەتی زۆریش هەن دەربڕی ڕاشکاوانەی ئەم ڕاستییەن، کە کردوومانەتە ناوونیشانی ئەم بنەمای شەشەمە لە بنەماکانی تەبایی و پێکەوە ژیان، لەوانە:

١- ﴿ وَإِن جَٰدَلُوكَ فَقُلِ ٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِمَا تَعۡمَلُونَ ﴿٦٨﴾ ٱللَّهُ يَحۡكُمُ بَيۡنَكُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ فِيمَا كُنتُمۡ فِيهِ تَخۡتَلِفُونَ ﴿٦٩﴾ ﴾ الحج ٦٨-٦٩.

٢- ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱلَّذِينَ هَادُواْ وَٱلصَّٰبِـِٔينَ وَٱلنَّصَٰرَىٰ وَٱلۡمَجُوسَ وَٱلَّذِينَ أَشۡرَكُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ يَفۡصِلُ بَيۡنَهُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ شَهِيدٌ ﴿١٧﴾ ﴾ الحج -١٧-.

٣- ﴿ .. فَإِنَّمَا عَلَيۡكَ ٱلۡبَلَٰغُ وَعَلَيۡنَا ٱلۡحِسَابُ ﴿٤٠﴾ ﴾ الرعد -٤٠-.

وە ئاشکرایە کە ئەم بنەمایە هۆکارێکی یەکجار گرنگە کە مسوڵمانان وا لێبکات لەچوارچێوەی کۆمەڵگادا، لەگەڵ غەیری خۆیان دا لێبوردە و تەبابن و، پێکەوە بژین و هاوکاربن، بۆ هێنانەدی بەرژەوەندییە هاوبەشەکان، وەك خوای تبارك وتعالى فەرمانی پێکردوون:

﴿ ..وَتَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلۡبِرِّ وَٱلتَّقۡوَىٰ ﴾ المائدة -٢-.

ئەویش لەسۆنگەی ئەوەوە کە ئەوەی وا لە مرۆڤی دیندار دەکات کە بەکوفر و خراپەی غەیری خۆی قەڵس و سەغڵەت بێ و، تەحەممولی نەکات هەستکردنیەتی بەوەی کە بەرانبەری لێپرساوە، یان بۆی هەیە دەست وەربداتە عەقیدەی و تایبەتمەندییەکانی، وەك ئەوە ڕوویدا لە کۆمەڵگا نەصرانییەکانی سەدەکانی نێوەڕاست دا، لەلایەن پاپا و قەشەکانەوە، دژی بیرمەند و دۆزەرەوەکان، کە بەسزادان و کوشتن و سووتاندن، بەرەنگاری بیروڕا تازە پێچەوانەکانیان لەگەڵ کڵێسا و دروشم و بۆنە و بیر وبڕوایەکانی دا، بوونەوە!.(١)



---

(١) لەوانەی کە لەلایەن کلێسا و دام و دەزگاکانیەوە بەزیندوویی سووتێنران: (جیۆردانو برونو) و (جیوفردی فالیە) و (بومبو راستیکو) و (بارپولومیولیجات) و (إدوارد وایتمان) بوون، بڕوانە: الإلحاد في الغرب، رمسيس عوض ص٤٧-٤٩، وە (تأريخ الفلسفة الحديثة يوسف كرم، ص٣٤، وە: (كتب غيرت العالم) روبرت داونز، ص ٢٢٥-٣٣٢، وە بڕوانە: (العلمانيون والقرآن الكريم)، ص٢٥١، د. إدريس الطعان.

## ٧- مرۆڤ لەلای خوای بەرز و مەزن، بەرز و ڕێز لێگیراوە:

وەك خوا تبارك وتعالى فەرموویەتی:

﴿وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِيٓ ءَادَمَ وَحَمَلْنَٰهُمْ فِي ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ وَرَزَقْنَٰهُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَفَضَّلْنَٰهُمْ عَلَىٰ كَثِيرٍ مِّمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلًا ٧٠﴾ الإسراء -٧٠-.

هەڵبەتە ئەو ڕێزلێگرتنەی پەروەردگاریش بۆ بەشەر، گشتییە و نێر ومێی مرۆڤەکان بەتێکڕا دەگرێتەوە، ئایین و بیروڕایان هەرچییەك بێ، ئەمەش وشەی (بنی آدم) دەیگەیەنێ، چونکە مرۆڤەکان هەموویان بەبڕوادار و بێبڕواوە، نەوەی ئادەمن.

هەروەها هەرکام لە فەرمایشتی خوا: ﴿وَحَمَلْنَٰهُمْ فِي ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ﴾ و ﴿وَرَزَقْنَٰهُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ﴾ و ﴿وَفَضَّلْنَٰهُمْ عَلَىٰ كَثِيرٍ مِّمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلًا﴾ دەیگەیەنن، چونکە:

هەڵمانگرتن (حملناهم) و بژێومان دان (رزقناكم) و، هەڵمان بژاردن (فضلناهم) گشتگیرن بۆ هەموو بەشەر و تێکڕای بەشەرەکان: هەڵگیراو (محمول) و بژیودرا و (مرزوق) و هەڵبژێراو (مفضل)ن، لەلایەن خوای بەخشندەوە تبارك وتعالى.

**کەواتـــە:**

ڕێزلێگرتنی خواش سبحانە وتعالى بەهەمان شێوە گشتی یە و هەموو بەشەری پێگرتۆتەوە، بەبێ جیاوازیی و هەڵاواردن.

ئنجا ئەم ڕێزلێگرتنەی پەروەردگاریش بۆ بەشەر، لەزۆر شت دا بەرجەستەیە، لەوانە:

**یەکـــەم:** گێڕانی خوای بەرز بۆ مرۆڤ بەجێنشین لەسەر زەوی:
وەك خوا سبحانە وتعالى فەرموویەتی:

١- ﴿وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي ٱلْأَرْضِ خَلِيفَةً﴾ البقرة -٣٠-.

٢- ﴿ هُوَ ٱلَّذِى جَعَلَكُمْ خَلَٰٓئِفَ فِى ٱلْأَرْضِ ﴾ فاطر -٣٩-.

٣- ﴿ ثُمَّ جَعَلْنَٰكُمْ خَلَٰٓئِفَ فِى ٱلْأَرْضِ مِنۢ بَعْدِهِمْ ﴾ يونس -١٤-.

٤- ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى جَعَلَكُمْ خَلَٰٓئِفَ ٱلْأَرْضِ وَرَفَعَ بَعْضَكُمْ فَوْقَ بَعْضٍ دَرَجَٰتٍ لِّيَبْلُوَكُمْ فِى مَآ ءَاتَىٰكُمْ ﴾ الأنعام -١٦٥-.

وە مەبەستیش لەگێڕانی خوا بۆ بەشەر بەجێنشین، ئەوەیە کە خوا سبحانە وتعالی برە ویستێکی ئازادی پێداون و دەستی ئاوەڵاکردوون کە بەخواستی خۆیان هەڵس و کەوت بکەن لەزەوی دا: چاکسازیی لەسەر بناغەی زانیاریی و دادگەریی - کە ئەمە پەسند و خۆشویستراوی خوایە -، یان خراپەکاریی لەسەر بناغەی نەفامیی وستەم - کە ئەمە ڕەتکراوە و بوغزێنراوی خوایە -.

دووەم: سپاردنی خوای بەرز سپاردەیەك بەمرۆڤ، کە ئاسمانەکان و زەوی و چیایەکان لەئاستی دا دەستەپاچەبوون:

وەك خوای بەرز و مەزن فەرموویەتی:

﴿ إِنَّا عَرَضْنَا ٱلْأَمَانَةَ عَلَى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱلْجِبَالِ فَأَبَيْنَ أَن يَحْمِلْنَهَا وَأَشْفَقْنَ مِنْهَا وَحَمَلَهَا ٱلْإِنسَٰنُ ۖ إِنَّهُۥ كَانَ ظَلُومًا جَهُولًا ﴿٧٢﴾ ﴾ الأحزاب -٧٢-.

دیارە توێژەرەوانیش لەبارەی مەبەست لە (ٱلْأَمَانَةَ) ڕاجیایی یان هەیە، بەڵام ئەوەی کە لەوەبارەوە بۆم ساغ بۆتەوە، ئەوەیە کە مەبەست پێی: ئەو ویستە ئازادەیە کە مرۆڤ هەیەتی و، لەنێو سەرجەم دروستکراوەکان دا پێی تایبەت کراوە، وە هەرئەوەشە کەوای لێکردوە شایستەی جێنشینایەتیی خوای بەرز بێ لەسەر زەوی.

سێیەم: دروستکردنی خوا بۆ مرۆڤ لەباشترین شێوەدا:

وەك خوای کاربەجێ فەرموویەتی:

﴿ لَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ فِىٓ أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ ﴿٤﴾ ﴾ التين-٤-.

چەمکی وشەی (التقویم)یش هەردووك لایەنی جەستەیی و ڕووحیی دەگرێتەوە و، مرۆڤ کۆمەڵێك تایبەتمەندیی ڕووحیی و جەستەیی هەن، کە جگە لەو لەهیچ دروستکراوێکی دیکەدا نین.

**ئنجا شتێکی ڕوونیشە کە هەرکام لە:**

١- بەجێنشین دانانی خوا بۆ مرۆڤ لەسەر زەوی.

٢- پێ سپاردنی سپاردە.

٣- دروستکردنی لەچاکترین شێوە و پێکهاتەدا.

خەڵکی بەگشتی تێیدابەشدارن، بەبێ هەڵاواردن، چونکە خوای بەرز لەوسێ بوارەدا، بەڕەهایی باسی مرۆڤی کردەوە و، بەهیچ شتێکەوە بەندار (مقـيَّد)ی نەکردوە، بۆیەش:

هەرکام لەمرۆڤەکان لەوەچەی ئادەم: نێربێ یان مێ، بڕواداربێ یان کافر، پارێزکاربێ یان گوناهکار، بە:

جێنشینی خوا لەسەر زەوی و
هەڵگری سپاردەکەی و
دروستکراو لەباشترین شێوەدا
دادەنرێ.

ئنجا بێگومانیش پەیبردن بەم ڕاستییە، گەورەترین شوێنەواری لەسەر ئەهلی ئیسلام و ئیمان دەبێ، بۆ تەبایی و پێکەوە ژیانیان، لەگەڵ نامسوڵمانان دا هەرکەسێك بن، چونکە: چۆن بابای بڕوادار لەگەڵ جێنشینەکانی خوا لەسەر زەوی و، هەڵگرانی سپاردەکەی و، لەباشترین شێوەدا دروستکراوەکانی دا، تەبا و گونجاو و لێبوردەنابێ؟! کۆتایی ئەم باسەش بەفەرموودەیەکی پێغەمبەر دێنین، کە باشترین بەڵگەیە لەسەر نەبوونی جیاوازیی لەنێوان مسوڵمانان و نامسوڵمانان دا، لەڕووی ڕێزلێگیرانیان لەلایەن پەروەردگاریانەوە، لەبواری وەچەی ئادەم بوونیان و، بەجێنشین دانرانیانەوە لەسەر زەوی دا:

{إِنَّ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) مَرَّتْ بِهِ جَنَازَةٌ فَقَامَ، فَقِيلَ لَهُ: إِنَّهَا جَنَازَةُ يَهُودِيٍّ! فَقَالَ: أَلَيْسَتْ نَفْسًاً؟!} أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٢٣٨٩٣)، وَالبُخَارِيّ برقم: (١٢٥٠)، وَمُسْلِم برقم: (٢٢٦٩).

واتە: تەرمێکیان بەلای پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) هێنا، ئەویش لەبەری هەڵسا و ڕاوەستا، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا! ئەوە تەرمی جوولەکەیە! فەرمووی: ئەدی نەفس (مرۆڤ) نیە؟!

بەڵێ: بەشەرەکان هەموویان لەو ڕووەوە کە بەشەرن و، خوا لەباشترین شێوەدا دروستیکردوون و، کردوونیە جێنشین لەسەر زەوی و، سپاردەی خۆی پێ سپاردوون و، هەرچی لەئاسمانەکان و زەوی دا هەیە بۆی دەستەمۆکردوون: لەلایەن خواوە و، لەم ژیانە زەمینییە تاقیکرانەوەیەدا، بەزیندوویی و مردوویی ڕێزلێگیراون، پاشان لەڕۆژی قیامەت و لەمەنزڵگای سزا و پاداشت دا، پێگەی هەرکامێکیان بە بەرز ونزم و، سەروخوارەوە، دیاریی دەکرێ، بەگوێرەی ئەوە کە لە ئیمان یان کوفر، وە پارێزکاریی، یان گوناهکاری هەیانە، وەك خوای بەرز فەرموویەتی:

﴿كَلَّآ إِنَّ كِتَٰبَ ٱلْأَبْرَارِ لَفِى عِلِّيِّينَ ﴿١٨﴾﴾ المطففين -١٨-.

وە فەرموویەتی:

﴿كَلَّآ إِنَّ كِتَٰبَ ٱلْفُجَّارِ لَفِى سِجِّينٍ ﴿٧﴾﴾ المطففين -٧-.

## ٨- هەموو پێغەمبەران علیهم السلام بۆ چەسپاندنی دادگەریی هاتوون:

خوا تبارك وتعالى هەواڵی پێداوین، کە تێکڕای پێغەمبەرانی بەڕێز و ڕەوانەکراوانی مەزنی خۆی، بۆهێنانەدی دادگەریی لەنێوان خەڵك دا ناردوون، دادگەریی گشتگیر و تەواو لەهەموو حاڵان دا و، لەگەڵ تێکڕای خەڵك دا، وەك فەرموویەتی:

﴿لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِٱلْبَيِّنَٰتِ وَأَنزَلْنَا مَعَهُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْمِيزَانَ لِيَقُومَ ٱلنَّاسُ بِٱلْقِسْطِ﴾ الحديد -٢٥-.

وە فەرمانی بەپێغەمبەری خاتەمی و ڕەوانەکراوی مەزنی (محمد) کردوە کە بەخەڵکی ڕابگەیەنێ کە خوا فەرمانی پێکردوە: دادگەرییان لەنێوان دا بەرپابکات:

﴿فَلِذَٰلِكَ فَٱدْعُ ۖ وَٱسْتَقِمْ كَمَآ أُمِرْتَ ۖ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَهُمْ ۖ وَقُلْ ءَامَنتُ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ مِن كِتَٰبٍ ۖ وَأُمِرْتُ لِأَعْدِلَ بَيْنَكُمُ﴾ الشورى -١٥-.

هەروەها خوای کاربەجێ تبارك وتعالى فەرمانی بەبڕواداران کردوە، کە بەباشترین شێوە دادگەریی بەڕێوەبەرن:

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ كُونُوا۟ قَوَّٰمِينَ بِٱلْقِسْطِ شُهَدَآءَ لِلَّهِ وَلَوْ عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمْ أَوِ ٱلْوَٰلِدَيْنِ وَٱلْأَقْرَبِينَ ۚ إِن يَكُنْ غَنِيًّا أَوْ فَقِيرًا فَٱللَّهُ أَوْلَىٰ بِهِمَا ۖ فَلَا تَتَّبِعُوا۟ ٱلْهَوَىٰٓ أَن تَعْدِلُوا۟ ۚ وَإِن تَلْوُۥٓا۟ أَوْ تُعْرِضُوا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًا ﴿١٣٥﴾﴾ النساء -١٣٥-.

هەروەها خوای بەرز و مەزن بڕوادارانی ئاگادارکردۆتەوە، کە پەلکێشی ستەم و لادان نەکرێن و، خۆیان لە دوورکەوتنەوە لە دادگەریی بپارێزن، تەنانەت لەگەڵ دوژمنانیش دا و، بەهۆی ڕق لێبوونەوەیان بۆیان، لانەدەن:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُونُواْ قَوَّٰمِينَ لِلَّهِ شُهَدَآءَ بِٱلْقِسْطِ ۖ وَلَا يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَـَٔانُ قَوْمٍ عَلَىٰٓ أَلَّا تَعْدِلُواْ ۚ ٱعْدِلُواْ هُوَ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَىٰ ۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرٌۢ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴿٨﴾ ﴾ المائدة -٨-.

شایانی باسیشە كەواتای (قسط) و(عدْل)، یان وەك یەكن، یان زۆر لێك نیزیكن[1]، هەروەها مانای دادگەریی (عدل) و یەكسانیی (مُساواة)یش زۆر لێك نیزیك و تێكهەڵكێشن، (عدل) و (قِسط)یش ئاوا پێناسەكراوە:

(إعطـاءُ المَـرْءِ مـالَهُ وأَخْذُ مـاعـليه) [2]

یانی: مرۆڤ مافی خۆی وەربگرێ و مافی خەڵكیشی لێوەربگیرێ.

ئنجا خۆڕازاندنەوەی بڕوادارانیش بەو دادگەرییەی، كە سەرجەم پێغەمبەران و ڕەوانەكراوانی پێ نێرراون، لەمامەڵەی نێوخۆیان دا و لەگەڵ خەڵكیش دا، وە لەكاتی جەنگ وئاشتیی دا، هۆكارێكی زۆر گرنگ و بنەمایەكی پتەوە، بۆ چەسپاندنی تەبایی و ڕیزی دووسەرە و هاوكاریی و دەستباریی یەكدی گرتنی كۆمەڵگای ئیسلامیی، بەسەرجەم پێكهاتە و مەشرەبە زۆر و جۆراوجۆرەكانیەوە.

---

(١) وا پێدەچێت (قسط) زیاتر لایەنی ماددیی و بەرهەست و، (عدل)یش لایەنی مەعنەویی بگرێتەوە، ئەگەر لە سیاقێك دا پێكەوەبێن، بەڵام ئەگەر بەجیابێن، ماناكەیان گشتییە و هەردووك بواری ماددیی و مەعنەویی دەگرنەوە.

(٢) المعجم الوسیط، ص٥٨٨.

## ٩- تۆبزیی کردن و ناچارکردن نیە لەبواری بیروڕا و دیندارییدا:

ئەم ڕاستییەش بنەمایەکی دیکەیە، لەبنەمایەکانی تەبایی و پێکەوە ژیان، کە کتێبی خوا مسوڵمانانی پێوەپابەند دەکات، لەمامەڵەیان لەگەڵ نامسوڵمانان دا، لەنێو جوغزی کۆمەڵگای ئیسلامیی فرە پێکهاتەدا و، لەوبارەشەوە ئایەت زۆرن، بۆ نموونە:

١- ﴿لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِۖ قَد تَّبَيَّنَ ٱلرُّشۡدُ مِنَ ٱلۡغَيِّ ..﴾ البقرة -٢٥٦-.

کە سەرنجدانی هۆی هاتنەخوارەوەی ئەم ئایەتە بەپێزە، زۆرباش چەمکەکەیمان بۆ ڕوون دەبێتەوە:

{عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ كَانَتِ الْمَرْأَةُ تَكُونُ مِقْلَاتًا، فَتَجْعَلُ عَلَى نَفْسِهَا إِنْ عَاشَ لَهَا وَلَدٌ، أَنْ تُهَوِّدَهُ، فَلَمَّا أُجْلِيَتْ بَنُو النَّضِيرِ، كَانَ فِيهِمْ مِنْ أَبْنَاءِ الْأَنْصَارِ، فَقَالُوا: لَا نَدَعُ أَبْنَاءَنَا، فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ (لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِۖ قَد تَّبَيَّنَ ٱلرُّشۡدُ مِنَ ٱلۡغَيِّ )} أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُد برقم: (٢٦٨٢)، وَالنَّسَائِي فِي "الكبرى"برقم: (١١٠٤٩)، وَالبَيْهَقِيّ فِي (الكُبْرَى) برقم: (١٨٤١٩)، وَابْنُ حِبَّان برقم: (١٤٠) قال شعيب الأرنؤوط : إسناده صحيح على شرطهما.

واتە: جاری وا دەبوو ژنێك منداڵی بۆ نەدەژیا، ئنجا لەخۆی دەگرت، کە ئەگەر منداڵەکەی بژیەت، بیکاتە جوولەکە، ئنجا کاتێك (هۆزی) (بنو النضير) ئاوارەبوون، هەندێك لەکوڕەکانی پشتیوانانیان تێدابوون، گوتیان: لێناگەڕێین کوڕەکانمان لەگەڵیان بڕۆن، خوای بەرز وزاڵیش ئەم ئایەتەی ناردەخوارێ:

﴿لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِ ..﴾.

(مقلات)یش ژنێکە منداڵی بۆ ناژین، یان لەبەری دەچن، یان دوای ئەوەی سکێك دەكات، هیچ منداڵی دیكەی نابن[١].

كەواتە: دروست نیە زۆر لەنامسوڵمانان بكرێ، بۆ بڕواهێنان بەئاینیی هەقی خوا كە ئیسلامە، چونكە خوا تبارك وتعالی لەمسوڵمانانی پشتیوانی قەدەغەكردوە، گوشار لەو كوڕانەیان بكەن، كە بوونەتە جوولەكە - یان بوونەتە نەصرانیی، وەك لەهەندێك گێڕانەوەدا هاتوە - بەر لەهاتنی ئیسلام، كە بەزۆر پەلكێشی ئیسلامیان بكەن، چونكە ئاینیی هەقی خوا، بێنیازە لەوەی، كە بەزۆر لەسەر خەڵك فەرز بكرێ، بەڵگەنەویستیشە كە بابایەك ئیسلامی لەسەر فەرزبكرێ و بۆی ناچاربكرێ، بەوە نابێتە مسوڵمانێكی بڕوادار، بەڵكو لەكوفرێكی ئاشكراوە دەگوازرێتەوە بۆ كوفرێكی شێرراوە و، سەرەنجام دەبێتە مونافیق، دیارە مونافیقیش حاڵی لەكافری ڕواڵەتیی و ئاشكرا خراپترە، وەك خوای شارەزا فەرموویەتی:

﴿إِنَّ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ فِي ٱلدَّرۡكِ ٱلۡأَسۡفَلِ مِنَ ٱلنَّارِ..﴾ النساء -١٤٥-.

٢- ﴿وَلَوۡ شَآءَ رَبُّكَ لَأٓمَنَ مَن فِي ٱلۡأَرۡضِ كُلُّهُمۡ جَمِيعًاۚ أَفَأَنتَ تُكۡرِهُ ٱلنَّاسَ حَتَّىٰ يَكُونُواْ مُؤۡمِنِينَ ٩٩﴾ یونس -٩٩-.

ئەمەش یانی: خوای بەرز هەرچەندە بەس خۆی بەدیهێنەر و پەروەردگار و خاوەنی بەشەرە، بەڵام بەندەكانی خۆی ناچارنەكردوە، لەسەر ئەو ئیمانەی كە پەسندی كردوە، وە ئەگەر هاتبا و ناچاری كردبان، هەركەس كە لەسەر زەوییە بڕوای دێنا و، تەنانەت یەك دانەكافریش بوونی نەدەبوو، چونكە هیچ كام لەدروستكراوەكان، لەڕووی ویستی زاڵی بەسەر هەموو شتێك دا ناوەستێ.

---

(١) لباب النقول في أسباب النزول، للسيوطي، الحاشية ص٤٧ (المقلاة: أي منقطعةً لايعيش لها ولد، والقَلْت: الهلاَك).

وە بڕوانە: المعجم الوسيط ، من ٧٥٣ (المِقلات: التي لا يعيش لها ولد، والتي تَضَعُ واحداً ثم لاتحمل).

کەواتە: هیچ کەس بۆی نیە - هەرکەسێك بێ - تەنانەت ئەگەر پێغەمبەری کۆتایی و هەرەمەزنی خواش (صلى الله عليه وسلم) بێ کە زۆر لەخەڵك بکات بڕوابێنن، دوای ئەوەی بەدیهێنەری و پەروەردگاری کاربەجێیان سەرپشکی کردوون و، لەو بوارەدا دەستی کردوونەوە.

٣- ﴿لَّسْتَ عَلَيْهِم بِمُصَيْطِرٍ ﴿٢٢﴾﴾ الغاشية -٢٢-.

واتە: وە تۆ بەسەریان دا زاڵنی (کە ناچاریان بکەی بڕوابێنن).

٤- ﴿وَمَآ أَنتَ عَلَيْهِم بِجَبَّارٍ﴾ ق -٤٥-.

واتە: وە تۆ (ئەی موحەممەد!) بەسەریانەوە مل پێکەچکەرنی.

دیارە ئەو دوو ئایەتە ڕووی دواندن تێیان دا لە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) و، خوا سبحانه وتعالى بەڕوونیی ڕایدەگەیەنێ، کە بەهیچ جۆرێك توانای بەسەر دڵ و دەروونی خەڵك و ویست (إرادة)یان دانیە و، ناتوانێ ناچاریان بکات لەسەر ئیمان و ئیسلام، چونکە ئەرکی وی (صلى الله عليه وسلم) بەرانبەریان، بەس بیرخستنەوە و ئاگادارکردنەوەیە، وەك فەرموویەتی:

أ- ﴿فَذَكِّرْ إِنَّمَآ أَنتَ مُذَكِّرٌ ﴿٢١﴾ لَّسْتَ عَلَيْهِم بِمُصَيْطِرٍ ﴿٢٢﴾﴾ الغاشية -٢١، ٢٢-.

ب- ﴿وَمَآ أَنتَ عَلَيْهِم بِجَبَّارٍ فَذَكِّرْ بِٱلْقُرْءَانِ مَن يَخَافُ وَعِيدِ ﴿٤٥﴾﴾ ق -٤٥-.

کاریگەریی زانینی ئەم ڕاستییە قورئانییەش لەئەهلی ئیسلام دا، لەڕووی تەبایی و کرانەوەیانەوە لەگەڵ نامسوڵمانان دا، هێندە ڕوونە حەوجێی ڕوونکردنەوەی زیاترنیە.

## ١٠- بناغەی مامەڵەی مسوڵمانان لەگەڵ ئەوانی دیکەدا، ئاشتییە:

ئەم بۆچوونە ئەو ڕایەیە، کە لەلایەن لێکۆڵەرەوانی زانایانەوە، تەبەنیی کراوە و، ڕاجیایی بەشێك لەزانایانیش لەبارەی ئەم ڕاستییە درەوشاوەوە، زیانی نیە، چونکە چەندان ئایەت هەن، کە دەقن لەسەر ئەم ڕاستییە، یان ئاماژەی پێدەکەن، بۆ وێنە:

١- ﴿أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَاتَلُونَ بِأَنَّهُمْ ظُلِمُوا۟ ۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ نَصْرِهِمْ لَقَدِيرٌ ﴿٣٩﴾ ٱلَّذِينَ أُخْرِجُوا۟ مِن دِيَـٰرِهِم بِغَيْرِ حَقٍّ إِلَّآ أَن يَقُولُوا۟ رَبُّنَا ٱللَّهُ ۗ وَلَوْلَا دَفْعُ ٱللَّهِ ٱلنَّاسَ بَعْضَهُم بِبَعْضٍ لَّهُدِّمَتْ صَوَٰمِعُ وَبِيَعٌ وَصَلَوَٰتٌ وَمَسَـٰجِدُ يُذْكَرُ فِيهَا ٱسْمُ ٱللَّهِ كَثِيرًا ۗ وَلَيَنصُرَنَّ ٱللَّهُ مَن يَنصُرُهُۥٓ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَقَوِىٌّ عَزِيزٌ ﴿٤٠﴾﴾ الحج -٣٩، ٤٠-.

٢- ﴿وَقَـٰتِلُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ يُقَـٰتِلُونَكُمْ وَلَا تَعْتَدُوٓا۟ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْمُعْتَدِينَ ﴿١٩٠﴾﴾ البقرة -١٩٠-.

٣- ﴿وَإِن جَنَحُوا۟ لِلسَّلْمِ فَٱجْنَحْ لَهَا وَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٦١﴾﴾ الأنفال -٦١-.

٤- ﴿إِلَّا ٱلَّذِينَ يَصِلُونَ إِلَىٰ قَوْمٍۭ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُم مِّيثَـٰقٌ أَوْ جَآءُوكُمْ حَصِرَتْ صُدُورُهُمْ أَن يُقَـٰتِلُوكُمْ أَوْ يُقَـٰتِلُوا۟ قَوْمَهُمْ ۚ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَسَلَّطَهُمْ عَلَيْكُمْ فَلَقَـٰتَلُوكُمْ ۚ فَإِنِ ٱعْتَزَلُوكُمْ فَلَمْ يُقَـٰتِلُوكُمْ وَأَلْقَوْا۟ إِلَيْكُمُ ٱلسَّلَمَ فَمَا جَعَلَ ٱللَّهُ لَكُمْ عَلَيْهِمْ سَبِيلًا ﴿٩٠﴾﴾ النساء -٩٠.

ئەوەی لەم ئایەتانە دەفامرێتەوە -کە تەنیا چەند نموونەیەکن لەبواری خۆیان دا- ئەوەیە کە ئیسلام فەرمان بەمسوڵمانان دەکات، بەئاشتیی و دەست پاراستن لەهەرکەسێك کە لەدژیان ناجەنگێ و، دەستدرێژییان ناکاتەسەر، بەشێوەیەکی

ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ، وە جەنگ کردنیان لێ قەدەغەش دەکات، لەدژی کەسانێك کە دەستیان لێدەپارێزن و بێلایەنن، لەکافران، ئەوە هیچ کە لەسەریان پێویست ناکات!

بگرە خوای بەرز ومەزن فەرمان بەئەهلی ئیسلام دەکات، کە پەیمان و بەڵێن لەگەڵ ئەهلی کوفردا بپارێزن و نەیشکێنن، تەنانەت ئەگەر ئەو کۆمەڵە کافرە هاوپەیمانە، دەستدرێژییش بکەنە سەر کۆمەڵێك لە مسوڵمانانیش لەدەرەوەی چوارچێوەی دەوڵەتی ئیسلامیی دا، وەك خوای بەرز فەرموویەتی:

﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَلَمۡ يُهَاجِرُواْ مَا لَكُم مِّن وَلَٰيَتِهِم مِّن شَيۡءٍ حَتَّىٰ يُهَاجِرُواْۚ وَإِنِ ٱسۡتَنصَرُوكُمۡ فِي ٱلدِّينِ فَعَلَيۡكُمُ ٱلنَّصۡرُ إِلَّا عَلَىٰ قَوۡمِۭ بَيۡنَكُمۡ وَبَيۡنَهُم مِّيثَٰقٌۗ وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ بَصِيرٞ ﴿٧٢﴾﴾ الأنفال -٧٢-.

ئەمەش یانی: ئیسلام ئەوپەڕی سووربوونی هەیە لەسەر پاراستنی پەیمان و بەڵێنەکانی نێوان مسوڵمانان و نامسوڵمانان، کە مایەی تەبایی و ئاشتیی و صوڵحی نێوانیانن.

بەڵام ئەوانەی پێیان وایە کە بناغە لەپەیوەندیی نێوان مسوڵمانان و غەیری خۆیان دا، بریتیە لەجەنگ - کە ئەمە ڕایەکە لەگەڵ قورئان و سیرەی پێغەمبەری خاتەم داناکۆکە -، پێم وایە ئەوەی بۆتە هۆکاری تەبەننیی کردنیان بۆ ئەوڕایە، بریتیە لەواقیعی باوی ئەو ڕۆژگارە، کە جیهان لەو ڕۆژگارەدا بۆ مەنزڵگای ئیسلام و مەنزڵگای کوفر (دار الإسلام و دار الكفر) دابەشکرابوو، یان مەنزڵگای ئاشتیی و مەنزڵگای جەنگ (دارالسِّلم ودار الحرب)، ئاشکراشە کە زاراوەکانی: (دار الإسلام) و (دار الحرب) و هاووێنەکانیان، زانایان و شەرعزانان لەسەریان پێکهاتوون و دایانناون، بۆ وەسفکردن و پێناسەکردنی واقیعی سیاسیی ئەوساکە، کە لەدوو بەرەی ئیسلام و کوفر (جبهة الإسلام وجبهة الكفر) پێکهاتبوو! بەڵام بێگومان ئەو واقیعەی ئەوساکە گۆڕانێکی ڕیشەیی بەسەرداهاتوە و،

جیهانی ئێستاکە پێویستیی بەوەسف و پێناسەیەکی دیکەی گونجاو لەگەڵ واقیعی ئێستادا، دەکات.

بۆ وێنە دەڵێین:

ئەو کاتە مسوڵمانان لەو وڵاتانەدا کە بە: (دار الإسلام) یان (دار السلم) ناو دەبرێن، ئارام و هێمن و سەلامەت بوون، بەپێچەوانەی ئەو شوێنانەوە کە بە: (دار الکفر) و (دار الحرب)ەوە ناسرابوون، کە تێیان دا هەڕەشەلێکراو و ناهێمن بوون، بەڵام ئێستاکە حاڵەکە پێچەوانە بۆتەوە و، بابای مسوڵمان لەو وڵاتانەدا کە زۆربەی دانیشتوانیان کافرن - گەلێك جار- هەست بەسەلامەتیی و هێمنیی دەکات و، لەوڵاتانی مسوڵماننشین دا، ترس و بیم و نائارامیی دەچێژێ!

## ١١- چاکەکاریی، بناغەی هەڵس وکەوتی مسوڵمانانە لەگەڵ نامسوڵمانان دا:

ئەمیش بنەمایەکی دیکەی مەزنە، لەو بنەما قورئانییانەی، کە تەبایی و پێکەوە ژیان و هاوکاریی نێوان مسوڵمانان و نامسوڵمانانیان، لەنێو کۆمەڵگای ئیسلامیی دا لێ دەکەوێتەوە.

ئایەتی زۆریش لەوبارەوە هەن، کە بەڕاشکاویی، یان ئاماژە، ئەو ڕاستییە دەگەیەنن، لەوانە:

١- ﴿لَّا يَنْهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ لَمْ يُقَٰتِلُوكُمْ فِى ٱلدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم مِّن دِيَٰرِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوٓا۟ إِلَيْهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ ﴿٨﴾﴾ الممتحنة -٨-.

واتە: خوا ڕێگرییتان لێ ناکات، لەبارەی کەسانێکەوە کە لەسەر ئایین جەنگیان لەدژ نەکردوون و، لەماڵ و حاڵتان وەدەریان نەناون، کە چاکەیان لەگەڵ بکەن و پێیان ببەخشن، بێگومان خوا بەخشەرانی خۆشدەوێن.

هۆی هاتنی ئەم ئایەتەش بەم شێوەیە: (لاینهاكم الله..) ئەو سیاقەیە کە ئایەتەکان تێیدا دەدوێن و، ئەوهەل ومەرجەیە کە تێیدا هاتوونە خوارێ، کە بریتی بوو لەواقیعێکی پڕ شەڕ و کوشتار و بەربەرەکانێ لەنێوان مسوڵمانان و هاوبەشدانەران دا.

ئنجا جێی سەرنجە کە خوای زانا دوو وشەی بەکارهێناون بۆ ڕەنگڕشتنی چۆنیەتی هەڵس وکەوتی مسوڵمانان، لەگەڵ نامسوڵمانانێکی ئاشتیخوازدا، کە دژایەتیی دین و ژینی مسوڵمانان ناکەن: (لم يقاتلوكم في الدين ولم يخرجوكم من دياركم) ئەو دوو وشەیەش بریتین لە: (أن تبرُّوهم) و (تُقسطوا اليهم) ئنجا ئەگەر وشەی (تبرُّوهم) بەرجەستەکەری لایەنی مەعنەویی هەڵس وکەوتی مسوڵمانانە، لەگەڵ غەیری خۆیان دا، ئەوە وشەی ( وتُقسطوا اليهم) بەرجەستەکەری لایەنی ماددییەتی و، وشەی (إحسان)یش هەردووکیان دەگرێتەوە.

بۆیەش دەڵێین: (وتقسطوا اليهم) لایەنی ماددیی دەگەیەنێ، چونكە (أَقْسط إليه) یانی: (أعطاه قسطاً من ماله) بەشێك لەماڵ و سامانی خۆی دایە، بەڵام (أقسط) كە بۆخۆی (تَعدِّی) دەكات، بەمانای (عَدَلَ)یە.

بەڵگەشمان لەسەر ئەوە كە (تُقسطوا اليهم) لێرەدا یانی: هاوكاریی ماددییان بكەن و، بەشێك لەسامانی خۆتانیان پێبدەن، ئەوەیە كە:

یـەك: ئەوە مانای: (أَقسط اليه)یەو وشەی (أقسط) ئەگەر بۆخۆی بەركار (مفعول) بخوازێ، بەمانای (عَدَل)یە، بەڵام ئەگەر بە (إلى) (تَعدِّي) بكات بەمانای پێیدا (أعطى)یە[1].

دوو: ڕستەی: (لاينهاكم الله..) ڕێمان لێدەگرێ كە بڵێین: (تُقْسطوا اليهم) لێرەدا بەمانا: لەگەڵیان دادگەربن (تعدلوا معهم)ە، چونكە بێگومان دادگەریی لەگەڵ كردن، هەرگیز و هیچ كاتێك قەدەغەكراو (منهيٌّ عنه) نابێ، بەڵكو هەردەم و بەردەوام فەرمان پێكراو (مأمُورٌ به)ە، لەگەڵ نیزیك و دوور و دۆست و دوژمن دا، وەك خوای بەرز فەرموویەتی:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُونُواْ قَوَّٰمِينَ لِلَّهِ شُهَدَآءَ بِٱلۡقِسۡطِۖ وَلَا يَجۡرِمَنَّكُمۡ شَنَـَٔانُ قَوۡمٍ عَلَىٰٓ أَلَّا تَعۡدِلُواْۚ ٱعۡدِلُواْ هُوَ أَقۡرَبُ لِلتَّقۡوَىٰۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرُۢ بِمَا تَعۡمَلُونَ ٨ ﴾ المائدة -٨-.

ئنجا ئاشكراشە كە چەمكی پێچەوانە (مفهوم المخالفة)ی ڕستەی: (لا ينهاكم الله عن الذين لم يقاتلكم) ئەگەر دامانناا، كە (تُقسطوا اليهم) بەمانای (تعدلوا معهم)ە، ئەوكات چەمكی پێچەوانەكەی ئاوادەبێ: (لكنَّ الله ينهاكم عن الذين قاتلوكم فـي الذين وأخرجوكم من دياركم أن تبرّوهم وتقسطوا اليهم) یانی: [بەڵام خوا ڕێگرییتان لێ دەكات، كە چاكەكار و دادگەربن لەگەڵ كەسانێك دا كە لەسەر ئایین لەدژتان دەجەنگن و، لەماڵ و حاڵتان دەرتان دەكەن] بەڵام وەك گوتمان: هەرگیز دادگەربوون ڕێ لێگیرا و قەدەغە نیە، لەگەڵ هیچ

---

(١) بڕوانە: مفردات ألفاظ القرآن، راغب الأصفهاني، ص ٦٧٠.

كەس و لە هیچ حاڵان دا!

٢- ﴿وَأَحۡسِنُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ١٩٥﴾ البقرة -١٩٥-.

٣- ﴿وَقُولُواْ لِلنَّاسِ حُسۡنٗا﴾ البقرة -٨٣-.

وەك دەبینین خوا عزوجل بەگشتی فەرمانی بەچاكەكاریی (إحسان) كردوە، بەقسە و كردەوەوە، وە تایبەتی نەكردوە بەخەڵكێكی دیاریكراوەوە - وەك مسوڵمان - كەواتە:

لەسەر مسوڵمانان پێویستە كە بەقسە و كردەوە لەگەڵ هەموو خەڵكی دا چاكەكار بن ئایین و بیروڕایان هەرچیەك بێ.

٤- ﴿وَإِذَا حُيِّيتُم بِتَحِيَّةٖ فَحَيُّواْ بِأَحۡسَنَ مِنۡهَآ أَوۡ رُدُّوهَآۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٍ حَسِيبًا ٨٦﴾ النساء -٨٦-.

ئەم ئایەتە موبارەكەش مانایەكەی زۆر ڕوونە، كە مسوڵمانان فەرمانیان پێكراوە: سڵاوی هەركەسێك بستێننەوە، كە سڵاویان لێدەكات، بەباشتر لەخۆی، یان وەك خۆی، ئنجا ئەو سڵاوكەرە هەركەسێك بێ، مسوڵمان، یان نامسوڵمان.

**ئێستاش باگوێ لەقسەی هەندێك لەتوێژەرەوان، لەبارەی تەفسیری ئەم ئایەتەوە، بگرین:**

أ- **(القرطبي) گوتوویەتی:** (واختلف في رَدِّ المسلم على أهل الذمَّة، هل هو واجب كالردّ على المسلمين؟ واليه ذهب ابن عباس والشَّعبـيُّ وقتادة، تمسُّكاً بعموم الآية وبالأمر بالردِّ في صحيح السنة)[١]

واتە: وە ڕاجیایی هەیە لەبارەی وەڵامدانەوەی مسوڵمان بۆ سڵاوی خاوەن پەیمانان، ئایا وەك هی مسوڵمانان فەرزە؟ ئەوە ڕای (ابن عباس)و (شعبي) و (قتادة)یە، بەبەڵگەی چەمكی گشتی ئایەتەكە و، فەرمانكردنی سوننەتی ڕاستیش بەوەڵامدانەوەی سڵاو.

---

(١) الجامع لأحكام القرآن، ج٥ ص٢٦٦.

ب- (عَنِ الشَّعْبـيِّ مِنْ أَئِمَّة السَّلَف، أَنَّهُ قَالَ لِنَصْرَانِيٍّ سَلَّم عليه: عَلَيْكَ السَّلاَم وَرَحْمَةُ اللهِ تَعَالَـى، قِيلَ لَهُ فِـي ذَلِكَ، فَقَالَ: أَلَيْسَت فِـي رَحْمَةِ اللهِ يَعِيش؟)[1]

له (شعبي) گێڕراوەتەوە، كە وەڵامی سڵاوكردنی نەصرانییەك دا گوتوویەتی: سەلام و ڕەحمەتی خوای بەرزت لێ بێ، ئنجا كە لەوبارەوە پرسیاری لێكراوە گوتوویەتی: ئەدی ئەوەنیە لەبەزەیی خوادا دەژی؟!

**ج- (جمال الدين القاسمي)یش لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا گوتوویەتی:**

( واستدلَّ بها الجمهور على ردِّ السلام على كل مُسَلِّمٍ، مسلماً كان أو كافراً، لكن مختلفان فـي صيغة الردِّ )[2]

واتە: ئەم ئایەتە زۆربەی زانایان بەبەڵگەیان هێناوەتەوە، كە دەبێ وەڵامی سڵاوی هەر سڵاوكەرێك بدرێتەوە، مسوڵمانی بێ یان كافر، بەڵام چۆنیەتییەكەیان جیاواز دەبێ.

**وە لەبەر ڕۆشنایی ئەم ئایەتەدا دەتوانین بڵێین:**

دەبێ مسوڵمانان لەخۆیانی نەوەشێننەوە، كە لەبواری مامەڵەدا ئاستیان لەهی غەیری خۆیان نزمتربێ، چونكە مسوڵمانان: خاوەنی ئیمان و عەقیدەی ڕاست و، جیهانبینی بەرز و، دڵی پاك و، عەقڵی ڕووناك و.. هتدن، بۆیە لێیان ناوەشێتەوە كە لەغەیری خۆیان سیفەت بەرزتر و، ئاكار پەسەندتر و، هەڵوێست جوانتر نەبن! بەڵێ، لەسەر مسوڵمانان پێویستە، ڕازی نەبن و لێ نەگەڕێن كە غەیری خۆیان لەبواری هەڵس وكەوت دا، لەوان بەڕێزتر وچاكتربن، بۆ ئەوەی لەئاستی بەرزی ئایینە ڕاست و تێر و تەواوەكەی خۆیان دابن.

---

(١) تفسير القرآن الحكيم، محمد رشيد رضا، ج٥ص١٦٩.

(٢) محاسن التأويل، ج٥ص٢٣٧.

**١٢- هاوكاریی و دەستبارگرتن لەگەڵ هەركەسێك دا، كە بۆهێنانەدی بەرژەوەندییە گشتییەكان و ئامانجە هاوبەشەكان تێدەكۆشێ:**

دەتوانین زۆر بەڵگان لەسەر ڕاستیی ئەم بنەمایە بێنینەوە، بەڵام بەیەكێكیان واز دێنین، كە ئەم ئایەتە موبارەكە دەیگرێتە خۆی:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُحِلُّواْ شَعَٰٓئِرَ ٱللَّهِ وَلَا ٱلشَّهۡرَ ٱلۡحَرَامَ وَلَا ٱلۡهَدۡيَ وَلَا ٱلۡقَلَٰٓئِدَ وَلَآ ءَآمِّينَ ٱلۡبَيۡتَ ٱلۡحَرَامَ يَبۡتَغُونَ فَضۡلٗا مِّن رَّبِّهِمۡ وَرِضۡوَٰنٗاۚ وَإِذَا حَلَلۡتُمۡ فَٱصۡطَادُواْۚ وَلَا يَجۡرِمَنَّكُمۡ شَنَـَٔانُ قَوۡمٍ أَن صَدُّوكُمۡ عَنِ ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِ أَن تَعۡتَدُواْۘ وَتَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلۡبِرِّ وَٱلتَّقۡوَىٰۖ وَلَا تَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلۡإِثۡمِ وَٱلۡعُدۡوَٰنِۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۖ إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ ﴿٢﴾ ﴾ المائدة -٢-.

دیارە شوێنی بەئامانج گیراو لەم ئایەتە موبارەكەدا، ئەم ڕستەیەیە:

﴿ وَتَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلۡبِرِّ وَٱلتَّقۡوَىٰۖ وَلَا تَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلۡإِثۡمِ وَٱلۡعُدۡوَٰنِۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۖ إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ ﴿٢﴾ ﴾.

واتە: وە لەسەر چاكەكاریی و پارێزكاریی، پێكەوە هاوكاربن و، لەسەر گوناهو دەستدرێژیی هاوكاریی یەكدی مەكەن، وە پارێز لەخوا بكەن، بەدڵنیایی خوا سزایەكەی توندە.

چونكە ئەم ڕستەیە كە [فەرمانی خوای بۆ بڕواداران بەهاوكاریی یەكدی كردن لەسەر چاكە و پارێز و، هاوكاریی یەكدی نەكردن، لەسەر گوناهو سنوورشكێنیی] گرتۆتە خۆی، لەسیاقێك دا، هاتوە كە دەربارەی هاوبەش بۆخوا دانەرانێك دەدوێ، كە پێشتر مسوڵمانانیان لەمزگەوتی حەرام قەدەغە دەكرد و دەیانگێڕانەوە، ئنجا خوا سبحانە وتعالی بڕوادارانی دەسترۆیشتوو و باڵادەست دەدوێنێ و پێیان دەفەرموێ:

زیاندان لە دروشمەکانی خوا وەك: مانگی حەڕام و، ئاژەڵی ئامادەکراو و، گەردن بەند لەمل کراو بۆ قوربانیی، بۆخۆتان ڕەوا مەکەن، هەروەها ڕێگریی لەحاجیان و عومرەکارانی بەئامانجکەری سەردانی مزگەوتی حەڕام، مەکەن و بەبیانووی ڕێگریی کردنی پێشتریان لێتان، کە سەردانی مزگەوتی حەڕام بکەن، دەستدرێژییان مەکەنەسەر، پاشان خوا دەفەرمووێ: ﴿وَتَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلۡبِرِّ وَٱلتَّقۡوَىٰ﴾ ئاشکراشە کە وشەی: ﴿وَتَعَاوَنُواْ﴾ کە لەسەر کێشی (تفاعل) هاتوە، هاوبەشێتیی (مشارکة) دەگەیەنێ، ئنجا بەپێی سیاقیش دیارە، کە مەبەست پێی هاوبەشێتیی مسوڵمانان و هاوبەشدانەرانە، لەئەنجامدانی هەرکار و پرۆژەیەك دا، کە بەچاکەکاریی و پارێزکاریی دادەنرێ، هەڵبەتە (ٱلۡبِرِّ)یش هەر شتێکە بۆ خەڵك مایەی خێر و سوود بێ، وە (تقوى)ش هەر شتێکە هۆکاری لەخواوە نیزیك کەوتن بێ.

پاشان خوا بڕواداران لەبەشدارییکردن لەهەر شتێك دا قەدەغە دەکات، کە پێچەوانەی چاکەکاریی و پارێزکاریی بێ، کە ئەوانیش بەگشتی(ٱلۡإِثۡمِ) و (وَٱلۡعُدۡوَٰنِ)ن، چونکە گوناهکاریی (إثـم) دژی پارێزکاریی (تقوى) و، دەستدرێژیی (عدوان)یش، دژی چاکەکاریی (بِرّ)ە.

وە لەکۆتاییدا خوای زاڵی کاربەجێ ئەهلی ئیمان وریا دەکاتەوە لە کەمتەرخەمیی نواندن لەهاوکاریی کردن دا، لەسەر چاکەکاریی و پارێزکاریی و، گیرۆدەبوون لەبەشداریی کردن لەگوناه و دەستدرێژیی داو، دەفەرمویٌ:

﴿.. وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۖ إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ ٢﴾.

**ئنجا بینا لەسەر ئەوە، کە ڕابرد:**

لەسەر مسوڵمانان پێویستە کە هاوکار و دەستباری هەر کەس و لایەنێك بن کە هەوڵی خێر و چاکە دەدەن، بۆ ئەنجامدانی هەرکارێك کە مایەی سوود و بەهرەی خەڵك و، جێگای ڕەزامەندیی خوای بەرز و مەزن بێ، ئنجا ئەو لایەنە خاوەنی هەر ئایین و بەرنامەیەك بن و، هەرپاشخان (خَلْفيّة)ێکی فیکریی و سیاسییان هەبێ.

بگرە پێویستە ئەهلی ئیسلام هەردەم پێشڕەو دەستپێشخەربن، لەهەموو بوار و مەیدانێکی خێر و چاکسازیی دا.

ئنجا بەڵگەنەویستیشە کە خۆڕازاندنەوەی مسوڵمانان، بەم خەسڵەتە گەورە و بەرزە، وایان لێدەکات کە بەرانبەر بەخەڵکی دیکە (نامسوڵمانان) کراوەبن و، بۆ هێنانەدی ئەو بەرژەوەندییە گشتی و ئامانجە گرنگانەی کە ڕاوەستان و گەشەکردنی کۆمەڵگا پەکی لەسەریان کەوتوە، دەستی هاوکاریی و دەستبارگرتنیان بۆ درێژبکەن.

## ١٣- ئیسلام تاکە ئایینی پەسندکراوی لای خوای بەرزە بۆ تێکڕای بەشەر، بۆیە دەبێ سێبەرەکەی هەموو خەڵکی بگرێتەوە:

ئەم ڕاستییەش گەلێك ئایەتی موبارەکی قورئان درەوشاندوویانەتەوە، بۆ وێنە:

١- ﴿ إِنَّ ٱلدِّينَ عِندَ ٱللَّهِ ٱلۡإِسۡلَٰمُ .. ﴾ آل عمران -١٩-.

٢- ﴿ وَمَن يَبۡتَغِ غَيۡرَ ٱلۡإِسۡلَٰمِ دِينٗا فَلَن يُقۡبَلَ مِنۡهُ وَهُوَ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ ٨٥ ﴾ آل عمران -٨٥-.

٣- ﴿ .. ٱلۡيَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ دِينَكُمۡ وَأَتۡمَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ نِعۡمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلۡإِسۡلَٰمَ دِينٗا .. ﴾ المائدة -٣-.

بەڵێ، ئەوە کە ئیسلام تاکە ئایینی پەسندکراوی خوای بەرزە بۆ تێکڕای بەشەر، وە ئەوە کە خوا عزوجل جگە لەئیسلام، شوێنکەوتنی هیچ ئایین و بەرنامەیەکی دیکە لەخەڵك قبووڵ ناکات، وە ئەوە کە خوا ئیسلامی وەك ئایین و بەرنامەی تێر وتەواوی خۆی پێناسەکردوە، هەموو ئەوانە خوازیاری ئەوەن، کە ئیسلام توانای لەبن سێبەری خۆدا حەواندنەوە و، جێکردنەوەی هەموو بەشەری هەبێ، لەمیانەی ئەو قەوارە سیاسییەدا کە لەسەر کۆی گۆی زەوی، یان بەشێکی سەرزەمین، بنیاتی دەنێ.

هەڵبەتە دەرککردنی ئەم ڕاستییەش وا لەمسوڵمانان دەکات، کە سینەفراوان بن و لەبازنەی کۆمەڵگا و قەوارە سیاسییەکەیان دا، بەهیچ مرۆڤێك سەغڵەت نەبن، ئایین و بیروڕای هەرچییەك بێ.

**ئنجا ڕەنگە لێرەدا پرسیار و ئیشکالێك لەهەندێك بیروزەنیان دا سەرهەڵبدات:**

ئایا قەناعەت و بڕوای مسوڵمانان بەوە، کە ئایینەکەیان تاکە بەرنامەی هەق و پەسندی لای خوای زانا و توانایە و، لەدوا ڕۆژدا جگە لەو، هیچ ئایین و بەرنامەیەکی دیکە قبووڵ ناکرێ و، شوێنکەوتوانی سەرجەم ئایین و

بەرنامەکانی دیکە بەزیانبار دادەنرێن، نابێتە مایەی دەمارگیریی و داخراویی مسوڵمانان، لەجیاتی تەبایی و کرانەوەیان؟!

دەڵێین: نەخێر، چونکە:

ئەو ئایین و بەرنامە هەق و تێروتەواوەی کە خوا لەڕۆژی دواییدا، جگە لەوی قبووڵ ناکات، بۆخۆی ڕێ بەبوون و پەیڕەویی لێکرانی بەرنامە و ئایینەکانی دیکە دەدات، لەم ژیانە دنیاییە تاقیکرانەوەیەدا، وە ئازادیی تەواو بەشوێنکەوتوانیان دەدات، کەپێیانەوە پابەند بن و جێ بەجێیان بکەن، ئەمەش وەك ڕۆژی ڕوون دیارە، بەتایبەت لەسوڕەتی (الکافرون)دا، کە خوا تێیدا فەرموویەتی:

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿قُلۡ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡكَٰفِرُونَ ۝١ لَآ أَعۡبُدُ مَا تَعۡبُدُونَ ۝٢ وَلَآ أَنتُمۡ عَٰبِدُونَ مَآ أَعۡبُدُ ۝٣ وَلَآ أَنَا۠ عَابِدٞ مَّا عَبَدتُّمۡ ۝٤ وَلَآ أَنتُمۡ عَٰبِدُونَ مَآ أَعۡبُدُ ۝٥ لَكُمۡ دِينُكُمۡ وَلِيَ دِينِ ۝٦﴾ الکافرون -١، ٦-.

چونکە وەك دەبینین خوا عزوجل لەم سووڕەتە مبارەکەدا، فەرمان بەپێغەمبەری خاتەمی خۆی (صلی الله علیه وسلم) دەکات، کە کافرەکان بەتێکڕایی بدوێنێ - بەبەڵگەی ئەلیف و لام (أل)ی سەر (الکافرون) کە سەرجەم تاکەکانیان دەگرێتەوە - بەهەر پێنج جۆرەکانیانەوە:

بێ دینەکان (الملحدون) و خاوەن کتێبەکان (أهل الکتاب) و هاوبەشدانەرەکان (المشرکون) و دەغەڵەکان (المنافقون) و هەڵگەڕاوەکان (المرتّدون)، وە دووریی خۆی و حاشالێکردنی لەپەرستراوەکانیان، ڕابگەیەنێ، وەك چۆن ئەوان لەپەرستراوی هەقی وی، سبحانه وتعالی دوورن، وە لەکۆتایی دا پێیان بفەرموێ:
(لَكُمۡ دِينُكُمۡ وَلِيَ دِينِ) ئاینیی خۆتان بۆخۆتان و، ئاینیی خۆم بۆخۆم.

ئەمەش یانی: ئایینی هەقی خوا، مافی بوون بەتێکڕای ئایین و بەرنامە بەتاڵەکانی کافران - کەبڕوایان پێیانە - دەدات، بەهەموو جۆرەکانیانەوە.

هەڵبەتە كاتێكیش سەرنجی مێژووی سێزدە سەدەیی مسوڵمانان دەدەین - كەتەمەنی دەوڵەت و قەوارە سیاسییە فراوانەكەیانە - هاتنەدی و بەرجەستەبوونی ئەو مەبدەئە مەزنە لەسەر ئەرزی واقیع، وەك ڕۆژی ڕوون دەبینین، چونكە سەرجەم خاوەن ئایین و بیرۆكە جۆرا و جۆرەكان بەڕێز و حورمەت و دڵنیایی و ماف و ئازادیی پارێزرانەوە، لەنێو كۆمەڵگای ئیسلامیی بەرفراوان و دەوڵەتی ئیسلامیی سنووركراوەدا، ژیاون.

## ١٤- خوای بەرز و مەزن ڕەوانەکراوی هەرە مەزنی خۆی و پێغەمبەری کۆتایی خۆی، بەڕەحمەت بۆ هەموو جیهانییان ناردوە:

وەك خوای تاك و پاك فەرموویەتی:

﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا رَحۡمَةً لِّلۡعَٰلَمِينَ ١٠٧﴾ الأنبياء-١٠٧-

واتە: تۆمان تەنیا بەڕەحمەت بۆ جیهانییان ڕەوانەکردوە.

هەروەها پێغەمبەری کۆتایی لە پێناسەی خۆیدا فەرموویەتی:

{إِنِّي لَمْ أُبْعَثْ لَعَّانًا، وَإِنَّمَا بُعِثْتُ رَحْمَةً} أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ برقم: (٢٥٩٩).

واتە: بە دڵنیاییەوە من بەنەفرین نەنێرراوم، بەڵکو بەڕەحمەت نێرراوم.

هەروەها فەرموویەتی:

{إِنَّمَا أَنَا رَحْمَةٌ مُهْدَاةٌ} أَخْرَجَهُ الحَاكِم برقم: (١٠٠) وَقَالَ: صَحِيح عَلَى شَرْطِهِمَا، وَالبَيْهَقِي فِي "شُعَبِ الإِيْمَان" برقم: (١٤٠٤)، والدارمي برقم: (١٥)، قَالَ حُسين سَليم أَسد: إِسْنَادُهُ صَحِيحٌ، وَلَكِنهُ مُرْسَلٌ.

واتە: بێگومان من بەزەییەکی خەڵات کراوم.

درەوشاوەشە، کە بەزەیی بەرجەستەبووی خوا، پێغەمبەری خاتەم و ڕەوانەکراوی هەرە بەڕێزی خوا (صلی الله علیه وسلم)، خوازیاری ئەوەیە کە بەشێوەیەك لەشێوەکان، سەرجەم جیهانییان لێی بەهرەمەندبن، ئەمەش بەر لەهەرشتێك یانی: دەبێ خەڵك بەگشتی بتوانن ژیانێکی ئازادانەی بەختەوەرانەی پڕ حورمەت و ڕێز بگوزەرێنن، لەژێر سایەی قەوارە سیاسییەکەی دا، کە ئەو ئایینە هەق و ڕێبازە ڕاستەی پێغەمبەری کۆتایی بەڕەحمەت نێرراو، هێناویەتی، تەبەنیی کردوە.

ئنجا بینا لەسەر ئەوەی ڕابرد: شوێنکەوتوانی پێغەمبەری خوا موحەممەد (صلی الله علیه وسلم) هەست دەکەن و لەسەر خۆیانی بەپێویست دەزانن، کە

تەبا و گونجاو و کراوەبن، لەگەڵ هەموو خەڵك دا، هەر ئایینێکیان هەبێ، هەروەها بەئەرکی سەرشانیانی دەزانن، کە لەنێو کۆمەڵگا و قەوارەی ئیسلامیی دا زەمینەی سوودمەندکردن و بەختەوەرکردنی غەیری خۆیان سازبکەن، تاکو ڕەحمەت بوونی پێغەمبەر بۆ خەڵك و جیهانییان بەگشتی، بەرجەستەببێ.

دیارە کۆمەڵگا و قەوارەی ئیسلامییش ناوونیشانی پێغەمبەری خاتەم (صلى الله عليه وسلم) ﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا رَحۡمَةٗ لِّلۡعَٰلَمِينَ ١٠٧﴾ بەرجەستە ناکەن، تاکو سەرجەم خەڵك بەمسوڵمان و نامسوڵمانەوە، لەژیانێکی ئازادانەی پڕحورمەت و ڕێزی شایستەی مرۆڤی جێنشینی خوا لەسەر زەوی دا، یەکسان نەکات.

کەواتە: ڕەحمەتی خوابوونی پێغەمبەری هەرە مەزنی خوا بۆ جیهانییان، یەکی دیکەیە لەبنەما گرنگەکانی تەبایی و پێکەوە ژیان، کە قورئانی بەپێز بۆ بەشەری هێناون، تاکو کۆمەڵگایەکانی خۆیان لەسەر دابمەزرێنێ و سەرەنجام، لەژیانێکی بەختەوەرانەی باڵادا بەهرەمەندبێ و، هەرکام لەتاکەکانی هەست بەبوون و ڕێز و کەسایەتیی خۆی بکات و، بەبێ لەبەرچاوگرتن و تێخوێندنەوەی ئایین و عەقیدە و فیکری، سەرجەم ماف و ئازادییەکانی بەتەواویی بۆدابین بکرێن.

## ١٥- هێنانەدی حەوت بەرژەوەندییە گەورەکان بۆسەرجەم هاووڵاتییان:

هەندێك لەزانایان زاراوەی پێنج شتە پێویستەکان (الضروريات الخمس) و هەندێکیان شەش شتە پێویستەکان (الضروريات السِّت)یان بەکارهێناوە، بەڵام من زاراوەی: حەوت بەرژەوەندییە گەورەکان ( المصالح السَبع الكبرى)م بەباشترزانی، بۆ کۆی ئەو شتە پێویستانەی کە ژیانی کۆمەڵگا رێك و راست نابێ، بەبێ دەستەبەرکرانیان بۆ هەموو پێکهاتەکانی و بگرە یەك یەکی ئەندامانیشی.

**ئەو حەوت بەرژەوەندییە گەورە، یان حەوت شتە گشتی و پێویستانەش، ئەمانەن:**

**١- پاراستنی ئایین** (حفظ الدّين):

وەك خوای بەرز و بێ وێنە فەرموویەتی:

﴿ لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِۖ ﴾ البقرة -٢٥٦-.
واتە: تۆبزیی کردن لەئایین دا نیە.

وە فەرموویەتی: ﴿ لَكُمۡ دِينُكُمۡ وَلِيَ دِينِ ٦ ﴾ الكافرون -٦-،
واتە: ئایینی خۆتان بۆخۆتان و، ئایینی خۆم بۆخۆم.

کەواتە: کاتێك ئیسلام حوکم و دەسەڵاتی دەبێ، مافی دینداریی بەجیاوازیی ئایین و رێڕەو و مەشرەبە فیکریی و سیاسییەکانیانەوە، بۆ هەموو خەڵکی دەستەبەر دەکات.

**٢- پاراستنی ژیان** (حفظ الحياة):

خوای بەرز و مەزن بۆ پاراستنی ژیانی خەڵك و دەستەبەرکردنی سەلامەتییان، فەرموویەتی:

أ- ﴿ وَلَكُمۡ فِي ٱلۡقِصَاصِ حَيَوٰةٞ يَٰٓأُوْلِي ٱلۡأَلۡبَٰبِ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ ١٧٩ ﴾ البقرة -١٧٩-.

واتە: وە ئەی خاوەن عەقڵینە! لەتۆڵەدا ژیان بۆ ئێوە هەیە، بەڵکو پارێزبکەن (لەکوشتنی بەناهەق).

ب- ﴿ وَكَتَبْنَا عَلَيْهِمْ فِيهَآ أَنَّ ٱلنَّفْسَ بِٱلنَّفْسِ وَٱلْعَيْنَ بِٱلْعَيْنِ وَٱلْأَنفَ بِٱلْأَنفِ وَٱلْأُذُنَ بِٱلْأُذُنِ وَٱلسِّنَّ بِٱلسِّنِّ وَٱلْجُرُوحَ قِصَاصٌ ۚ فَمَن تَصَدَّقَ بِهِۦ فَهُوَ كَفَّارَةٌ لَّهُۥ ۚ وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّـٰلِمُونَ ﴾ المائدة -٤٥-.

واتە: وە لەوێ (تەورات)دا لەسەرمان نووسیبوون، کە نەفس بەنەفس (دەکوژرێتەوە) وە چاو لەتۆڵەی چاو (دا کوێر دەکرێتەوە) وە لووت بەلووت و گوێ بەگوێ و ددان بەددان، وە برینەکانیش تۆڵەیان تێدایە، وە هەرکەس مافەکەی خۆی کردە خێر و بەخشی، ئەوە بۆی دەبێتە کەففارەت، وە هەرکەس حوکم بەو (بەرنامە)ە نەکات، کە خوا ناردوویەتە خوار، ئائەوانەن ستەمکاران.

شایانی باسیشە بەهۆی ئەوەوە، کە هەرکام لە ئایەتی ژمارە (١٧٩)ی (البقرة) و ئایەتی ژمارە (٤٥)ی (المائدة) لەسیاقێکی گشتی دا هاتوون، چەمك و حوکمەکەشیان گشتگیرە، بۆ هەموو کەسێك کە خاوەن ژیان و نەفس و ئەندامانە و، تایبەت نین بەمسوڵمانانەوە.

### ٣- سەلامەتیی و پاراستنی عەقڵ و هۆش (سلامة وصيانة العقل):

بەمەبەستی سەلامەتیی و پارێزگاری لێکردنی عەقڵ و هۆشی خەڵك، خوای زانا و شارەزا (جلَّ وعلا) هەموو سەرخۆشکەر و هۆش لابەرەکانی بەهەموو جۆرەکانیانەوە:

خوراو (مأكول) و خوراوە (مشروب) و بۆنکراو (مشموم) و لەخۆدراو (مَزرْوق)، قەدەغەکردوون، وەك خوا فەرموویەتی:

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِنَّمَا ٱلْخَمْرُ وَٱلْمَيْسِرُ وَٱلْأَنصَابُ وَٱلْأَزْلَـٰمُ رِجْسٌ مِّنْ عَمَلِ ٱلشَّيْطَـٰنِ فَٱجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٩٠﴾ ﴾ المائدة -٩٠-.

واتە: ئەی بڕوادارینە! بێگومان مەی و قومار و نەصەبەكان و زەلەمەكان پیسن لەكردەوەی شەیتانن، دەجا خۆتانیان لێ دووربگرن، بەڵكو سەرفرازبن.

هەڵبەتە (خَمْـر)یش كە لە كوردیی دا (مـەی) و (شـەڕاب)ی پێدەڵێن، هەرشتێكە كە عەقڵ و هۆش لابەرێ و مرۆڤ سەرخۆش بكات، وەك خاوەنی (مختار الصِّحاح) گوتوویەتی[1]. ئنجا قەدەغەبوونی (خَمْر)یش بەس خواردن و هەڵمژین و لەخۆدانی ماددە سڕكەرەكان ناگرێتەوە، بەڵكو وێڕای ئەوە، هەرجۆرە مامەڵەیەكی دیكەش دەگرێتەوە، وەك:

دروستكردن و كڕین و فرۆشتن و هەڵگرتن و گواستنەوە و. هتد.

**٤- سەلامەتیی و پاراستنی وەچە (سلامـة النسل وصونـه):**

بەمەبەستی سەلامەتیی و پاراستنی وەچە (نَسْل)ش، خوا زینای قەدەغەكردوە و لێدانی سەد (١٠٠) قامچی (جَلْدَة)ی كردوە بەسزای بكەرانی لەنێر ومێ، وەك خوای دادگەر عزوجل فەرموویەتی:

﴿ ٱلزَّانِيَةُ وَٱلزَّانِي فَٱجْلِدُواْ كُلَّ وَٰحِدٍ مِّنْهُمَا مِاْئَةَ جَلْدَةٍ.. ﴾ النور -٢-.

واتە: وە ئافرەتی زیناكەر و پیاوی زیناكەر، یەكی سەد قامچییان لێبدەن (وەك سزادانی دنیایی).

**٥- پاراستنی هێمنیی و ئاسایش (حفظ الأمن):**

وە خوای كاربەجێ و زاڵ، بۆ پاراستنی هێمنیی و ئاسایشی خەڵك و كۆمەڵگا، سزایەكی توندی داناوە، بۆ هەركەسێك كە لەڕووی: جەستەیی، دارایی، سیاسیی، مەعنەوییەوە، دەبێتە مایەی تێكدانی ژیان و گوزەرانی خەڵك؟ وەك خوا فەرموویەتی:

﴿ إِنَّمَا جَزَٰٓؤُاْ ٱلَّذِينَ يُحَارِبُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَسْعَوْنَ فِي ٱلْأَرْضِ فَسَادًا أَن يُقَتَّلُوٓاْ

---

(١) ص١٨٩، لفظ: خ م ر.

﴿أَوۡ يُصَلَّبُوٓاْ أَوۡ تُقَطَّعَ أَيۡدِيهِمۡ وَأَرۡجُلُهُم مِّنۡ خِلَٰفٍ أَوۡ يُنفَوۡاْ مِنَ ٱلۡأَرۡضِۚ ذَٰلِكَ لَهُمۡ خِزۡيٞ فِي ٱلدُّنۡيَاۖ وَلَهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ ٣٣﴾ المائدة -٣٣-.

واتە: بێگومان سزای کەسانێك، کە جەنگ لەدژی خوا و پێغەمبەرەکەی دەکەن، وە بۆ خراپە و ئاشووب لەزەوی دا تێدەکۆشن، ئەوەیە کە: بکوژرێن، یان هەڵبواسرێن، یان دەست و پێیان ڕاست و چەپ ببڕدرێ، یان لەزەوی دا دووربخرێنەوە، ئا ئەو (سزا)یە زەبوونییە بۆیان لەدنیادا و، لەدوارۆژیش دا ئازارێکی مەزنیان هەیە.

وە بەپێی ڕای زۆربەی زانایان، ئەو چوار سزایە بەگوێرەی تاوانی ئەنجامدرا و، بەسەر تاوانبارانی تێکدەری هێمنیی و ئاسایشی کۆمەڵگادا، جێ بەجێ دەکرێن، بەم جۆرە:

١- ئەگەر خەڵکیان کوشتبێ و ماڵ و سامانیان نەستاندبێ، دەکوژرێن.

٢- وە ئەگەر وێڕای کوشتن، ماڵ و سامانیشیان ستاندبێ، هەڵدەواسرێن.

٣- وە ئەگەر ماڵ و سامانیان ستاندبێ و کەسیان نەکوشتبێ، دەست و پێیان ڕاست و چەپ دەبڕرێن (دەستی ڕاست و پێی چەپ).

٤- وە ئەگەر بەس خەڵکیان ترساندبێ و، کوشتار و ڕاو و ڕووتیان نەکردبێ، تەنیا نەفی دەکرێن و دوور دەخرێنەوە[١].

**٦- پاراستنی ئابڕوو** (صيانة العِرض):

وە بۆ پارێزگاریی لێکردنی ئابڕوو و کەرامەتی خەڵك، خوای بەرز سزای لێدانی هەشتا قامچیی (ضرب ثمانين سوطاً)ی داناوە بۆ هەرکەسێك کە ئابڕوو سومعەی خەڵك لەکەدار دەکات و، تۆمەتی زینایان بۆ هەڵدەبەستێ، پیاوبن یان

---

(١) لەبەرگی حەوتەمی کتێبی: (الإسلام كما يتجلى في كتاب الله تعالى)دا بەدرێژیی باسی ئەو بابەتەمان کردوە.

ئافرەت، وەك خوای بەرز فەرموویەتی:

﴿ وَٱلَّذِينَ يَرۡمُونَ ٱلۡمُحۡصَنَٰتِ ثُمَّ لَمۡ يَأۡتُواْ بِأَرۡبَعَةِ شُهَدَآءَ فَٱجۡلِدُوهُمۡ ثَمَٰنِينَ جَلۡدَةً وَلَا تَقۡبَلُواْ لَهُمۡ شَهَٰدَةً أَبَدًاۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ ﴿٤﴾ ﴾ النور -٤-.

واتە: وە کەسانێك کە تۆمەتی زینا بۆ ئافرەتانی پاك و پارێزراو هەڵدەبەستن، ئەوەیە کە هەشتا قامچییان لێبدەن، وە هەرگیز شایەدییان لێوەرمەگرن، وە ئائەوانەن لارێیان.

دیارە دەشگونجێ قەوارەی سیاسی، سزای تەمبێ کردن (تعزیر)ی پڕ بەپێست بۆ هەرکەسێك دابنێ، کە تۆمەتی خراپ - جگە لەزینا - بۆ خەڵك هەڵدەبەستێ، هەر تۆمەتێك کە مایەی لەکەدارکردنی خەڵك و ڕووشاندنی سومعەیان بێ.

**٧- پاراستنی ماڵ و سامانی خەڵك** (حفظ أموال الناس وممتلكاتهم):

خوای زاڵی کاربەجێ سزای بڕینی دەستی دزی - پیاوبێ یان ئافرەت - داناوە، تاکو پەرژینێك بێ، بۆ پاراستنی ماڵ و سامانی خەڵك، وەك فەرموویەتی:

﴿ وَٱلسَّارِقُ وَٱلسَّارِقَةُ فَٱقۡطَعُوٓاْ أَيۡدِيَهُمَا جَزَآءَۢ بِمَا كَسَبَا نَكَٰلٗا مِّنَ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٞ ﴿٣٨﴾ ﴾ المائدة -٣٨-.

واتە: وە دەستەکانی پیاوی دز و ئافرەتی دز ببڕن، وەك سزایەك لەخواوە و بۆ پرینگاندنەوە، وە خوا زاڵی کاربەجێیە.

دیارە بۆ جێ بەجێ کردنی سزای دزیی و سەرجەم سزا شەرعییەکانی دیکەش چەند مەرجێك هەن، پێویستە بێنەدی، ئەگەرنا دروست نیە جێ بەجێ بکرێن و بەرپا بکرێن.

ڕوونکردنەوەی ئەم بابەتەش حەوجێی شوێنێکی دیکەیە.

شایانی باسیشە کە مامەڵەکردن لەگەڵ نامسوڵمانان دا، لەبوارەکانی دیکەی، جگەلە سزا تاوانییەکان (العقوبات الجنائية) دا، لەنێویشیان دا بواری باری

کەسێتیی (الأحوال الشخصية)، بەگوێرەی ئەو ئایین و بەرنامانەیان دەبێ کە بڕوایان پێیانە، مەگەر خۆیان حەزبکەن بگەڕێنەوە بۆ دادگا ئیسلامییەکان (المحاكم الإسلامية) وە بەبڕیارەکانیان ڕازی بن و پێیانەوە پابەندبن، وەك خوای بەرز ومەزن فەرموویەتی:

﴿... فَإِن جَآءُوكَ فَٱحۡكُم بَيۡنَهُمۡ أَوۡ أَعۡرِضۡ عَنۡهُمۡۖ وَإِن تُعۡرِضۡ عَنۡهُمۡ فَلَن يَضُرُّوكَ شَيۡـٔٗاۖ وَإِنۡ حَكَمۡتَ فَٱحۡكُم بَيۡنَهُم بِٱلۡقِسۡطِۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُقۡسِطِينَ ٤٢﴾ المائدة -٤٢-.

واتە: ئنجا هەرکات (خاوەن کتێبەکان و نامسوڵمانان بەگشتی بەمەبەستی چارەسەری کێشەکانیان، بۆ دادوەریی کردن) هاتنەلات، دادوەرییان لەبەین دا بکە، یان پشتگوێیان بخە، وە ئەگەر پشتگوێیان بخەی، هیچ زیانێکت لێ نادەن، وە ئەگەر دادوەرییشیت کرد، دادگەرانە دادوەرییان لەنێوان دا بکە، بێگومان خوا دادگەرانی خۆشدەوێن.

ئنجا بەدڵنیاییەوە کۆمەڵگایەك، کە ئەو حەوت بەرژەوەندییە گەورەی تێدا دەپارێزرێن:

ئایین و ژیان و عەقڵ و وەچە و ئاساییش و ئابڕوو و سامان، کۆمەڵگایەکە شایستەی ئەوەیە کە دەستبار بۆ یەکدی گرتن لەنێو خۆیدا بێنێتەدی و، پێکەوە تەبا و گونجا وبێ و بتوانێ هەردەم لەگەشەکردن و بەرەوپێشچوون دابێ.

# بنچینەیەکی کۆکەرەوە:

لەکۆتاییش دا دەڵێم:

بنچینەیەکی پێغەمبەرایەتیی (قاعدة نبوية) هەیە، کەسەرجەم شەرعزانان لەبواری مامەڵەکردن لەگەڵ نامسوڵمانان دا، تەبەنییان کردوە، وە سەرجەم ئەو پازدە بنەمایەی ڕابردن، دەگرێتەخۆی و لەخۆیدا کۆیان دەکاتەوە، ئەویش ئەوەیە کەدەفەرموێ:

[لهم مالَنا، وعليهم ما علينا][1]

واتە: ئەوان (نامسوڵمانان) هەمان مافیان هەیە، کە ئێمە هەمانە، وە هەمان ئەرکیان لەسەرشانە، کە لەسەرشانی ئێمەیە.

هەڵبەتە بەگوێرەی ئەم بنچینەیەی پێغەمبەریش، هاووڵاتییانی نێو کۆمەڵگا و دەوڵەتی ئیسلامیی، هەموو ئەو مافانەیان هەن کە مسوڵمانان هەیانن، وە هەمان ئەو ئەرکانەی کە لەسەر مسوڵمانان پێویستن، لەسەروانیش پێویستن، جگە لەو ماف و ئەرکانەی، کە بەتایبەتمەندیی ئایینی هەرکامێکیانن، ئەوە بەنسبەت هەردووك لایانەوە:

مسوڵمانان و نامسوڵمانان، لەو بنچینەگشتییە هەڵاوێراون و هەرکامێکیان لە مسوڵمانان و نامسوڵمانان ئازاد و سەربەستن لە پاراستنی تایبەتمەندییەکانی خۆیان دا.

---

(١) بڕوانە: مجموعة الوثائق السياسية للعهد النبوي والخلافة الراشدة، محمد حميدالله، ص١٨٩،١٨٨ الوثيقتا رقم: ٩٦،٩٧ [نسختان لمكتوب النبى (صلى الله عليه وسلم) الى نجران].
تێبینی: لەپەڕاوێزی ژمارە (٨٠)دا و لەبەشی سێیەمی سێیەم ئاڵقەی سێیەم دا، تەواوی ئەو دەقەمان - کەجێی مەبەست بووە - هێناوە.

# ئـەم ئاڵقـەیە

خـوێـنـەرە خۆشەویستەکانم!

ئەم ئاڵقەیەش وەك هاوەڵەكانی، لەئەسڵدا وتارێك بووە لەکۆڕێك دا دراوە، کە لەسلێمانی بەستراوە لەهۆڵی (ڕۆشنبیریی)دا ڕۆژی: ١ شعبان ١٤٢٣ك بەرانبەر: ٢٠٠٢/١/٧زدا، لەژێر ناوونیشانی: ( مافەکانی مرۆڤ لەنێوان ئیسلام و ڕۆژئاوادا ).

شایانی باسیشە مافەکانی مرۆڤ، پێوەر و سەنگی مەحەکی هەر ئایین و بەرنامەیەکن، شەریعەتی بێ هەڵەی خوای تاك و پاکیش، بەجۆرێك ماف و ئازادییەکانی بەرجەستەکردوون، لەکاتێك دا کە جێبەجێکراوە، مەگەر بەخەون و خەیاڵ، ئەگەرنا هیچ بەرنامەیەك هەرتۆزێ ڕێیەشی نەشکاندوە.

هەڵبەتە هەر ئەوەش لەئایین و بەرنامەیەك چاوەڕێ دەکرێ، کە خوای خاوەنی ناوە هەرەبەرزەکان و سیفەتە هەرە پەسندەکان، ناردوویەتی، ئاخر دەبێ کێ لەبەدیهێنەر و پەروەردگاری بەندەکان، بەرانبەر بەبەندەکانی بەخشندەتر و بەبەزەیی تربێ؟! وە لەسەر دابینکردنی مافەکانیان سوورتر و، بۆ پاراستنی ڕێز و حورمەتیان بەمشوورتر و، لەسەر بەختەوەرکردنیان، بەتواناتربێ؟!

بەڵام گرنگ ئەوەیە کە ئێمەی مسوڵمان، باش لەئایین و بەناوی خوا تێبگەین و، هەوڵیش بدەین چاك پێوەی پابەندبین و تێیدا پێبگەین.

# دەســـتپێك

الحمد لله، والصلاة والسلام على رسول الله،
محمد وآله وصحبه ومن اهتدى بهداه

**بەخێر هاتنی گەرمی هەموو لایەك دەكەم و، خۆشحاڵم بەبەشداریی هەموو بەڕێزان: خوشكان و برایان.**

بــەڕێــزان!

بێگومان بەڕێزترین دروستكراو لە ڕوانگەی ئیسلامەوە، كە لەم سەر زەوییە هەبێت و، ناوازەترین و پایەدارترین دروستكراو كەلە بوونەوەردا هەبێت و، خوای پەوەردگار بەكۆمەڵێك تایبەتمەندییەوە خولّقاندبێتی، كەلەهیچ كام لە دروستكراوەكانی دیكەدا نین، مرۆڤە.

جا لەم سەردەم و ڕۆژگارەی ئێمەدا، كە ئینسانییەت زۆر هۆشیار بۆتەوە، وە لەزۆر لایەن و بواری ژیان و ژیاردا بەرەو پێشەوە چووە، یەكێك لەو بابەتانەی كەهەموو لایەك لەسەری یەك دەنگن و جەختی لەسەر دەكەن، بریتیە لە دابینكردنی مافەكانی ئینسان، بەڵام بەداخەوە كە لەبەرانبەر تێروانینی ئیسلام و هەڵوێستی ئیسلامدا بۆمافەكانی مرۆڤ، لێڵیی و تارمایی بەرچاوی خەڵكێكی زۆری گرتوە، تەنانەت كەسانێك هەن، كە تۆمەتی ئەوە دەدەنە پاڵ ئیسلام، كە ڕێز لە ئینسان ناگرێ، وەگوێ بەمافەكانیشی نادات!! بەڵام وەك ڕوونی دەكەینەوە، ئەو ڕێزو پایەو مەقامە بەرزەی كە ئیسلام بۆ ئینسانی داناوە، وە ئەو مافانە

کەهەوڵ دەدات بۆ ئینسانەکانیان دابین بکات، بەهەموو دین و فیکرەو، بەهەموو شێوەو ڕەنگ و زمانەکانیانەوە، ئا ئەو ڕێزو پایەو مەقامەو، ئەو مافە بەرزو ناوازانە، لە ژێر سایەی هیچ بەرنامەیەکی دیکەدا، چنگ ئینسان ناکەون.

ئنجا شتێکی نکوولْیی لێ نەکراوە، بۆ هەرکەسێك کە ویژدانێکی ساغ و عەقڵێکی سەلیمی هەبێ، کە ڕێز لەئینسان گرتن، وە دابینکردنی ئەو مافانەی کە بەبێ ئەوان، ناتوانێ ژیانێکی ئینسانانە بەسەر بەرێ، ئەوە سەنگی مەحەکە بۆ هەڵسەنگاندنی هەر بەرنامەیەك و هەر بیرو بڕوایەك، وە هەر بەرنامەیەك و هەر سیستەمێك بەئەندازەی ئەوە سەرکەوتوو دەبێ، بۆ بەختەوەر کردنی ئینسان، وە بەرەو پێش بردنی ژیان، کەڕێز لەئینسان دەگرێ.

**شایانی باسیشە کە ئێمە ئەم بابەتەمان لە دوو بەشی سەرەکییدا پێشکەش دەکەین:**

لەبەشی یەکەم و لەخاڵی یەکەمدا، دەمانەوێ بزانین، کە سەرەتا ڕۆژئاواو ئەوروپا، چۆن جموجۆڵی داواکردنی مافەکانی مرۆڤی دەست پێکردو، بەچەند قۆناغدا تێپەڕی، وە پاشان لەخاڵی دووەمدا چەند تێبینیی و سەرنجێکی خۆمان لەسەر تێڕوانینی ڕۆژ ئاواییانە بۆ مافی مرۆڤ دەخەینەڕوو.

لەبەشی دوومیشیدا دێینەسەر: هەڵوێستی ئیسلام لەبەرانبەر مافەکانی مرۆڤ و، لەخاڵی یەکەمدا ڕوونی دەکەینەوە، داخۆ بنەماکانی شەریعەت لە تێرڕوانینیدا بۆ مافی مرۆڤ، چین؟!، وەپاشان لەخاڵی دووەمدا مافەکانی مرۆڤ لەسایەی شەریعەتدا باس دەکەین و، دەیخەینە ڕوو، کە چۆن دابین دەکرێن؟

## باسی یەکەم: سەرنجێکی مێژوویی لەبارەی جووڵانەوەی داواکردنی مافەکانی مرۆڤەوە:

با سەرنجێکی مێژوویی لەسەرهەڵدانی جووڵانەوەی مافەکانی مرۆڤ لە ڕۆژئاوادا بدەین، ئایا ڕۆژئاوا لەکەیەوە توانی هەمووی یەك دەنگ بێ لەسەر ئەوە، کەمافەکانی مرۆڤ دابین بکرێن؟ ئایا هەر لەسەرەتاوە ئەو فیکرەو بۆچوونەی هەبوو، یان دوای کۆمەڵێك هەوڵ و تەقەللاو شۆڕش و زەحمەتکێشان، بەوە گەیشتن؟!!

گەلانی ڕۆژئاوا لەسەدەکانی نێوەڕاستدا وەك میللەت و جەماوەر خاوەنی هیچ هەق و مافێك نەبوون لە بەرانبەر حوکمڕانەکاندا، ئەوە شتێکە لەهەموو کتێبەکانی مێژوودا ڕوون و ئاشکرایە، لە بەر ئەوەی کە ئیمپڕاتۆرەکان وەقەیسەرو پادشایەکانی ڕۆم - واتە هەموو وڵاتانی ڕۆژئاوا، بەئەمەریکاشەوە - لەسەر بناغەی: (مافی خوایی - الحق الإلهي) حوکمڕانییان دەکرد.

وە سیستەمی (ثیۆکڕاسیی / الثیوقراطیة) کەلەبەرانبەر (دیموکراسی) دایە، (دیموکراسی): واتە: حوکمی گەل، (ثیۆکڕاسیی) واتە: حوکمی خوا، لەڕاستیدا هەڵقوڵاوی ڕۆژئاوایە، وە لەسەدەکانی نێوەڕاستدا، پادشاو دەستەڵاتدارانی ڕۆژئاوا هەموویان بەبێ جیاوازیی، لەسەر ئەو بناغەیە حوکمیان دەکرد بەسەر میللەت و خەڵك و جەماوەریاندا، کە: هەرکام لە پاپاو ئیمپراتۆڕەکان خۆیان بەسێبەرو نوێنەری خوا دەزانی لەسەر زەوی و پێیان وابوو میللەت هەقی هەڵبژاردن و ڕەخنەی نیە! ئنجا ئەوەی کەماڵی میللەتی زیاتر وێران کردبوو، وە قوڕەکەی زیاتر بۆ خەست کردبوو، ئەوەبوو کەدام و دەزگای کڵێسا، کەچینی ئەکلیروس (طبقة الأكليروس) یان پێ دەگوتن، واتە: پیاوانی ئایین (رجال الدين) - کە وەك جارانی دیکەش باسمان کردوە: زاراوەی [ پیاوانی ئایین ] هیچ پەیوەندییەکی بەئیسلامەوەنیە، چونکە لەئیسلامدا هەموو پیاوان، دەبێ پیاوانی ئایین بن و، هەر کەسێك بڕوای بەدین هەبێ، دەبێ پیاوی دین بێ،

وە زانایانی ئایین، کۆمەڵێکی دیاریکراوو تایبەت نین لەنێو مسوڵماناندا - بەڵێ، ئنجا ئەوەی قوڕەکەی خەستتر کردبوو، ئەوە بوو کەپیاوانی کڵێسا لەو مەسەلەیەدا کە حوکمڕانەکان بەحەقێکی خوایی حوکم بەسەر میللەتدا دەکەن و، میللەت هیچ حەقی هەڵبژاردنی نیە، وە حەقی ڕەخنە گرتنی نیە، وەتەنانەت حەقی ئامۆژگاریی کردن و تێبینی و پێشنیار خستنەڕووشی نیە، (پیاوانی ئایین)ش لەگەڵ پیاوانی دنیاییدا، پیاوانی کڵێسالەگەڵ قەیسەرو پادشاو دەستەڵاتدارەکاندا، لەوەدا هاوفیکرو هاودەست بوون، بەواتایەکی دی: شەریکە دز بوون بەیەکەوە!!

وە هەردووکیان بۆ میللەت و جەماوەر بووبوونە ملۆزم، یەکیان بەناوی سیاسەت و حوکمەوە، یەکیشیان بە ناوی دین و دینداریی کڵێساوە، میللەتیان لە تەنگژە نابوو، تەنگیان بەخەڵك هەڵچنیبوو، پشوویان پێ سوارکردبوو، وە هیچ کەسێك مافی نەبوو کە ڕەخنە لەسیستەمی حوکم بگرێ، دیارە سیستەمەکانی حوکمڕانی ئەوکاتەش، تێکڕا سیستەمی تاکڕەوانەو دیکتاتۆریی بوون!

ئا لە بـــارودۆخ و کەش و هەوایەکی ئاوادا[1]، خەڵك و جەماوەر وردە وردە جموجۆڵیان تێکەوت، چونکە خوای بەدیهێنەر ئیسنانەکانی وا خوڵقاندوون بەفیطرەت، وە بەویژدانی ساغیان، وە بەعەقڵی سەلیمیان، هەست بەحەق و ناحەق و، زوڵم و عەدل و، چاك و خراپ، دەکەن، ئنجا خەڵك و جەماوەر وردەوردە دەستیان کرد بە بێزاریی و ناڕەزایی دەربڕین، وە فەیلەسووف و حەکیمەکان و نووسەرو بلیمەتەکان، بوونە پێشڕەوو سەرقافڵەی خەڵك و میللەت، هەتا ئەوە بوو، کەچەند شۆڕشێك ڕوویاندا - هەرچەند ئێستادەرفەتمان نیە بەدرێژیی باسیان بکەین-، لەساڵی (١٧٧٦)ز لەئەمەریکا شۆڕشێك ڕوویدا، بۆ سەربەخۆیی وەدەستهێنان بۆ ئەمەریکا، کەئەوکاتە ئەمەریکا (مستعمرة)ی ئینگلیزەکان بوو، ئەوەبوو شۆڕشیان کردو داوای سەربەخۆییان کرد، کەهیچی دیکە لە ژێر نیری ئیمپراتۆری بەریتانیی (الأمبراطورية البريطانية)دا نەمێننەوە، وە هاوکات

---

(١) وەك لەکۆڕێکی دواتردا، لەباسی (سیکولاریزم - علمانية) دا، باسمان کردوە.

لەگەڵ ئەوە شۆڕشیان کرد دژی جیاوازیی ڕەگەزیی، جیاوازیی ڕەنگ، چونکەکۆمەڵگای ئەمەریکیی ئەوکاتە زۆری ڕەش پێست بوو، وە ڕەنگی دیکەی هەبوو و بەشێکیشی سپی پێست بوو.

وە پاشان لە ساڵی (١٧٨٩ز)دا شۆڕشی ناوداری فەڕەنسا ڕوویدا، کە یەکێك لە دروشمەکانیان ئەوەبوو دەیانگوت: بەڕیخۆڵەی دوایین قەشە، دوایین پادشای ستەمکار لەسێدارە بدەن،واتە هەردووکیان بەیەکەوە لەگۆڕ بنین.

ئاشکراشە خەڵکێکی ژێر چەپۆك و چەوسێندراوە، دوای ئەوەی لەزیندان (سجن) ڕزگاری دەبێ، یەکەمین شتێك کە بیری لێدەکاتەوە، بریتیە لەئازادیی، وەك لەکوردەواریی خۆماندا گوتراوە: (ئەگەر لەبرسی بپرسی: (٢+٢) چەند دەکات؟ دەڵێ: دەکاتە چوار کولێرە)، یان عارەب گوتوویانە:

(صاحب الحاجة أعمى إلا عن حاجته)

واتە: ئەوەی پێویستییەکی هەبێت، تەنیا پێویستییەکەی خۆی دەبینێ، ئاگای لەهیچی دیکە نیە.

ئنجا کاتێك خەڵکی ڕۆژئاوا، کە لە ژێر نیری هەردووك تاغووتی بەناو دینیی و دونیایی، ئیمپڕاتۆرەکان و پاپایەکان، ڕزگاریانبوو، یەکەمین هاوار کە لێیان بەرز بۆوە، ئەوەبوو کە داوای ئازادییان کرد، ئازادیی چی؟! ئازادیی بیرکردنەوەو بیروڕا دەربڕین، ئازادیی عەقیدە، ئازادیی شەخسیی، ئازادیی کۆمەڵایەتیی، ئازادیی ئابووریی، ئازادیی سیاسیی، تا کۆتایی.

**ئنجا ئەگەر تەماشای ڕەوتی جووڵانەوەی مافی مرۆڤ بکەین لەڕۆژئاوا، دەتوانین لەم چەند بڕگەیەدا، بەکورتیی پوختی بکەینەوە:**

١- پێشتر باسمان کرد، کە لەساڵی (١٧٧٦ز)دا لە ئەمەریکا شۆڕشی سەربەخۆیی لە دژی دەستەڵاتی بەریتانیی ڕاگەیەنرا، وە شۆڕشەکە سەری گرت، ئەمەریکییەکان سەربەخۆییان وەدەست هێنا، پیاوێك بەناوی (تۆما جیفرسۆن) وەسیقەیەکی نووسی بەناوی: [ڕاگەیاندنی مافەکانی مرۆڤ (إعلان حقوق الانسان)] وە ئەو

وەسیقەیە، دوایی ڕەسمییەتی پێدراو ڕاگەیەندرا، کەهەم مەسەلەی سەربەخۆیی سیاسی گرتبۆخۆی، هەم ئازادیی کۆمەڵایەتیی و یەکسانیی کۆمەڵایەتیی.

٢- وە لەساڵی (١٧٩١ز)دا کەفەرەنسا شۆڕشی کردو، یەکێك لە شیعارەکانی بریتی بوو لە داواکردنی مافەکانی مرۆڤ، دواتر دەستووری بۆ وڵاتەکەی خستەڕوو، چونکەهیچ وڵاتێك بەبێ ڕێسا (دەستور)ێك بەڕێوەناچێ، ئەگەرنا هەرکەسە لەخۆیەوە بە ئارەزوو و میزاجی خۆی قانوون دادەنێ، بۆیە دەبێ دەستوورێك هەبێ، واتە قانوونێکی ئەساسی هەبێ و پشتی پێ ببەسترێ بۆ هەڵهێنجرانی یاسایەکانی دیکە، ئەوکاتە ئەو وەسیقەیە، کە دەربارەی مافەکای مرۆڤ، زانای فەرەنسیی (ئەمانۆئێل جوزیف) نووسیبووی، ئەویش لەگەڵ دەستووری فەرەنسییدا، ڕەسمییەتیی پێدراو ئیعلان کرا.

٣- وە لەسەدەی نۆزدەهەمدا زۆربەی هەرە زۆری دەوڵەتانی ڕۆژئاوا، دانیان بەمافەکانی مرۆڤداهێنا، بەڵام هەتا ئەوکاتە مەسەلەی مافەکانی مرۆڤ تەنها کاروبارێکی نێو خۆیی بوو، نەبوو بوو بەشتێکی نێو دەوڵەتیی.

٤- جەنگی جیهانی یەکەم، کە لە ١٩١٤ تا ١٩١٨ ڕوویدا، هەر لەنێو دەوڵەتانی ڕۆژئاوادا خۆیان بوو، بەڵام پریشکی ئاگرەکە وڵاتانی ئیسلامییشی گرتەوە، پاشان جەنگی جیهانی دووەم ڕوویداو، لە (١٩٣٩ز) تا (١٩٤٦ز) درێژەی کێشا، وە زیاتر لەپەنجا ملیۆن (٥٠,٠٠٠,٠٠٠) کەس تێیدا کوژران، ئەوە مەینەتییەکی گەورە بوو بەسەر مرۆڤایەتی هات، بۆیە کۆمەڵێك خەڵکی زاناو بیر تیژو خێرخواز بۆ مرۆڤایەتیی کۆبوونەوە، کەپێشتریش هەر قسەیان کردبوو، لە (١٩٤٥) شتێکیان گەڵاڵە کردبوو، ئەوە بوو لە (١٩٤٨/١٢/١٠ز) دا ئەو (وثیقة) یەی کە دوایی بە (جاڕنامەی گەردوونیی مافەی مرۆڤ / الإعلان العالمي عن حقوق الإنسان) ناسراوە، ئیعلان کرا [کەدوایی تێبینییەکانی خۆمانی لەسەر دەخەینەڕوو] کەلەڕاستیدا لەبواری دابین کردن و داواکردنی مافەکانی مرۆڤدا، دەتوانین بڵێین: باشترین هەنگاو بوو، وە باشترین دەستکەوت بوو، ئەوە بوو کەلەلایەن (ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان / منظمة الأمم المتحدة)، وە

ڕاگەیاندرا، کەدیارە نەتەوە یەکگرتووەکانی ئێستا، میراتگری کۆمەڵەی گەلان (عصبة الأمم)ی کاتی خۆیەتی، کەلە سۆنگەی ئەوە وە، کە فەشەلی هێنا لەوەدا، کە بتوانێت مەسەلەی جەنگ و ئاشتیی نێو دەوڵەتان کۆنترۆڵ بکات و کێشەکانیان چارەسەر بکات، هەڵوەشێنرایەوەو (ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان) دروست کراو جێی گرتەوە، کەئەویش ئێستا خەریکن فەشەلی پێ بهێنن، کە هەندێك لە زلهێزەکان، بەتایبەت ئەمەریکا، هێندە فشاری دەخەنە سەر، خەریکن لەنێوەڕۆك (محتوى)ی خۆی خاڵیی دەکەنەوە، ئەگەر بەکردەیی (فعلي)ش خاڵی نەکرابێتەوە و، نەکرابێت بەپەردە (غطاء)یەك بۆ جێبەجێکردنی بڕیاری هەندێك لەزلهێزەکان بەتایبەتی ئەمەریکا، بەڵێ، لەساڵی (١٩٤٨)دا بەڕەسمیی (جاڕنامەی گەردوونیی مافەکانی مرۆڤ) ڕاگەیەندرا.

٥- وە لە (١٩٧٦/١٢/١٦ز)دا (نەتەوە یەکگرتووەکان) دوو ڕێککەوتننامە (اتفاقية)ی دیکەی کردن بەهاوپێچ و، وەك شەرح و تەفسیرو پاشکۆی: (جاڕنامەی گەردوونیی مافەکانی مرۆڤ) بەناوی (مافە مەدەنییەکان و سیاسییەکان/ الحقوق المدنية والسياسية)وە (مافە ئابووریی و کۆمەڵایەتیی و کلتوورییەکان/ الحقوق الإقتصادية والإجتماعية والثقافية)، وە لە (١٩٧٧/١/١٣)دا، وڵاتانی نێو ڕێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکان، لەسەر ئەوە ڕێککەوتن کە ئەو دوو (اتفاقية) لەگەڵ ئەسڵی جاڕنامە گەردوونییەکەدا جێبەجێ بکرێن، وە دەبێ داوا لە دەوڵەتان بکرێ، پێیانەوە پابەند بن.

٦- وە لەکۆتایی حەفتایەکان دا، لەسەردەمی حوکمڕانیی (جیمی کارتەر)دا، ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا دەستیکرد بەجەختکردنی زیاتر لەسەر مافەکانی مرۆڤ، دیارە مافەکانی مرۆڤ بەتێگەیشتن (فهم)ی ڕۆژئاوا، وە داواکردن و جەخت لەسەرکردنی مافەکانی مرۆڤیش بەمیکانیزمی ئەمەریکیی، کەئێستا شوێنەواری دەبینین! کە ئەگەر لە شوێنێك بە ڕقدابچن، بیانووی پێ دەگرن، کەبۆچی مافەکانی مرۆڤ جێبەجێناکات؟ شوێنێکیش کەلێی ڕازی بن، چاوی لێدەپۆشن، وەك سیاسەتێکی باو، کە پێی دەگوترێ: (بانێکەو دووهەوا) یاخود (الكيل بمكيالين).

وەلەوکاتەوە ئەمەریکا دەستیکرد بەدۆسیە (ملف) کردنەوە بۆ دەوڵەتان، هەرکام لەدەوڵەتان، ئەگەر بێت و مافەکانی مرۆڤ ڕەچاو نەکات و ڕێز لەمرۆڤەکان نەگرێ و، مافەکانیان دابین نەکات، وەك گوتم ئەمەریکا بەپێی بەرژەوەندیی خۆی، بیانووی پێ دەگرت، ئەگەر بەرژەوەندیی تێدابا، یاخود چاوپۆشیی لێدەکرد، ئەگەر بەرژەوەندیی لەچاویۆشییکردندا بوایە.

٧- وە سەرەنجام دوای هەرەسهێنانی یەکیەتی سۆڤیەتی پێشوو، لەساڵی (١٩٩١ز)دا، وە هاتنەکایەی دەستەڵاتی یەك جەمسەریی (سلطة القطب الواحد) واتە: ئەوەی کەپێی دەگوترێ: (سیستەمی نوێی جیهان / النظام العالمي الجديد)، بەتایبەتی دوای بەسترانی کۆنگرەی (ڕێکخراوە ناحکوومییەکان بۆ مافەکای مرۆڤ / المنظمات غير الحكومية لحقوق الانسان) لە (ڤیینا) لە ساڵی (١٩٩٣)ز دا، جاڕنامەیەکی تایبەت دەربارەی مافەکانی مرۆڤ دەرکرا، زیاتر لەژێر چاودێریی و لە ژێر فشاری ئەمەریکادا، کە ئەمەریکا خۆی سەپەرشتی دەکرد و، زیاتر داکۆکییان کردوە لەسەر مافەکانی مرۆڤ (دیارە بەو چەمك و میکانیزمەی کە ئەمەریکا دیاریی کردوون).

وە لەوکاتەوە ئەمەریکا بڕیاری دا کەهەرکەسێك، وەهەر دەوڵەتێك مافەکانی مرۆڤ ڕەچاو نەکات: تووشی سزا دەبێت، ئنجا ئێستا کە ئەمەریکا سزای ئابووریی و سزای بازرگانیی و ..هتد، بەسەر چەند دەوڵەتێك داسەپاندوە، بەحیساب لەبەر ئەوەیە کەمافەکانی مرۆڤ ڕەچاو ناکەن، بەڵام بە لەبەرچاوگرتنی ئەو حەقیقەتە کە ڕەنگە دەوڵەتی دیکە هەبێ، وەك قەوارەی جوولەکە (یهود)، یان شوێنی دیکە، مافەکانی مرۆڤی زۆر تێدا پێشێل بکرێن، بەڵام لە بەر ئەوەی لەئەمەریکا نزیکن، یان ئەمەریکا بەرژەوەندیی لەوەدانیە کەفشاریان بخاتەسەر، ئەوە دیارە لەگوڵ کاڵتریان پێ ناگوترێ!

## باسی دووەم : چەند تێبینییەك لەسەر ڕەوتی جووڵانەوەی مافی مرۆڤ و، جەوهەری مافەکانی مرۆڤ، بەتێگەیشتنی ڕۆژئاواییانە

من وەك مسوڵمانێك، کەتەماشای مێژووی بەشەر دەکەم، پێم وایە کە ئەو جووڵانەوەیەی مافی مرۆڤ، وە ئەو (اتفاقیة)یانەی کەکراون، وە ئەو (وثیقة) و(إعلان)انە کەبڵاو کراونەوە، هەموویان هەنگاوی باشن و لەخزمەتی مرۆڤایەتیی دابوون بەگشتی، چاوپۆشیی لەوە بکە، کە چ ئامانجێکی سیاسی و کۆلۆنیالیزمییان لەپشتەوە بووە، یان چ ئامانجێکی شۆڤینیی و (پاوانخوازیی)یان لەپشتەوە بووە، بەڵام گرنگ ئەوەیە بەگشتی هەرکەسێك بڵێ: با ئینسان ڕێزی لێ بگیرێ و، ستەمی لێنەکرێ و، نەچەوسێندرێتەوەو، ئیهانەی پێ نەکرێ، ئێمە دەبێ سوپاسی بکەین و دەستخۆشیی لێ بکەین، وە بەتەئکید ئەو جووڵانەوەیەی داواکردنی مافەکانی مرۆڤ و، دابین کردنی مافەکانی مرۆڤیش، کەم و زۆر کاریگەریی بووە لەسەر سیاسەتی زۆر لە دەوڵەتان، وە زۆر لە دەوڵەتانی والێکردوە کەلە ملهوڕیی و لەخۆبایی بوون و، سەرکێشیی خۆیان بگرنەوە، لە ژێر فشاری ئەو ڕێکخراوانەدا کەداوای مافەکانی مرۆڤ دەکەن، وە ئەو دەستەڵاتانەی کە بەهەر حاڵ، ئەگەر وەك (کراسی عوسمان)یش بێ، مافی مرۆڤیان کردوە بەدروشمێکی خۆیان، بۆ فشار خستنە سەر خەڵك.

وە (جاڕنامەی گەردوونیی مافەکانی مرۆڤ)یش، کە لەسی (٣٠) بڕگە پێکهاتوە[١]، ئەگەر ئینسان بە ویژدان (إنصاف)ەوە سەرنجیان بدات، جگە لە چەند بڕگەیەکی کەم، هیچ کام لەبڕگەکانی لەگەڵ شەریعەتی ئیسلامییداو، لەگەڵ بنچینە شەرعییەکاندا دژایەتیی و ناکۆکییان نیە، دیارە چەند بڕگەیەکی تێدان هەیە لەگەڵ شەریعەتی ئیسلامیی دا ناگونجێن، ئەوەش دوایی باسی دەکەین، کە بۆ چی بەو شێوەیە، ئەگەر نا، زۆربەی هەرەزۆری بڕگەکانی لەگەڵ

---

(١) کە دوایی لەکۆتایی ئەم ئاڵقەیەدا لەدوو پاشکۆدا، هەرکام لە: (جاڕنامەی جیهانیی بۆ مافەکانی مرۆڤ) و (جاڕنامەی ئیسلامیی بۆ مافەکانی مرۆڤ) دێنین.

شەریعەتدا كۆكن، بەتایبەت ئەوە كەكەس لەكەس گەورەتر نیەو، ئینسانەكان دەبێ لەبەرانبەر دادگادا، وەك یەك بن و، هەموو ئینسانێك دەبێ ڕێزی لێ بگیرێ و، نابێ كەس بچەوسێندرێتەوەو، نابێ كەس بەبێ بەڵگە بخرێتە زیندان (سجن)ەوەو نارەحەت بكرێ و، نابێ كەس هێمنیی و ئاساییشی ماڵ و حاڵی بشێوێندرێ و، هیچ ئینسانێك نابێ ستەمی چینایەتیی و ستەمی نەتەوەیی.. هتدی لێ بكرێ، ئەوانە هەموویان ئامانجی بەرز و باشن و، وە شەریعەتەكانی خوای پەروەردگاریش هەر بۆ چەسپاندنی ئەوانە و هێندێك شتی دیكەش هاتوە.

**بەڵام ئەو چەند تێبینییانەشمان هەن، لەسەر تێڕوانینی ڕۆژئاواییانە بۆ مافەكانی مــرۆڤ:**

١- هەركاتێك باس لەوشەی ماف (حق) دەكرێت، یەكسەر ئەوە بەسەر زەین دا دێ: كەلەسەر چ بناغەیەكەو بەڵگەو بناغەی ئەو مافە چییە؟! هەركەسێك گوتی: حەقم هەیە، خەڵك پێی دەڵێن: بەڵگەت چییە؟ هەر كەسێك داوای حەقی لەكەسێك كرد، پێی دەڵێن: لەسەر چ بناغەیەك؟

بەڵام (جاڕنامەی گەردوونیی مافەكانی مرۆڤ) كەداواكردنی مافەكانی مرۆڤە بەتێگەیشتنێكی ڕۆژئاواییانەو ئەوروپاییانەیە، هیچ بناغەیەكی دانەناوەو، هیچ بەڵگەیەكی نەهێناوەتەوە، كەبۆچی دەبێ ئینسان مافەكانی پارێزراو بن؟ بۆچی دەبێ ئینسان حەقی ژیان و، حەقی سەربەخۆیی و، حەقی موڵكایەتیی و، حەقی ماڵ پێكەوەنان و، حەقی ڕێزلێگیران و...هتدی هەبێ؟ لەسەر چ بناغەیەك؟ واتە: داوا (دعوى)یەكە هیچ بەڵگە (بيّنة)یەكی لەپشتەوە نیە! كە ئەمە خاڵێكی لاوازە لەو جۆرە تێگەیشتنەدا بۆ مافەكانی مرۆڤ .

٢- داواكردنی خەڵكی ڕۆژئاوا بۆمافەكانی مرۆڤ، كردار (فعل) نەبووە، بەڵكو كاردانەوە (رد فعل) بووە، وەئەگەر لە (جاڕنامەی گەردوونیی مافەكانی مرۆڤ) وردبینەوە، لەپێشەكی (ديباجة)یەكەی دا، زۆر بەزەقیی هەست دەكەین، كەئەوە قەناعەتی خەڵكی ڕۆژئاوا نەبووە، بەگەورەیی و ڕێزو حورمەتی ئینسان، كەداوای مافی بۆ بكەن، بەڵكو چەندشتێكی دیكە هاندەری ئەوە

بووە!! لەپێشەکی (جارنامە)کەدا هاتوە، دەڵێ: (لەبەر ئەوەی دان پێداهێنانی کەرامەت و مافی مرۆڤ بناغەی ئازادیی و ئاشتیی و دادگەرییە، وە لەبەر ئەوەی گوێ پێنەدانی ڕێزگرتن لەئینسان، لەڕابردوودا بۆتە مایەی کێشەو ئاژاوەو گرفتاریی، وە بۆ ئەوەی ڕێگا بگرین لە دووبارە بوونەوەی ئەو حاڵەتانە، وە بۆ ئەوەی دۆستایەتیی لەنێوان دەوڵەتان دا بەرقەراربێ، پێویستە ئینسان ڕێزی لێ بگیرێ و مافەکانی بۆ دابین بکرێن).

کەواتە: ئەگەر لێی وردبینەوە داواکردنی (جارنامەی گەردوونیی بۆ مافەکانی مرۆڤ) بۆ مافەکانی مرۆڤ هیچی پەیوەندیی بەوەوە نیە، کەئینسان لەخۆی دا خاوەنی ڕێزەو، خاوەنی پایەو حورمەتە، بۆیە پێویستە مافەکانی بۆدابین بکەین، بەڵکو دەڵێ: بۆ ئەوەی ڕێگا لەئاشووب و ئاژاوەبگیرێ و، بۆ ئەوەی شەڕو کوشتار دروست نەبێتەوە - کە ئاماژە دەکات بەجەنگی جیهانی یەکەم و دووەم - بۆ ئەوەی کە دەوڵەتان ئاشتیی و تەباییان لەنێوان دا بەرقەراربێ، بۆیە پێویستە ئینسان ڕێزی لێ بگیرێ و، مافەکانی بۆ دابین بکرێن!!

واتە: ڕێزگرتن لە ئینسان و دابین کردنی مافەکانی، نەکراوە بەئامانج، بەڵکو شتێکی دیکە ئامانجەو، ڕێزگرتن لە مرۆڤ و دابین کردنی مافەکانی کراوەتە وەسیلە، کە بێگومان ئەوە لەگەڵ ڕێزو حورمەت و لەگەڵ پایەو مەقامێك دا، کەلە ئینسان دەوەشێتەوە، شایستە نیەو پێویستە دابین کردنی مافەکان و ڕێزگرتنی مرۆڤ، ئامانج بن.

٣- لەجارنامەی گەردوونیی مافەکانی مرۆڤدا، باسی مرۆڤە ماف پێشێکراوەکان و، مرۆڤە ماف پێشێل کەرەکان نەکراوەو، لێك جیانەکراونەوە، هەر دەڵێ: مرۆڤەکان ئاواو ئاوابن... بەڵام دەبێ ئەوانەی کەبەدرێژایی مێژوو مافی مرۆڤەکانی سەر زەوییان پێشێل کردوە، چ وەك تاك، چ وەك کۆمەڵ، چ لەڕووی ئابووریی یەوە، مافیان پێشێل کردبن، چ لەڕووی سیاسییەوە، چ لەڕووی نەتەوەیی یەوە، چ لەڕووی ڕەنگ و ڕەگەزو زمانەوە، دەبێ لەیەکیان جیا بکەینەوە،کە لە ئیسلامدا زۆر بەڕوونیی ئەوانە هەموویان نوختەیان تێداخراوەتە سەرپێت.

٤- هیچ بناغەو مەرجیعێك دیاریی نەکراوە، بۆ دیاریی کردنی مافەکانی مرۆڤ، ئایا کێ مافەکانی مرۆڤ دیاریی دەکات؟ ئایا بەسەرنج دان لە سروشت (طبیعة)ی مرۆڤ، یان بەسەرنج دان لەغەریزەکان، یان فەلسەفە، یان دین، یان جەماوەر، یان عورف و عادەت، بەکام لەو پێوەرانە ئەو مافانە دیارییکراون؟! یانی چ مەرجیعێك و چ بناغەو سەرچاوەیەك هەیە کە ئێمە مافەکانی مرۆڤی لێوە هەڵبهێنجین؟! چونکە هەرکاتێك خەڵکێك کۆببێتەوە بڵێن: ئێمە داوای مافەکانی مرۆڤ دەکەین، پێیان دەگوترێ: کێ ئەو حەقەی پێداون و، لەسەر چ بناغەیەك؟!

٥- زۆربەی هەرەزۆری بڕگەکانی (جاڕنامەکە)، وەك پێشتریش باسمان کرد، شتی جوان و دڵگیرن، بەڵام میکانیزمی جێبەجێ کردنیان دیاریی نەکراوە، هەربۆیەش وڵاتانی بلۆکی ڕۆژهەڵات (وڵاتە سۆسیالیستییەکان) لە پێش هەموویانەوە یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو، زۆر خۆپارێزیی (تحفظ)یان دەکرد لە ئیمزاکردنی (جاڕنامەی گەردوونی مافەکانی مرۆڤ) و ئەو (وثیقة)انەی، کە دوایی کرانە پاشکۆی، قسەکەشیان بەجێ بوو، دەیانگوت: ڕۆژئاوا - سیستەمی کاپیتالیستیی (سەرمایەداریی) - داوا دەکات کە ئینسانەکان ڕێزیان لێ بگیرێ و، مافەکانیان دابین بکرێن، بەڵام سوودی چیە (وثیقة)یەك بنووسرێ و بڵاو بکرێتەوە، کە دەبێ ڕێز لە ئینسان بگیرێ، بەڵام چینی سەرمایەدارو بورجواز، دەست بنێنە قورقوڕاگەی خەڵکەوە، لەڕێی چەوساندنەوەی ئابووریی و، چەوساندنەوەی سیاسی و، چەواشەکردنی ڕاگەیاندن (إعلامي)وە، کە چینایەتیی و قڕیی و پڕیی هەبێ، چەوساندنەوە هەبێ؟! باهەر باسی مافی مرۆڤ بکرێ، چونکە بەتەئکید وەك کوردەواریی خۆمان دەڵێن: (بەحەڵوا حەڵوا دەم شیرین نابێ).

٦- بڕگەکانی (جاڕنامەی گەردوونیی مافەکانی مرۆڤ) ئامانجی باش باشیان تێدان و دڵگیرن - جگە لە چەند دانەیەکیان -، بەڵام دەستەبەر (ضمانة)یان بۆ دانەنراوەو سەنەدێکیان لەپشتەوە نیە، کەوایان لێبکات لەدنیای واقیع دا بەرجەستە ببن و پراکتیزە ببن.

وە بەتایبەتیش دوای ئەوەی کەپێنج (٥) دەوڵەتی هەمیشە ئەندام لە ئەنجوومەنی ئاسایش (مجلس الأمن)دا، واتە: ئەمەریکا و ڕووسیای ئێستا - یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو - و چین و فەڕەنسا و بەریتانیا، کەئەوانە چونکە (جەنگی جیهانی دووەم) یان بردبۆوە، ئەو مافەیان بەخۆیاندا کە لە (ئەنجوومەنی ئاسایش)دا ئەندامی هەمیشەیی بن، هەڵبەتە (ئەنجوومەنی ئاساییش) لەپازدە(١٥) ئەندام پێك دێت، وێڕای ئەو (٥) ئەندامەی، دە(١٠) یەکەی دیکەش بەشێوەیەکی دەوریی هەڵدەبژێردرێن، بەس ئەو پێنجە هەر لەشوێنی خۆیانن، وەمافی (ڤیتۆ)یشیان هەیە، (ڤـیتۆ) واتە هەڵوەشاندنەوەی بڕیار، کە ئەمەریکا تا ئێستا حەفتا و پێنج (٧٥) جار زیاتریش مافی (ڤیتۆ) ی بەکارهێناوە، هەر بڕیارێك عەقڵی نەیگرێ، ڕەخنەی لێ دەگرێ و، بڕیارەکە سەرناگرێ، بەتایبەتی ئەو بڕیارانەی کە زەرەریان هەیە بۆ قەوارەی جوولەکە (إسرائيل)، هەروەها هەر بڕیارێك کەزیانی هەبێ بۆ بەرژەوەندییەکانی ئەمەریکا.

خۆتان ئاگادارن چەندبڕیار دران، دەربارەی کەم کردنەوەی چەکی ڕۆکێتی بالیستیی و، دەربارەی کەم کردنەوەی بەرهەمی ئەوکارگانەی کە دووکەڵی زۆریان لێ بەرز دەبێتەوەو، ژینگە پیس دەکەن و (چینی ئۆزۆن) کون دەکەن... ئەمەریکا بەو حەقەی پێی دراوە، یاخود بەخۆیان داوە، حەقی (ڤیتۆ)ی بەکارهێناوەو، پابەندی هیچ کام لەو بڕیارانە نەبووەو، لەسەر پیس کردنی ژینگەو لەسەر ئەو بڕیارانەی کەلە بەرژەوەندیی خۆی دان، هەر بەردەوام بووە، هەروەها بەریتانیاو ڕووسیاو فەڕەنساو چینیش، هەرکامێکیان کەم و زۆر ئەو هەڵوێستەیان هەبووە.

٧- (جاڕنامەی گەردوونیی مافەکانی مرۆڤ)، ناوەکەی زۆر گەورەیە، بەڵام ئەو نیشانەی پرسیارەی دێتەسەر: ئایا ئەو (جاڕنامە)یە حەقی خۆیەتی ئەو ناوەگەورەیەی لێبنرێ؟! وە ئایا نوێنەرانی هەموو بەشەر و، نوێنەرانی هەموو جیهان چوون دابنیشن و، ئەو (وثيقة) سی (٣٠) بڕگەییەو ئەوانی دیکەش ئیمزا بکەن؟! یاخود هەر ڕۆژئاواییەکان بوون؟! ئاشکرایە کە جیهانی ئیسلامیی، مەگەر ئەوەی دوایی وەك پاشکۆیەك چووبێت و خۆی ڕەگەڵ دابێت، ئەگەرنا

بێ ئاگا بوونەو، هیچ حیسابیان بۆ نەکراوە! هەروەها بلۆکی ڕۆژهەڵات بەگشتی، خۆپارێزیی (تحفظ)یان لە بارەیەوە کردوە.

کەواتە: لەڕاستیدا ناوەکەی زۆر لە نێوەڕۆکەکەی گەورەترە، وەك یەکێك لەنووسەرە ئیسلامییەکان گوتوویەتی و جوانیشی گوتوە، دەڵێ: ئەگەر لەجیاتی (جاڕنامەی گەردوونی مافەکانی مرۆڤ (الإعلان العالمي لحقوق الانسان) ناوی لێبنرایە: (جاڕنامەی ئەورووپیی بۆ مافی هەندێك لە مرۆڤەکان / الإعلان الأوروبي لحقوق بعض الناس) ئەوە بەڕاستی ناوەکە ڕاستتر بوو، وە ناوەکە زیاتر لەگەڵ نێوەڕۆکەکەی دا، یەکی دەگرتەوە!

ئەوە تێبینییەکانمان بوون لەسەر چۆنیەتی تێڕوانینی ڕۆژئاوا بۆ مافەکانی مرۆڤ، بۆیە من ئامۆژگاریی هەموو خوشك و برایەکی مسوڵمان دەکەم، کە بەڕاستی هەر لەڕێوە نەکەوینە ژێر کاریگەریی ئەو دروشم (شعار)انەی کەبریقەدارو جوانن و، سەرنج ڕاکێشن و بەرز دەکرێنەوە، بۆ وێنە: کە باسی جیهانگیریی (عولمة)، یان دیموکراسیی، دەکرێ، با یەکسەر تەسلیم نەبین، بەڵکو لێی وردبینەوە، خوای پەنهان بین دەفەرموێ:

﴿ وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ ﴾ (الإسراء: ٣٦).

واتە: (شتێك زانیارییت دەربارەی نیە، شوێنی مەکەوە)، بەڵکو جوان جوان لێی وردبەوەو تێی بگە، ئەوجار بڕیاری خۆتی لەسەر بدە.

زانایانی ئیسلامیش، بنچینە (قاعدة)یەکی جوانیان داناوە، کە دەڵێ: (الحكم على الشيء فرع عن تصوره) واتە: حوکم دان بەسەر شتێکدا، بەرهەمی لێ تێگەیشتنیەتی، واتە: ئەگەر لێی تێنەگەی و نەیناسی، بۆت نیە بڕیاری دەربارە بدەی، چونکە هەر بڕیارێك بدەی لەسەر بنچینەی جەهل و نائاشنایی دەیدەی، بەتەئکید بڕیارێکیش لەسەر بناغەی ناشارەزایی بێت، بەهەڵە دەردەچێت و، بناغەی خوار، هەر دیواری لاری لەسەر هەڵدەچنرێ!

لە بەشی یەکەمدا باسمانکرد کە لە ڕوانگەی ڕۆژئاواوە، داواکردنی مافەکانی مرۆڤ چۆن هاتوە، وەتێبینیی و سەرنجەکانی خۆیشمان لەو بارەوە خستنەڕوو، ئێستاش با بزانین لەشەریعەتی بێ هەڵەو پەڵەی خوای پەروەردگاردا، مرۆڤ چۆن تەماشاکراوە؟ وە ئەرك و مافەکانیشی چۆن دیاریی کراون؟!

**تێبینی بکەن:** من وشەی (ئەرك)یشم زیاد کردوە، چونکە لەڕاستی دا لە ئیسلامدا هەموو ئەوانەی کەپێیان دەگوترێ: مافەکان (الحقوق)، پێش ئەوەی ماف بن، ئەرکن، وە ئەرکیش پابەندیی (إلتزام)ی تێدایە، بەڵام ماف (حق) داواکردنی تێدایە، ئاشکراشە کە (إلتزام) بەهێزترە، چونکە لەوحاڵەتەدا دەبێ شتێك هەبێ وا لەئینسان بکات، کە مافی خەڵکی دیکە دابین بکات، واتە ئەرکی سەرشانیەتی، وەئینسانەکە خۆیشی ئەرکی سەرشانیەتی ئەو مافە داوا بکات، وەك دوایی باسی دەکەین.

**ئەم بەشەش لەدوو باس دا دەخەینەڕوو:**

## باسی یەکەم:- بنەمایەکانی ئەرك و مافەکانی مرۆڤ لەئیسلام دا

وەك باسمان کرد یەکێك لە کەم وکوڕییەکانی تێڕوانینی ئەورووپیی و ڕۆژئاواییەکان بۆ مافەکانی مرۆڤ، ئەوەیە کەهیچ بناغەیەکی فەلسەفیی ڕوون و ئاشکرای نیە، بەڵام لەئیسلامدا وانیە، لەئیسلامدا، مافەکانی مرۆڤ وەك چەوەندەرێك لەو گۆڕە هەڵنەقەندراون!، وەلەئیسلامدا، مافەکانی ئینسان وەك ئاڵقەیەکی پچڕاو لەزنجیرێك نین و، وەك ئەنجامێکی بێ پێشەکی نین، بەڵکو لەئیسلامدا، پێش ئەوەی باسی مافی مرۆڤ بکرێت، چەند شتێکی دیکە هەن، ئنجا مافی مرۆڤ، وەك ئەنجامێکی مەنتیقیی و سروشتیی خۆی فەرز دەکات.

**ئنجا ئێستا با سەرنج بدەین داخۆ:**

ئیسلام لەسەر چ بناغەیەك مافەكانی مرۆڤ بنیات دەنێ؟ لەوەڵام دا دەڵێین: بناغەی دیواری مافەكانی مرۆڤ و سەرچاوەی هەڵقوڵینیان بریتیە لەوە، كە ئینسان و ژیان و بوونەوەر، خاوەنێكیان هەیە، وەك كوردەواریی دەڵێن: (دنیا شاری بێ ساحێب نیە)، ئنجا خاوەنی ئینسان و ژیان و بوونەوەر، ئەركەكانی ئینسان و مافەكانی ئینسان و، ڕێزو كەرامەت و پایەو مەقامی ئینسان، دیاری دەكات.

كەواتە: دەتوانین بناغەو سەرچاوەی مافەكانی مرۆڤ لەشەریعەتی خوای دادگەردا، ببەینەوە سەر دوو ڕیشەی گرنگ:

١- پەروەردگارێتیی و پەرستراوێتیی خوا و، خاوەندارێتیی خوا بۆ بوونەوەر.

٢- بەندایەتیی ئینسان بۆ خواو، ڕێز لێگیراوێتیی ئینسان لەلایەن خوای پەروەرەدگارەوە.

ئاشكراشە كە ئەم دوو ڕیشە گرنگە، كە بناغەی مافەكانی مرۆڤ لەئیسلامدا پێك دێنن، تایبەتن بەئیسلامەوەو، لەهیچ بەرنامەو ڕێبازێكی دیكەدا نایەنە بەرچاو، بەڵام ئیمتیازو تایبەتمەندیی ئیسلام هەر ئەوەندە نیەو، تایبەتمەندییەكی گرنگی دیكەی ئەوەیە، كە ئیسلام نەهاتوە مافەكانی مرۆڤ تەنها وەك دروشمێكی جوان بخاتەڕوو، بەڵكو لەئیسلامدا گرنگ ئەوەیە قسەو دروشم بەكردەوە تەرجەمە بكرێ و، لەمەیدانی واقیع دا بچەسپێنرێ و، بكرێ بەكردەوە (عمل)، ئەوجار بۆ خەڵك شتێكی لێ هەڵدەوەرێ و، خەڵك لێی بەهرەمەند دەبن.

بۆیە ئیسلام هاوكات لەگەڵ داكۆكیی كردن لەسەر ڕێزو حورمەتی ئینسان و، دابین كردن و پاراستنی مافەكانی، فەرمان بەمسوڵمانانیش دەكات، كە زەمینەیەك بسازێنن و، كەش و هەوایەك بخەملێنن و ئامادە بكەن، كە ئینسانی تێدا ڕێزلێگیراو بێ و، مافەكانی تێدا دابین كراو بن، دیارە هەر لێرەشدا یەكێك لە حیكمەتەكانی هەبوونی دەوڵەت لەئیسلامدا دەردەكەوێ، هەندێك كەس دەڵێن: ئیسلام سیاسەت و دەوڵەتی بۆ چییە؟ ئایین[1] حوكم و دەستەڵاتی بۆ چییە؟!

---

(١) لێرەدا وشەی (ئایین)مان بەمانای باوو عورفییەكەی نێو مسوڵمانان بەكارهێناوە، كە

**لەوەڵامدا دەڵێین:** ئایین، دەوڵەت و سیاسەت و حوکمڕانیی بۆ ئەوەیە، کە کەش وهەوایەك بسازێ، ئینسان بەڕاستیی تێیدابەندەی خوابێ و، ئینسانەکان هەندێکیان هەندێکیان نەپەرستن و، ئینسان کۆیلەو خزمەتکاری کەس نەبێ، ئینسانەکان پێکەوە خوشك وبرابن، یان خوشك برای ئاییني بن، یان خوشك و برای ژینیی بن، یان لەسەر بناغەی دین پێکەوە خوشك وبرا بن، یان لەبەر بەڕێکردنی ژین دا پێکەوە تەبا بن.

واتە ئیسلام بەشێوەیەکی واقیع بینانە تەماشای مافەکانی مرۆڤ دەکات، بەشێوەیەکی وا کەکەش و هەوا یەك بسازێنێ، کەئینسان بەکردەوە (فعلي) بتوانێ مافەکانی تێداوەدەست بهێنێ، بۆیە مەسەلەی فەرمان بەچاکەو نەهی لەخراپە، مەسەلەی پێکهێنانی دەوڵەت و حوکم و سیاسەت، ئەوە کەمسوڵمانان دەبێ کیان و قەوارەیەکیان هەبێ، مەسەلەیەکە پەیوەستەکۆی ئیسلامەوە و، یەکسەر پەیوەستە بە (لا إله الا الله) وە، یانی: جگەلە (الله) پەرستراوێکی دیکە نیە، کەواتە: ئەو پەرستراوە، کە پەروەردگارو خاوەنی بوونەوەرە، دەبێ حەڵاڵ و حەرام بۆ بەندەکانی دیاریی بکات و، ڕێگاو شوێنیان بۆ دیاریی بکات و، چاکەو خراپەیان پێشان بدات و، ئەرك و مافەکانیان بۆ دەست نیشان بکات.

چونکە ئیسپات بووە کە: چەوساندنەوەی نێو خۆو دەستدرێژیی دەرەکیی (الإستبداد الداخلي والعدوان الخارجي) گەورەترین ئاستەنگن لەڕێی مافەکانی مرۆڤدا، تەماشای گەلی کوردی خۆمان بکەین، کاتێك کە ڕژێمی بەعس سێبەری شوومی بەسەر سەری میللەتی ئێمەوە بوو، یان لەشوێنانی دیکە، کەمیللەتی ئێمە بەعاستەم هەر لێی دەسەلمێندرێ کەهەیە[1]، ئایا لەشوێنێکدا کە ئینسان دان بەبوونی دا نەهێنرێ، دان بەمافی دا دەهێندرێ؟ لەشوێنێك دا کەجارێ (کورد)ەکە هەر بەگەل و نەتەوە حیساب نەکراوە، هەر بەهاووڵاتیی دانەندراوە، ئایا دان بەمافەکانیدا دەهێندرێ؟!! بەتەئکید نەخێر.

---

بریتیەلە (ئیسلام)، نەك بەمانا ئەسڵییەکەی، کە هەر بەرنامەیەك دەگرێتەوە.

(١) مەبەست تورکیایە کەهەتا ئەم ساڵانەی دوایی دانی پێدانەدەهێنا کەگەلێك هەیە بەناوی (کورد)!!

لەڕوانگەی ئیسلامەوە بۆ دابین کرانی مافەکان مرۆڤ، دەبێ قەوارەیەك پێك بهێندرێ، کە چەوساندنەوەی نێو خۆ (الإستبداد الداخلي)ی تێدا نەبێ و، و ڕێگاش لەدەستدرێژیی دەرەکیی (العدوان الخارجي)بگرێ، ئنجا مافەکانی مرۆڤ دەڕسقێن و هەراش دەبن و دەبنە درەخت و بەر دەگرن.

ئەگەر یەکێك بپرسێ: بۆچی لەقورئان و سوننەتی پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم) زاراوەی مافی مرۆڤ، (حق الإنسان)، ناکەوێتە بەرچاو؟! کە ئەوە وایەو لەقورئاندا، وە لەسوننەتەدا زاراوەو وشەی (مافی مرۆڤ / حق الإنسان) بەشێوەیەکی زەق ناکەوێتە بەرچاو، هەرچەندە بەشێوەی ڕوونکراوەیی (تفصیلي) هەیە، وەك : حەقی خوا لەسەر بەندەکانی و، حەقی بەندەکان لەسەر خواو، حەقی مسوڵمان لەسەر مسوڵمان و، حەقی هەژار لەسەر ساماندار و، حەقی کۆمەڵگا لەسەر حوکمڕان و...هتد، بەڵام وشەی (مافی مرۆڤ / حق الإنسان)باس نەکراوە، هەرچەندە بەگشتی دەقەکانی قورئان و سوننەت، ئەوە دەگەیەنن، بەڵام وەك زاراوەیەك کەمتر بەکارهێنراوە، ئەوەش لەبەر چەند هۆکارێك:

یـــــەك:

مافی مرۆڤ - وەك پێشتر باسمان کرد - دەبێ بناغەیەکی هەبێ لەسەری بنیات بنرێ، مرۆڤ بۆچی دەبێ مافی هەبێ؟! بۆچی دەبێ نەچەوسێندرێتەوە؟ بۆچی دەبێ ڕێگای عەقیدەو بیروڕای لێ نەگیرێ و لەو ڕووەوە ئازاد بێ؟! بۆچی دەبێ ڕێگای دەربڕینی لێ نەگیرێ؟! بۆچی دەبێ ئازادییە شەخسییەکانی بۆ دابین بکرێن و لەبەرچی؟!

ئیسلام دانی بەو بناغەیەدا هێناوە، کە بریتیە لەڕێز لێ گیران و کەرامەتی ئینسان (کرامة الإنسان)، وە ئەوە کە ئینسان خوای بەدیهێنەر بەتایبەت خوڵقاندوویەتی و، بەجێنشین (خلیفە)ی خۆی و بۆ بەندایەتیی کردنی خۆی خوڵقاندوویەتی، نەك بۆ کۆیلایەتیی و خزمەتکارێتیی طاغووت و دیکتاتۆرەکان، بۆیە بۆ هیچ کەس نیە نەبەناوی سیاسەتەوە، نەبەناوی دینەوە، نە بەناوی دنیاوە، بەندەکانی خوا ژێر دەست و زەبوون و زەلیل بکات.

لەو بارەوە قسەیەکی ناوداری (عومەر) خوا لێی ڕازی بێ هەیە، کەبە (عەمری کوڕی عاص و کوڕەکەی)گوت، کە عەمری کوڕی عاص خوا لێی ڕازی بێ (والي)ی مسوڵمانان بوو لە (مصر)، کوڕەکەی عەمر لەگەڵ کوڕی کابرایەکی (قبطي)دا پێشبڕکێی ئەسپیان دەکرد، ئەسپی کوڕە (قبطي)یەکە پێش ئەسپی کوڕەکەی عەمر کەوتەوە، ئەویش دایگرت و هێنایە خوارەوەو دایە بەرقەمچی و پێی گوت: (خُذْها وأنا ابنُ الأَكرَمين) واتە: بیگرە، نازانی من کوڕی دوو ئینسانە بەڕێزەکانم، کوڕی دایك و باوکی زۆر بەڕێزم! بابم عەمری کوڕی عاص (والي)ی (مصر)ەو، دایکیشم فلان ژنەیە، تۆش کابرایەکی (قبطي)[1]ی، چۆن بۆت هەیە ئەسپی تۆ پێش ئەسپی من بکەوێتەوە؟! دیارە کوڕە (قبطي)یەکە دەزانێ، کە ڕۆژگار ڕۆژگاری خەلیفەی دادگەری ئیسلام، عومەری کوڕی خەططابە، بۆیە لەمیصرەوە دەچێ بۆ مەدینە، بەڵێ، دەبێ ئینسان ئاوا لەسەر مافی خۆی بەدەنگ بێ، زانیویەتی حوکمێك هەیە، کە حوکمی ئیسلامە و، حەقی ئەو قەمچییانەی بۆ دەستێنێ، دەچێ سکاڵای خۆی دەباتە لای ئیمام عومەر، عومەر خوا لێی رازی بێ نامە دەنێرێ و دەڵێ: عەمری کوڕی عاص خۆت و کوڕەکەت وەرن بۆ لام و، ئەو قەمچییەش کەپێتان لەو کوڕە (قبطي)یە داوە، لەگەڵ خۆتانی بهێنن، یەکسەر دێن و دادگاییان دەکات، دیارە شتەکەی لەسەر ئیسپات دەبێ، دەڵێ: قەمچییەکە بدە دەست ئەو کوڕە (قبطي)یە، ئەویش لەدەستی وەردەگرێ، ئنجا عومەر پێی دەڵێ: کوڕی عەمر چەند قەمچی لێداوی، هێندەی لێبدەوەو، چۆنی لێداوی ئاوای لێبدەوە، ئیدی کوڕە قبطییەکە، کوڕەکەی (والي) میصر دەداتە بەر قامچی بەو شێوەی، کە لێی دراوە، دوای ئەوەی کەتەواو دەبێ، عومەر دەڵێ: (أَدِرْها على صلعة عمرو) واتە: قەمچییەکە وەربسووڕێنە بۆ سەری عەمر، عەمری کوڕی عاص یەکێك بووە لەهاوەڵە بەڕێزەکان و (والي)ی میصریش بووە، لەوکاتەدا هاوەڵان (أصحاب) خوا لێیان ڕازی بێ، دەکەونە نێوان و دەڵێن: ئەی گەورەی ئیماندارا‌ن! خۆ بابی لێی نەداوە، کوڕەکەی لێی داوە! کوڕە (قبطي)یەکەش دەڵێ: گەورەی

---

(١) (قبطي) واتە: نەصڕانیی.

ئیمانداران! هەقم بەسەربابیەوە نیە، چونکە حەقی خۆم ستاندۆتەوە، عومەر دەڵێ: ئەو، بەپشت و پەناو قووەتی بابی لەتۆی داوە، لەسەری بابیشی بدە! دوایی هاوەڵان دەکەونە شەفاعەت و تکاو ڕەجاو، بەهەر حاڵ عەمر ڕزگاری دەبێ.

ئنجا عومەری کوڕی خەططاب لەو مەقامەدا ئەو ڕستە ناوداره - کەدەبێ بەزێڕ بنووسرێت - دەفەرموێ: (متى استَعْبَدْتُمُ النَّاسَ، وَقَدْ وَلَدَتْهُمْ أُمَّهاتُهُم أَحراراً)؟ واتە لەکەیەوە خەڵکتان کردوە بە کۆیلە، خۆ بەئازادیی لە دایك بوون؟![1]

کەواتە: ئینسان بەڕێزە، ئازادە، خوا ئینسانی ئازادانە خوڵقاندوە، بۆیە دەبێ مافەکانی بۆ دابین بکرێن، ئیسلام باسی ڕێزی ئینسان، ئازادیی ئینسان، بەندایەتیی ئینسان، بۆ خوا دەکات، بۆیە زۆر داکۆکیی نەکراوە لەسەر ماف، چونکە وەختێك ئینسان ڕێز لێگیراوو حیساب بۆ کراو بوو، مافەکانیشی دابین دەکرێن.

دوو:

لە ئیسلامدا مافەکان و ئەرکەکان، وەك دروشم و شیعارێکی گشتی نەخراونەڕوو، بەڵکو وەك شتێکی تەفصیلیی و بەوردیی دیاریی کراون، بۆ ئەوەی بگونجێ بەکردەوە جێبەجێ بکرێن، نەك تەنها دروشمی بریقەدارو قسەی خۆش و بۆش بن و، دروشمێکی گشتی بن و، خەڵك هەڵبخەڵەتێنن و چەواشە بکەن.

لەشەریعەتی ئیسلامییدا، بە وردیی و بەڕوونیی هاتوە، کەمافی حوکمڕان بەسەر کۆمەڵگاوە چییە؟ وەمافی کۆمەڵگاش بەسەر حوکمڕانەوە چییە؟!، مافی ژن بەسەر مێردییەوە چییە؟ وە مافی مێردیش بەسەر ژنەوە چییە، و مافی دایك و باب بەسەر ڕۆڵەکانیانەوەو، مافی ڕۆڵە بەسەر دایك و بابیانەوە، وە مافی دراوسێ بەسەر دراوسێ و، مافی میوان لەسەر خاوەن ماڵ چییە؟ ...هەتا کۆتایی، واتە: هەرکام لەو ئەرك و مافانە بەدرێژیی (تفصیل) باس کراون، نەك وەك دروشمێکی گشتی باس بکرێن، بەڵام نەزانرێ چۆن جێبەجێ

---

(١) بڕوانە: (حُسْن المحاضرة) ج١ص٥٧٨، وە بڕوانە: (حقوق الإنسان في الإسلام، دراسة مقارنة مع الإعلان العالمي والإعلان الإسلامي لحقوق الإنسان) للدكتور محمد الزحيلي، ص٣٧٨.

بکرێن! بەوردیی لەدەقەکانی قورئان و سوننەتدا باس کراوە، کەمافی فڵان لەسەر فڵان ئاوایە و، دەبێ ئاواش جێ بەجێ بکرێ.

**سێ:**

ئەوەی لەرۆژئاوادا ماف (حق)ی پێ دەگوترێ، لە ئیسلامدا ئەرك (وظیفة)ی پێ دەگوترێ، ئەوەش حیکمەتێکی زۆر گەورەی تێدایە، چونکە کاتێك ئینسان مافێکی هەبێ، ڕەنگە هەرکات بەربەستێکی بێتە پێش و هەڕەشەیەکی لێ بکرێ، لەئەنجام دا بڵێ: مافەکەم ناوێ و، سەر سەلامەت بێ حاشا لەو غەنیمەتە!!!

بەڵام کاتێك ئەرکێکی لەسەر شان بێ، لەترسی سزاو جەزرەبەی خوای دادگەر، ناچارە بەدوای جێبەجێ کردنی ئەو ئەرك و واجبەی سەرشانیدا بڕوا، بەڵێ ئەوەی کە ئەورووپیی و ڕۆژئاوایی یەکان بەماف (حق)ی دادەنێن، ئیسلام بەئەرك (وظیفة)ی دادەنێ، با تەماشا بکەین چۆن و بەچ شێوەیەك؟ بۆ وێنە: خوای دادگەر دەفەرموێ:

﴿فَمَنِ ٱعْتَدَىٰ عَلَيْكُمْ فَٱعْتَدُوا۟ عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا ٱعْتَدَىٰ عَلَيْكُمْ ۚ﴾ البقرة: ١٩٤.

واتە: هەرکەسێك دەستدرێژیی کردنەسەر، وەك دەستدرێژییەکەی، دەستدرێژیی بکەنە سەرو بەرپەرچی بدەنەوە.

واتە: ئەگەر نیشتمانی داگیرکردی، دەری بکە، ئەگەر ماڵی داگیر کردی، لێی بستێنەوە، ئەگەر قسەی پێ گوتی، قسەی پێ بڵێوە- هەڵبەتە دەشتوانی لەهەندێك حاڵەتدا چاوپۆشیی لێ بکەی- ئەگەر ویستی بتکوژێ، مەهێڵە بتکوژێ و تۆ بیکوژە، وەك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دیفاع لەخۆکردنی کردوە بە ئەرکێکی شەرعیی، وەپایەو مەقامێکی بەرزیشی داناوە، بۆ کەسێك کەدیفاع لەحەقی خۆی دەکات، وەك ئەرکێکی شەرعیی، دەفەرموێ:

{مَنْ قُتِلَ دُونَ مَظْلَمَتِهِ فَهُوَ شَهِيد} أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٢٧٧٩)، وَالنَّسَائِي برقم: (٤٠٩٦)، وَصَحَّحَهُ الألبَاني.

واتە: هەر کەسێك لەسەر دیفاع کردن لە مەزڵوومیەتی خۆی و، لەسەر ستەم دیدەیی خۆی بکوژرێ، شەهیدە.

ئنجا زوڵمی نەتەوەییت لێ بکرێ، زوڵمی ئابووریی، سیاسیی، ستەمی شەخصیی لە ڕووی ئابڕوو و کەرامەت و ناموسەوە، لەهەر ڕوویێکەوە زوڵمت لێ بکرێ و، دەستدرێژییت بکریتەسەر، ئەگەر بەرگریی لەخۆت بکەی و لەو بەرگرییەدا بکوژرێی، بە مردنێکی شەریفانە مردوویی و، پلەی شەهیدییت هەیە.

لە فەرموودەیەکی دیکەدا پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ:

{مَنْ قُتِلَ دُونَ مَالِهِ فَهُوَ شَهِيدٌ} أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٧٠٨٤)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٢٣٤٨)، وَمُسْلِمٌ برقم: (١٤١)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (١٤١٩).

واتە: هەر کەسێك لەسەر ماڵ و سامانی خۆی بکوژرێ، شەهیدە.

زانایانی ئیسلام باسیان لەوە کردوە، کە ئەگەر کەسێك یەك دینار بە زوڵم لەتۆ بستێنێ، ئایا وا باشە دینارەکەی بدەیتێ و لە کۆڵت بێتەوە، یان نەیدەیەو دیفاع لەخۆت بکەی؟ لەوەڵامدا زۆربەیان دەڵێن: واباشە نەهێڵی و دیفاع لەو دینارە بکەی،پاشان گوتراوە: ئەگەر نەهێڵی، چۆن نەهێڵی؟ دەڵێن: سەرەتا بەهەڕەشە کردن، ئەگەر بەهەڕەشە لێت دوورکەوتەوە، ئەوە باشە، ئەگەرنا هەوڵ بدەی بریندارى بکەی، ئەگەر بەوەش هەر وازی لێ نەهێنای، دەتوانی بیکوژی، خوێنەکەشی بەخۆڕایی (هدر) دەڕواو تۆڵە (قصاص)یشی نیە، ئەو بەهیلاك دەچێ و، تۆش پاداشتت هەیە، چونکە دیفاعت لەماڵی خۆت کردوە، کە شەرعزانان بەم مەسەلەیە دەڵێن: (دَفْعُ الصائل)[1].

هەروەها پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ:

{مَنْ قُتِلَ دُونَ مَالِهِ فَهُوَ شَهِيدٌ، وَمَنْ قُتِلَ دُونَ دَمِهِ فَهُوَ شَهِيدٌ، وَمَنْ قُتِلَ دُونَ دِينِهِ فَهُوَ شَهِيدٌ، وَمَنْ قُتِلَ دُونَ أَهْلِهِ فَهُوَ شَهِيدٌ} أَخْرَجَهُ عَبْد الرّزّاق برقم: (١٨٥٦٥)، وَأَحْمَد

---

(١) بەرپەرچدەرەوەی هەڵکوتەرەسەر و دەستدرێژییکار.

برقم: (١٦٥٢)، وَعَبْدُ بْنُ حُمَيْد برقم: (١٠٦)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٤٧٧٢)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (١٤٢١)، وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيح، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٤٠٩٥)، وَأَبُو يَعْلَى برقم: (٩٤٩)، وَصَحَّحَهُ الأَلبَانِي.

واتە: هەرکەسێك لەسەر ماڵی بکوژرێ، شەهیدە، وەهەرکەس لەسەر خوێن (نەفس)ی بکوژرێ، شەهیدە، وە هەرکەس لەسەر ئایینی بکوژرێ، شەهیدە، وە هەرکەس لەسەر ماڵ و خێزان (نامووس و ئابڕوو)ی بکوژرێ، شەهیدە.

کەواتە: دابین کردنی مافەکان لە ئیسلامدا، ئەرك (وظیفة)ن و، ئەگەر ئینسان کەمتەرخەمییان تێدا بکات، گوناهبار دەبێت، واتە: شتێك نیە بڵێی: قەیناکات چاوپۆشیی لێ دەکەم، بەڵکو خوای زاڵ و بەهێز لەسەر کەمتەرخەمیی کردنت، سزات دەدات، هەرکەسێك زوڵم قبووڵ بکاو، هەوڵ نەدا بۆدەستەبەرکردنی مافی شەرعیی خۆی، ئەوە لەدنیادا بەئاگری زاڵمەکان دەسووتێ و، خوای باڵادەستیش لەڕۆژی دواییدا بەئاگری خۆی دەیسووتێنێ، لەسەر ئەوەی کە لەبەرانبەر زاڵمەکاندا هەڵوێستی نەبووە، ئەوەش بەدەقی ئایەت، وەك خوای دادگەر دەفەرموێ:

﴿ وَلَا تَرْكَنُوٓاْ إِلَى ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ فَتَمَسَّكُمُ ٱلنَّارُ ﴾ هود: ١١٣.

واتە: مەیل مەکەن بەلای ئەوانەدا کەزوڵم دەکەن (هەر جۆرە زوڵمێك: زوڵمی سیاسیی، ئابووریی، کۆمەڵایەتیی، نەتەوەیی) لێیان نزیك مەکەونەوە (مەبنە دەست و پێوەندیان و خزمەتکاریان)، ئەگەرنا، ئاگری دۆزەخ دەتانگاتێ، (وەخوای دادگەر سزاتان دەدات لەسەر ئەوەی کەمتەرخەمیتان کردوە، لەبەرگریی لێکردنی مافی خۆتاندا).

**ئێستاش با دووبارە سەرنج بدەینەوە:**

# بناغەی ئەرك و
# مافەكانی مرۆڤ لەئیسلامدا

هەرچەندە پێشتریش ئاماژەمان بۆ کرد، شەریعەتی ئیسلامیی لەسەر سێ (٣) بناغەو بنەما ئەرك و مافەكانی مرۆڤی بنیات ناون:

یەکەم: تەنیا خوا - جل جلالە - بەدیهێنەرو پەروەردگارو خاوەنی شتێکە.

دووەم: ئینسان دروستکراوێکی ناوازەی هەڵبژاردەیە و، بەجێنشینی خوا داندراوە لەسەر زەوی.

سێیەم: ئینسانەکان یەکسانن لەماددە و لەسروشت و لەمافەکانیاندا .

ئێستاش با باسێکی ئەوسێ بنەمایە بکەین:

## بنەمای یەکەم: تەنیا خوا -جل جلالە- بەدیهێنەر و پەروەردگار و خاوەنی هەموو شتێکە:

وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿أَلَيْسَ ٱللَّهُ خَٰلِقُ كُلِّ شَيْءٍ﴾ الزمر: ٦٢.

یان دەفەرموێ: ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ۝٢﴾ الفاتحة:٢.

یان دەفەرموێ: ﴿قُلِ ٱللَّهُمَّ مَٰلِكَ ٱلْمُلْكِ﴾ آل عمران: ٢٦.

کەواتە ئەوەی کەبەدیهێنەرو پەروەردگارەو خاوەنە بۆ هەمووشتێك، تەنیا

خوا(الله)یە - جل جلالە -، مادام وایە تەنها خوا (الله)ش حەقی ئەوەی هەیەو شایستەیی ئەوەی هەیە، کەئەرك و مافەکان بۆ ئینسانەکان دیاریی بکات و پێیان بدات.

ئنجا ئەوەش حیکمەتێکی گەورەی تێدایە، چونکە کاتێك خوا مافێك بۆ ئینسان دیاریی دەکات وەك بەندەی خۆی و، جێنیشینی خۆی لەسەر زەوی، هیچ کەسێك بۆی نیە نەبەناوی دینەوە، نەبەناوی سیاسەتەوە،نەبەناوی بەرژەوەندیی گشتییەوە، نەبەهیچ ناوێکەوە، ئەو مافەی لیَ زەوت بکات، کەخوا پێی داوە، حەق و مافێك خوا بەبەندەکانی خۆی بدات، هیچ بەندە (عبد)ێك بۆی نیە لێیان بستێنێتەوە، بەڵام ئەگەر بەندە (عبد)ەکان بۆ خۆیان لە نێوان خۆیاندا ڕێك بکەون، لەسەر هەندێك ماف، دەشتوانن دوایی سەوداو مامەڵەیان لەسەر بکەن!

## بنەمای دووەم: ئینسان درووستکراوێکی ناوازەی هەڵبژاردەیە و، بەجێنشینی خوا دانراوە لەسەر زەوی:

بەداخەوە زۆر کەس بەتایبەتی خوێندەواران و ڕۆشنبیرانی نێو میللەتەکەمان، یان هاندەرێکیان نەبووە، یان چەواشەکراون، یان بەرچاویان لێڵ کراوە،بۆیە لەقورئان و سوننەتیان نەکۆڵیوەتەوەو، نازانن کەمرۆڤ لەئیسلامدا پایەو مەقامێکی بەرزی وای هەیە، لەهیچ فەلسەفەو بەرنامەو فیکرەیەکی دیکە دا، ئینسان ئەو پایەو مەقامەی نەدراوەتیَ، بەڵکو نێوانیان ئاسمان و ڕێسمانە!! کە دەتوانین بەخێرایی لە (١٠) خاڵدا ئاماژەی بۆ بکەین:

### ١- ئینسان بەندەی خوایە:

زۆر کەس وا دەزانیَ ئەوە ئیهانەیە بەئینسان، بەڵام نەخێر، ئینسان کاتێك لە کۆیەلایەتیی ڕزگاری دەبیَ، کەبەندەی خوابیَ، کاتێك زنجیرو کۆت و پێوەندی طاغووت و دیکتاتۆرەکان لەدەست و پیَ وملی خۆی دادەرنیَ، کەبەندەی خوابیَ، چونکە خوا بەدیهێنەر (خالق)ی هەموانە و ئیمتیازی بەسەر

دروستکراوە (مخلوق)ەکانیدا هەیە، بەڵام ئەوانی دیکە هەموویان دروستکراون، بۆیە هیچ کەسێك حەقی ئەوەی نیە خەڵك بکاتە کۆیلەی خۆی و خزمەتکاری خۆی، بەڵێ، ئینسانەکان بەوە ڕزگاریان دەبێ لەکۆیلایەتیی و خزمەتکاریێتیی و، لە وابەستەیی و دابەستەیی بۆ یەکدی، کەبەندەی خوابن، خوای بەدیهێنەر دەفەرموێ:

﴿ وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ﴿٥٦﴾ ﴾ الذاريات:٥٦.

واتە: ئینسان و جند (جن)م تەنیا بۆ ئەوە دروست کردوون کەبەندایەتییم بۆبکەن.

دیارە خوای پەروەردگار پێویستی بەبەندایەتیی ئێمە نیە، بەڵام ئێمە ئەگەر بەندەی خوا نەبین، تووشی کۆیلایەتیی و خزمەتکاریی بۆ طاغووتەکان دەبین!

**با تەماشا بکەین!** ئایا لە (یەکێتی سۆڤـیەتی) پێشوودا، بیردۆزەی (مارکسیزم - لینینیزم) وەك بت (صنم)ێك نەدەپەرسترا؟!! ئایا پەیکەرە مۆمیاکراوەکەی (لینین) لەکۆشکی (کرملین)دا نەدەپەرسترا؟! ئایا (مارکس) وەك بتێك نەدەپەرسترا؟! ئێستاش ئایا کۆشکی سپی و بڕیارەکانی کۆنگرێس و بۆچوونەکانی (جۆرج W بۆش)وە باقی سەرانی ئەمریکی لەلایەن ئەمەریکاییەکانەوە وەك کتێبی پیرۆز (الکتاب المقدس) سەیر ناکرێن؟! وەهەروەها، ئینسان ناتوانێ بێ پەرستراو بژی، جائەگەر پەرستراو (معبود)ی حەقیقیی نەپەرست، کەخوا (الله)یە، پەرستراوە ساختەکان (المعبودات المزیفة)، یان ئینسانێکی وەك خۆی دەپەرستێ، جاچ مردوو بێ چ زیندوو، یان ئەستێرەو مانگ و خۆر دەپەرستێ، یان حیزبێك دەپەرستێ، یان دەوڵەتێك دەپەرستێ، گرنگ ئەوەیە ئینسان بێ پەرستراو ناژی.

### ٢- ئینسان جێنیشین (خلیفة)ی خوایە:

جێنشینی خوا، واتە خوا مرۆڤی لەسەر زەوی داناوە بۆ ئاوەدانکردنەوەی زەوی، جاچ جێنشینی خوا (خلیفة الله)بێ، چ جێنشینی دروستکراوێکی دیکەبێ، کەخوا لەسەر زەوی دایناوە، ئنجائایا مرۆڤ جێنشینی کێیە لەدروستکراوانی

دیکە، کە لەپێش ئینساندا لەسەر زەوی ژیابن[1]؟ بەهەر حاڵ لە نێو توێژەرەوان (مفسرین)ی قورئاندا مشتومڕێك لەوبارەوە هەیە، بەڵام گرنگ ئەوەیە ئینسان جێنشینە و لەسەر زەوی داندراوە، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ:

﴿ وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّى جَاعِلٌ فِى ٱلْأَرْضِ خَلِيفَةً ﴾ (البقرة: ٣٠.

وە ئەوە بەڕاستیی بەڕاستی پایەو مەقامێکی یەکجار بەزرە، مەقام لەوە بەرزتر؟! واتە: لەخوای پەروەردگار بێتەخوار، ئینسانە، چونکە جێنشین (خليفة) واتە: ئەو کەسەی لەشوێنی ئەو زاتە دادەنیشێ، کە کردوویەتی بەجێنشینی خۆی، خوا ئینسانی لەسەر زەوی داناوە، بۆ ئەوەی سەرزەوی ئاوەدان بکاتەوە، وەك لەئایەتی دیکەدا باسی دەکات و دوایی دەیهێنین.

**٣- خوای پەروەردگار ئینسانی بەشێوەیەکی تایبەت خوڵقاندووەو لەڕووحی تایبەتی خۆی فووی بەبەرداکردوە:**

وەك دەفەرموێ:

﴿ فَإِذَا سَوَّيْتُهُۥ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِى ﴾ الحجر:٢٩.

واتە: ئنجا کاتێك جەستەی ئینسانم ڕێك خست، وە لەڕووحی تایبەتی خۆم فووم بەبەردا کرد.

هەڵبەتە ڕووحی ئینسان لەخوای تاك وپاك جیا نەبۆتەوە، بەڵام ڕووح دروستکراو (مخلوق)ێکی تایبەتە، خوا - جل جلاله - بەفوو (نفخة)ی تایبەتی خۆی ناوی هێناوە، ئەوەش نهێنی (سرّ)ێکە تەنیا خوای بەرزو مەزن دەیزانێ چییە، وەك دەفەرموێ:

﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِ ۖ قُلِ ٱلرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّى ﴾ الاسراء:٨٥.

---

(١) ئەمە ڕایەکی زاناو توێژەرەوانی قورئانە، کەڕایەکی بێ هێزەو هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نیەو، ڕای ڕاست ڕای یەکەمە، وەك لەبەرگی یەکەمی: (خواپەرستیی ئیسلامیی)دا ڕوونمان کردۆتەوە.

بەڵام گرنگ ئەوەیە ئەوە پایەو مەقامێکە بە ئینسان دراوە، بەسەر هەموو دروستکراوەکانی دیکەدا، خوای پەروەردگار بەهیچ کام لەدروستکراوەکانی دیکەی نەفەرمووە: لەڕووحی خۆم فووم بەبەردا کردوون، تەنیا بە ئینسانی فەرمووە، واتە ئەو ڕووحەی کە دروستکراوی تایبەتیی خوایە.

**٤- خوا - جل جلاله - بەفریشتەکانی فەرمووە: سەجدەی ڕێزگرتن بۆ ئادەم بەرن و، سەجدەیان بردوە:**

بەڵێ، بابی بەشەر (ئادەم) سەجدەی بۆ براوی فریشتەکانە!! وە لەشوێنی دیکەدا دەفەرمویٚ:

﴿ فَسَجَدَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ كُلُّهُمْ أَجْمَعُونَ ﴾ الحجر:٣٠.

واتە: تێکڕای فریشتەکان لەئاسمانەکان و زەوی دا سەجدەیان بۆ ئادەم برد، سەجدەی ڕێز و حورمەتگرتن (سجده التكريم والتشريف).

**٥- خوای پەروەردگار سپاردەیەك، کە بەئاسمانەکان و زەوی و شاخەکان هەڵنەگیراوە، بەمرۆڤی سپاردوە و ئەویش هەڵیگرتوە:**

وەك خوا فەرموویەتی:

﴿ إِنَّا عَرَضْنَا ٱلْأَمَانَةَ عَلَى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱلْجِبَالِ فَأَبَيْنَ أَن يَحْمِلْنَهَا وَأَشْفَقْنَ مِنْهَا وَحَمَلَهَا ٱلْإِنسَٰنُ إِنَّهُۥ كَانَ ظَلُومًا جَهُولًا ﴿٧٢﴾ ﴾ الأحزاب:٧٢.

پایە لەوە بەرزتر؟! ئەو ئەرکەی بەئینسان سپێردراوە لەبوونەوەردا، نە ئاسمانەکان و نە زەوی و نەشاخەکان، هیچیان نەیانتوانیوە ئەو ئەرکە هەڵگرن، بەڵام ئینسان توانی، ئینسان شایستەی ئەوە بوو، کەخوا جل جلالە ئەو شایستەییەی پێداوە، ئەو ئەمانەتەش ئەوەیە، کە ئینسان بەویستی ئازادانەی خۆی لەسەر ئەم زەوییە بژیەت، بەوشێوەیە کەخوا پێی خۆشەو فەرمانی پێ کردوە، ئەو توانا و ئازادییەی پێ دراوە، یاخود بەوشێوەیەی کەخواپێی ناخۆشە، کە ئەو بوارو مۆڵەتەشی هەرپێ دراوە.

ئائەوە ئەمانەتێکە لەئەستۆی ئینساندا، ئەو ئیرادە ئازادە کەئینسان دەتوانێ بەرێی شەڕو خراپەداپێی بڕوا، یان بەرێی خێرو چاکەدا.

**٦- خوای پەروەردگار ئاوەدانکردنەوەی زەوی بەئینسان سپاردوە:**

وەك دەفەرموێ:

﴿هُوَ أَنشَأَكُم مِّنَ ٱلۡأَرۡضِ وَٱسۡتَعۡمَرَكُمۡ فِيهَا﴾ هود: ٦١.

واتە: خوا ئێوەی لەزەوی دا پێکەیاندوە، وە ئاوەدان کردنەوەی زەویشی بەخۆتان سپاردوە.

هەندێك کەس وا دەزانن کەباسی دینداریی کرا، نابێ باسی دنیاداریی بکرێ، بەڵام خوای زانا وتوانا دەفەرموێ: خوا ئاوەدان کردنەوەی سەرزەوی بەئێوە سپاردوە.

**٧- خوا هەرچی لەئاسمانەکان و زەویدایە، بۆ مرۆڤی ڕام کردوە:**

وەك فەرموویەتی:

﴿وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعٗا مِّنۡهُ﴾ الجاثية: ١٣.

واتە: هەرچی لە ئاسمانەکان و زەوی دا هەیە، هەمووی بۆ ئێوە مەیسەر کردوە.

هەندێك کەس وا دەزانن کە ئەهلی دین پێیان ناخۆشە کە ئینسان پێی ناوەتە سەر مانگ، یان ئەگەر لەداهاتوودا بگاتە سەر (مریخ)، یان بگاتەسەر هەر خڕۆکەیەکی دیکە!! نەخێر بەپێچەوانەوە: ئەگەر ئینسان لەدین تێگەیشتبێ و، لەڕوانگەی قورئانەوە تەماشا بکات، دەزانێ خوای پەنهان بین دەفەرموێ: ئاسمانەکان و زەوییم بۆ ئێوە ڕام و دەستەمۆ (مُسَخَّر) کردوون، تاکو سوودیان لێ ببینن، کەواتە: ئەگەر ئینسان بتوانێ بچێتە شوێنی زۆر دوورتر لەمانگ و (مریخ)یش، ئنجا ئەوە مانای ئەوەیە، کەلەو بوارەدا هەنگاوی ناوەو بەو مەجالەدا ڕۆیشتوە کە خوا بۆی ئاسان کردوە.

**٨- خوا ڕێزی لەوەچەی ئادەم گرتوە و، لەوشکانیی و دەریادا هەڵیگرتوون و، بەسەر زۆر لە دروستکراوەکانیدا هەڵیبژاردوون:**

وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ:

﴿ وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِيٓ ءَادَمَ وَحَمَلْنَٰهُمْ فِي ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ وَرَزَقْنَٰهُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَفَضَّلْنَٰهُمْ عَلَىٰ كَثِيرٍ مِّمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلًا ﴿٧٠﴾ ﴾ الاسراء: ٧٠.

واتە: بەتەئکید ڕێزمان لە وەچەی ئادەم گرتوە (بەهەموو شێوە و ڕەگەزەکانیانەوە)، وە لەدەریاو لەوشکانییدا هەڵمانگرتوون، (واتە هۆکارەکانمان بۆ سازاندوون، کە بتوانن لەوشکایی و دەریادا پێیان بڕۆن و سەفەریان پێ بکەن) وە بەسەر زۆر لە دروستکراوەکانمان دا، پلەو ئیمتیازمان پێداون:

وەك دەبینین خوای کاربەجێ فەرموویەتی:

﴿ وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِيٓ ءَادَمَ ﴾ الاسراء: ٧٠.

ڕێزمان لەوەچەی ئادەم گرتوە، دیارە خوا - جل جلاله - دەزانێ کە لە وەچەی ئادەم (هابیل)یش هەیەو (قابیل)یش هەیە، کافریش هەیەو مسوڵمانیش هەیە، کەچی دەفەرموێ: ڕێزمان لەوەچەی ئادەم گرتوە، کەواتە: ڕێز لێگیرانی ئینسان گشتی یەو، سەرجەم ئینسانەکان وەك خۆیان ڕێز لێگیراون.

ئنجا ئایا ڕێزەکە لەچی دایە؟! لەوەدایە کە دەفەرموێ:

﴿ وَحَمَلْنَٰهُمْ فِي ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ ﴾ الاسراء: ٧٠.

واتە: سەرزەوی و بوونەوەرمان بۆ ڕام و دەستەمۆ کردوون.

﴿ وَفَضَّلْنَٰهُمْ عَلَىٰ كَثِيرٍ مِّمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلًا ﴿٧٠﴾ ﴾ الاسراء: ٧٠.

یانی: کۆمەڵێك ئامادەیی و شایستەیی (إستعدادات) بەئینسان دراون، کەلە دروستکراوەکانی دیکەدا نین.

### ٩- خوا مرۆڤی لەباشترین شێوە و پێكهاتەدا دروستكردوە:

وەك خوای كاربەجێ دەفەرموێ:

﴿لَقَدۡ خَلَقۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ فِيٓ أَحۡسَنِ تَقۡوِيمٖ﴾ التين:٤.

واتە: (وەبێگومان ئینسانمان لەباشترین شێوە پێكهاتنی ماددیی و مەعنەویی دا خولّقاندوە): واتە: هیچ مەخلووقێكی دیكە بەوشێوەیە كەئینسان خولّقاوە، دروست نەكراوە.

### ١٠- خوا مرۆڤی ئازاد و سەرپشك كردوە لەنێوان ئیمان هێنان و كافربوون دا:

وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ:

﴿وَقُلِ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّكُمۡۖ فَمَن شَآءَ فَلۡيُؤۡمِن وَمَن شَآءَ فَلۡيَكۡفُرۡ﴾ الكهف:٢٩.

واتە: ئەی موحەممەد! بفەرموو: حەق لەپەروەردگارتانەوەیە، ئنجا كێ پێی خۆشە، بائیمان بێنی و، كێش پێی خۆشە باكافر بێ:

ئا ئەوە گەورەترین ڕێز دانانە بۆ ئینسان، ڕێز دانانە بۆ بوون و كەسایەتیی، هەرچەندە خوا كوفری پێ ناخۆشە، بەلاّم ڕێی لەئینسان نەگرتوە ڕێی كوفریش بگرێتەبەر، چونكە ئینسان كاتێك بوونی خۆی ئیسپات دەكات، كە ئازاد بێت.

## بنەمای سێیەم: یەکسانیی مرۆڤەکان لەمادده و لەسروشت و لەمافەکانیان دا:

یەکسانیی و وەك یەك بوونی ئینسانەکان بەهەموو ڕەنگ و ڕەگەز و زمانە جیا جیاکانیانەوە، لەوەدا کە هەموویان بەندەی خوان و، خاوەنی یەك سروشتن و، بۆ یەك ئەرك و حیکمەت و ئامانجیش خوڵقێنراون، یەکی دیکەیە لە سێ بنەما و بناغەی مافەکانی مرۆڤە.

دیارە یەکسانیی ئینسانەکانیش، دەیان دەقی قورئان و سوننەت دەلالەتی لەسەر دەکەن و، شتێکی یەکجار ئاشکراو ڕوونە، بۆ وێنە:

١- ﴿ لَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ فِىٓ أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ ﴾ التین:٤.

٢- ﴿ وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِىٓ ءَادَمَ ﴾ الاسراء:٧٠

٣- ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَٰكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَىٰ وَجَعَلْنَٰكُمْ شُعُوبًا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓا۟ ۚ إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ ٱللَّهِ أَتْقَىٰكُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ ﴿١٣﴾ ﴾ الحجرات:١٣.

٤- ((كُلُّكُمْ لِآدَم وَآدَم خُلِقَ مِنْ تُراب)) رواه أحمد وغیره.

وەلە کۆتایی ئەم خاڵەدا، بەپەسندی دەزانم ئاماژە بۆ دووپلەو ئیمتیازی دیکەی تێڕوانینی ئیسلام بۆ مافەکانی مرۆڤ بکەم، بەسەر تێڕوانینی ڕۆژئاوادا:

یەکەمیان:

ئەوەیە کەدان پێداهێنان و دابینکردنی ئیسلام بۆ مافەکانی مرۆڤ، بەرهەمی کردوکۆشی کەس نیەو، هەر لەسەرەتاوە کەخوای پەروەردگار قورئانی ناردۆتە خوارێ، ئەو ئایەتانەشی ناردوونە خوارێ و نەپێویستی کردوە کە کەس ڕاپەڕین و شۆڕش بکات و، نەپێویستی کردوە خەڵك کۆبوونەوەی لەسەربکەن و، داوا بکەن کە ئینسانەکان ڕێزیان لێ بگیرێ و، مافیان پارێزراوبێ، چونکە خوا

دروستکەری ئینسانەکانە و هەمووما فەکانی پێداون و، هەموو ڕێزو حورمەتێکی بۆ داناون.

**دووەمـــیـــان:**

ئەوەیە کەلەئیسلامدا ئەرك و مافەکانی مرۆڤ، وەك چۆن وەك دروشم (شعار) باس کراون، میکانیزمی بەرجەستەکردنیشیان دیاریی کراوە، هەروەها پشتیوانە (ضمانة) شیان بۆ داندراوە، کە گەورەترین زەمانەتی دابینکردنی ماف و ئەرکەکانی مرۆڤ، بریتیە لەئیمان، پاشان بریتیە لەدەوڵەت و حکوومەت و، لە شەریعەتی ئیسلامییدا دەبێ دەوڵەت بەهەمووهێزو توانای خۆیەوە، لەپشت ڕێز لێگرتنی ئینسان و کەرامەتی ئینسان و، ماف و ئەرکەکانی ئینسانەوە بوەستێ و، ڕێ نەدات هیچ کەس و لایەنێك، بەهیچ بیانووو پاساوێکەوە، پێشێلیان بکات.

## باسی دووەم: ئەرك و مافە بنەڕەتییەکانی ئینسان لەئیسلامدا

### یەك: دابین کردنی ژیانێکی ئازادانە:

بنەڕەتی ترین و سەرەکیترین مافی ئینسان لەئیسلامدا، بریتیە لەوە کە ژیان و گوزەرانێکی ئازادانەو سەربەرزانەی بۆ دابین بکرێ، لەسۆنگەی ئەوەوە، کە خوای دادگەرو کاربەجێ، ئینسانی بۆ ئەوە خوڵقاندوە کەتاقی بکاتەوەو، تاقیکردنەوەکەیشی بەوە دەبێ کە بەندایەتیی کردنی خۆی لەسەری پێویست کردوە:

﴿ وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ﴿٥٦﴾ ﴾ الذاريات:٥٦.

ئنجا ئەو بەندایەتیی کردنەی مرۆڤیش بۆ خوا، بەهۆی پابەندیی بە بەرنامەی خواوە جل جلالە دێتە دی:

﴿ إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ ﴿٥﴾ ﴾ الفاتحة:٥.

﴿ ٱهْدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلْمُسْتَقِيمَ ﴿٦﴾ ﴾ الفاتحة:٦.

ئنجا بۆ ئەوەی بەڕاستی ئینسان لەو مەیدانەدا بتوانێ ئیمتیحانی خۆی بدات و تاقی بکرێتەوە، خوای کاربەجێ ویستێکی ئازادی پێ بەخشیوەو توانای ئەوەی پێداوە، کەبە هەر لایەکدا حەز بکات بڕوات:

﴿ وَقُلِ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكُمْ فَمَن شَآءَ فَلْيُؤْمِن وَمَن شَآءَ فَلْيَكْفُرْ ﴾ الكهف: ٢٩.

بۆیە ئەگەر ئیسلام کیان و دەوڵەتێکی هەبێ، کەهەموو خەڵکی سەر زەوی بخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە، بێ ئەوەی تۆسقاڵێك زەخت و فشار بخاتەسەر هیچکەس، تێکرای ئینسانەکان سەرپشك دەکات لەنێوان ئیسلام و کوفرداو، پاشان هەم مسوڵمانەکەو هەم کافرەکە بەیەکسانیی هەل و مەرجەکانی ژیانێکی ئازادانەو سەربەرزانەیان بۆ دەڕەخسێنرێ، بۆ ئەوەی حیکمەتی خوای کاربەجێ لەخوڵقاندنی بەشەردا، کەتاقیکردنەوە (إبتلاء)یە بێتەدی:

﴿ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلۡمَوۡتَ وَٱلۡحَيَوٰةَ لِيَبۡلُوَكُمۡ أَيُّكُمۡ أَحۡسَنُ عَمَلًاۚ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡغَفُورُ ۝٢﴾ الملك: ٢.

**ئەگەر یەكێك بپرسێ:**

چۆن كیان و دەوڵەتێكی ئسلامیی ڕێ بەخەڵكی دەدات، كە لەسەر كوفرو شیرك بمێننەوەو، لە ژێر ڕكێفی دەستەڵاتی ئیسلامیشدا بژین، مەگەر سەرانە (جزية) لێوەرگیران و لەسەر دینی خۆ مانەوە، تایبەت نیە بەخاوەن كتێبەكان (أهل الكتاب)ەوە، كەجوولەكەو دیانەكانن؟!!

لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا، بەپێویستی دەزانم كورتە لێكۆڵینەوەیەك لەبارەی مەسەلەیەكەوە بكەم، كەچەند جارێكیش لە كۆڕو كتێبەكانمدا ئاماژەیەكی خێرام بۆ كردوە[1] ئەویش ئەوەیە كە: لەبارەی ئەوەوە كەئایا تەنها خاوەن كتێبەكان سەرانەیان لێ وەردەگیرێ و، وازیان لێ دەهێنرێ كەلە ژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامیی دابژین، یان ئەو حوكم و هەڵوێستەی شەریعەت تایبەت نیە بە (أهل الكتاب)ەوەو، سەرجەم ئینسانەكان دەگرێتەوە، چ خاوەن كتێب بن، چ هاوبەش دانەر (مشرك)، چ بێ بڕوا (ملحد)، چ بێ دین (زنديق)...هتد؟!.

هەڵبەتە بەندە بیروڕاو قەناعەتم وایە كە سەرجەم ئینسانەكان، خاوەنی هەر جۆرە دین و فیكرەیەك بن، لەشەریعەتی وردبین و دووربین و دادگەری ئیسلامدا، ڕێیان پێ دەدرێ، كە لە ژێر سێبەری دەوڵەت و كیانی ئیسلامیی دا بژین و، سەربەزرانە قۆناغی ژیانی دنیاو دەرفەتی تێدا تاقیكرانەوەیان بگوزەرێنن، وەپێشم وایە جگە لەم ڕایە هەڵەیەو، بەهیچ جۆرێك لەگەڵ شەرع و عەقڵدا ناگونجێ و، لەگەڵ چەندان دەقی قورئان و سوننەتدا دژ دەوەستێ و تێك دەگیرێ، ئەمەش چەند بەڵگەیەك بۆ ئیسپاتی ڕاستیی، ئەو ڕایەی هەڵمان بژاردوە:

---

(١) لەهەركام لەكتێبی: (ئیسلام و دەوڵەتداریی) بەرگی چوارەم، وە كتێبی: (الإسلام كما يتجلى في كتاب الله) بەرگی هەشتەم دا، بەدرێژیی ئەو بابەتەمان توێژیوەتەوە.

١- خوای دادگەر فەرموویەتی:

﴿ لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِۖ قَد تَّبَيَّنَ ٱلرُّشۡدُ مِنَ ٱلۡغَيِّ ﴾ البقرة: ٢٥٦.

واتە: لەئیسلامدا تۆبزیی کردن (إکراه) و زۆرە ملێ (إجبار) بۆ سەپاندنی دین و عەقیدە، قەدەغەیە.

ئنجا بێگومان دین و عەقیدە بەزۆرە ملێ هەرناگونجێ وەربگیرێ، چونکە سەرەنجام بابای تۆبزیی لێکراو، دەچێتە حاڵەتی دووڕوویی (نفاق)یەوەو، ئاشکراشە کە جۆری کوفری پەنهان (نیفاق) لەکوفری ئاشکرا خراپترەو بەزەرتریشە بۆ ئەهلی ئیسلام. هەر بۆیەش خوای باڵا دەست لەبارەی نیفاقەوە هەڕەشەی توندی کردوەو، پانتاییەکی زیاتری قورئانیشی بۆ کەشف و خستنەڕووی مونافیقان تەرخان کردوەو، ئەوەندەش بەسە کە خوای دادگەر، بنی بنەوەی دۆزەخی بۆ مونافیقان داناوە:

﴿ إِنَّ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ فِي ٱلدَّرۡكِ ٱلۡأَسۡفَلِ مِنَ ٱلنَّارِ ﴾ النساء: ١٤٥

واتە: بێگومان دەغەڵەکان لە پلەی ژێرەوەی ئاگر- ی دۆزەخ - دان.

کەواتە: بەڵێ، دروست نیە هیچ جۆرە کافرێك بخرێتە نێوان: هەڵبژاردنی ئیسلام بەزۆرە ملێ و ناچاریی یانی: (نیفاق)، و کوژرانەوە، بەڵکو دەبێ هەمووکەس مافی ئەوەی بدرێتێ کەلەسەر فیکرەی خۆی بمێنێتەوەو سەرانە بدات و، ببێتە هاووڵاتییەکی سەربەزری ژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامیی!

٢- ئنجا مادام خوای دادگەر لەچەندان ئایەتدا ڕایگەیاندوە، کەمافی هەڵبژاردنی یەکێك لەکوفرو ئیمانی، بەبەندەکانی داوەو، پاشان زۆر بەڕوونییش فەرموویەتی: هیچ کەس بۆی نیە زۆر لەبەندەکان بکات بۆ ئیمان هێنان، هیچ جێگای مشت و مڕو ڕاجیایی لەو مەسەلەیەدا نەماوەتەوە.

**با سەرنج بدەین:**

أ- ﴿وَقُلِ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّكُمۡۖ فَمَن شَآءَ فَلۡيُؤۡمِن وَمَن شَآءَ فَلۡيَكۡفُرۡ﴾ الكهف: ٢٩.

واتە: وەبڵێ: هەق لە پەروەردگارتانەوەیە، جاکێ دەیەوێ بائیمان بێنێ و، کێش حەز دەکات باکافر بێت.

ب- ﴿وَلَوۡ شَآءَ رَبُّكَ لَأٓمَنَ مَن فِي ٱلۡأَرۡضِ كُلُّهُمۡ جَمِيعًاۚ أَفَأَنتَ تُكۡرِهُ ٱلنَّاسَ حَتَّىٰ يَكُونُواْ مُؤۡمِنِينَ ٩٩﴾ يونس:٩٩.

واتە: وەئەگەر پەروەردگارت ویستبای، هەمو ئەوانە کە لە زەوی دان، تێکڕایان ئیمانیان دەهێنا، ئنجا ئایا تۆ زۆر لەخەڵکی دەکەی تاکوببنە بڕوادار!! (کە دیارە ڕووی دواندن لەپێغەمبەری خوایە(صلی الله علیه وسلم)؛ واتە تۆش ئەو مافەت نیە!).

ج- هەروەها هەر لەو بارەوە خوای دادگەر بەپێغەمبەری کۆتایی خۆی(صلی الله علیه وسلم) فەرمووە:

﴿فَذَكِّرۡ إِنَّمَآ أَنتَ مُذَكِّرٞ ٢١ لَّسۡتَ عَلَيۡهِم بِمُصَيۡطِرٍ ٢٢﴾ الغاشية:٢١-٢٢.

د- وەفەرموویەتی:

﴿وَمَآ أَنتَ عَلَيۡهِم بِجَبَّارٖۖ فَذَكِّرۡ بِٱلۡقُرۡءَانِ مَن يَخَافُ وَعِيدِ ٤٥﴾ ق: ٤٥

کەواتە: تەنانەت پێغەمبەری خواش (صلی الله علیه وسلم) بێجگە لەبیرخستنەوەو بێدارکردنەوە و قورئان بەسەردا خوێندنەوە، ماف و دەستەڵاتێکی دیکەی بۆ مسوڵمان کردنی کافرو موشریکەکان پێ نەدراوە!

٣- پاشان خوای کاربەجێ تبارك وتعالى بەڕاشکاویی فەرموویەتی، کە ئینسانەکان لەژیانی سەر زەمیندا، بۆ کافرو مسوڵمان دابەش بوونە:

﴿ هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَكُمْ فَمِنكُمْ كَافِرٌ وَمِنكُم مُّؤْمِنٌ ۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿٢﴾ ﴾ التغابن:٢.

کەواتە: ویستی خوای مەزن وابووە کەلەم ژیانە زەمینییەدا، هەم کافر هەبن و هەم مسوڵمانیش! پاشان لەهیچ دەقێکی شەرعیشدا نەهاتوە کە دەبێ کافران قەڵاچۆو بنبڕ (إبادة) بکرێن، بەڵکو لەو ئایەتەش دا کە خوای کاربەجێ فەرمانمان پێ دەکات بەئامادەکردنی هێز (قوة) لە دژی کافران، فەرموویەتی:

﴿ وَأَعِدُّوا۟ لَهُم مَّا ٱسْتَطَعْتُم مِّن قُوَّةٍ وَمِن رِّبَاطِ ٱلْخَيْلِ تُرْهِبُونَ بِهِۦ عَدُوَّ ٱللَّهِ وَعَدُوَّكُمْ ﴾ الأنفال: ٦٠

وەك دەبینین ئامانج و حیکمەتی هێز سازکردنەکە بریتیە لە : ترساندنی دوژمنان (إرهاب الأعداء) نەك قەڵاچۆکردنیان (إبادتهم)!

٤- ئنجا جێی خۆیەتی بپرسین: ئایا لەحاڵێکدا کە دەوڵەتی ئیسلامیی ئەهلی کوفر سەرپشك (مختار) دەکات لەنێوان مسوڵمان بوونی بەرواڵەتیی و، کوژران (الإسلام الظاهري والقتل)دا، ئایا چۆن و کەی ئەوتاقیکردنەوە (إبتلاء)یەی خوای دادگەر بۆ بەندەکانی دێتەدی، کەلە چەندان ئایەتی قورئاندا، جەختی لە سەر کراوەتەوەو، نەك تەنهابەهۆکارو ئامانج و حیکمەتی دروستکرانی ئینسان دانراوە، بگرە کراوەتە حیکمەت و ئامانج و فەلسەفەی تێکرای بوون (الوجود)؟! وەك فەرموویەتی:

﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ وَكَانَ عَرْشُهُۥ عَلَى ٱلْمَآءِ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ﴾ هود: ٧.

واتە: وە خوا ئەو زاتەیە کەئاسمانەکان و زەوی لە شەش ڕۆژان دا دروستکردوون، وە ئەوکاتە عەرشەکەی لەسەر ئاو بوو، تاکو تاقیتان بکاتەوە، داخۆ کامەتان کردەوەتان چاکترە!

بەڵێ، بەبێ ئازادبوونی ئینسان لەهەڵبژاردنی بیروبڕوادا، تاقیکرنەوەی مرۆڤ دەبێتە ناوی بێ نێوەڕۆك، بێگومان ئەوەش لەئایین و بەرنامەی بێ هەڵەو پەڵەی خوای کاربەجێ ناوەشێتەوەو، پێچەوانەی حیکمەت و فەلسەفەی خوڵقێنرانی مرۆڤیشە!.

٥- پێغەمبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) هەرکاتێك کۆمەڵێك جەنگاوەری لەهاوەڵانی دڵسۆزی بۆ جەنگ ڕەوانە کردبێ، عادەتی وابووە کەبەم شێوەیە ئاراستەی کردوون و فەرموویەتی:

{إِذَا لَقِيتَ عَدُوَّكَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ فَادْعُهُمْ إِلَى ثَلاَثِ خِصَالٍ... فَإِنْ أَبَوا فَسَلْهُم الجِزْيَة}

أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٢٣٠٢٨)، تعليق شعيب الأرنؤوط: إِسْنَادُهُ صَحِيح عَلَى شَرْطِ مُسْلِم، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٢٦١٤).

واتە: وە هەرکاتێك بەرەنگاری دوژمنەکەت بووی لەهاوبەش دانەران، بانگیان بکە بۆ یەکێك لەسێ شتان... جائەگەر ڕازی نەبوون (مسوڵمان بن) داوای سەرانەیان لێ بکە[1].

---

(١) ئەو سێ شتانەش وەك لەدەقی فەرموودەکەدا هاتوون، ئەمانەن: ١- مسوڵمان بوون ٢- سەرانەدان ٣- جەنگ، دیارە دووەمیشیان دروست نیە، مەگەر دوای نەبوونی یەکەم، وە سێیەمیش دروست نیە، مەگەر لەکاتی نەبوونی دووەم دا، ئەمەش دەقی فەرموودەکەیە:
[عن سليمان بن بُرَيْدة عن أبيه قال: كان رسول الله (صلى الله عليه وسلم) اذا أَمَّر أميراً على جيش أو سَرِّيةٍ أوصاهُ في خاصَّته بتقوى الله ومَن مَعَهُ من المسلمين خيراً، ثم قال: أُغزُوا باسم الله في سبيل الله، قاتِلوا من كفر بالله، أغزوا ولاتَغُلُّوا، ولا تَغْدِروا، ولا تَمْثُلوا(*)، ولا تقتلوا وليداً واذا لقيت عدوَّك من المشركين فادعهم الى ثلاث خِصالٍ أو خلالٍ فأَيَّتُهُنَّ ماأجابك، فاْقْبَلْ منهم وكُفَّ عنهم: ثم ادعهم الى الإسلام، فإن أجابك فأْقْبَلْ منهم وكُفَّ عنهم، ثم ادعهم الى التحوُّلِ من دارهم الى دار المهاجرين وأخْبِرهم أَنَّهم إن فعلوا ذلك فلهم ما للمهاجرين وعليهم ما على المهاجرين. فإن أَبَواْ أن يتحَوَّلُوا منها فأَخْبِرهم أنهم يكونون كأعراب المسلمين، يجري عليهم حكم الله الذي يجري على المؤمنين ولا يكون لهم في الغنيمة والفَيء شَيء إلاّ أن يجاهدوا مع المسلمين. فإن هم أَبَواْ فسَلْهم الجزية، فإن هم أجابوك فاْقْبَلْ منهم وكُفَّ عنهم. فإنْ هم أَبَواْ فاْستَعِنْ بالله وقاتِلْهُم] رواه مسلم: ٤٤٩٧.
(*)مَثَلَ بالقتيل: جَدَعَهُ ومَثَل به: نكَّل به والإسم: المُثْلَة، مختار الصحاح ص٥٣٠.

دیارە ئەم فەرمایشتە بەڕوونیی ئەوە دەگەیەنێ كەهاوبەش بۆ خوادانەران (مشركین)یش وەك ئەهلی كیتاب، سەرانەیان لێ وەردەگیرێ و لەو بارەیەوە هیچ جیاوازییان نیە.

٦- هەروەها دەربارەی وەرگیرانی سەرانە لە فارسەكانو كە بێگومان ئەهلی كیتاب نەبوونە، ئەم دەقەی سوننەت هەیە:

{عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ أَنَّهُ قَالَ لِعَمل كِسْرى: أَمَرَ نَبِيّنَا صَلَّى اللَّهُ علية وَسَلَّمَ أَنْ نُقَاتِلَكُمْ حَتَّى تَعْبُدُوا اللَّهَ وَحْدَهُ أَوْ تُؤَدُّوا الْجِزْيَةَ} أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ برقم: (٣١٥٩).

وەك دەبینین موغەیرەی كوڕی شوعبە (خوا لێی ڕازی بێ) لەكاتی جەنگی نەهاوەنددا، بە كار بەدەستێكی كیسرا دەڵێ: پێغەمبەرمان (صلی الله علیه وسلم) ڕەوانەكراوی پەروەردگارمان فەرمانی پێ كردووین، كە لە دژتان بجەنگین، تاكو یان تەنها خوا دەپەرستن، یان سەرانە دەدەن...

٧- هەروەها دەربارەی وەرگیرانی سەرانە (جزية) لەمەجووسی هەجەر، ئەم دەقەی سوننەتیش هەیە:

{عَنْ عُمَرَ أَنَّهُ لَمْ يَأْخُذَ الْجِزْيَةَ مِنَ المَجُوسِ حَتَّى شَهِدَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ علية وَسَلَّمَ أَخَذَهَا مِنْ مَجُوسِ هَجَرَ} (أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٦٨٥) تَعْلِيق شُعَيْب الأَرْنَؤُوط: إِسْنَادُهُ صَحِيح عَلَى شَرْطِ البُخَارِي، رِجَالُهُ ثِقَات رِجَالُ الشَّيْخَيْنِ غَيْر بجالة التميمي، فَمِنْ رِجَال البُخَارِي، وَالبُخَارِيُّ برقم: (١٧٣١)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٣٠٤٥)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (١٥٨٦)، وَالدَّارِمِيُّ برقم: (٢٥٠١).

ئاشكراشە كەمەجووسییەكان ئاگرپەرست بوونەو، لەسەر هیچ دینێكی خوایی نەبوونە.

ئنجا هەر چەندە پاش ئەم بەڵگە ڕوون و بەهێزانەی قورئان و سوننەت، پێویستمان بە هیچ شتێكی دیكە نیە، بەڵام با بۆ زێدە دڵنیایی، سەرنجێكی قسەی هەندێك لە زانایانیش بدەین:

١- **( النووي)** لە کاتی شەرح کردنی فەرموودەکەی (بريدة)دا گوتوویەتی:
(هذا مما استدل به مالك والأوزاعي وموافقوهما في أخذ الجزية من كل كافر عربياً كان أو أعجمياً، كتابياً أو مجوسياً أو غيرهما) بڕوانە: شرح صحيح مسلم، ج٧ ص٣١٣.

واتە: ئەم فەرموودەیە (فإذا لقيت عدوك من المشركين...) لەو بەڵگانەیە کە (مالك) و (أوزاعی) و هاوڕایەکانیان بەبەڵگەیان هێناونەوە لەسەر ئەوە، کەسەرانە لەهەموو جۆرە کافرێك وەردەگیرێ، عەرەب بێ یان عەجەم و، خاوەن کتێب بێ یان مەجووسیی، یان غەیری ئەوانەش...

٢- **(الصنعاني)**یش هەر لەشەرحی فەرموودەی ناوبراودا گوتوویەتی:

(في الحديث دليل عن أن الجزية تؤخذ من كل كافر، كتابي أو غير كتابي، عربي أو غير عربي، لقوله: (عدوك) وهو عام.. وأما الآية فأفادت أخذ الجزية من أهل الكتاب ولم تتعرض لأخذها من غيرهم ولا لعدم أخذها، والحديث يبين أخذها من غيرهم.. وأما عدم أخذها من العرب فلأنها لم تُشَرّعْ إلا بعد الفتح، وقد دخل العرب في الإسلام ولم يبق منهم محارب.. واستمر هذا الحكم بعد عصره (صلى الله عليه وسلم) ففتحت الصحابة رضي الله عنهم بلاد فارس والروم وفي رعاياهم العرب خصوصاً الشام والعراق، ولم يبحثوا عن عربي من عجمي، بل عَمَّموا حكم السبَّيْ والجزية على جميع من استولوا عليه، وبهذا يعرف أن حديث بريدة كان بعد نزول فرض الجزية وفرضها كان بعد الفتح، فكان فرضها في السنة الثامنة عند نزول براءة) بڕوانە: سبل السلام، ج٤ ص٤٧.

واتە: لەو فەرموودەیەدا بەڵگە هەیە لەسەر ئەوە کە سەرانە لەهەموو کافرێك وەردەگیرێ، کیتابیی و غەیری کیتابیی، عەرەب و غەیری عەرەب، چونکە فەرموویەتی: (دوژمنەکەت) کەوشەیەکی گشتییە، ئنجا هەرچی ئایەتەکەیە، ئەوە دەگەیەنێ کە سەرانە لەئەهلی کیتاب وەردەگیرێ، بەڵام باسی وەرگرتنی یان وەرنەگرتنی لەغەیری ئەوان نەکردوە، بەڵام فەرموودەکە ڕوونی کردۆتەوە، کە لە غەیری وانیش وەردەگیرێ...

بەڵام هۆی وەرنەگیرانی لەعەرەب، ئەوە بووە کەوەرگرتنی سەرانە تەنها پاش ئازادکرانی شاری مەککە (فتح مكه) دانراوە، هەتا ئەوکاتەش عەرەبەکان هاتبوونە نێو ئیسلامەوە، هیچ جەنگاوەرێکیان نەمابوو لەدژی ئیسلام...

ئنجا ئەو حوکمە پاش سەردەمی پێغەمبەریش(صلى الله عليه وسلم) هەر بەردەوام بوو، هاوەڵانی (خوالێیان ڕازی بێ) وڵاتانی فارس و ڕۆمیان ئازاد کرد، کە عەرەبیشیان لەنێودا هەبوون، بەتایبەت شام و عێراق، وە هاوەڵان هەوڵیان نەداوە کەعەرەب و عەجەم لەیەك جیابکەنەوە، بەڵکو حوکمی بەدیلگرتنی وەچەو سەرانە وەرگرتنیان، بەسەر سەرجەم ئەوانەدا گشتاندوە، کە خستوویاننە ژێر قەڵەمڕەوی حوکمی ئیسلامەوە، وە لەمەوە دەزانرێ کە فەرموودەکەی (بريدة) پاش هاتنە خوارەوەی حوکمی سەرانە بووەو، حوکمی سەرانەش پاش ئازاد کردنی مەککە بووە، واتە: لە ساڵی هەشتەمداو لەکاتی هاتنە خوارەوەی سووڕەتی (البراءة)دا.

٣- **(إبن قيم الجوزية)**ش کە یەکێکە لەلایەنگرانی ئەو ڕایەی کەهەڵمان بژاردوە، لەو بارەوە گوتوویەتی:

(وقالت طائفة: في الأمم كلها إذا بذلوا الجزية قبلت منهم. أهل الكتابين بالقرآن، والمجوس بالسنة، وَمْن عداهم ملحق بهم، لأن المجوس أهل شرك لا كتاب لهم، فأخذها منهم دليل على أخذها من جميع المشركين،وإنما لم يأخذها صلى الله عليه وسلم من عبدة الأوثان من العرب، لأنهم أسلموا كلهم قبل نزول آية الجزية، فإنها نزلت بعد تبوك وكان رسول الله فرغ من قتال العرب واستوثقت كلها له بالإسلام،ولهذا لم يأخذها من اليهود الذين حاربوه لأنها لم تكن نزلت بعد، فلما نزل أخذها من نصارى العرب ومن المجوس، ولو بقي حينئذ أحد من عبدة الأوثان بذلها لقبلها منه، كما قبلها من عبدة الصلبان والنيران، وهذا القول أصح في الدليل كما ترى) بڕوانە: زادالمعاد، ج٥ ص٩٢،٩١.

واتە: وە کۆمەڵێك گوتوویانە: سەرجەم میللەتان ئەگەر سەرانە بدەن، لێیان وەردەگیرێ، جوولەکەو دیانەکان بەدەقی قورئان و، مەجووسییەکان بە دەقی

سوننەت و، غەیری ئەوانیش قیاس دەکرێنە سەر وان، چونکە مەجووس هاوبەش دانەرن و هیچ کتێبیان نین، ئنجا وەرگرتنی سەرانە لەوان بەڵگەیە بۆ وەرگرتنی لەتێکرای هاوبەش دانەران، وە هۆی وەرنەگرتنی سەرانە لە لایەن پێغەمبەرەوە (صلی الله علیه وسلم) لەبت پەرستەکانی عەرەب، ئەوە بووە کە بت پەرستەکان تێکرا بەر لەهاتنە خوارەوەی ئایەتی سەرانە[1] مسوڵمان بووبوون، کەپاش جەنگی (تبوك) هاتۆتە خوارێ، وە ئەوکاتە پێغەمبەری خوا لەجەنگی عەرەبەکان بووبووەو، هەموویان بەئیسلامەوە پەیوەست بوو بوون، هەربۆیەش سەرانەی لەو جوولەکانەش وەرنەگرت کە لە دژی جەنگین، چونکە جارێ ئایەتی سەرانە نەهاتبۆ خوارێ، بەڵام پاش هاتنە خوارەوەی، لەدیانە عەرەبەکان و لەمەجووسیشی وەرگرت، وەبێگومان ئەگەر هەتا ئەوکاتە هەرکام لە بتپەرستەکان مابایەو سەرانەی دابایە، لێی وەردەگرت، وەك چۆن لەخاچپەرست و ئاگرپەرستەکانی وەرگرت، وەئەم قسەیە وەك دەبینی، لەڕووی بەڵگەوە لەقسەکەی دیکە بەهێزترە.

٤- **(الشوكاني)**یش کە لایەنگری هەمان ڕایە لەوبارەوە گوتوویەتی:

( قوله: (فسلم الجزية) ظــاهره عدم الفرق بين الكافر العجمي والعربي وغير الكتابي) بڕوانە: نيل الأوطار ، ج٧ص٢٤٥.

واتە: فەرموودەکەی (فَسَلْهُم الجزية) سەرانەیان لێ داوابکەن، ڕواڵەتەکەی جیاوازیی نەکردنە لەنێوان کافری عەجەمیی و عەرەبیی و غەیری خاوەن کتێب دا.

هەروەها گوتوویەتی: (ظــاهر الأدلة يقتضي أن بذل الجزية من أي كافر يوجب الكف من مقاتلته.. فإن قوله: (كان رسول الله..) يدل على أن هذا كان شأنه في كل جيش يبعثه...) بڕوانە: (السيل الجرّار)ج٤ ص٥٧٠-٥٧١.

---

(١) ئایەتی سەرانە ئەم ئایەتەیە: ﴿ قَٰتِلُواْ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَلَا بِٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَلَا يُحَرِّمُونَ مَا حَرَّمَ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَلَا يَدِينُونَ دِينَ ٱلۡحَقِّ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ حَتَّىٰ يُعۡطُواْ ٱلۡجِزۡيَةَ عَن يَدٖ وَهُمۡ صَٰغِرُونَ ٢٩ ﴾ (التوبة:٢٩).

واتە: ڕواڵەتی بەڵگەکان ئەوە دەخوازێ، کەسەرانەدان لەهەر کافرێکەوە، دەست گێڕانەوە لەجەنگ لەدژکردنی، پێویست دەکات، چونکە قسەکەی: (کان رسول الله) ئەوە دەگەیەنێ کە هەر سوپایەکی ناردبێ هەر وای پێ فەرمووە.

هەروەها گوتوویەتی: (والحاصل: أنّ من ادعَّى أن طائفة من طوائف الكفار لا يجوز ضرب الجزية عليه، بل تُخيَّرُ بين الإسلام والسيف، فعليه الدليل ولا دليل تقوم به الحجة إلا ماورد في المرتد) بڕوانە: (السيل الجرار)٤ ص٥٧٠-٥٧١.

واتە پوختەی مەبەست: هەرکەسێك لافی ئەوە لێبدات کەکۆمەڵێك و جۆرێك لە کافران هەن، کە دروست نیە سەرانەیان لێ وەربگیرێ، بەڵکو لەنێوان ئیسلام و شمشێردا سەرپشك دەکرێت، پێویستە بەڵگە بێنێتەوەو هیچ بەڵگەیەکیش نیە، کە قسە بڕبێت، مەگەر ئەوەی کەلەبارەی هەڵگەڕاوەوە هاتوە!

لە کۆتایی ئەم بڕە لێکۆڵینەوەیەشدا، بەپێویستی دەزانم ئاماژە بۆ فەرمایشتێکی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بکەم، کەڕەنگە گومان و دوو دڵییەك لەبارەی ئەو ڕایەوە کەهەڵمان بژارد، لەدڵی هەندێك کەسدا پەیدا بکات، ئەگەر وەك پێویست لێی حاڵی نەبین!

**ئەویش ئەمەیە:**

{أُمِرْتُ أَنْ أُقَاتِلَ النَّاسَ حَتَّى يَشْهَدُوا أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللهِ، وَيُقِيمُوا الصَّلاَةَ، وَيُؤْتُوا الزَّكَاةَ، فَإِذَا فَعَلُوا ذَلِكَ عَصَمُوا مِنِّي دِمَاءَهُمْ وَأَمْوَالَهُمْ، إِلاَّ بِحَقِّ الإِسْلاَمِ وَحِسَابُهُمْ عَلَى اللهِ} أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ برقم: (٢٤)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٣٦).

واتە: فەرمانم پێکراوە کە لەدژی خەڵکی بجەنگم، تاکو شایەتمان دێنن، کە بێجگە لەخوا، هیچ پەرستراوی دیکەی - ڕاست - نین، وە کە من پێغەمبەری خوام، وە نوێژ بەرپابکەن و زەکات بدەن، ئنجا ئەگەر ئەوەیان کرد، ئەوە خوێن و سامانی خۆیانیان لەمن قەدەغەکردوە، مەگەر بەهەقی ئیسلام، وە لێپرسینەوەشیان لەسەر خوایە.

بەڵێ، ڕواڵەتی ئەم فەرمایشتە ئەوە دەگەیەنێ، کەخەڵکی لە نێوان مسوڵمان بوون و هاتنە مەیدانی جەنگ دا، سەرپشك بکرێن!.

**بەڵام هەر بەکورتی دەڵێین:** ئەم فەرمایشتە کورت (مجمل)ەو درێژە (تفصیل)ی ئەو مەبەستە لەدەقی دیکەدا هاتوە، وەك پێشتر هەر لەم ئاڵقەیەدا باسمان کرد و، لەئاڵقەی سێیەمیش دووبارە قسەی لەبارەوە دەکەین، کەهەمیشە خەڵکی خراونە بەردەم سێ بژاردە (خیار)ەوە: مسوڵمان بوون، سەرانەدان، جەنگ: (الإسلام، الجزية، القتال)، دیارە سەرجەم زانایانیش لەسەر ئەوە یەکدەنگن، کەپێویستە هەمیشە دەقە کورتەکان لەبەر ڕۆشنایی دەقە تەفصیلییەکاندا فام بکرێن، بۆ ئەوەی بەهەڵەدا نەچین، وە بۆ ئەو مەبەستە زانایانی (أصول الفقه) ئەم بنچینە شەرعییەیان داناوە: (يُحْمَلُ الـمُجْمَلُ على الـمُفَصَّلِ)، واتە: دەقی کورت، لەبەر ڕۆشنایی دەقی درێژ و ڕوون دا دەفامرێتەوە.

پێشم وایە لەئەنجامی ئەم برە توێژینەوەیەدا زۆر چاك ڕوون بۆتەوە، کە ئەو ڕایە چەندە ڕاست و بەهێزە، کەئێمە هەڵمان بژاردو، بێجگە لە (مالك) و (الأوزاعي) و (إبن القيم) و (الصنعاني) و (الشوكاني) ژمارەیەك لەزانایانی هاوچەرخیش پەسندیان کردوە[1].

## بــەڵێ بەڕێـــزان!

لە دەوڵەتی ئیسلامیی دا هەموو کەمایەتییە فیکریی و دینییەکان، بە (ملحد) و (زنديق)ەکانیشەوە (نەك هەر ئەهلی کیتاب) هەموویان سەرانە (جزية)یان لێ قبووڵ دەکرێ و، لێیان قبووڵ دەکرێ هاووڵاتیی بن و، لە ژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامیی دا بژین، وەلەسەر دین و فیکرەو بەرنامەی خۆشیان بن، لەڕووی شەخسیی و نێو خۆیانەوە، بەڵام بێگومان دەبێ ڕێز بگرن لەو ئەدەب و یاساو ڕێسایانەی کە بەسەر ئەو کیان و قەوارەیەدا حاکمن و، ئەمەش لەهەموو وڵاتانی دنیادا هەر وایە.

---

(١) بڕوانە: (آثار الحرب..) د. وهبة الزحيلي ص٧٠١، ٧٠٢، وە : (الجهاد والقتال في السياسة الشرعية) د.محمد خير هيكل، ج٣ ص١٤٦٤.

وە خوای دادگەر کەدەفەرموێ:

﴿ هُوَ ٱلَّذِي خَلَقَكُمۡ فَمِنكُمۡ كَافِرٞ وَمِنكُم مُّؤۡمِنٞۚ ﴾ التغابن: ٢.

واتە: (خوای ئێوە خوڵقاندوە، هەتانە کافرەو، هەتانە ئیماندارە)، دەبینین لێرەدا (کافر)ەکەی پێش خستوە!، ئنجا ئایا حیکمەتی ئەوە چییە؟! حیکمەتێکی ئەوەیە کە: ڕەنگە هەندێك مسوڵمانی واهەبن پێیان وابێ، ئەگەر ئیسلام دەستەڵاتی هەبێ، یەك کافر لەسەر زەوی ناهێڵێ! بەڵام وانیەو، ئەوە تێڕوانین (تصور)ێکی هەڵەیە، چونکە خوای پەروەردگار، کە دەفەرموێ: خوائێوەی خوڵقاندوە، هەتانە کافرە، هەتانە مسوڵمانە، نەیفەرمووە: دەبێ کافرەکە قەڵاچۆ بکرێ، بەڵکو بوونی هەردووکیانی بەشتێکی واقیع و ئاسایی داناوە!.

وە کەباسی پێویست بوونی ئامادەکردنی هێز بۆ جەنگ و جیهادیش دەکات، دەفەرموێ:

﴿ وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا ٱسۡتَطَعۡتُم مِّن قُوَّةٖ وَمِن رِّبَاطِ ٱلۡخَيۡلِ تُرۡهِبُونَ بِهِۦ عَدُوَّ ٱللَّهِ وَعَدُوَّكُمۡ ﴾ الأنفال:٦٠

نافەرموێ: (تُبيدون به)[1]، بەڵکو دەفەرموێ: هێز ئامادە بکەن، تاکو دوژمنی خواو دوژمنی خۆتانی پێ بترسێنن، واتە: با دوژمنتان بایی ئەوەندە لێتان بترسێ، کە دەستدرێژیی نەکاتەسەرتان و، نەبێتە کۆسپ و ڕێگر لەبەردەم کاروانی بانگەوازی ئیسلامیی دا، ئەگەر نا، بابمێنێت، چونکەخوای بەدیهێنەر، ئەم دنیایەی تەنیا بۆ مسوڵمانان دروست نەکردوە.

ئنجا وەك نوکتەیەکی خۆش، بائەم بەسەرهاتەتان بۆ بگێڕمەوە: (ابن بطوطة) هەبووە کەیەکێك بووە لەگەڕیدەو مێژوونووسان: دەڵێن کەبەشاراندا دەگەڕاو دەگەیشتە هەر شوێنێك، پرسیاری دەکردو دەیگوت: ئێرە کوێیە و دانیشتوانی کێن؟! ئنجا ئەگەر مسوڵمان نشین بوایە، دەیگوت: (عَمرّها الله) واتە: خوا

---

(١) أَبادَهُ يبيده، قەڵا چۆی کرد، قەڵا چۆی دەکات.

ئاوەدانی بکات، وە ئەگەر نامسوڵمان نشین بوایە، دەیگوت: (دمرها الله) واتە: خوا کاولی بکات!! کە بێگومان ئەو بۆچوونە ڕاست نیە، چونکە ئیسلام هاتوە کەهەموو سەر زەوی ئاوەدان بکاتەوە، چ ئەوەی بەمسوڵمانەتیی تێیدا دەژی، وە چ ئەوەی بەکافرێتیی تێیدا دەژی،گرنگ ئەوەیە کافرەکە ڕێ حوکمڕانێتی ئیسلام نەگرێ، ئەویش کاتێك کەمسوڵمانان دەستەڵاتیان هەبوو، کە بتوانن حوکمڕانێتی جیهانگیر بکەن، وەك ئێستا ئەمەریکا دەیەوێ بیرو بەهاکان (قیم)ی خۆی بەسەر دنیادا حاکم بکات، کە زادەو هەڵقوڵاوی هزری مرۆڤیشن، دیارە خوای پەروەردگاریش ئەو حەقەی هەیە، کە بەرنامەو شەریعەتەکەی بەسەر هەموو دنیادا حاکم بێ، - هەڵبەتە لەمیانەی قەناعەت و بڕواپێهێنان و قبووڵکردنی ئارەزوومەندانە و ئازادانەی خۆیان دا- لەحاڵێکدا کە بە باشترین شێوە ڕێز لە هەموو کەمایەتییە فیکریی و دینییەکان دەگرێ و، بەختەوەریی و سەرفرازیی ڕاستەقینەی دنیایی و دواڕۆژیی بۆ ئینسانەکان دابین دەکات[1].

دیارە ژیانێکی ئازادانەش پێویستیی بەوە هەیە، کە ئینسان ئازادیی بیرکردنەوەی هەبێ، ئازادیی دەربڕینی هەبێ، ئازادیی هەڵبژاردنی عەقیدەو بیروبڕوای هەبێ، وە ئازادیی سیاسیی و کۆمەڵایەتیی و شەخسیی و ئابووریی و سەرجەم ئازادییەکانی دیکەی هەبن، کەبەکورتیی لەبڕگەکانی داهاتوودا ئاماژەیان بۆ دەکەین.

---

(١) ئاشکراشە ڕانواندنی ئیسلام لەسەر خەڵك و، بانگەوازکردنیان بۆی لەم ڕۆژگارەدا، بەهۆی گەشەکردن و بەرە و پێشچوونی تەکنۆلۆژیای زانستییەوە، زۆر سێنابووە بۆ مسوڵمانانی خاوەن هیممەت.

**دوو: مسۆگەر کردن و پاراستنی حەوت (٧) ئامانجە مەزنەکە (ضمان وحماية المقاصد السَّبعة العظيمة):**

خوشك و برا بەڕێزەكان! لەشەریعەتی ئیسلامیی و لەفیقهی ئیسلامیی دا، زانایانی (أصول الفقه) بەتایبەتی، زاراوەیەكیان هەیە كەبریتیە لە: (الضروريات الخمس) یان (الضروريات الست)، ئەو پێنج شتانەی كەپێویستن، یان ئەو شەش شتانەی كەپێویستن و، كۆمەڵگای ئیسلامیی و دەوڵەتی ئیسلامیی دەبێ بۆ هەموو هاووڵاتییان دابینیان بكات[1]، بەڵام من وام بەڕاستترزانی، كە بەلای كەمەوە بیانكەین بە حەوت (٧) و بڵێین: حەوت ئامانجەكان (المقاصد السبعة) كە بریتین لە:

١- دین.
٢- ژین.
٣- وەچە (النسل).
٤- ئابڕوو.
٥- هێمنیی و ئاسایش.
٦- عەقڵ.
٧-ماڵ و سامان.

دیارە ئەو حەوت شتانەش هەموو ئینسانێك پێویستیی پێیان هەیە، چونكە بەبێ ئەوان ژیان و گوزەرانی بەڕێوە ناچێ.

---

(١) بڕوانە: (نظرية الإسلام وهديه)ی أبو الأعلى المودودي، ص٣٠٨، كە لەو بارەوە دەڵێ: (والإسلام لا يفرق في هذا الباب بين سكان الدولة من المسلمين وأهل الذمة وهو يضمن لكل رجل من أهل الذمة - كمايضمن لكل رجل من المسلمين - بأن الدولة لن تحرمه من المأكل والملبس والمسكن.).

**١- پاراستنی ئایین (حفظ الدین):**

هەڵبەتە (دین) تەنیا بەمانای ئەو ئایین و بەرنامەیە نیە کەخوا ناردوویەتی، چونکە ئەوەی خوا ناردوویەتی، ئەوە ئایینی حەقە، ئەگەرنا وشەی (دین) بەمانای هەر بەرنامەیەکە کە ئینسان پەیڕەویی لێدەکات، جائەگەر خوا ناردبی، ئەوە دینێکی ئاسمانیی پێ دەڵێن، ئنجا ئەگەر (نسخ) نەکرابێتەوە، کەئیسلامە، ئەوە دینی حەقە، وەئەگەر (نسخ)یش کرابێتەوە، یان گۆڕابێ و دەستکاریی کرابێ و شێوانێنرابێ، وەك هەرکام لەجوولەکایەتیی و دیانەتیی (الیهودیة والنصرانیة)، هەروەها هەر دینێکی دیکەی خوایی گۆڕاوو شێوێنراو، ئەوە دینێکی بەتاڵە، چونکە هەرچەندە ئەو دینانە لەئەسڵدا خوایی و ڕاست بوونە، بەڵام دوایی، یان نەسخ کراونەوە، یان دەستکاریی کراون و گۆڕاون، وە ئەگەر ئینسانیش دایبنابن، وەك: کاپیتالیزم، لیبرالیزم، مارکسیزم، سۆسیالیزم... هتد، کەبێگومان ئەوانەش هەموویان دینن، بەڵام زادەی بیرو هۆشی مرۆڤن، ئەوە دینیی بەشەریی و دەستکرد (وضعي)یان پێ دەگوترێ.

ئنجا مافی دینداریی (حق التدین) بریتیە لەوەی، کە هەموو ئەو ئینسانانەی لە ژێر سایەی دەوڵەتیی ئیسلامیی دا دەژین، ئازاد بن لە هەڵبژاردنی ئەو دینەدا کە بەپەسندی دەزانن و، بەزۆر هیچ دین و بەرنامەیەکیان بەسەردا فەرز نەکرێ و، دینی دڵپەسەندی خۆیشیانیان لێ قەدەغە نەکرێ، وەك خوا فەرموویەتی:

﴿ لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِ ﴾ البقرة -٢٥٦-.

**٢- پاراستنی ژین (حفظ الحیاة):**

ئەمیش ئەوەیە کە هەرکام لەو کەسانەی هاوڵاتیی کیان و دەوڵەتی ئیسلامیین، هەم هۆکارەکانی ژیانێکی ئینسانانەی ئاسوودەیان بۆ دابین بکرێن و، هەم ژیان و گوزەرانیشیان پارێزراو بێت لەهەرجۆرە مەترسیی و دەستدرێژییەك، دیارە قەدەغە کرانی قەتڵیش هەر لەو سۆنگەیەوەیە، بۆیەش خوا فەرموویەتی:

﴿ وَلَكُمۡ فِي ٱلۡقِصَاصِ حَيَوٰةٞ .. ﴾ البقرة -١٧٩-.

واته: وه لەتۆڵەدا ژیان بۆئێوه هەیه.

هەروەها خوا فەرموویەتی:

﴿ وَكَتَبۡنَا عَلَيۡهِمۡ فِيهَآ أَنَّ ٱلنَّفۡسَ بِٱلنَّفۡسِ وَٱلۡعَيۡنَ بِٱلۡعَيۡنِ وَٱلۡأَنفَ بِٱلۡأَنفِ وَٱلۡأُذُنَ بِٱلۡأُذُنِ وَٱلسِّنَّ بِٱلسِّنِّ وَٱلۡجُرُوحَ قِصَاصٞۚ فَمَن تَصَدَّقَ بِهِۦ فَهُوَ كَفَّارَةٞ لَّهُۥۚ وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ٤٥ ﴾

المائدة -٤٥-.

دیاره هەركام لەئایەتی (١٧٩)ی (البقرة) و (٤٥)ی (المائدة) لەسیاقێكی گشتیدا هاتوون، بۆیه چەمك و واتایەكەیان گشتییه و مسوڵمانان و نامسوڵمانان دەگرێتەوە، واته: هەركەسێك كه ژیان و نەفس و ئەندامیان هەبن.

### ٣- پاراستنی وەچە (حفظ النسل):

ئەمیش ئەوەیه كه هەركام لەهاووڵاتییان، هەل و مەرجی ماڵ و حاڵ پێكەونان و، وەچە لێكەوتنەوەیان بۆ بسازێنرێ و، بەهەمان شێوەش وەچەیان وەك قەدەغەو پیاوانێك بپارێزرێ، هەر بۆیەش داوێن پیسیی قەدەغە كراوە و، سزای سەد (١٠٠) قەمچیی بۆ زیناكارانی نێر ومێ دانراوە، وەك خوا فەرموویەتی:

﴿ ٱلزَّانِيَةُ وَٱلزَّانِي فَٱجۡلِدُواْ كُلَّ وَٰحِدٖ مِّنۡهُمَا مِاْئَةَ جَلۡدَةٖ .. ﴾ النور -٢-.

### ٤- پاراستنی ئابڕوو (حفظ العرض):

ئەمیش ئەوەیه كه دەبێ هەموو هاووڵاتییەك لە ژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامییدا، ئابڕووو كەرامەتی و كەسایەتیی سەلامەت و پارێزراو بێت، هەربۆیەش شەریعەت بوختان (قذف) و، زەم و غەیبەت و، ناوو ناتۆره وه دواخستن و، جاسووسیی لەسەركردن و.. هتد و حەرام كردوه، ئنجا چ بەرانبەر بەهاووڵاتییەكی مسوڵمان بكرێن، چ هاووڵاتییەكی نامسوڵمان! چونكه هەركەسێك ڕازی بێ كه هاووڵاتیی

کیان و دەوڵەتێکی ئیسلامیی بێت و، لە ژێر سێبەری ئیسلامدا ژیان بەسەربەرێ، دین و عەقیدەو بەرنامەی هەر شتێك بێ، هیچ لەمەسەلەکە ناگۆڕێ و، مادام تەنیا خوای دادگەر بەدیهێنەرو پەروەردگاریەتی و لێشی سەلماندوە کەبەویستی خۆی بژیەت و، هیچ شتێکی لەسەر فەرزنەکردوە، هیچ کەسێکی دیکە بۆی نیە کەبەو بیانووەوە، هیچ جۆرە زمان درێژیی و دەستدرێژییەك بکاتە سەر کەسایەتیی و کەرامەتی و،کت و مت و وەك مسوڵمانان، هەر جۆرە ئازاردان و زیان پێگەیاندنێکی، حەرام و قەدەغەیە.

لە (صحیح البخاري)دا هاتوە، کەخەلیفەی چوارەمی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) عەلی کوڕی ئەبووتالیب ئەم وتە بەجێیەی گوتوە:

(إنما قبلوا عقد الجزية حتى تكون أموالهم كأموالنا ودماؤهم كدمائنا)[١]

واتە: (أهل االذمة) - ئەوانەی کە دەبنە هاووڵاتیی دەوڵەتی ئیسلامیی و مسوڵمانیش نین - بۆیە قبووڵیان کردوە پەیمانمان لەگەڵدا ببەستن و ببنە هاووڵاتیی ئێمە، تاکو ماڵیان وەك هی ئێمە بێ و، خوێنیشیان وەك هی ئێمە بێ (هەروەها باقی مافەکانی دیکەشیان وەك هی ئێمە پارێزراو بن)[٢].

**٥- پاراستنی ئاسایش (حفظ الأمن):**

هەروەها هاوڵاتییانی ژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامیی مافی خۆیانە لەژیانێکی پڕهێمنیی و ئاسایش دا بگوزەرێنن، بەمانای گشتگیری ئاساییش و لەڕووی نەفسیی و جەستەیی و دارایی و خێزانیی و.. هتدەوە، هەربۆیەش خوا سزای ڕێگریی و تێکدانی ئاسایشی داناوە:

﴿ إِنَّمَا جَزَٰٓؤُاْ ٱلَّذِينَ يُحَارِبُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَسۡعَوۡنَ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَسَادًا أَن يُقَتَّلُوٓاْ

---

(١) بڕوانە: (بدائع الصّنائع) للكاساني، ج٧ص١١١، وە بڕوانە: (السير الكبير) للشيباني، ج٣ص٢٥٠.

(٢) ئەوەی نێوان دووکەوانەکە خۆم زیادم کرد، چونکە سیاقی قسەکە دەیگەیەنێ.

﴿أَوۡ يُصَلَّبُوٓاْ أَوۡ تُقَطَّعَ أَيۡدِيهِمۡ وَأَرۡجُلُهُم مِّنۡ خِلَٰفٍ أَوۡ يُنفَوۡاْ مِنَ ٱلۡأَرۡضِۚ ذَٰلِكَ لَهُمۡ خِزۡيٞ فِي ٱلدُّنۡيَاۖ وَلَهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ ٣٣﴾ المائدة -٣٣-.

**٦- پاراستنی عەقڵ (حفظ العقل):**

هەروەها هەموو کەسێك دەبێ لەسایەی کیان و دەوڵەتی ئیسلامییدا، هۆش و عەقڵی هەم گەشەی پێ بدرێ، هەم بشپارێزرێ لەهەر شتێك کەزیانی پێ بگەیەنێ و، ببێتە مایەی سست کردنی و پەکخستنی، هەر بۆیەش لە ئیسلامدا مادده سڕکەرو سەرخۆشکەرەکان قەدەغە کراون، تاکو عەقڵی خەڵك ساغ و سەلامەت بێ، چونکە ئینسان بەعەقڵ و هۆش لەئاژەڵ جیا دەکرێتەوە:

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلۡخَمۡرُ وَٱلۡمَيۡسِرُ وَٱلۡأَنصَابُ وَٱلۡأَزۡلَٰمُ رِجۡسٞ مِّنۡ عَمَلِ ٱلشَّيۡطَٰنِ فَٱجۡتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ٩٠﴾ المائدة -٩٠-.

**٧- پاراستنی ماڵ و سامان (حفظ المال):**

وە لە کۆتاییدا پێویستە لە ژێر سایەی حوکمڕانێتیی ئیسلامدا، ماڵ و سامانی هەموو هاووڵاتییان پارێزراوبێ، هاووڵاتییان هەم دەبێ مافیان هەبێ، کە کەسابەت بکەن و ماڵی حەلاڵ پەیدابکەن و، هەم ماڵەکەشیان سەلامەت و پارێزراو بێ، هەربۆیەش لەئیسلامدا سزای دزیی و ڕێگریی داندراوە، تاکو ماڵی خەڵك سەلامەت بێ:

﴿وَٱلسَّارِقُ وَٱلسَّارِقَةُ فَٱقۡطَعُوٓاْ أَيۡدِيَهُمَا جَزَآءَۢ بِمَا كَسَبَا..﴾ المائدة -٣٨-.

زۆر کەس هەیە پەرۆشی دەستی دزێ کیەتی، کە دەبڕدرێ، بەڵام پەرۆشی ماڵ و سەروەت و سامانی خەڵکێکی نیە، کە بەئارەقی نێوچاوان و ڕەنجی شان پەیدای کردوە، بەئاشکراو لە ڕێگرییدا لێی دەستێندرێ، یاخود بە پەنامەکیی و لەماڵی لێی دەدزرێ!! بەڵام نەخێر، پێویستە پەرۆشی هەوڵ و ماندوو بوون و ماڵ و سامانی خەڵکمان بێت، وە دیفاع لەکەسێك نەکەین، کە خیانەت و ناپاکیی

دەكات بەرانبەر بەماڵ و سامانی خەڵك، یان بەرانبەر بە ئابڕوو و كەڕامەتی خەڵك، وە نابێ بەزەییمان بە كەسێكی ناپاكدا بێتەوە، كەتاوان و دزیی دەكات و حوكمی شەرعی بەسەردا دەدرێ.

وە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەربارەی ئەو مافانە لەحەجی ماڵئاوایی (حجة الوداع)دا كەزیاتر لەسەد هەزار (١٠٠٠٠٠)كەس لەهاوەڵە بەڕێزەكانی لەخزمەتی دابوون، وە دوایین حەج بوو كردی، دوایین وتاریشی بوو كە بەو شێوەیە بەگشتی بۆیان بدات، فەرمووی:

{أَيها النَّاس! إِنَّ دمائكم وأموالكم وأعراضكم، عليكم حرام كحرمة يومكُم هَذَا في شَهْرِكُم، هَذَا في بلدكم هذا، ألا هل بَّلغْت؟ أَللّهُمَّ فاشْهَد!} أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ برقم: (٢٩٤١)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (١٩٠٥)، وغيرهما[١].

واتە: خوێنتان و ماڵتان و نامووس و ئابڕووتان لەسەرتان قەدەغەیە لەنێو خۆتاندا، وەك قەدەغەی ئەم ڕۆژەتان، لەم مانگەتاندا، لەم وڵاتەتاندا، ئایا پێم ڕاگەیاندن؟ خوایە! شایەدبە.



---

(١) بۆ درێژەی (خطبة حجة الوداع) بڕوانە: (مجموعة الوثائق السياسية للعهد النبوي والخلافة الراشدة) لمحمد حميدالله، ص٣٦٠-٣٦٨، الوثيقة رقم: ٢٨٧/ألف (خطبة حجة الوداع).

**سێ: مافە شەخسیی و تایبەتییەکان:**

لە ئیسلامدا هەموو ئینسانێك وەك تاكێك[١]، دەبێ مافە شەخسییەكانی بۆ دابین بکرێن، دیارە مافە شەخسییەكان زۆرن، بۆ وێنە: ئازادیی هەڵبژاردنی عەقیدە، وەك باسمانكرد، وە ئازادیی بیركردنەوەو دەربڕین، هەتا (أبو الأعلى المودودي)[٢] و (سيد قطب)و هەندێكی دیكە لە زانایانی ئیسلامیی هاوچەرخ، ڕەحمەتی خوایان لێ بێ، ڕایان وایە كەئەهلی كیتاب، یان: هاوپەیمانان، وەختێك لە ژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامییدا بن، بۆیان هەیە بانگەشە بكەن بۆ فیكرەو بیروبڕوای خۆیان، بەڵام بەبێ قسە گوتن بە ئیسلام، وە بۆیان هەیە بەشێوەیەكی بابەتیی (موضوعي) یانە باسی بیروبڕوای خۆیان بكەن و بانگەواز بكەن.

وە لە سەردەمی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) لەكاتێك دا وەفدی (نجران) هاتوە، لە مزگەوتی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) قسەكەر (خطيب)ی ئەوان هەستاوە قسەی خۆی كردوەو دیفاعی لەئاینی دیانەتیی (نصرانية)ی خۆیان كردوە، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) ئایەتی خوای بۆ خوێندوونەوەو باسی ئیسلامی بۆ كردوون[٣].

هەروەها لەمەدینە لەمزگەوتی پێغەمبەردا(صلى الله عليه وسلم) شاعیری موشریكەكان هێرشی كردۆتە سەر ئیسلام، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) بە (حەسسانی كوڕی ثابیت و كەعبی كوڕی مالیك)ی فەرمووە، كەدوو

---

(١) لێرەدامن قسە لەئینسان دەكەم، نەك لە مسوڵمان، ئینسان بەگشتی، چ مسوڵمان چ نامسوڵمان نێرو مێ و، گەورە و بچووك.

(٢) (أبو الأعلى المودودي) ڕەحمەتی خوای لێ بێ لەو بارەوە گوتویەتی: (فالذي يظهر من هذا بوجه قاطع أن كل طائفة من طوائف البلاد إذا كانت لاتوافق آراؤها آراء الأمة الإسلامية، لا تحول الدولة الإسلامية دون إظهار آراءها، وأما إذا حاولت نشر أفكارها وحمل الجمهور عليها بالطرق الإرهابية والعمل على قلب نظام البلاد بالقوة، فهناك تؤاخذها الدولة وتجازيها على أعمالها) بڕوانە: (نظرية الإسلام وهديه). ص٣٠٧.

(٣) بڕوانە: السيرة النبوية لابن هشام، ج٢ص٣٠٨-٣١٤.

شاعیر بوون لەهاوەڵان خوا لێیان ڕازی بێ، دیارە هەر جارەی یەکێکیان بووە، فەرموویەتی: هەڵسن وەڵامیان بدەنەوە، شیعر بەشیعر، وتار بەوتار، قسە بەقسە، ئەوەش لەکاتێکدا بووە کە ئیسلام لەوپەڕی دەسەڵاتی دا بووە!![1]

هەروەها ئازادیی جل و بەرگ و[2]، ئازادیی خواردن و خۆراك و، ئازادیی سەفەرو هاتووچۆ و، ئازادیی خانووبەرە و، ئازادیی گەشت و گەڕان، هەندێك کەس لەخۆوە پڕوپاگەندەی خراپمان بۆ دەکەن و دەڵێن: ئەگەر ئیسلامییەکان دەسەڵات و حوکمڕانییان بکەوێتە دەست، پێکەنین و زەردەخەنە قەدەغە دەکەن، چوونە سەیران و گەشت و گوزار قەدەغە دەکەن، بەرگ و پۆشاکی جوان و خواردنی خۆش قەدەغە دەکەن!!

بەڵام لەڕاستییدا ئەوە هەمووی درۆو دەلەسەیە، چونکە خوای بەخشندە دەفەرموێ:

﴿ قُلْ مَنْ حَرَّمَ زِينَةَ ٱللَّهِ ٱلَّتِىٓ أَخْرَجَ لِعِبَادِهِۦ وَٱلطَّيِّبَٰتِ مِنَ ٱلرِّزْقِ .. ﴾ الأعراف: ٣٢.

واتە: ئەی موحەممەد! پێیان بفەرموو: کێ جوانیی و ڕازاوەییەك، کە خوا خوڵقاندوویەتی بۆ بەندەکانی، وە ڕۆزییە پاك و بەلەزەت و خۆشەکانی، قەدەغە کردوون؟!

کێ قەدەغەی کردوون؟! ئەدی خوا بۆ بەندەکانی خۆی نەیخوڵقاندوون؟! بەڵام خوا فەرموویەتی: بەشێوەی شەرعیی وەدەستیان بێنن، وەبەشێوەی شەرعییش بەکاریان بێنن.

---

(١) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ج٤، ص٣٢٤-٣٢٨، ط ٢٠٠٦،دار بن الهيثم.

(٢) دیارە لەگەڵ ڕەچاوکردنی ئەدەبە شەرعییە گشتییەکانی کۆمەڵگای مسوڵماندا.

## چوار: مافە ئابوورییەکان:

هەموو ئینسانێك لە ژێر سایەی دەستەڵات و قەوارەیەکی ئیسلامییدا بۆی هەیە خاوەن (مالك) بێت، وەك خوای کاربەجێ دەفەرمویێ:

﴿.. فَلَكُمْ رُءُوسُ أَمْوَالِكُمْ لَا تَظْلِمُونَ وَلَا تُظْلَمُونَ ﴿٢٧٩﴾﴾ البقرة:٢٧٩.

واتە: سەرمایەکانتان هی خۆتانن، نەستەم دەکەن و نەستەمیشتان لێ دەکرێ. وەهەموو ئینسانێك لەدەوڵەتی ئیسلامییدا بۆی هەیە کارو کەسابەت بکات بەشێوەیەکی شەرعیی و ڕەوا، هەرکارو کەسابەتێك دەکات و چۆن ماڵ و سامانی خۆی وەسەرێك دەنێ، بەڵام لەسنووری شەریعەت داو بەشێوەی شەرعیی، بۆیە لە ئیسلامدا سوودخۆریی (ربا) قەدەغە کراوە، وە قۆرخکردن (إحتكار) قەدەغە کراوە، وە زەوت کردن (غصب) و دزیی کردن قەدەغە کراون، چونکە زیان بەبەرژەوەندیی گشتی و بەکۆمەڵ دەگەیەنن.

وە ئیسلام لەڕووی ئابوورییەوە هاوسەنگییەکی زۆر وردی ڕاگرتوە لەنێوان ئازادیی تاك و بەرژەوەندیی کۆمەڵدا، بەپێچەوانەی سیستمی سەرمایەداریی و، بەپێچەوانەی سیستمی سۆشیالیستییەوە، کەلەسیستمی سەرمایەدارێتییدا کۆمەڵگا لە ژێر پێی تاك دا دەپلێشێندرێتەوەو، تاك بەکەیفی خۆی و بێ گوێدانە هیچ شتێك، ماڵ و سامانی خۆی زیاد دەکات؟ بەبازرگانیی حەڕام؟ بەبازرگانی کردن بەناموسی خەڵك؟ بەهەر شتێك، گرنگ ئەوەیە سەروەت و سامانی زۆر وەسەرێك بنێت، وە لەسیستمی سەرمایەدارێتییدا، ئینسان وەك تاك بەرهەڵداو ئازادە هەرچییەك بکات.

بەڵام لەسیستمی سۆشیالیزمدا بەپێچەوانەوە: تاك لە ژێر پێی کۆمەڵگادا دەپلێشێندرێتەوەو، بەبیانووی بەرژەوەندیی گشتییەوە، سەرجەم ماف و ئازادییەکانی پێشێل و زەوت دەکرێن.

بەڵام ئیسلام وا نیە، ئیسلام ڕێزی تاك دەگرێ و ماف و ئازادییەکانی بۆ دابین دەکات، بەڵام نەك لەسەر حیسابی بەرژەوەندییەکانی کۆمەڵگا.

هەروەها لە کۆمەڵگای ئیسلامییدا، هەرکەسێك نەیتوانی ژیان و گوزەرانی خۆی دابین بکات، دەوڵەتی ئیسلامیی ئەرکدار (مُکلَّف)ە کە ژیان و پێداویستییەکانی بۆ دابین بکات، (أبو یوسف) لە کتێبی (الخراج)[1]دا هێناویەتی کە: ڕۆژێك خەلیفەی دووەم عومەری کوڕی خەتتاب (خوا لێی ڕازی بێ) جوولەکەیەکی ڕیش سپی و بەتەمەن و نەخۆش دەبینێ سواڵ دەکات، پێی دەڵێ: جوولەکە! بۆ چی سواڵ دەکەی؟ ئەویش دەڵێ: بڵێم چی سێ شتم لەسەر کۆبوونەوە: فەقیریی و پیریی و سەرانە، سەرانە (جزیة)م لەسەرداندراوەو پیریشم و نەداریشم، عومەر گوتی: ئینساف نیە، کەبەگەنجێتیی سوودت لێ ببینین و بەپیریی بەرهەڵدات بکەین، دەستی دەگرێ و دەیباتە لای بەرپرسی خەزێنەی دارایی (بیت المال)ی مسوڵمانان و پێی دەڵێ: سەرنج بدەو سەرژمێریان بکە ئەمەو هاو وێنەکانی، لەخەزێنەی ماڵدا مووچەیان بۆ ببڕنەوە، چونکە هاووڵاتییانی دەوڵەتی ئیسلامیی، با کافریش بن، نابێ سواڵ بکەن و نابێ موحتاج و نەداربن.

**پێنج: مافە کۆمەڵایەتییەکان:**

ئەمانەش مافی هەموو ئینسانێکن لە ژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامییدا، هەر لەژن هێنان و شووکردن و پێکەوەنانی خێزانەوە بگرە، هەتا پاراستنی ساغ و سەلامەتیی و ئەنجامدانی چالاکییە کۆمەڵایەتییەکان، کەبێگومان حەوت مافە گرنگەکان (الضروریات السبع)یش دەگرنەوە.

---

(١) الخراج، ص١٢٦، وە: (منتخب کنز العُمّال من مسند أحمد) (٢/٣٠٩).

## شەش: مافە سیاسییەکان:

بەهەمان شێوە لە ژێر سایەی دەوڵەت و قەوارەی ئیسلامییدا، هەموو ئینسانەکان مافی چالاکیی سیاسییان هەیە، ئنجا یەکەمین مافی سیاسی ئەوەیە کەوەك نەتەوە، نەتەوەکان بەیەك چاو سەیر دەکرێن و لەشەریعەتی ئیسلامییدا، کەمینە (أقلية)ی نەتەوەیی نیە، لەدەوڵەتی ئیسلامییدا کەمینەی دینیی و فیکریی هەیە، بەڵام کەمینەی نەتەوەیی (الأقلية القومية) نیە، بۆچی؟ چونکە نەتەوەکان لەڕوانگەی ئیسلامەوە وەك یەکن، نە عەرەب لە کورد،نەکورد لەتورك، نەتورك لەئەفغان...هتد، هیچ لەهیچی گەورەتر نیە، بەڵام کەمینەی دینیی (الأقلية الدينية) و فیکریی هەیە، مادام زۆربەی وڵاتەکە مسوڵمان نشینەو کەمێك جوولەکە، یان کەمێك نەصرانیی، یان کەمێك زەردەشتیی، یان کەمێك زەندیقی تێدایە، بەپێی سیستمی دیموکراسیش بێ، دەبێ کەمینەکە لەیاساو دەستوورە گشتییەکان دا، دامل کەچ بکەن بۆ زۆرینە[1].

**هەڵبەتە مافە سیاسییەکانیش زۆرن، بەڵام ئێمە ئاماژە بەچواریان دەکەین، وەك چەند نموونەیەك لەسەرەکییەکانیان:**

١- یەکەمین مافی سیاسی بریتییە لە (مافی نەتەوەیی) واتە: نەتەوەکان هەموویان وەك یەك و بەیەك چاو سەیر دەکرێن، پاشان مافی فەرمان بەچاکەو نەهی لەخراپە هەیە، تەنانەت بۆ ئەهلی زیممە (أهل الذمة)ش، ئەگەر ناحەقیی و ناعەدالەتییەك ببینن، بۆیان هەیە بەرهەڵستیی بکەن، وەزۆر لەزانایانی ئیسلام ڕایان وایە کەلە ئەنجوومەنی شووڕای دەوڵەتێکی ئیسلامییدا، دەبێ نوێنەری هەموو کەمایەتییە دینییەکانیشی تێدابێ، بەجوولەکەو نەصرانیی و زەردەشتیی و هەموویانەوە، دەبێ هەموویان نوێنەریان لە ئەنجوومەنی شووڕای

---

(١) دیارە بەپێی شەریعەتی ئیسلامیی هەر شوێنێك کەوتە ژێر ڕکێفی حوکمی ئیسلامەوە، شەریعەتیان بەسەردا جێ بەجێ دەکرێ، وەك سیستمی حوکمڕانیی، بەبێ ڕەچاوکردنی زۆرینەو کەمینەی مسوڵمانان لەو شوێنەدا.

دەوڵەتی ئیسلامییدا هەبێ، بۆ ئەوەی نوێنەرەکەیان دەنگ و باس و خواس و پێداویستییەکانی ئەو خەڵکەی خۆی بگەیەنێ، بەئەنجوومەنی شوورِا، وە دیفاع لەمافەکانیان بکات.

٢- مافێکی دیکەی سیاسی، بریتیە لەهاوکاریی کردن و دەستبارگرتن بۆ حوکمرِان، وە رِاستکردنەوەی هەڵەکانی، وەلە حاڵەتی رِاست نەبوونەوەشی دا، هەڵوێست لێوەرگرتنی، وەك لادان و دوورخستنەوەی لەدام و دەزگاکانی حوکمرِانیی، چونکە خەڵك بۆیە داینـاوە کە شەریعەت پیادەبکات.

٣- وە مافێکی دیکەی سیاسی، ئەوەیە کەبەگوێرەی شایستەیی (کفاءة)ئەرك بەخەڵکی دەسپێردرێ، نەك لەسەر بناغەی رِەنگ و زمان و خزمەیاتی و. هتد.

٤- وە مافێکی دیکە ئەوەیە کەخەڵك لەبەرانبەر یاساو دادگادا یەکسانن و، هیچ کەس هیچ جۆرە پلەو ئیمتیازێکی نیەو، کێ لەهەمـوو کەس پلەو پایەی بەرزترە، دەبێ لە هەموویان ملکەچتر بێ!

ئەوەش کورتەیەك بوولەمافە بنەرِەتییەکانی مرۆڤ، وە ئەرکەکانی لەسایەی شەریعەتی خوادا (تبارك وتعالى).

شایانی باسیشە کە زۆربەی ئەو ئەرك و مافانە، بەتایبەت مافە سیاسییەکان بەکورتی و خێرایی ئاماژەمان بۆیانکرد، ئەگەرنا پێویستییان بەتوێژینەوەو رِوونکردنەوەی چاکترو زیاتر هەیە، بەتایبەت هێنانەوەی دەقی قورئان و سوننەت لەسەر هەرکام لەو مافانە، بەڵام خوا یاربێ لەئاڵقەی شەشەم و کۆتایی دا کە باسی (دیموکرِاسیی)یە، ئەوە قەرەبوو دەکەینەوە.

**کۆتایی ئەم ئاڵقەیەش بەم چەند تێبینییە کورتە دێنم:**

یەکەم:

ناگونجێ ئیسلامێك پێغەمبەرەکەی (صلى الله عليه وسلم) نازناوی (رحمة للعالمين)ی هەبێ:

﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا رَحۡمَةٗ لِّلۡعَٰلَمِينَ ١٠٧ ﴾ الانبیاء:١٠٧.

هەموو مافەکانی ئینسانەکان دابین نەکات!! تەماشا دەکەین لەو ئایەتەدا خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ((للعالمین)) واتە: هەموو جیهانییان، واتە: بەلای کەمەوە، سەرجەم ئەوانەی کەلەسەر زەوین، کەواتە: کاتێك شەریعەتی (محمد المصطفی) (صلی الله علیه وسلم) بەرپاو بەرقەرار دەبێ، هەموو جیهانییەکان بەکافرو مسوڵمانەوە، بەهرەمەند دەبن و، وەك ئینسانێك ڕێزیان لێ دەگیرێ و مافەکانیان دابین دەکرێت.

دووەم:

هەرکارگەیەك کەشتێك بەرهەم دێنێت و ئامێرێك دروست دەکات، یەکسەر (کەتەلۆك)ێکی ڕەگەڵ دەخات، خوای بەدیهێنەریش ئینسانی خوڵقاندوەو، هەرئەویش شایستەی ئەوەیە ئەرك و مافەکانی بۆ دیاریی بکات، وە چاکترین و پێشکەوتوو (متطور)ترین کەل و پەل کە دروست دەکرێت، بۆ وێنە: تەلەفزیۆنێك کەدەتوانێ چەندان شەپۆلی دەنگیی و ڕەنگیی کۆبکاتەوە، کاتێك بەوشێوەیەی، کەکارگەکە دەست نیشانی کردوە بەکارناهێنرێ، دەبێتە کۆڵکە دارێك، ئینسانیش بەڕاستیی تاکو ئەوکاتە ئەو پایەو مەقامەی دەبێ، کەبەو شێوەیە بەڕێوە دەچێ، کە خوای بەدیهێنەر بۆی دیاریی کردوە.

سێیەم:

لەکۆتاییش دا دەڵێم: بەندەبوونی ئینسان بۆ خوا - جل جلاله - بۆ ئەوەیە کە لە کۆیلایەتیی بۆ بەندەکان ڕزگاری بێ، وەلەڕاستییدا ئینسان بەبێ پەرستراو (معبود) ناتوانێ بژیەت، جا پەرستراوی حەقیقیی بێ، کە خوایە - جل جلاله-، یان پەرستراوە ساختەکان بن، کە لە بت (صنم)و طاغووت و دیکتاتۆرەکاندا خۆیان دەبیننەوە، بەڵێ، ئینسان تەنهابەهۆی بەندایەتییەوە بۆ خوا، ڕێزو کەرامەت و کەسایەتیی سەلامەت و پارێزراو دەبێ و، لەخەم و پەژارەی دنیاو دوارۆژ دەرەخسێ.

خوای پەروەردگار نەتەوەی ئێمەو باقی نەتەوە مسوڵمانەکان هیدایەت بدات، کەلەژێر سایەو سێبەری شەریعەتەکەی دا، هەوڵ بدەن ئەرکە شەرعییەکانیان جێ بەجێ بکەن، وەمافە شەرعییەکانیشیان دابین بکەن.

وەبەڕاستیش ئێمە خۆشحاڵ بووین کە لەو دواییەدا هەرچەند درەنگ وەخت بوو برادەرانی (یەکێتی و پارتی) توانییان کەدوای هەشت ساڵ بۆ یەکەمین جار لەپەرلمانەکەیاندا پێکەوە دابنیشن، لەگەڵ ڕەخنەو گلەیی و تێبینیمان لەسەر زۆر شت، بەڵام بێگومان ئاشتی و تەبایی لەبەرژەوەندیی هەموولایەك دایە، هیواداریشین ئەو ئاشتەوایی و ئەو دەست لەنێو دەستی یەكدی نانە، هەڵقوڵاوی قەناعەت و ئیرادەی ئازادانەی خۆیان بێ، وەلەپێناوی بەرژەوەندیی میللەتەکەشماندا بەکاربێت، وەبۆ دابین کردنی بەرژەوەندیی شەخسیی و حیزبیی و بۆ تەصفیەی حیساباتی لاوەکییش بەکارنەیەت، وە بۆ دژایەتیی کردن و پەراوێزکردنی خەڵکی دیکەش بەکارنەیەت، خوای پەروەردگاریش سەرەنجامی هەموو لایەکمان خێر بکات.

وصلى الله على محمد وعلى آلـه وصحبه أجمعين

والحمد لله رب العالمين

# الإعلان العالمي لحقوق الإنسان
# ( جارنامەی جیهانیی بۆ مافەکانی مرۆڤ )

اعتمد ونشر على الملأ بموجب قرار الجمعية العامة للأمم المتحدة ٢١٧ ألف (د-٣) المؤرخ في ١٠ كانون الأول/ديسمبر ١٩٤٨

**الديبــاجــة**

لما كان الإعتراف بالكرامة المتأصلة في جميع أعضاء الأسرة البشرية وبحقوقهم المتساوية الثابتة هو أساس الحرية والعدل والسلام في العالم. ولما كان تناسي حقوق الإنسان وازدراؤها قد أفضيا إلى أعمال همجية آذت الضمير الإنساني، وكان غاية ما يرنو إليه عامة البشر انبثاق عالم يتمتع فيه الفرد بحرية القول والعقيدة ويتحرر من الفزع والفاقة. ولما كان من الضروري أن يتولى القانون حماية حقوق الإنسان لكيلا يضطر المرء آخر الأمر إلى التمرد على الاستبداد والظــلم. ولما كانت شعوب الأمم المتحدة قد أكدت في الميثاق من جديد إيمانها بحقوق الإنسان الأساسية وبكرامة الفرد وقدره وبما للرجال والنساء من حقوق متساوية وحزمت أمرها على أن تدفع بالرقي الاجتماعي قدماً وأن ترفع مستوى الحياة في جو من الحرية أفسح. ولما كانت الدول الأعضاء قد تعهدت بالتعاون مع الأمم المتحدة على ضمان اطراد مراعاة حقوق الإنسان والحريات الأساسية واحترامها. ولما كان للإدراك العام لهذه الحقوق والحريات الأهمية الكبرى للوفاء التام بهذا التعهد. فإن الجمعية العامة تنادي بهذا الإعلان العالمي لحقوق الإنسان على أنه المستوى المشترك الذي ينبغي أن تستهدفه كافة الشعوب والأمم حتى يسعى كل فرد وهيئة في المجتمع، واضعين على الدوام هذا الإعلان نصب أعينهم، إلى توطيد احترام

هذه الحقوق والحريات عن طريق التعليم والتربية واتخاذ إجراءات مطردة، قومية وعالمية، لضمان الاعتراف بها ومراعاتها بصورة عالمية فعالة بين الدول الأعضاء ذاتها وشعوب البقاع الخاضعة لسلطان.

• **المـــادة ١** : يولد جميع الناس أحراراً متساوين في الكرامة والحقوق، وقد وهبوا عقلاً وضميراً وعليهم أن يعامل بعضهم بعضاً بروح الإخاء

• **المـــادة ٢** : لكل إنسان حق التمتع بكافة الحقوق والحريات الواردة في هذا الإعلان، دون أي تمييز، كالتمييز بسبب العنصر أو اللون أو الجنس أو اللغة أو الدين أو الرأي السياسي أو أي رأي آخر، أو الأصل الوطني أو الاجتماعي أو الثروة أو الميلاد أو أي وضع آخر، دون أية تفرقة بين الرجال والنساء. وفضلا عما تقدم فلن يكون هناك أي تمييز أساسه الوضع السياسي أو القانوني أو الدولي لبلد أو البقعة التي ينتمي إليها الفرد سواء كان هذا البلد أو تلك البقعة مستقلا أو تحت الوصاية أو غير متمتع بالحكم الذاتي أو كانت سيادته خاضعة لأي قيد من القيود

• **المـــادة ٣** : لكل فرد الحق في الحياة والحرية وسلامة شخصه.

• **المـــادة ٤** : لايجوز استرقاق أو استعباد أي شخص، ويحظـــر الاسترقاق وتجارة الرقيق بكافة أوضاعهما

• **المـــادة ٥** : لايعرض أي إنسان للتعذيب ولا للعقوبات أو المعاملات القاسية أو الوحشية أو الحاطة بالكرامة

• **المـــادة ٦** : لكل إنسان أينما وجد الحق في أن يعترف بشخصيته القانونية

• **المـــادة ٧** : كل الناس سواسية أمام القانون ولهم الحق في التمتع بحماية متكافئة عنه دون أية تفرقة، كما أن لهم جميعا الحق في حماية متساوية ضد أي تميز يخل بهذا الإعلان وضد أي تحريض على تمييز كهذ

• **المـــادة ٨** لكل شخص الحق في أن يلجأ إلى المحاكم الوطنية لإنصافه عن أعمال فيها اعتداء على الحقوق الأساسية التي يمنحها له القانون

• **المـــادة ٩** : لا يجوز القبض على أي إنسان أو حجزه أو نفيه تعسفاً.

• **المـــادة ١٠** : لكل إنسان الحق، على قدم المساواة التامة مع الآخرين، في أن تنظـــر قضيته أمام محكمة مستقلة نزيهة نظـــراً عادلاً علنياً للفصل في حقوقه والتزاماته وأية تهمة جنائية توجه إليه.

• **المـــادة ١١** : ( ١ ) كل شخص متهم بجريمة يعتبر بريئاً إلى أن تثبت إدانته قانوناً بمحاكمة علنية تؤمن له فيها الضمانات الضرورية للدفاع عنه. ( ٢ ) لا يدان أي شخص من جراء أداة عمل أو الامتناع عن أداة عمل إلا إذا كان ذلك يعتبر جرماً وفقاً للقانون الوطني أو الدولي وقت الارتكاب، كذلك لا توقع علية عقوبة أشد من تلك التي كان يجوز توقيعها وقت ارتكاب الجريمة.

• **المـــادة ١٢** : لا يعرض أحد لتدخل تعسفي في حياته الخاصة أو أسرته أو مسكنه أو مراسلاته أو لحملات على شرفه وسمعته، ولكل شخص الحق في حماية القانون من مثل هذا التدخل أو تلك الحملات.

• **المـــادة ١٣** : ( ١ ) لكل فرد حرية التنقل واختيار محل إقامته داخل حدود كل دولة. ( ٢ ) يحق لكل فرد أن يغادر أية بلاد بما في ذلك بلده كما يحق له العودة إليه.

• **المـــادة ١٤** : ( ١ ) لكل فرد الحق في أن يلجأ إلى بلاد أخرى أو يحاول الالتجاء إليها هرباً من الاضطهاد. ( ٢ ) لا ينتفع بهذا الحق من قدم للمحاكمة في جرائم غير سياسية أو لأعمال تناقض أغراض الأمم المتحدة ومبادئها.

• **المـــادة ١٥** : ( ١ ) لكل فرد حق التمتع بجنسية ما. ( ٢ ) لا يجوز حرمان شخص من جنسيته تعسفاً أو إنكار حقه في تغييرها.

• **المـــادة ١٦** : ( ١ ) للرجل والمرأة متى بلغا سن الزواج حق التزوج وتأسيس أسرة دون أي قيد بسبب الجنس أو الدين، ولهما حقوق متساوية عند الزواج وأثناء قيامه وعند انحلاله. ( ٢ ) لا يبرم عقد الزواج إلا برضى الطرفين الراغبين في الزواج رضى كاملاً لا إكراه فيه. ( ٣ ) الأسرة هي الوحدة الطبيعية الأساسية للمجتمع ولها حق التمتع بحماية المجتمع والدولة.

• **المـــادة ١٧** : ( ١ ) لكل شخص حق التملك بمفرده أو بالاشتراك مع غيره. ( ٢ ) لا يجوز تجريد أحد من ملكه تعسفاً

• **المـــادة ١٨** : لكل شخص الحق في حرية التفكير والضمير والدين، ويشمل هذا الحق حرية تغيير ديانته أو عقيدته، وحرية الإعراب عنهما بالتعليم والممارسة وإقامة الشعائر ومراعاتها سواء أكان ذلك سراً أم مع الجماعة

• **المـــادة ١٩** : لكل شخص الحق في حرية الرأي والتعبير، ويشمل هذا الحق حرية اعتناق الآراء دون أي تدخل، واستقاء الأنباء والأفكار وتلقيها وإذاعتها بأية وسيلة كانت دون تقيد بالحدود الجغرافية

• **المـــادة ٢٠** : ( ١ ) لكل شخص الحق في حرية الاشتراك في الجمعيات والجماعات السلمية. ( ٢ ) لا يجوز إرغام أحد على الانضمام إلى جمعية ما

• **المـــادة ٢١** : ( ١ ) لكل فرد الحق في الاشتراك في إدارة الشؤون العامة لبلاده إما مباشرة وإما بواسطة ممثلين يختارون اختياراً حراً. ( ٢ ) لكل شخص نفس الحق الذي لغيره في تقلد الوظائف العامة في البلاد. ( ٣ ) إن إرادة الشعب هي مصدر سلطة الحكومة، ويعبر عن هذه الإرادة بانتخابات نزيهة دورية تجري على أساس الاقتراع السري وعلى قدم المساواة بين الجميع أو حسب أي إجراء مماثل يضمن حرية التصويت

• **المـــادة ٢٢** : لكل شخص بصفته عضواً في المجتمع الحق في الضمانة الاجتماعية وفي أن تحقق بوساطة المجهود القومي والتعاون الدولي وبما يتفق ونظم كل دولة ومواردها الحقوق الاقتصادية والاجتماعية والتربوية التي لاغنى عنها لكرامته وللنمو الحر لشخصيته

• **المـــادة ٢٣** : ( ١ ) لكل شخص الحق في العمل، وله حرية اختياره بشروط عادلة مرضية كما أن له حق الحماية من البطالة. ( ٢ ) لكل فرد دون أي تمييز الحق في أجر متساو للعمل. ( ٣ ) لكل فرد يقوم بعمل الحق في أجر عادل مرض يكفل له ولأسرته عيشة لائقة بكرامة الإنسان تضاف إليه، عند اللزوم، وسائل أخرى للحماية الاجتماعية. ( ٤ ) لكل شخص الحق في أن ينشئ وينضم إلى نقابات حماية لمصلحته

• **المـــادة ٢٤** : لكل شخص الحق في الراحة، وفي أوقات الفراغ، ولاسيما في تحديد معقول لساعات العمل وفي عطلات دورية بأجر

• **المـــادة ٢٥** : ( ١ ) لكل شخص الحق في مستوى من المعيشة كاف للمحافظة على الصحة والرفاهية له ولأسرته، ويتضمن ذلك التغذية والملبس والمسكن والعناية

الطبية وكذلك الخدمات الاجتماعية اللازمة، وله الحق في تأمين معيشته في حالات البطالة والمرض والعجز والترمل والشيخوخة وغير ذلك من فقدان وسائل العيش نتيجة لظـــروف خارجة عن إرادته. ( ٢ ) للأمومة والطفولة الحق في مساعدة ورعاية خاصتين، وينعم كل الأطفال بنفس الحماية الاجتماعية سواء أكانت ولادتهم ناتجة عن رباط شرعي أو بطريقة غير شرعية

• **المـــــادة ٢٦** : ( ١ ) لكل شخص الحق في التعلم، ويجب أن يكون التعليم في مراحله الأولى والأساسية على الأقل بالمجان، وأن يكون التعليم الأولي إلزامياً وينبغي أن يعمم التعليم الفني والمهني، وأن ييسر القبول للتعليم العالي على قدم المساواة التامة للجميع وعلى أساس الكفاءة. ( ٢ ) يجب أن تهدف التربية إلى إنماء شخصية الإنسان إنماء كاملاً، وإلى تعزيز احترام الإنسان والحريات الأساسية وتنمية التفاهم والتسامح والصداقة بين جميع الشعوب والجماعات العنصرية أو الدينية، وإلى زيادة مجهود الأمم المتحدة لحفظــ السلام. ( ٣ ) للآباء الحق الأول في اختيار نوع تربية أولادهم

• **المـــــادة ٢٧** : ( ١ ) لكل فرد الحق في أن يشترك اشتراكاً حراً في حياة المجتمع الثقافي وفي الاستمتاع بالفنون والمساهمة في التقدم العلمي والاستفادة من نتائجه. ( ٢) لكل فرد الحق في حماية المصالح الأدبية والمادية المترتبة على إنتاجه العلمي أو الأدبي أو الفني

• **المـــــادة ٢٨** : لكل فرد الحق في التمتع بنظـــام اجتماعي دولي تتحقق بمقتضاه الحقوق والحريات المنصوص عليﺓا في هذا الإعلان تحققاً تاما

• **المـــــادة ٢٩** : ( ١ ) على كل فرد واجبات نحو المجتمع الذي يتاح فيه وحده لشخصيته أن تنمو نمواً حراُ كاملاً. ( ٢ ) يخضع الفرد في ممارسة حقوقه وحرياته لتلك القيود التي يقررها القانون فقط، لضمان الاعتراف بحقوق الغير وحرياته واحترامها ولتحقيق المقتضيات العادلة للنظـــام العام والمصلحة العامة والأخلاق في مجتمع ديمقراطي. ( ٣ ) لا يصح بحال من الأحوال أن تمارس هذه الحقوق ممارسة تتناقض مع أغراض الأمم المتحدة ومبادئها

• **المـــــادة ٣٠** : ليس في هذا الإعلان نص يجوز تأويله على أنه يخول لدولة أو جماعة أو فرد أي حق في القيام بنشاط أو تأدية عمل يهدف إلى هدم الحقوق والحريات الواردة فيه.

# إعلان القاهرة حول حقوق الإنسان في الإسلام

## ( ڕاگەیاندراوی قاهیرە بۆ مافەکانی مرۆڤ لە ئیسلامدا )

**تم إجازته من قبل مجلس وزراء خارجية منظـــمة مؤتمر العالم الإسلامي**
**القاهرة، ٥ أغسطس ١٩٩٠**

**الديبـــاجـــة**

تأكيدا للدور الحضاري والتاريخي للأمة الإسلامية التي جعلها الله خير أمة أورثت البشرية حضارة عالمية متوازنة ربطت الدنيا بالآخرة وجمعت بين العلم والإيمان، وما يرجى أن تقوم به هذه الأمة اليوم لهداية البشرية الحائرة بين التيارات والمذاهب المتناقضة وتقديم الحلول لمشكلات الحضارة المادية المزمنة.

ومساهمة في الجهود البشرية المتعلقة بحقوق الإنسان التي تهدف إلي حمايته من الاستغلال والاضطهاد وتهدف إلي تأكيد حريته وحقوقه في الحياة الكريمة التي تتفق مع الشريعة الإسلامية.

وثقة منها بأن البشرية التي بلغت في مدارج العلم المادي شأنا بعيدا، لا تزال، وستبقي في حاجة ماسة إلي سند إيماني لحضارتها وإلي وازع ذاتي يحرس حقوقها.

وإيمانا بأن الحقوق الأساسية والحريات العامة في الإسلام جزء من دين المسلمين لا يملك أحد بشكل مبدئي تعطيلها كليا أو جزئيا، أو خرقها أو تجاهلها في أحكام إلهية تكليفية أنزل الله بها كتبه، وبعث بها خاتم رسله وتمم بها ما جاءت به الرسالات السماوية وأصبحت رعايتها عبادة، وإهمالها أو العدوان علية منكرا في الدين وكل

إنسان مسؤول عنها بمفرده، والأمة مسؤولة عنها بالتضامن، وأن الدول الأعضاء في منظـــمة المؤتمر الإسلامي تأسيسا علي ذلك تعلن ما يلي:

**المـــادة ١**

أ- البشر جميعا أسرة واحدة جمعت بينهم العبودية لله والنبوة لآدم وجميع الناس متساوون في أصل الكرامة الإنسانية وفي أصل التكليف والمسؤولية دون تمييز بينهم بسبب العرق أو اللون أو اللغة أو الجنس أو المعتقد الديني أو الانتماء السياسي أو الوضع الاجتماعي أو غير ذلك من الاعتبارات. وأن العقيدة الصحيحة هي الضمان لنمو هذه الكرامة علي طريق تكامل الإنسان.

ب- أن الخلق كلهم عيال الله وأن أحبهم إليه أنفعهم لعياله وأنه لا فضل لأحد منهم علي الآخر إلا بالتقوى والعمل الصالح.

**المـــادة ٢**

أ- الحياة هبة الله وهي مكفولة لكل إنسان، وعلي الأفراد والمجتمعات والدول حماية هذا الحق من كل اعتداء علية، ولا يجوز إزهاق روح دون مقتض شرعي.

ب- يحرم اللجوء إلي وسائل تفضي إلي إفناء الينبوع البشري.

ج- المحافظـــة علي استمرار الحياة البشرية إلي ما شاء الله واجب شرعي.

د- سلامة جسد الإنسان مصونة، ولا يجوز الاعتداء عليةا، كما لا يجوز المساس بها بغير مسوغ شرعي، وتكفل الدولة حماية ذلك.

**المـــادة ٣**

أ- في حالة استخدام القوة أو المنازعات المسلحة، لا يجوز قتل من لا مشاركة لهم في القتال كالشيخ والمرأة والطفل، وللجريح والمريض الحق في أن يداوي وللأسير أن يطعم ويؤوى ويكسى، ويحرم التمثيل بالقتلى، ويجب تبادل الأسري وتلاقي اجتماع الأسر التي فرقتها ظـــروف القتال.

ب- لا يجوز قطع الشجر أو إتلاف الزرع والضرع أو تخريب المباني والمنشآت المدنية للعدو بقصف أو نسف أو غير ذلك.

**المــــادة ٤**

لكل إنسان حرمته والحفاظـــ علي سمعته في حياته وبعد موته وعلي الدول والمجتمع حماية جثمانه ومدفنه.

**المــــادة ٥**

أ- الأسرة هي الأساس في بناء المجتمع، والزواج أساس تكوينها وللرجال والنساء الحق في الزواج ولا تحول دون تمتعهم بهذا الحق قيود منشؤها العرق أو اللون أو الجنسية.

ب- علي المجتمع والدولة إزالة العوائق أمام الزواج وتيسير سبله وحماية الأسرة ورعايتها.

**المــــادة ٦**

أ- المرأة مساوية للرجل في الكرامة الإنسانية، ولها من الحق مثل ما عليةا من الواجبات ولها شخصيتها المدنية وذمتها المالية المستقلة وحق الاحتفاظـــ باسمها ونسبها.

ب- علي الرجل عبء الإنفاق علي الأسرة ومسئولية رعايتها.

**المــــادة ٧**

أ- لكل طفل عند ولادته حق علي الأبوين والمجتمع والدولة في الحضانة والتربية والرعاية المادية والصحية والأدبية كما تجب حماية الجنين والأم وإعطاؤهما عناية خاصة.

ب- للآباء ومن يحكمهم، الحق في اختيار نوع التربية التي يريدون لأولادهم مع وجوب مراعاة مصلحتهم ومستقبلهم في ضوء القيم الأخلاقية والأحكام الشرعية.
للأبوين علي الأبناء حقوقهما وللأقارب حق علي ذويهم وفقا لأحكام الشريعة.

**المــــادة ٨**

لكل إنسان التمتع بأهليته الشرعية من حيث الإلزام والالتزام وإذا فقدت أهليته أو انتقصت قام وليه - مقامه.

المـــادة ٩

أ- طلب العلم فريضة والتعليم واجب علي المجتمع والدولة وعليةا تأمين سبله ووسائله وضمان تنوعه بما يحقق مصلحة المجتمع ويتيح للإنسان معرفة دين الإسلام وحقائق الكون وتسخيرها لخير البشرية.

ب- من حق كل إنسان علي مؤسسات التربية والتوجيه المختلفة من الأسرة والمدرسة وأجهزة الإعلام وغيرها أن تعمل علي تربية الإنسان دينيا ودنيويا تربية متكاملة متوازنة تنمي شخصيته وتعزز إيمانه بالله واحترامه للحقوق والواجبات وحمايتها.

المـــادة ١٠

الإسلام هو دين الفطرة، ولا يجوز ممارسة أي لون من الإكراه علي الإنسان أو استغلال فقره أو جهله علي تغيير دينه إلي دين آخر أو إلي الإلحاد.

المـــادة ١١

أ- يولد الإنسان حرا وليس لأحد أن يستعبده أو يذله أو يقهره أو يستغله ولا عبودية لغير الله تعالي.

ب- الاستعمار بشتى أنواعه وباعتباره من أسوأ أنواع الاستعباد محرم تحريما مؤكدا وللشعوب التي تعانيه الحق الكامل للتحرر منه وفي تقرير المصير، وعلي جميع الدول والشعوب واجب النصرة لها في كفاحها لتصفية كل أشكال الاستعمار أو الاحتلال، ولجميع الشعوب الحق في الاحتفاظ بشخصيتها المستقلة والسيطرة علي ثرواتها ومواردها الطبيعية.

ج- للأبوين علي الأبناء حقوقهما وللأقارب حق علي ذويهم وفقا لأحكام الشريعة.

المـــادة ١٢

كل إنسان الحق في إطار الشريعة في حرية التنقل، واختيار محل إقامته داخل بلاده أو خارجها وله إذا اضطهد حق اللجوء إلي بلد آخر وعلي البلد الذي لجأ إليه أن يجيره حتى يبلغه مأمنه ما لم يكن سبب اللجوء اقتراف جريمة في نظر الشرع.

المـــادة ١٣

العمل حق تكفله الدولة والمجتمع لكل قادر علية، وللإنسان حرية اختيار العمل اللائق به مما تتحقق به مصلحته ومصلحة المجتمع، وللعامل حقه في الأمن والسلامة وفي كافة الضمانات الاجتماعية الأخرى. ولا يجوز تكليفه بما لا يطيقه، أو إكراهه، أو استغلاله، أو الإضرار به، وله -دون تمييز بين الذكر والأنثى- أن يتقاضى أجرا عادلا مقابل عمله دون تأخير وله الاجارات والعلاوات والفروقات التي يستحقها، وهو مطالب بالإخلاص والإتقان، وإذا اختلف العمال وأصحاب العمل فعلي الدولة أن تتدخل لفض النزاع ورفع الظـلم وإقرار الحق والإلزام بالعدل دون تحيز.

المـــادة ١٤

للإنسان الحق في الكسب المشروع، دون احتكار أو غش أو إضرار بالنفس أو بالغير والربا ممنوع مؤكدا.

المـــادة ١٥

أ- لكل إنسان الحق في التملك بالطرق الشرعية، والتمتع بحقوق الملكية بما لا يضر به أو بغيره من الأفراد أو المجتمع، ولا يجوز نزع الملكية إلا لضرورات المنفعة العامة ومقابل تعويض فوري وعادل.

ب- تحرم مصادرة الأموال وحجزها إلا بمقتضى شرعي.

المـــادة ١٦

لكل إنسان الحق في الانتفاع بثمرات إنتاجه العلمي أو الأدبي أو الفني أو التقني. وله الحق في حماية مصالحه الأدبية والمالية العائدة له علي أن يكون هذا الإنتاج غير مناف لأحكام الشريعة.

المـــادة ١٧

أ- لكل إنسان الحق في أن يعيش بيئة نظيفة من المفاسد والأوبئة الأخلاقية تمكنه من بناء ذاته معنويا، وعلي المجتمع والدولة أن يوفرا له هذا الحق.

ب- لكل إنسان علي مجتمعه ودولته حق الرعاية الصحية والاجتماعية بتهيئة جميع المرافق العامة التي تحتاج إليها في حدود الإمكانات المتاحة.

ج- تكفل الدولة لكل إنسان حقه في عيش كريم يحقق له تمام كفايته وكفاية من يعوله ويشمل ذلك المأكل والملبس والمسكن والتعليم والعلاج وسائر الحاجات الأساسية.

**المـــادة ١٨**

أ- لكل إنسان الحق في أن يعيش آمنا علي نفسه ودينه وأهله وعرضه وماله.

ب- للإنسان الحق في الاستقلال بشؤون حياته الخاصة في مسكنه وأسرته وماله واتصالاته، ولا يجوز التجسس أو الرقابة علية أو الإساءة إلي سمعته وتجنب حمايته من كل تدخل تعسفي.

ج- للمسكن حرمته في كل الأحوال ولا يجوز دخوله بغير إذن أهله أو بصورة غير مشروعة، ولا يجوز هدمه أو مصادرته أو تشريد أهله منه.

**المـــادة ١٩**

أ- الناس سواسية أمام الشرع، يستوي في ذلك الحاكم والمحكوم.

ب- حق اللجوء إلي القضاء مكفول للجميع.

ج- المسؤولية في أساسها شخصية.

د- لا جريمة ولا عقوبة إلا بموجب أحكام الشريعة.

هـ- المتهم برئ حتى تثبت إدانته بمحاكمة عادلة تؤمن له فيها كل الضمانات الكفيلة بالدفاع عنه.

**المـــادة ٢٠**

لا يجوز القبض علي إنسان أو تقييد حريته أو نفيه أو عقابه بغير موجب شرعي. ولا يجوز تعريضه للتعذيب البدني أو النفسي أو لأي من أنواع المعاملات المذلة أو القاسية أو المنافية للكرامة الإنسانية، كما لا يجوز إخضاع أي فرد للتجارب الطبية أو العلمية إلا

برضاه وبشرط عدم تعرض صحته وحياته للخطر، كما لا يجوز سن القوانين الاستثنائية التي تخول ذلك للسلطات التنفيذية.

**المـــادة ٢١**

أخذ الإنسان رهينة محرم بأي شكل من الأشكال ولأي هدف من الأهداف.

**المـــادة ٢٢**

أ- لكل إنسان الحق في التعبير بحرية عن رأيه بشكل لا يتعارض مع المبادئ الشرعية.

ب- لكل إنسان الحق في الدعوة إلي الخير والأمر بالمعروف والنهي عن المنكر وفقا لضوابط الشريعة الإسلامية.

ج- الإعلام ضرورة حيوية للمجتمع، ويحرم استغلاله وسوء استعماله والتعرض للمقدسات وكرامة الأنبياء فيه، وممارسة كل ما من شأنه الإخلال بالقيم أو إصابة المجتمع بالتفكك أو الانحلال أو الضرر أو زعزعة الاعتقاد.

د- لا يجوز إثارة الكراهية القومية والمذهبية وكل ما يؤدي إلي التحريض علي التمييز العنصري بكافة أشكاله.

**المـــادة ٢٣**

أ- الولاية أمانة يحرم الاستبداد فيها وسوء استغلالها تحريما مؤكدا ضمانا للحقوق الأساسية للإنسان.

ب- لكل إنسان حق الاشتراك في إدارة الشؤون العامة لبلاده بصورة مباشرة أو غير مباشرة، كما أن له الحق في تقلد الوظـــائف العامة وفقا لأحكام الشريعة.

**المـــادة ٢٤**

كل الحقوق والحريات المقررة في هذا الإعلان مقيدة بأحكام الشريعة الإسلامية.

**المـــادة ٢٥**

الشريعة الإسلامية هي المرجع الوحيد لتفسير أو توضيح أي مادة من مواد هذه الوثيقة.

# ئـەم ئاڵقـەیە

**خوێنـەرە خـۆشـەویستەکانـم!**

ئەو بابەتەی لەبەردەستتانە، لەئەسڵ دا وتارێك بووە لە كۆڕێك دا دراوە لە هۆڵی (ڕۆشنبیریی) لەشاری سلێمانیی لەڕۆژی: ٤جمادی الثانیة ١٤٣٢ك بەرانبەر: ١٥ / ٨ / ٢٠٠٢ز.

هیوادارم ئەم بەرهەمەش وەك هاوەڵەكانی دیكەی بەهەرسێك حاڵەتی: نووسرا و بیستراو و بینراوەوە، مایەی ڕاماڵینی ئەو تەم ومژە بێ، كە سەبارەت بەهەڵوێستی ئیسلام بەرانبەر بە تیرۆر، كە بەهەڵە بە (إرهاب) تەرجەمەكراوە و بەرچاوی زۆركەسی لێڵ كردوە و دووچاری هەڵە و چەواشەبوون بوون.

بەڵێ تیرۆر (Terror) كاتی خۆی دەرهاوێشتەیەكی ڕۆژئاوایی بووە و، كەم و زۆر پەیوەندیی بەئیسلام و مسوڵمانانەوە نەبووە.

وە بەهیچ شێوەیەك شەریعەت دانووی لەگەڵ تیرۆردا ناكوڵێ و ڕێی پێ نادات، هەرچەندە جارجار هەندێك گرووپ و تاقمی لادەر و سەرگەردان و خەواریج ئاسا، بەهۆی خراپ حاڵی بوون و دووركەوتنەوەیانەوە لە شەریعەت، گیرۆدەی نەخۆشیی تیرۆر و تۆقاندن بوون و ببن!

# ڕێ خۆشکردن

سەرەتا بەخێرهاتنی گەرمی هەموو لایەك دەکەم بەتایبەتی مامۆستایانی بەڕێز، خوای پەروەردگار ئەم کۆڕو مەجلیسەمان لەو کۆڕو مەجلیسانە بگێڕێ، کە بۆ دنیاو دوارۆژمان مایەی تێدا بەهرەمەند بوونن.

بەڕێزان!

مەسەلەی تیرۆرو تۆقاندن - کە بەزمانی عەرەبی بە وشەی: (إرهاب) تەرجەمە کراوە، وە لەزمانی کوردیی دا تیرۆر بەمانای ترساندن و تۆقاندنە - یەکێکە لەمەسەلە هەرە باوو ڕەواج پێدراوەکانی ئەم ڕۆژگارەی ئێمە، دیارە شەریعەتی خوای پەروەردگاریش هیچ مەسەلەیەك نیە، کە نوختەی تێدا نەخستبێتە سەر پیت و، هەڵوێستی لە بارەوە دەرنەبڕیبێت.

ئنجا وەك عەرەب دەڵێن: (عَلِمَهُ مَنْ عَلِمَهُ، وَجَهِلَهُ مَنْ جَهِلَهُ) وە لەسۆنگەی ئەوەوە کەمەسەلەی: (تیرۆر) یان (ئیرهاب)یان (ترساندن و تۆقاندن) چەواشە کاریی زۆری تێدا کراوەو دەکرێ، وەخەڵکێك نەزانانە یاخود زۆرزانانە، دەیانەوێت کەتیرۆرو ترساندن و تۆقاندن بکەن بەهەڵقولاوی ئیسلام، وە منیش وەك مسوڵمانێك ئەوەندەی کە تەماشای قورئان و سوننەتی پێغەمبەرم (صلى الله عليه وسلم) کردوە، لەبیرۆکەی تیرۆرم بەدوور هاتۆتە بەرچاو، وە ئەگەر سەرنجی مێژووی پڕشنگداری دەوڵەتی ئیسلامیش بدەین، هەر لەو ڕۆژەوە کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بەردی بناغەی دانا لەشاری مەدینەدا، تا ئەو ڕۆژەی کۆتایی پێهات لەسەر دەستی (کەمال ئەتاتورك)، بە پیلانی ئیمپریالیزمی

جیهانیی لەساڵی (١٩٢٤)زدا، دەبینین کە ئیسلام، وەکۆمەڵگای ئیسلامیی و دەوڵەتی ئیسلامیی، زۆر دوور بوون لەترساندن و تۆقاندن، ئەدی بۆچی دەبێ کەسانێك بیانەوێ خەڵکی وا فریو بدەن، کە بۆ ئەوەی تۆمەتی تیرۆر لەخۆیان دوور بخەنەوە، دەبێ لە ئیسلام دوور بکەونەوە، یان بەلای کەمەوە ئەگەر لە ئیسلامیش دوور نەکەونەوە، وەك دینداریی شەخسیی و وەك ئیمان و عەقیدە، دەبێ لە کاری ئیسلامیی دووربکەنەوە، وە دەبێ لە جیهادو جەنگ کردن لە پێناوی ئیسلام دا دوور بکەونەوە؟!

لەو سۆنگەوە خوا پشتیوان بێت من لە (٥) بەشان دا باسی (تیرۆرو تۆقاندن لە تەرازووی شەریعەتدا)دەکەم.

**لەبەشی یەکەم** دا پێناسەی تیرۆر دەکەین، کە ئایا لەڕووی زمانی یەوە وشەی تیرۆر لە چ زمانێکەوە هاتوەو، لەکوێ سەری هەڵداوە؟ هەروەها ئایا وشەی ناوبراو، وەك زاراوەیەکی سیاسیی، کەی بەکارهاتوەو ڕەواجی پێدراوە؟!

**لەبەشی دووەمیش دا** باسی ئەوە دەکەین، کە نێوەڕۆك و جەوهەری تیرۆریزم، وەك دیاردەیەکی جیهانیی، تایبەت نیە بەهیچ گەل و کۆمەڵێکەوەو، بەهیچ شوێن و جێگایەکەوە.

**پاشان لەبەشی سێیەم دا** باسی ئەوە دەکەین کە لەبواری ترساندن و تۆقاندن دا، ئەگەر تەماشای مێژووەکەی بکەین، لەنێوان هەرکام لەمسوڵمانان و نامسوڵماناندا، ئەوکاتە بۆمان ڕوون دەبێتەوە، کە جیاوازییان نێوانی ئاسمان و زەوی یەو، مسوڵمانان کەمترین پشك و بەشیان پێ دەبڕێ و، زۆربەی هەرەزۆری بەر نامسوڵمانان کەوتوە.

**وە دواتر لەبەشی چوارەم** دا باسی تیرۆر دەکەین، کەلەشەریعەتی خوای پەروەردگاردا، جێگای نابێتەوەو، هیچ شوێن پێیەکی دەست ناکەوێت.

**وە لە کۆتاییشدا** و لەبەشی پێنجەم دا، وەڵامی چەند پرسیارو ئیشکالێك دەدەینەوە: وەك:

١- مەسەلەی جەنگ

٢- جیهاد و مەسەلەی پەنهانکوژیی (إغتیال).

٣- وە مەسەلەی کوشتنی خەڵکی لاشەڕ و خەڵکی مەدەنیی و هاووڵاتیی.

کە ئایا ئەو مەسەلانە لەڕوانگەی شەریعەتەوە چۆنن و حوکمیان چییە؟ وە بۆچی کەسانێك دەیانەوێ بەبیانووی ئەو شتانەوە، مسوڵمانان و ئیسلام بەتیرۆرو تۆقاندن، تۆمەتبار بکەن؟!!

چونکە وەك زانایانی ئوصووڵ[١] فەرموویانە: (الحكم على الشيءِ فرعٌ عن تصورِهِ). بەڵێ، ئینسان ناتوانێ هەڵوێستێکی ڕاست و ڕێك و مەنتیقیی و ژیرانە لەبەرانبەر هیچ شتێدا وەربگرێ، تاکو چاك نەیناسێ، هەربۆیەش زانایانی (أصول الفقه) لەمەسەلەی (قیاس)دا عیبارەتێکیان هەیە، کەبریتیە لە: (تحقيق المناط) و(تنقيح المناط) واتە: ئەو شتەی حوکمەکەی پێوە بەستراوە، دەبێت ساغ بکرێتەوەو، دیاریی بکرێت و، جوان بپاڵێورێ و سپی بکرێ، ئەو جار دەگونجێ وەك پێویست هەڵسەنگێنرێ، چونکە زۆر جار دوو کەس لەسەر شتێك دەبێتە کێشەو مشت و مڕیان، بەڵام دوایی تێدەگەن کەلەیەکدی حاڵی نەبوون! بۆیە عەرەب گوتوویانە: (فهم السؤال نِصْفُ الجَواب) ئەگەر ئینسان لەپرسیارێك تێنەگات، بێگومان ناتوانێ وەڵامی ڕاست و دروستی بداتەوە، کەواتە: بابزانین مانای وشەی تیرۆر چییە، وە لەکوێوە هاتوە؟!

هەموو فەرهەنگەکانی زمان، بۆ وێنە: فەرهەنگی (المعجم الوسيط)[٢]، وەفەرهەنگی (مجمع اللغة العربية)[٣] و قاموسی (ئۆکسفۆرد)ی بەریتانیی، وە (لغت نامة دَهخُدا)[٤] کە گەورەترین قامووسی فارسییە، هەروەها فەرهەنگی (عميد)[٥]، وە فەرهەنگەکانی دیکەش هەموویان لەسەر ئەوە یەك دەنگن و یەك قسە دەکەن و دەڵێن: وشەی تیرۆر لەئەسڵ دا وشەیەکی فەرەنسییە، کە سپێڵەکەی بەم شێوەیە دەنووسرێ: (Terror)وە دەڵێن: تیرۆر واتایەکەی ترساندن و تۆقاندن و هەڕەشە لەخەڵك کردنە، کەجاری واش هەیە ترساندن و تۆقاندنەکە، سەر دەکێشێ بۆ کوشتارو فەوتاندنیش!

---

(١) واتە زانایانی (أصول الفقه) کەلەبارەی چۆنیەتی هەڵهێنجانی حوکمە شەرعییەکانەوە دەکۆڵێتەوە.

(٢) ص٢٧٦.

(٣) کە (المعجم الوسيط) لێیەوە نەقڵ کردوە.

(٤) ج ٥ ص٦٦٨٣.

(٥) ص ٤٣١ط٨.

ئەوە مەعنای زمانییەتی، ئنجا هەرچەندە وشەکە لەئەسڵ دا فەڕەنسییە، بەڵام دوایی لە زمانەکانی دیکەشدا بەکارهێنراوەو ڕەواجی پێدراوە، وەك گەلێك وشەی دیکە.

مانای سیاسی ئەو وشەیەش لەقاموسی سیاسیدا بەکورتی بریتیە لە: (کوشتنی سیاسییانە بەهۆی بەکارهێنانی چەکەوە) هەندێکیان ئاوایان پێناسە کردوە، بۆ وێنە: (مجمع اللغة العربية) کە قاموسێکی بەناوبانگی زمانی عەرەبییە.

هەروەها( المعجم الوسيط) دوای ئەوەی کەلەڕووی زمانەوانییەوە، وشەی (تیرۆر) دەبەنەوە سەر ئیرهاب، وشەی ئیرهاب (إرهاب)یش وەك زانایان گوتوویانە:

(أَرْهَبَ فُلانٌ فُلاناً يُرْهِبُهُ أَيْ: خَوَّفَهُ وفَزَّعَهُ).

واتە: فلان کەس فلان کەسی ترساندو تۆقاندی و زراوی برد، دوای ئەوە گوتوویانە:

(الإرهابيون وَصفٌ يُطَلَقُ على الذين يَسْلُكُون سَبيلَ العُنْفِ والإرهاب لتحقيق أهدافهم السياسية).

واتە: (ئیرهابییەکان، ئەوە وەسفێکە بۆ کەسانێك بەکاردەهێنرێت کەڕێگای توندوتیژیی و تۆقاندن دەگرنەبەر بۆ هێنانەدی مەرامە سیاسییەکانیان).

کەواتە هەرکەسێك ڕێگای توندو تیژیی و ڕێگای کوشتن و برین و ڕێگای داپۆڵسین و تۆقاندن بگرێتەبەر، بۆ هێنانەدی ئامانجی سیاسیی، ئەوە تیرۆریستە، وە ڕێبازەکەشی تیرۆریزمەو کارەکەشی تیرۆرە، ئیدی ئەو کەسە هەرکەسێك بێ، مسوڵمان بێ، یان کافر، ڕۆژهەڵاتیی بێ، یان ڕۆژئاوایی، جیاوازیی نیە و، هەمان حوکمی هەیە، مادام ئەو وەسف و پێناسەیەی بەسەردا بچەسپێ.

فەرهەنگی (عمید)یش، کە فەرهەنگێکی فارسی یە، بەم شێوەیە پێناسەی (تیرۆرزم) دەکات: (تیروریسم روش کسانی أست کە آدمکشی وتهدید مردم و

إيجاد خوف وحشت را بهر طريقى كه‌باشد، براى رسيدن به‌هدفهاى سياسى خود، أز قبيل تغيير حكومت يا دردست گرفتن زمام أمور، لازم ومباح ميدانند)[١].

واتە: تیرۆریزم ڕێبازی کەسانێکە، کە خەڵك کوشتن و هەڕەشەکردنی مەرگ لەخەڵك، وەپەیداکردنی ترس و دڵەڕاوکەو تۆقاندن بەهەرشێوەیەك، کە بۆیان بگونجێ، بەکار دەهێنن و بەڕەوا دەزانن، بۆ گەیشتن بەئامانجی سیاسی، وەك: گۆڕینی حکوومەت، یاخود بەدەست گرتنی جڵەوی حوکمڕانیی.

## ئەو وشەیە کەی پەیدابووە ؟!

لە کتێبی (تأريخ جهان)[٢]دا، کە کتێبێکی فارسی گەورەیە، هاتوە، وەك قامووسەکانی زمانیش ئاماژەیان پێکردوە، کە یەکەم جار وشەی تیرۆر لەساڵی (١٧٩٣)ز داو لەوڵاتی فەڕەنسا بەکارهێنراوە، چونکە شۆڕشی فەڕەنسی لەساڵی (١٧٨٩)کرا، ئنجا ماوەیەك دوای بەرپابوونی ئەو شۆڕشە یەکێك بەناوی (ڕوبسپییر) جڵەوی حوکمڕانیی لەفەڕەنسا گرتە دەست، ئەوکابرایە ڕێبازی توندوتیژیی و تیرۆرو تۆقاندنی گرتەبەر، وەحوکمەکەی لەساڵی (١٧٩٣) تاکو(١٧٩٤) واتە نزیکەی ساڵێك زیاتری خایاند، وەهەرکەسێك گومانی لێ کردبایە، کە دژی شۆڕشە (شۆڕشی فەڕەنسا) دەیکوشت! ئەوە بوو لەماوەی حوکمڕانییەکەی دا سی و پێنج هەزار(٣٥,٠٠٠) کەسیان بەبیانووی ئەوەی کە دژی شۆڕشن، کوشت، هەرکەسێك بەس گومانیان لێکردبایە، دەیان کوشت، وەیەکێك لەوانەی بەو بیانووە کوژرا (دانتۆن) بوو، کەڕێبەری خۆشەویستی شۆڕشی فەڕەنسا بوو، یەکێکیشیان (لوئەی شازدەیەم) بوو کەپادشای فەڕەنسا بوو.

وە ئەوانەی کە دەکوژران، بەئامێرێك دەیانکوشتن و سەریان دەبڕین بەناوی (گیوتین) کە ئالەتێکە لەهەندێك لەفەرهەنگەکان دا وێنەی کێشراوەو، شوێنێکی تێدایە، کەئینسانیان وەك جەنازە تێداڕاکێشاوەو ئاسنێکی تیژیش لەسەرەوە بووە، پلاکێکی لێبووە، کە دەستیان پێداهێناوە بەربۆتەوەو ملی ئەوکەسەی قرتاندوە،

---

(١) بڕوانە: ص٤٣١ ط ٨ ساڵ:١٣٧٥ ە ق.

(٢) ئەو کتێبەم لەسەر (CD) ییەك تەماشاکرد، کەبەفارسی نووسراوە.

ئیدی (٣٥)هەزار کەسیان بەوشێوەیە کوشتوە! دوایی لەساڵی (١٧٩٤)دا (ڕوبسپیر) بۆ خۆیشی هەر بەو ئامێری (گیوتین)ە، ئیعدام کراوەو، پاشان ئەو سەردەمە کە بەزمانی فارسی پێی گوتراوە (دورانی وحشت) وە بەزمانی عەرەبی پێیانگوتوە: (عصر الإرهاب) وە بەفەرەنسی پێیان گوتوە: (چاخی تیرۆریزم)، کۆتایی پێهاتوە.

کەواتە: ئەگەر واقیع بینانە تەماشای ئەو وشەیە بکەین، وەتەماشای ئەو ڕێبازە بکەین، چ وەك لایەنی زمانیی و، چ وەك زاراوەیەکی سیاسیی، بۆمان ڕوون دەبێتەوە، کە وشەو زاراوەی (تیرۆر) هیچ پەیوەندیی بەعالەمی ئیسلامیی و بەجیهانی ڕۆژهەڵاتەوە بەگشتی، نیە، بەڵکو وشە و زاراوەیەکی فەرەنسییە.

پێشتر باسی تیرۆریزممان، وەك وشەو زاراوەیەکی سیاسیی و شێوازێکی هەڵس و کەوت، کرد، ئێستاش باسی نێوەڕۆك و جەوهەری تیرۆریزم دەکەین، وەك دیاردەیەکی جیهانیی و گشتیی، کە تایبەت نیەو نەبووە بەگەل و کۆمەڵ و کات و شوێنێکەوە، بەڵکو دیاردەیەکی لەمێژینەیە.

**تیرۆریزم واتە:**

فەرزکردنی بیروڕای خۆت لەسەر غەیری خۆت بەزۆرو زۆرداریی، کەبەبێ ئەوەی ئەو بەرانبەرە قەناعەتی پێ بێت، لەسەری فەرز بکەی و دایبپڵۆسی و ئیرادەی پێشێل بکەی، ئا ئەوە تیرۆریزمە، وە تیرۆریست کەسێکە کەهەوڵی سەپاندن و فەرزکردنی بیرو بڕوا و قەناعەتی خۆی دەدات، جا چ قەناعەتێکی دینیی بێت، چ سیاسیی بێت، چ فەلسەفیی بێت، چ مەزهەبیی، چ هەر شتێکی دیکە بێت، هەرکاتێك قەناعەتی خۆت یان قەناعەتی پێڕو دەستەو کۆمەڵی خۆت، بەتۆبزیی لەسەر غەیری خۆت فەرزبکەی، بێگومان ئەوە حاڵەتێکی تیرۆریستانەیە.

کەواتە: نێوەڕۆکی تیرۆریزم و کاکڵ و جەوهەرەکەی، دیاردەیەکی گشتی و جیهانییە، چونکە ئەگەر ئێمە تەماشای مێژووی دنیا بکەین، دەبینین کە ئەو حاڵەتە هەر هەبووە، چونکە ئەو حاڵەتە پەیوەندیی بەغەریزەی شەڕخوازانە و یاخیی بوون و لەخۆبایی بوون و غەڕڕابوونی ئینسانەوە هەیە، ئەو غەریزەیەش وەك گەلێك غەریزەی دیکەی شەڕخوازانە، لەسروشتی مرۆڤدا دانراوە، وەك چۆن زۆر غەریزەی خێرخوازانەش لەگەڵ فیترەتی دا شێلراون، تاکو بگونجێ بەهەردووك باری خێرو چاکەو شەڕو خراپەدا بجووڵێ و، بەکەڵکی ئەوە بێت کەتاقی بکرێتەوەو بجەرِبێنرێ، وەك خوای کاربەجێ فەرموویەتی:

﴿ فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَاهَا ﴿٨﴾ ﴾ الشمس: ٨.

واتە: خوا ئینسانی فێری خراپەکاریی و پارێزکاریی کردوە، بەڵی خوای پەروەردگار سروشتی ئینسانی وا هەڵخستوەو خوڵقاندوە، کەبتوانێ هەمو جۆرەکانی خراپە بکاو، هەمووجۆرەکانی چاکەش بکات.

ئینسان لەنێو بوونەوەردا مەخلووقێکی ناوازەیەو، مەوداو مەسافەیەکی ئەوەندە بەرینی هەیە بۆ هاتوچۆ، بۆ بەرزبوون و نزم بوون، کەهیچ مەخلووقێك نیەتی، مەلائیکەت هەر مەلائیکەتەو، دەبێ هەر لەو ئاستە بەرزەی خۆی دابێ، کەخوا پێی بەخشیوە، دارو بەردو ژیاندارانیش هەر داروبەردو ژیاندارن و، کەهەکەشان و ئەستێرەو خڕۆکەکانیش، هەر لەپلەو شوێنی خۆیاندا دەمێننەوەو، مەوداو بواری هەڵکشین و داکشین و بەرزبوونەوەو نزم بوونەوەیان نیە، بەڵام ئینسان دەتوانێ هێندە بەرز بێتەوەو، بەڕاددەیەك چاك و پاك بێ، کەشایستەی ئەوە بێ فریشتەکان سەجدەی بۆ بەرن، وە دەتوانێ، هێندە نزم بێتەوە، کە خوا -جل جلاله- و فریشتەکان وهەموو دروستکراوەکانی لەعنەتی لێ بکەن، وەك خوای دادگەر دەفەرموێ:

﴿لَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَـٰنَ فِىٓ أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ ﴿٤﴾ ثُمَّ رَدَدْنَـٰهُ أَسْفَلَ سَـٰفِلِينَ ﴿٥﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ فَلَهُمْ أَجْرٌ غَيْرُ مَمْنُونٍ ﴿٦﴾﴾ التين:٦.

واتە: بێگومان ئینسانمان لە جوانترین و چاکترین شێوەدا[1] خوڵقاندوە، [شێوەیەك کە دەتوانێت بەهۆیەوە جێنشینی خوا بێت لەسەر زەوی، واتە: شەریعەتی خوا لەسەر زەوی پیادە بکات] وەك (القاسمي) و (القرطبي) و (سید قطب) لەتەفسیرەکانیاندا ئاماژەیان بۆ کردوە[2].

وە دەشتوانێت بەهۆی ئیرادەی ئازادانەیەوە، لەجیاتی بەرزبوونەوەی، نزم بێتەوەو وەك شەیتان بێ و بچێتە پلەیەکی نزمی هەرە نزم: ﴿ثُمَّ رَدَدْنَـٰهُ أَسْفَلَ سَـٰفِلِينَ﴾ واتە: دوایی گێڕامانەوە بۆ نزمی هەرە نزمان!

---

(١) دیارە مەبەست لە شێوە (تقویم) تەنها دیمەن و ڕواڵەتی جەستەیی نیە، بەڵکو مەبەست شێوەو پێکهاتەی دەروونیی و ڕواڵەتییەتی، کەمرۆڤ پێیان لەدروستکراوەکانی دیکە خوا جیاکراوەتەوەو، ئەو حاڵەتە تایبەت و ناوازەیەی وەرگرتوە.

(٢) (تفسیر القاسمي) ج١ص٩٥، وە (الجامع لأحکام القرآن) ج١ ص٢٢٣، وە (في ظلال القرآن) ج١ص٥٦.

ئنجا یەكێك لەو هاندەرو غەریزە شەڕخوازانەی كەخوای پەروەردگار بەمەبەستی تاقیكردنەوەی ئینسان، لەئینساندا خوڵقاندوونی، بریتیە لە غەریزەی یاخیبوون و لەخۆبایی بوون، وەك خوای كاربەجێ فەرموویەتی:

﴿ كَلَّآ إِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ لَيَطۡغَىٰٓ ﴿٦﴾ أَن رَّءَاهُ ٱسۡتَغۡنَىٰٓ ﴿٧﴾ ﴾ العلق:٦-٧.

واتە: نەخێر، ئینسان یاخی دەبێت، كاتێك كە خۆی بێنیازو باڵادەست دەبینێت.

ئەگەر تەماشای سەربردەی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) بكەین، دەبینین هەمیشە نەیارانی پێغەمبەران( (علیهم الصلاة والسلام) بەزۆری دووچین بوون: چینی خۆش گوزەرانان، وەچینی خاوەن دەستەڵاتان، كە خوای دادگەر وشەی: (مترفین)[١] و (مسرفین)[٢]ی بۆ پێناسەی چینی یەكەمی نەیارو ناحەزانی پێغەمبەران، بەكارهێناون، چونكە ئەوان بەهۆی ماڵ و سامانەكەیانەوە، لەخوا عاسیێ دەبن و لەخەڵك یاخیی دەبن!.

وە بۆ ئەوانی دیكەش وشەی: (مستكبرین)ی بەكارهێناوە، واتە: خۆ بەزل گران و خۆ گەورەكەرانی بەناهەق، چونكە وشەی (مستكبر)، لە (كبر)ەو (س)ی (طلب)ی چۆتە سەریێ! واتە گەورەو زل نیە، بەڵام خۆی گەورەو زل كردوە، هەروەها بۆ پێناسەی كەسانێكیش كە دەچەوسێنرێنەوە، خوای پەنهان بین وشەی: (مستضعفین)ی بەكارهێناوە، كە ئەمەیش لە (ضعف)ەوەیە و (س)ی (طلب)ی لەسەرە، تاكو دەری بخات كە ئەوانیش لەئەسڵ دا بێهێزنین، بەڵام بێهێز (ضعیف) كراون!.

دیارە ئەو ئایەتەش كە فەرموویەتی: ﴿ وَخُلِقَ ٱلۡإِنسَٰنُ ضَعِيفٗا ﴿٢٨﴾ ﴾ النساء: ٢٨.

ناكۆكیی نیە لەگەڵ ئەو مەبەستەدا كەخەریكی توێژینەوەو ئیسپات كردنینی، چونكە مەبەست لەو بێ هێزیی یەی ئینسانەكان، ئەو حاڵەتەیە كە هەموویان تێیدا یەكسانن، بەڵام ئەو بێ هێزكردنەی كەلەلایەن طاغووت و

---

(١) خۆشگوزەرانان.

(٢) زێدەڕۆییكەران.

فیرعەونەكانەوە بەسەر خەڵكی بێ چارەدا سەپێنراوە، مەبەست حاڵەتێكە، كە بەناحەق دەیانچەوسێننەوە و زەعیفیان دەكەن! با تەماشای ئەم ئایەتە بكەین:

خوای پەروەردگار لە ئایەتی (٣٤)ی (السبأ)دا و هەر هەمان ئایەت لەسوورەتی (الزخرف)یش دا بەشێوەیەكی دیكە هاتوە، دەفەرموێ:

﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا فِي قَرۡيَةٖ مِّن نَّذِيرٍ إِلَّا قَالَ مُتۡرَفُوهَآ إِنَّا بِمَآ أُرۡسِلۡتُم بِهِۦ كَٰفِرُونَ ﴿٣٤﴾ ﴾

سبأ:٣٤

واتە: ئێمە هیچ ڕەوانەكراوێكمان لەهیچ ئاوەدانییەك دا نەناردوە، مەگەر خۆش گوزەرانەكانی گوتوویانە: ئەوەی ئێوە پێی ڕەوانەكراون، ئێمە بڕوامان پێی نیە.

## بەڵێ بەڕێزان!

پێویستە هەموو لایەكمان ئەو ڕاستییە گرنگە زۆر باش بزانین، كە یەكەمین كەسانێك كە دژی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) وەستاونەتەوەو، بەربەرەكانێیان كردوون: خۆشگوزەرانان (مترفین)بوون، ئەوانەی لەسەر حیسابی خەڵكی ڕەش و ڕووت سەروەت و سامانی حەرامیان وەسەریەك ناوەو، كۆشك و تەلاریان پێ دروست كردوون.

ئنجا پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) كە هاتوون بانگی زوڵاڵی ئازادیی و پەیامی سەرفرازیی و ڕزگاریی لە چەوسانەوەیان، بەگوێی ئەو خۆش گوزەرانانەدا داوە، بێگومان ئەوان دەستبەرداری نازو نیعمەت و كەیف و سەفاو سەروەت و سامانی ناشەرعییانەی خۆیان نەبوون! بۆیە سەرسەختانە لە دژی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) وەستاون و لەگەڵیاندا دەستەو یەخە بوون.

ئەوە لەبارەی خۆشگوزەرانان و زێدەڕۆییكەرانەوە، كە جۆری یەكەمی دوژمنان و ناحەزانی پێغەمبەرانی خواو شوێنكەوتوانیانن، جۆری دووەمیش كەوەك پێشتر ئاماژەمان بۆ كرد: دەستەڵاتدارە خۆپێ زۆرو خۆ بەزلگرەكان (مستكبرین)ن، واتە:

کەسانێك کەوەك چۆن (مترفین) لەڕێی حەڕام و ناشەرعییەوە، ماڵیان وەسەریەك ناوەو دەوڵەمەند بوونە، ئەوانیش لەڕێی ستەم و ناهەقییەوە دەستەڵاتی سیاسییان بەدەستەوە گرتوەو، خۆیان بەسەر خەڵکدا فەرز کردوە، وەك خوا فەرموویەتی:

﴿قَالَ ٱلۡمَلَأُ ٱلَّذِينَ ٱسۡتَكۡبَرُواْ مِن قَوۡمِهِۦ لَنُخۡرِجَنَّكَ يَٰشُعَيۡبُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَكَ مِن قَرۡيَتِنَآ أَوۡ لَتَعُودُنَّ فِي مِلَّتِنَاۚ قَالَ أَوَلَوۡ كُنَّا كَٰرِهِينَ ٨٨﴾ الاعراف:٨٨.

واتە: خۆ بەزلگرەکان (ئەوانەی کە دەستەڵاتیان هەبوو وبەهۆی دەستەڵاتەکەیانەوە لەخۆیان بایی بوون) گوتیان: ئەی شوعەیب! خۆت و ئەوانەی لەگەڵتن و ئیمانیان پێت هێناوە، یان لە ئاوەدانی خۆمان دەرتان دەکەین، یان دەبێ بگەڕێنەوە سەر ڕێبازی ئێمە! ئەویش فەرمووی: ئەدی چارەمان چییە، ئەگەر حەز لەڕێبازی ئێوە نەکەین و قەناعەتمان پێی نەبێ؟!

وەك دەبینین نەیارانی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) زۆر بەڕاشکاویی و بێ شەرمانە، بەخۆیان و پەیڕەوانیان دەڵێن: کەمافی ئەوەتان نیە بەئازادیی بیر بکەنەوەو، جگە لەڕێبازو بەرنامەی ئێمە، شوێن شتێکی دیکە بکەون، ئەگەر نا، دووچاری سزاو تۆڵەو دەرکران دەبن!

کەواتە: ئەوانە نەیارو ناحەزانی ئایین و بەرنامەی خوا بوون، کەمافی بیرکردنەوەی ئازاد و هەڵبژارنی ڕێبازی ژیان و گوزەرانیان لە ئەهلی ئیمان زەوت کردوەو، بەپێچەوانەی پڕوپاگەندەی چەواشەکارانەی دوژمنانی ئیسلامەوە، کە بەرانبەر بەئیسلام دەیڵێن، چونکە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) هیچ کاتێك مافی بیرکردنەوەو بیروڕا و ئازادیی مرۆڤ، ئیمان دێنێ یان ناهێنێ، یان لەخەڵکی زەوت نەکردوە، وەك دوایی باسی دەکەین.

**بۆ نموونە:**

١- لەبەسەرهاتی (ئیبراهیم - علیه الصلاة والسلام) و (نەمروود)دا چی دەبینین؟! کاتێك (إبراهیم) لەگەڵ (نەمروود)و دارو دەستەکەی دا ڕووبەڕوو دەبێتەوەو، لەبواری گفت و گۆو وتوێژدا، هیچ بەڵگەیەکیان بەدەستەوە ناهێڵێ و، بەتەواویی

بێ قسەو بیانوو براویان دەکات و (إقامة الحجة) یان لەسەر دەکات، دوایین پەناگە و ئامرازی نەمروودو دارو دەستەکەی، بریتی بووە لە هەڕەشەو گوڕەشەو سزادان، وەك خوای زانا دەفەرموێ:

﴿ قَالُوا۟ حَرِّقُوهُ وَٱنصُرُوٓا۟ ءَالِهَتَكُمْ إِن كُنتُمْ فَـٰعِلِينَ ﴿٦٨﴾ ﴾ الانبیاء:٦٨.

واتە: (نەمروودو دارو دەستەکەی) گوتیان: ئیبراهیم بسووتێنن و پەرستراوەکانی خۆتان سەربخەن، ئەگەر دەتانەوێ شتێك بەشتێك بکەن!

## بەڵی بەڕێزان!

ئەوە هەر نەمروود و فیرعەونەکان بوون، کە لەبەرانبەر (إبراهیم) و (موسی)یەکان دا (علیهم الصلاة والسلام) پەنایان بردۆتە بەر ئاگرو ئاسن و دارو قەمچی! چونکە بیروبڕوای بت پەرستانەی ئەوان زادەی هەواو ئارەزوو گومانی خۆیان بوو و، وەك شتێکی چاوەڕوان کراو، لەبەرانبەر ئایین و بەرنامەی ڕاست و هەقی هەڵقوڵاو لەزانیاریی و ڕەحمەت و حیکمەتی بێ سنووری خوادا، شکستی خواردوە، ئنجا کاتێك لەو مەیدانەدا شکاون، پەنایان بردۆتە بەر دوایین چەکیان، کە بریتیە لەهەڕەشەو گوڕەشەو ترساندن و تۆقاندن و، پاشانیش ئاگرو ئاسن و پەت و سێدارەو قەمچی!!، کە هەر ئەوەشە لەسەردەمی ئێمەدا ناویان ناوە: تیرۆرو تۆقاندن و کوشتن و بڕین.

٢- یان باتەماشا بکەین کاتێك کە (موسی) - علیه الصلاة والسلام - لەگەڵ فیرعەوندا ڕووبەڕوو دەبێتەوە و، هیچ قسەو بیانووێك بەدەست فیرعەونەوە ناهێڵێ، تەنها بەمەنتیق و دەلیل و بەڵگەش، چونکە (موسی) - علیه السلام - بەس خۆی و گۆچانەکەی و هاڕوونی برایشی لەگەڵ بووە - سەلامی خوایان لەسەربێ - کەجگە لە پەیامی هەقی خواو بەڵگەی ڕوون، هیچیان پێ نەبووە، نەهێزو دەسەڵات و نەسوپاو لەشکر، تەنها هەقیان بەدەستەوە بووە، ئنجا کاتێك بەوجۆرە لەگەڵ فیرعەوندا ڕووبەڕو و دەبنەوە، دوایین قسەی فیرعەون، وەك عادەتی هەمیشەیی طاغووت و دیکتاتۆرەکان، ئەوەبووە، کە پەنای بۆ هەڕەشە

بردوە و، دوایین بڕیاری لەبەرانبەر (موسی) و ئەو ئایین و پەیامە هەقەدا کەهێناویەتی، ئەوەبوو کە دەڵێ:

﴿قَالَ لَئِنِ ٱتَّخَذۡتَ إِلَٰهًا غَيۡرِي لَأَجۡعَلَنَّكَ مِنَ ٱلۡمَسۡجُونِينَ ٢٩﴾ الشعراء:٢٩.

واتە: ئەگەر بێت و جگە لەمن پەرستراوێکی دیکەت هەبێت، ڕەگەڵ گیراوانت دەخەم، واتە: دەتخەمە گەڵ ئەو کەسانەی کەوەك تۆ سجنم کردوون! وا دیارە گەلێك کەسی دیکەی وەك مووسای، بەزوڵم زیندانیی کردوون!.

بەڵێ ئەوە دوایین هەڕەشەی فیرعەونە، کە لە مووسای دەکات، ئنجا مووساش (علیه السلام) وەك خوای پەروەردگار لێی دەگێڕێتەوە، تەنهاو تەنها پەنای بردۆتە بەرخواو فەرموویەتی:

﴿وَقَالَ مُوسَىٰٓ إِنِّي عُذۡتُ بِرَبِّي وَرَبِّكُم مِّن كُلِّ مُتَكَبِّرٖ لَّا يُؤۡمِنُ بِيَوۡمِ ٱلۡحِسَابِ ٢٧﴾ غافر:٢٧.

واتە: وە مووسا گوتی: من پەنا دەگرم بەپەروەردگاری خۆم و ئێوەش، لەهەر خۆ بەزلگرێك کە ئیمانی بەڕۆژی لێپرسینەوەو سزاو پاداشت نیە.

بەڵێ، ئەوە طاغووتە خۆ بەزلگرەکانن، کەهەمیشە پاش تێشکان و بەزین لەمەیدانی وتوێژو بەڵگە هێنانەوەدا، پەنایان بردۆتە بەر ئاگرو ئاسن و ئەشکەنجەو ئازاردان و گرتن و، لەوڵات دەرکردنی پێغەمبەران و شوێنکەوتوانیان، وەپاش نەمانی هێزی بەڵگە (قوة الدليل) هانایان بردوە بۆ بەڵگەی هێز (دليل القوة) بەواتایەکی دیکە: لەبەرانبەر هێزی مەنتیق (قوة المنطق) دا پەنایان بردۆتە بەر مەنتیقی هێز (منطق القوة)!

٣- هەروەها پێغەمبەری خاتەم و کۆتاییش (صلى الله عليه وسلم) لەگەڵ نەیارو ناحەزانی دا هەر بەهەمان شێوە بووە: کاتێك لەگەڵ ئەبووجەهل و وەلیدی کوڕی موغەیرەو باقی سەرانی قوڕەیش دا ڕووبەڕوو دەبێتەوەو، هیچیان بەدەستەوە نامێنێ و، لەمەیدانی گفت وگۆو وتووێژدا دەبەزن و تێدەشکێن، کافرو موشریکەکان، هەمان شێوازی پێشووەکانیان ڕەچاو دەکەن! بۆیە بەڕاستیی

زۆر زۆر جێی سەرسوڕمانە، كە لەم چاخ و زەمانەی ئێمەدا ئیسلامییەكان و مسوڵمانان بەوە تۆمەتبار بكرێن، كەبڕوایان بەوتوویژ نیەو، بڕوایان بەزمانی مەنتیق نیەو، بڕوایان بەیەكدی دواندن و گفتوگۆ نیەو، تۆمەتی توندوتیژییان وەپاڵ دەدرێ!!

ئایا دەبێ دینی خوا، هێندە بێ بەڵگەو دەلیل بێ، كە لەمەیدانی وتوویژدا تێ بشكێ؟! نەء، یان ئەوەتا ئەوە تۆمەتێكە بەناهەق ئاراستەی ئیسلام دەكرێ، یان كەسانێكی مسوڵمان هەن، كە مسوڵمانی كرچ و كاڵ و ناشێن و، باش لە دینەكەی خۆیان تێنەگەیشتوون و، بیانوویان بەدەستی تەرەفی بەرانبەرەوە داوە!

ئەگەر نا، وانیە كە ئایین و بەرنامەی خوای بێ وێنەو باڵا دەست، توانای ئاخاوتن و وتوێژی نەبێ و، هێزی بەڵگەی بەدەستەوە نەبێ و، پەنا بۆ بەڵگەی هێز بەرێ!

بەڵێ، ئەگەر سەرنجی مێژوو و ژیاننامەی پێغەمبەری كۆتاییش (صلی الله علیه وسلم) بدەین، دەبینین كەهەمان سیاسەت و شێوازی كۆن و لەمێژینەی ئەهلی كوفر، كە لەگەڵ پێغەمبەراندا (علیهم الصلاة والسلام) بەكاریان هێناوە، (قورەیش) و موشریكەكانی سەردەمی پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) پەنایان بردۆتە بەرهەمان شێوازو ڕێبازو ئامراز، بۆ نموونە: خوای باڵا دەست و دادگەر دەفەرموێ:

﴿ وَإِذْ يَمْكُرُ بِكَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لِيُثْبِتُوكَ أَوْ يَقْتُلُوكَ أَوْ يُخْرِجُوكَ ۚ وَيَمْكُرُونَ وَيَمْكُرُ ٱللَّهُ ۖ وَٱللَّهُ خَيْرُ ٱلْمَٰكِرِينَ ﴿٣٠﴾ ﴾ الأنفال:٣٠.

واتە: [ئەی (محمد!)] یادی ئەوكاتە بكەوە، كە ئەوانەی بێ بڕوا بوون، پیلانیان لە تۆ دەگێڕا، كە یەكێك لەو سێ شتانەت لە دژ بكەن: یان زیندانیی (سجن)ت بكەن، یان بتكوژن، یان دەرت بكەن.

كەواتە: ئەوە نەیارانی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) بوون، كەپاش هیچ پێ نەمان و تێشكان لەمەیدانی وتوێژو بەڵگەكاریی دا، پیلانیان گێڕاوەو، هەوڵیان داوە یەكێك لەو سێ شتە: گرتن، كوشتن، دەركردن،ی لەگەڵدابكەن.

٤- وە لەسوورەتی (إبراهیم)یشدا، خوای پەروەردگار بەسەرهاتی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام)و نەیارانیان لە ئۆممەتەکانیان باس دەکات، کە هەموو ئەهلی کوفر بەیەك مەنتیق قسە لەگەڵ هەموو پێغەمبەران دا (علیهم الصلاة والسلام) دەکەن و، لەهەڵبژێرانی یەکێك لە دوو ڕێیاندا سەرپشکیان دەکەن، کە وەك گوتراوە: (أَحلاهُما مُرٌّ) شیرینترەکەیان تاڵە، دەفەرموێ:

﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لِرُسُلِهِمۡ لَنُخۡرِجَنَّكُم مِّنۡ أَرۡضِنَآ أَوۡ لَتَعُودُنَّ فِي مِلَّتِنَا ﴾ ابراهیم: ١٣.

واتە: وە ئەوانەی کەبێ بڕوان، بە پێغەمبەرەکانی خۆیانیان گوت: یان لەسەر زەمینی خۆمان دەرتان دەکەین، یان دەبێ بگەڕێنەوە سەر ئایینەکەمان!

دیارە حیکمەتی کۆکرانەوەی تێکڕای پێغەمبەرانی خوا (علیهم من الله أفضل الصلوات وأتم التسلیمات) لەبەرانبەر سەرجەم ئەهلی کوفردا، لەم ئایەتەدا، ئەوەیە کە دەربکەوێ: هەم ئایین و پەیامی پێغەمبەران لەنێوەڕۆکدا یەك شتەو، هەم شێوازی ڕووبەڕووبونەوەی نەیارو ناحەزانیشیان، لەجەوهەرو نێوەڕۆکدا یەکە.

پاشان خوای پەروەردگارو دادگەر لەوەڵامی ئەو هەڕەشەیەی ئەهلی کوفردا، کە ئاڕاستەی پێغەمبەرانی پایە بەرزی خوایان کردوە، ڕوو لەپێغەمبەرەکانی خۆی (علیهم الصلاة والسلام) دەکات و پێیان دەفەرموێ:

﴿فَأَوۡحَىٰٓ إِلَيۡهِمۡ رَبُّهُمۡ لَنُهۡلِكَنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ ١٣﴾ ابراهیم: ١٣.

واتە: پەروەردگاریان پێی ڕاگەیاندن - واتە بەپێغەمبەران (علیهم من الله أفضل الصلوات وأتم التسلیمات) - کەبە تەئکید ئێمە ستەمکاران دەفەوتێنین!

بەڵێ، لەحاڵێك دا، کە سەرکردە دیکتاتۆرو خۆسەپێنەرو ملهوڕەکانی ئەهلی کوفر، لەبەرانبەر پەیامی هەق و پڕ خێرو خۆشی و عەدالەتی خوای بەخشندەدا، دەست بۆ چەك و هێزو هەڕەشەو گوڕەشەو ترساندن و تۆقاندن - بەزاراوی ئەم سەردەمە (تیرۆرو ئیرهاب) - دەبەن، وە پێغەمبەرانی خوا (صلی الله علیه وسلم) و شوێن کەوتوانیشیان، چەك و هێزێکی ئەوتۆیان نیە، کە بەرگریی پێ

لە پەیام و بەرنامەکەیان بکەن، ئەوە بەگوێرەی یاسا (سنة)یەکی خوایی، کە بریتیە لەتۆڵەسەندنەوە لەستەمکاران ﴿لَنُهۡلِكَنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ خوای تۆڵەستێن لەوکاتەدا کە خۆی بەچاکی دەزانێ، دەست بەکاردەبێ و ئەهلی کوفر بەربادو ئەهلی ئیمان دەرباز دەکات!

بەکورتی:

(تیرۆریزم) کە بریتیە لە فەرزکردن و سەپاندنی بیروبڕواو قسەو بۆچوونی خۆت بەسەر غەیری خۆتداو، پێشێل کردنی ئازادیی تەرەفی بەرانبەرو، پڵیشاندنەوەی ئیرادەو کەسایەتیی و کەرامەتی، بەڵێ، ئا ئەم ڕەفتارو دیاردەیە: وەك نێوەڕۆك و جەوهەرەکەی، دیاردەو حاڵەتێکی لەمێژینەو گشتیی و جیهانییەو، هەمیشەش نەیارو ناحەزانی پێغەمبەرانی خواو دوژمنانی ئایین و ڕێبازەکەی، پاش تێشکان و بەزین و هیچ پێنەمان، لە بواری وتووێژو بەڵگە هێنانەوەدا، پەنایان بردۆتە بەرێ، بۆ ئەوەی بەبەڵگەی هێز (منطق القوة) کەلێن و بۆشایی هێزی بەڵگە (قوة المنطق)ی ڕێچکەو بیردۆزەکانیان پڕ بکەنەوە، بۆیە:

شتێکی زۆر بێ ویژدانانەو دوور لەعەقڵ و مەنتیق و واقیعە، کە تۆمەتی (تیرۆرو ئیرهاب) پاڵدرێتە لای ئیسلام و ئەهلی ئیسلام، چونکە ئەگەر بگونجێ هەر بیروبڕواو فەلسەفەیەك بەتۆبزیی و زۆرو چاولێزەق کردنەوەو، هەڕەشەو فشار لەسەر خەڵك، فەرز بکرێ، مەحاڵە ئەو شێوازە بۆ ئیسلامێك دەست بدات، کەبەر لەهەر شتێك، سەروکاری لەگەڵ دڵ و دەروون و دیوی پەنهانی ئینساندا هەیەو، هەر کارو کردەوەو چالاکییەك، کە هەر چەندە بەڕواڵەت زۆر چاك و پەسند بێت، بەڵام مادام قەناعەت و نیەت و خوا پێ مەبەست بوونی دەروونی لەگەڵ دا نەبێت، ئیسلام نەك هەر قبووڵی ناکات و فلسێکی پێ نادات! بگرە ئەگەر خاوەنەکەی بەئانقەست و بۆ فریودان ئەنجامی دابێت، لەسەریشی تووشی سزاو جەزرەبەی توند دەبێت و، بابای وا لەپێناسەی شەرعدا بەدەغەڵ و دووڕوو (منافق)، یان لایەنی کەم، ڕیاباز (مرائی) لەقەڵەم دەدرێ!

هەر بۆیەش پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی:

{إِنَّ اللَّهَ لاَ يَنْظُرُ إِلَى صُوَرِكُمْ وَأَمْوَالِكُمْ وَلَكِنْ يَنْظُرُ إِلَى قُلُوبِكُمْ وَأَعْمَالِكُمْ} أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٧٨١٤)، وَمُسْلِم برقم: (٢٥٦٤)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٤١٤٣).

واتە: بێگومان خوا سەرنجی قەد و قیافە و دیمەنتان و ماڵ و سامانتان نادات، بەڵكو تەماشای دڵ و كردەوەكانتان دەكات.

كەواتە: با هەموو لایەك بزانن و دڵنیا بن كە: تیرۆرو بەزۆر دین بەسەر خەڵكدا فەرزكردن، بەرلەوەی پێچەوانەو دژی حوكمەكانی شەریعەت بێت، لەگەڵ ئەسڵ و بناغەی ئیسلام دا، كەئیمان و عەقیدەیە، ناكۆك و نەگونجاوە.

بۆیە هەر تۆمەتباركردنێكی ئیسلام بەتیرۆرو ئیرهاب، بەڵگەو نیشانەی نەزانیی و بێ ئاگایی و نەشارەزاییە بە ئەلیف و بێی ئیسلام.

دیارە ئەگەر گریمان مسوڵمانێكیش، یان تاقمە مسوڵمانێكیش، لەو بوارەدا دووچاری هەڵەو كەم و كووڕیی یەك بووبێ، ئەوە هیچ ڕەواو ماقووڵ نیە، كە ڕەفتارو هەڵوێستێكی هەڵەو ناشەرعیی، كە ئیسلام لێی بەرییە لەسەر ئیسلام حیساب بكرێ!

ئنجا وەك دواتریش باس دەكەین: گەلێك جار ناحەزو دوژمنانی داخ لەدڵی ئیسلام و مسوڵمانان، هەر جۆرە زبریی و توندو تۆڵیی و دەست كردنەوەو هێز بەكارهێنانێكی مسوڵمانان، هەر لەبەر ئەوە بەناوی ئیسلامەوەیەو لەلایەن مسوڵمانانەوەیە، هەر بە تیرۆرو ئیرهاب ناوزەد دەكەن! كە بێگومان ئەوەش دژو پێچەوانەی عەقڵ و شەرع و ویژدانە، چونكە هەموو خاوەن عەقڵ و ویژدانێكی ساغ و زیندوو دەزانێ، كەتیرۆرو تۆقاندن و زەبروزەنگی ستەمكارانەو، دیفاع و لەسەرخۆكردنەوەو بەر هەڵستیی ڕەوا (المقاومة الشرعية)، هێندەی زەوی و ئاسمان لەیەك جیاو دوورن!

ئەگەر سەرنجێكی مێژووش بدەین، كەبەداخەوە زۆر جار دەبینین ڕۆشنبیرانی كوردو خەڵكی (عەلمانیی) لەپشت پەردەی ڕەشەوەو بەچاویلكەی خەڵكی دیكە، تەماشای مێژووی ئیسلام و مێژووی میللەتەكەی خۆشیان دەكەن! بەڵام بێگومان قسە لەدوژمن وەرناگیرێ و قسەی نەیار لەسەر فیكری نەیار، ناكرێتە بەڵگەو دەلیل، دەجا ئێمەش نابێت قسەی ڕۆژهەڵاتناسەكان (مستشرقین)و قسەی ڕۆژئاواییەكان بهێنین و، لەسەر مێژووی ئیسلام و مسوڵمانانی بكەینە بەڵگەو دەلیل، گەلێك جار ئەو تۆمەتە پاڵ دەدرێتە لای مێژووی ئیسلامیی، كە گوایە جەنگەكانی مسوڵمانان بەتایبەتی لەسەردەمی هاوەڵانی پێغەمبەردا - خوا لێیان ڕازی بێ - بریتی بوون لەوڵات زەوت كردن لەخەڵك و، لە داپڵۆسینی خەڵك و میللەتان و، ژێر دەست كردنیان و چەوساندنەوەیان!!

بەڵام كاتێك تەماشای دەقەكانی قورئان و سوننەت و سیرەو ژیانی كردەیی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) و خەلیفە ڕاشیدەكانی دەكەین، كە بێگومان ئێمە بەس سیرەی كردەیی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) و پاشان تا ڕاددەیەكیش سیرەو كردەوەی چوار جێنشینە سەر ڕاستەكانی (أبوبكرو عمرو عثمان وعلی) - خوا لێیان ڕازی بێ - وەك بەڵگەو سەنەدێكی شەرعیی خەڵك دەتوانێ لەسەرمان بیكاتە بەڵگەو دەلیل، بۆیە بەناو خەلیفەیەكی (ئومەویی و عەبباسیی و عوسمانیی) ئەگەر ڕەفتارێكی هەڵەو ناشەرعیی و پێچەوانەی ئیسلامیی لێ ڕوودابێ، ئەوە نابێ ئیسلام و مسوڵمانان لەبەرانبەری دا بەرپرسیار بن، هەرچەندە مێژوی ئیسلام بەسەردەمی (ئومەویی و عەبباسیی و عوسمانیی)یشەوە، ئەگەر بەراورد بكرێ، لەگەڵ مێژووی میللەتان و وڵاتانی دیكەدا، دیسان هەر جیاوازییان ئاسمان و ڕێسمانە.

ئنجا ئەوە شتێكی ئاشكرایە، كە لە جەنگەكان و ئازادكردنەكان (فتوحات)ی ناوازەو دادگەرانەی ئیسلامیی دا، بنچینەیەكی شەرعیی (قاعدة شرعیة) هەبووە كە بەگوێرەی ئەو بنچینەیە ڕەفتاریان لەگەڵ خەڵكی دا كردوە، ئەویش بریتی بووە لەوە كەسوپای ئیسلام، پاش ڕووبەڕووبوونەوەی لەگەڵ خەڵكی هەر ناوچەیەك و هەر وڵاتێك دا، ئەو خەڵكانەیان خستۆتە بەردەم سێ

بژاردە(خیار)ەوە و سەرپشکیان کردوون لەنێوان سێ شتاندا، کەیەکێك لەوسێ شتانە هەڵبژێرن[١]، وەك لە (تأریخ الطبري)[٢]و (البدایة والنهایة)[٣] و(الكامل في التأریخ)[٤]و لەهەموو مێژووەکانی ئیسلامدا تۆمار کراوە، هەڵبەتە بەر لەمێژووش ئەو مەسەلەیە لە چەندان فەرمایشتی پێغەمبەردا (صلى الله علیه وسلم) هاتوەو حەقیقەتێکی ڕوون و بەڵگەنەویستە، بۆ وێنە: پێغەمبەری خوا (صلى الله علیه وسلم) لەوبارەوە فەرموویەتی:

{إِذَا لَقِيتَ عَدُوَّكَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ فَادْعُهُمْ إِلَى ثَلاَثِ خِصَالٍ... فَإِنْ أَبَوا فَسَلْهُم الجِزْيَةَ}

أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٢٣٠٢٨)، تعليق شعيب الأرنؤوط: إِسْنَادُهُ صَحِيح عَلَى شَرْطِ مُسْلِم، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٢٦١٤).

واتە: ئنجا کاتێك بەرەنگاری دوژمنەکەت بوویەوە، لەهاوبەش بۆ خوا دانەران، بانگیان بکە بۆ سێ شتان - یانی: بۆ یەکێك لەسێ شتان -، دوایی لە درێژەی فەرموودەکەدا هاتوە: ئنجا ئەگەر هەرکام لەو سێ شتەیان قبووڵ کرد لێیان وەربگرەو وازیان لێبێنە، سەرەتا بانگیان بکە بۆ ئیسلام، ئنجا ئەگەر لێیان وەرگرتی و مسوڵمان بوون، ئەوە لێیان قبووڵ بکەو دەستیان لێ بپارێزە[٥].

شایانی باسیشە ئەوەی پێغەمبەری خوا(صلى الله علیه وسلم) فەرموویەتی: فەرماندەکانی سوپای ئیسلام زۆر باش لەمەیدانی واقیعدا بەرجەستەیان کردوە، هەر گەل و کۆمەڵگایەک مسوڵمان بوویێت، سوپای ئیسلام یەکسەر وازی لێیان هێناوە، ئەگەر پادشاو حوکمڕانەکەشیان مسوڵمان بوویێ و شایستەی

---

(١) کەبریتیین لە: ١- مسوڵمان بوون. ٢- سەرانەدان و ملکەچ کردن بۆ دەوڵەتی ئیسلامیی و مانەوە لەسەر دین و بیروبڕوای خۆیان. ٣- جەنگ لەگەڵ کران بەناچاریی.

(٢) بڕوانە: (تأریخ الأمم والملوك) ج٢ ص١٠٧،١٠٨، کە (ربعي بن عامر) نوێنەری سوپای ئیسلام بە (رُستم) سەرکردەی سوپای فارسی گوتوە: (إختر واحدة من ثلاث: إختر الإسلام وندعك وأرضك، أو الجزاء، أو المنابذة).

(٣) بڕوانە: (البدایة والنهایة) ج٧ ص٤٩تا ٥٣.

(٤) بڕوانە: (الكامل في التأریخ) ج٢ ص ٤٦٣،٤٦٤.

(٥) لەئاڵقەی دووەم دا، دەقی ئەو فەرموودەیەمان بەدرێژیی لە (صحیح مسلم)ەوە هێناوە.

حوکمڕانییش بووبێ، ئەوە هەر لە شوێنی خۆی هێڵراوەتەوە، بۆ وێنە:

پادشای (بَحْرَیْن) کە ناوی: (المنذر بن ساوی العَبْدي) بووە، کاتێك کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) نامەیەکی بۆ دەنێرێ و تێیداهاتوە:

(.. أَسْلِمْ يجعل الله لك ما تحت يَدِك..)[1].

دیارە لەسەر ئەو حوکمڕانانەش فەرز کراوە، کە بەگوێرەی شەریعەتی خوای کاربەجێ حوکمڕانیی بکەن و گەل و وڵاتیان بەڕێوە بەرن. چونکە ئامانجی سوپای ئیسلام لەجەنگ و جیهادی دا، تەنهاو تەنها تەخت کردنی کۆسپ و پەرچەکانی ڕێگای بانگەوازی ئیسلام بووە، نەك داگیر کردنی وڵاتان و، دەست بەسەرداگرتنی خێرو بێرەکانیان! بۆیە هەرکاتێك ئەو گەل و میللەتانە ئامادەیی وەرگرتنی دوایین ئایین و بەرنامەی خوایان پێشاندابێ، هیچ داواکاریی دیکەیان لێیان نەبووەو، پاش دیاری کردنی حوکمڕانێك و دانانی چەند زاناو مامۆستایەك کەلە ئایینی خوادا شارەزایان بکەن، بەجێیان هێشتوون و گەڕاونەوە شوێنی خۆیان.

بەڵام ئەگەر خەڵکەکە ئیسلامیان وەرنەگرتبێ و ئامادەییان پێشان نەدابێ، کەمسوڵمان بن و شەریعەتی خوا بەڕێوە ببەن، ئەوە پێغەمبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: (دوایی- ئەگەر مسوڵمان نەبوون - داوای سەرانە - (جزیة)یان لێ بکە، ئنجا ئەگەر ئامادەبوون بیدەن، ئەوە لێیان قبووڵ بکەو دەستیان لێ بپارێزەو لێیان گەڕێ).

سەرانە (جزیة)یش بریتیە لە ئەندازەیەك ماڵ و سامان، کەتەنها لەوانەی لە توانایان دا هەیە لە پیاوان وەردەگیرێ و، ڕەمزو نیشانەی ئەوەیە، کە ئەو خەڵك و میللەتەی ئەو شوێن و وڵاتە، دژی ئیسلام نیەو دوژمنایەتیی مسوڵمانان و ئەو دەوڵەتە ئیسلامییە ناکات، کە دەیەوێ سایەو دەوڵەتێك بۆ هەموو بەشەر پێك بێنێ و، سەرجەم ئینسانەکان و گەل و تیرە جیا جیاکانی مرۆڤایەتیی، لە ژێر سێبەری دا کۆبکاتەوەو بەختەوەریان بکات.

---

(١) بڕوانە: (نَصْب الراية لأحاديث الهداية) للإمام الزيعلي، ج٤ص٤١٩.
واتە: مسوڵمان ببە، خوا ئەوەی لە ژێر دەستت دایە و لەژێر حوکمی تۆدایە، پێت دەدات.

بەپێچەوانەی ئەو جیهانگیرییەوە، كە ئێستا ئەمریكا بانگەشەی بۆ دەكات و بریتیە لە داگیركردن و دەست بەسەرداگرتنی دنیا، چونكە لەڕاستیدا جیهان كردنە یەك دەوڵەت و یەك قەوارە، بەشێوەی ڕاست و دروست و عادیلانە، تەنیا لە ژێر سایەی شەریعەتی خوادا دەبێت، چونكە شەریعەتی خوا، دان بەتایبەتمەندیی (خصوصیة)ی هەمو میللەتاندا دەهێنێ، وە ڕێگاش بەخەڵك دەدات كە عەقیدەی خۆیان و، پەرستن و ڕەوشت و ئەدەبی خۆیان جێ بەجێ بكەن، نەك وەك عەولەمەی ئێستا - كە لەڕاستیدا (ئەمرەكە)یە نەك (عەولەمە) - دەیەوێت میللەتان هەموویان بەهاو نەریت و ڕێ و ڕەسمەكانی ئەوان (ئەمەریكاو ڕۆژئاوا) وەربگرن و، دەستبەرداری هەموو شتێكی خۆیان بن و، بەزۆری زۆرداریش بەسەریان دا دەسەپێنێ و، دەستكاریی هەموو شتێكیان دەكات!!

پاشان پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (ئنجا ئەگەر ئەوەشیان نەكرد، ناوی خوای لێ بێنەو لەدژیان بجەنگە).

واتە: لە لایەكەوە: ئیسلام وەرناگرن كەبیكەنە بەرنامەو پەیڕەوی ژیانیان، وەلەلایەكی دیكەشەوە: دانیش ناهێنن بەدەستەڵاتی ئەو دەوڵەتەدا، كە جگە لە خێرو بەرەكەت چی دیكەی بۆیان نەهێناوە! ئەوە ئەوكاتە مانای وایە بوونەتە لەمپەرێك و كۆسپێك لەبەردەم ئەو جیهادو جم و جۆڵە ئازادیخوازانەیەدا، كە ئیسلام دەستی پێكردووە، دەیەوێ میللەتانی ژێر دەست و چەوساوە ڕزگار بكات و، دەیەوێ كۆمەڵگا پڵیشاوەو زەلیل كراوەكان، لە زۆنگ و تاریكیی زوڵمی طاغووتەكان دەربهێنێ و، ئازادیان بكات و دەربازیان بكات، ئنجا ئەوكاتە ئیمان دێنن، یان نا؟ ئەوە گرفت نیەو گرنگ ئەوەیە ئازاد بن و نەچەوسێنەوە، گرنگ ئەوەیە هیچ كەس زەخت و زۆری بەسەریانەوە نەبێت، ئیدی ئەوكاتە سەرپشكن، وەك خوای دادگەر فەرموویەتی:

﴿ وَقُلِ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّكُمۡۖ فَمَن شَآءَ فَلۡيُؤۡمِن وَمَن شَآءَ فَلۡيَكۡفُرۡ ﴾ الكهف: ٢٩.

واتە: بڵێ: هەق لەپەروەردگارتانەوەیە، ئنجا كێ حەز دەكات بائیمان بهێنێ، كێش حەز ناكات با ئیمان نەهێنێ.

هەندێك كەس وا دەزانن ئەو جەنگانەی، كە سوپای ئیسلام كردوونی و فتووحاتی ئیسلامیی كە كراوە، بۆ ئەوە بووە كە خەڵك بە زۆر مسوڵمان بكرێت!! نا، وا نەبووە، بەڵكو جەنگەكە لە ئەنجامی ئەوە دا دروست بووە، كەهەندێك لە كۆمەڵگاو میللەتان، بەفیتی حوكمڕانە زۆردارەكانیان نەمسوڵمان بوونەو، نەئامادەیی دانی سەرانەشیان هەبووە، ئیدی سوپای ئیسلامیش بەناچاریی دەستی بۆ چەك بردوەو، هێزی بەكارهێناوە، نەك بۆ مسوڵمان كردنیان، كەبێگومان ئەوە دروست و ڕەوا نیە، بەڵكو بۆ ڕێگا پاكردنەوەو لابردنی كۆسپ و پەرچەكانی سەر ڕێی بانگەوازو گەیاندنی پەیام و بەرنامەی خوای تاك.

شایانی باسیشە كە لەمەسەلەی وەرگرتنی سەرانە[١] (جزية)دا پاش لێكۆڵینەوەی زۆرو قووڵ، من بۆم دەركەوتوە، كە ئەو ڕایە ڕاست و بەڵگەدارە، كە دەڵێ: هەموو جۆرەكانی كافران سەرانەیان لێ قبووڵ دەكرێ، كە ئیمام (مالك)[٢]و (أوزاعي) و زانایانی (شام) ئەو ڕایەیان هەیەو، هەركام لە (إبن القيم)[٣] و (الشوكاني)[٤] و (الصنعاني)[٥]یش هەڵیان بژاردوەو، بەسەرنجدانی بەڵگەكانیش، هیچ كەس دوو دڵیی (تردّد)ی نامێنێ لەڕاستیی و تەواویی ئەو ڕایەدا، كە دەڵێ: تەنها ئەهلی كیتاب و مەجووس سەرانەیان لێ وەرنا گیرێ، بەڵكو هەموو خاوەن فیكرەیەك و هەموو خاوەن دینێك بەهاوبەش دانەر (مشرك) و بت پەرست (وثني)و بێبڕوا (مُلْحِد)یشەوە، هەموویان سەرانەیان لێ وەردە گیرێ،

---

(١) شایانی باسیشە كە زۆرێك لەزانایانی ئیسلام، بەتایبەت هاوچەرخەكان (المعاصرون) ڕایان وایە كە هەركاتێك (أهل الذمة) ئامادەی بەشداریی كردنی جەنگ و جیهاد (سەربازیی كردن) بوون، بۆیان دەخرێتە بری سەرانەوەو لێیان وەرنا گیرێ، بڕوانە: (الإسلام والمشكلات السياسية المعاصرة، نظام الحكم، حقوق الإنسان، الأقليات) د. جمال الدين محمود، ص٣٨٦ تا٣٩٦.

(٢) بڕوانە: (صحيح مسلم بشرح النووي)ج٧ ص٣١٣.

(٣) بڕوانە: ( زاد المعاد ) ج٥ ص٩٢،٩١.

(٤) بڕوانە: (السيل الجرار) ج٤ص٥٧١،٥٧٠.

(٥) بڕوانە: (السيل السلام) ج٤ص٤٧.

هەڵبەتە جگە لەهەڵگەڕاوە (مرتد) کە حیسابێکی دیکەی جیاوازی هەیە[1]،

---

(١) چونکە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (من بدل دينه فاقتلوه) رواه البخاري، هەرچەندە وەك ئەمانەتیی زانستیی پێویستە ئەوەش بگوترێ، کە لە مەسەلەی سزای هەڵگەڕاوە (مرتد)دا، کە ئایا وەك سزای زیناو قەتڵ و دزیی، سزاو سنوور (حد)ێکی شەرعییەو هیچ کەس بۆی نیە دەستکاریی بکات، یان سزاو تۆڵەیەکە لە جوغزی سیاسیەتی شەرعیی و دەسەڵاتی حوکمڕانی مسوڵمانان دایە و، بۆی هەیە کۆشش (إجتهاد)ی تێدابکات؟! لەنێو زانایان دا تاڕادەیەك قسەو باس و مشت و مڕ هەیەو، هەندێك لەزانایان سزادانی (مرتد) بەسزاو سنوورێکی دیاریکراو (محدد)ی شەرعیی نازانن و، چەند شتێکیش لەو بارەوە بەبەڵگە دێننەوە، کەیەکیان بریتیە لەوە کەپێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) شەفاعەتی (عثمان بن عفان)ی خوا لێی ڕازی بێ دەربارەی نەکوشتنی (إبن أبي السرح) کەهەڵگەڕابۆوە، قبووڵ کردو عەفووی کرد، کەدیارە ئەمەش لەسزا و سنوورە شەرعیی یەکان دا دروست نیە.

بەڵام ئێستا (٢٠١٥/٣/١٩) دەڵێم:

وەك کتێبی: (الإسلام كما يتجلى في كتاب الله عزوجل) بەرگی هەشتەم دا، وە لەبەرگی دووەمی لەکتێبی: (ئیسلام و دەوڵەتداریی)دا بەرێزیی باسم کردوە.

ناگونجێ بگوترێ: کوشتنی هەڵگەڕاوە لەئیسلام (قتل المرتد عن الإسلام) سزایەکی دیارییکراویی شەرعییە.

هەربۆیەش پێم وایە: هەڵگەڕاوە و مولحیدەکانیش بەگشتی، وەك جۆرەکانی دیکەی نامسوڵمانان: خاوەن کتێب و هاوبەش دانەر و مونافیقان، بۆیان هەیە ببنە هاووڵاتیی لەکۆمەڵگا و دەوڵەتێکی ئیسلامیی دا، ئنجا چ سەرانەیان لێوەربگیرێ، چ وەرنەگیرێ، لەوبارەوەش بەڵگەم زۆرن و لەو دوو کتێبەدا، کە ئاماژەم پێدان خستوومنەتەڕوو، لێرەش بەهێنانەوەی دوو شوێنەوار (أثر) وازلەم مەسەلەیە دێنم:

١- [روى سعيد بن منصور في سننه (٢٥٨٨) أن (تُسْتُر) فُتِحت صلحاً ثم كفر أهلها فغزاهم المهاجرون و سبوهم، فأمَرَ عمر بن الخطاب من سُبِيَ منهم، أن يُردُّوا إلى جزيتهم و فرّق بين سادتهم].

واتە: (توستور) بەصوڵح گیرا، پاشان خەڵکەکە، دوای مسوڵمان بوون، کافربوونەوە، کۆچکەرانیش جەنگییان لەدژکردن و لێیان بەدیلگرتن، عومەری کوڕی خەتتابیش فەرمانی کرد، کە دیلەکانیان بگێڕێنەوە بۆ سەرانەدان و ئازادبکرێن، وە بەرپرسەکانیشیانی لەیەك جیاکردەوە و بڵاوی کردن.

٢- [روى عبدالرزاق في المصنَّف (١٨٧١٤) أن قوماً أسلموا من أهل الجزيرة بالعراق، ثم لم يمكثوا إلاّ قليلاً حتى أُرتدُّوا، فكتب فيهم ميمون بن مهران إلى عمر بن عبدالعزيز: فكتب إليه عُمرُ : أن رُدَّ عليهم الجزية وَدَعْهُمْ.]

ئەگەرنا هەموو خاوەن فیکرەیەك سەرانەی لێ وەردەگیرێ و، بێگومان ئەو ڕاو بۆچونەش زۆر بەهێزەو وەك (إبن القیم) گوتوویەتی: (. وهذا القول أصح في الدليل كما ترى)[1] واتە: وە ئەم قسەیە لەڕووی بەڵگەوە ڕاست ترە، وەك دەبینی. وە ئەو ڕایە لەگەڵ تێکڕای ئایەت و فەرموودەکانیش دا دێتەوە.

لەوەڵامی ئەو بەڵگەیەشدا، کە دەڵێ: پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) هیچ کاتێك سەرانەی لەبت پەرستەکان وەرنەگرتوە! دەڵێن: هۆی وەرنەگیرانی سەرانە لەبتپەرستەکان، ئەوەیە کە پاش هاتنە خوارەوەی ئایەتی:

﴿ قَٰتِلُواْ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَلَا بِٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَلَا يُحَرِّمُونَ مَا حَرَّمَ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَلَا يَدِينُونَ دِينَ ٱلۡحَقِّ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ حَتَّىٰ يُعۡطُواْ ٱلۡجِزۡيَةَ عَن يَدٖ وَهُمۡ صَٰغِرُونَ ٢٩ ﴾ التوبة:٢٩.

سوپای ئیسلام لەگەڵ هیچ کۆمەڵێکی موشریكدا ڕووبەڕوو نەبۆتەوە، تاکو بزانین سەرانەیان لێ وەردەگیرێ، یان نا؟! چونکە لەوکاتەدا موشریکەکان سەرجەمیان مسوڵمان بووبوون، ئنجا ئەوەی بەڕاستی مسوڵمان بووبێ و، ئەوەی بەناو مسوڵمان بووبێت و، چووبێتە حاڵەتی دووڕوویی و نیفاقەوە، ئەگەر نا، دوایی کەسوپای ئیسلام لەگەڵ مەجووسدا ڕووبەڕوو بۆتەوە، کەوەك (إبن القيم)

---

واتە: کۆمەڵێك لەخەڵکی جەزیرە لەعیراق مسوڵمان بوون، دوایی زۆری نەبرد، هەڵگەڕانەوە، مەیموونی کوڕی مەهرانیش لەبارەیانەوە، نامەی بۆ عومەری عەبدولعەزیز نارد، عومەریش بۆی نووسی: سەرانەیان بگێرەوە سەر و وازیان لێ بێنە.
کەواتە: هەڵگەڕاوەکان (مُرتَدّون)یش وەك جۆرەکانی دیکەی کافران، مامەڵەیان لەگەڵ دەکرێ و سەرانەیان لێوەردەگیرێ.
شایانی باسیشە لەبەرگی هەشتەمی کتێبی: (الإسلام كما يتجلى في كتاب الله عزوجل) بەناوونیشانی: (الإسلام نظرة سديدة تجاه الناس وتعامل صحيح معهم) باسی چۆنیەتی مامەڵەی ڕاست و دروستی شەرعییانەم لەگەڵ نامسوڵمانان دا بەهەر پێنج جۆرەکانیانەوە کردوە، واتە: خاوەن کتێبەکان و، بێبڕوایەکان و، مونافیقەکان و، هاوبەش بۆخوا دانەرەکان و هەڵگەڕاوەکان.

(١) بڕوانە: (زاد المعاد...)ج٥ ص٩٢.

دەڵێ: ئاگر پەرست لەبت پەرست خراپترن، ئەدی بۆ چی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) لەبارەیانەوە فەرمووی:

( سُنّوا بهـم سُـنَّة أهل الكتـاب )[1]

واتە: وەك ئەهلی کیتاب (جوو ودیانەکان) ڕەفتاریان لەگەڵ بکەن.

ئنجا (إبن القیم) دەڵێ: خۆ ئەگەر بۆ ئاگر پەرست هەبێ سەرانە بدات - کە دیارە ژنیان لێ ناهێنرێت و سەربڕاویشیان ناخورێت، چونکە ئەهلی کتێب نین -، ئەوە هەر بتپەرستێکی دیکەش و هەر خاوەن فیکرەیەکی دیکەش، بەهەمان شێوە مامەڵەو ڕەفتاری لەگەڵ دەکرێت، ئنجا هەر کەسێك کە مسوڵمان نابێت، ئەوە کەیفی خۆیەتی و ئازادە، بەڵام کەمسوڵمان نابێت، دەبێ لێگەڕێ ئەو بانگی ئازادیی ئیسلامەتییە بگاتە خەڵك، بۆیە با دژایەتیی ئەو دەوڵەتە نەکات، کە جاڕی ئازادیی مرۆڤەکان بەدنیادا ڕادەگەیەنێ، ئیدی جگە لەوە با لەسەر دینی خۆی بێت و لەسەر جێگاو ڕێگای خۆی بێت، بەڵام دەبێ سەرانە بدات، سەرانەبۆ چی دەدات؟ لەبەرانبەر ئەوەدا کە ئەو قەوارەو سێبەرەی لەسایەی دا دەژیەت، دەوڵەتێکی ئیسلامیی یەو بەرگریی لێدەکات و، هەرکات پێداویستیەکانی ژیان و گوزەرانی خۆی پێ دابین نەکرا، ژیانی دابین دەکات، هەروەها ئەرکی جیهادو خزمەتی سەربازیشی پێ جێ بەجێ ناکات و، نەفس و ناموس و کەرامەت و ماڵ و سامانیشی دەپارێزێ، وە لەسنووری شەریعەتدا هەموو جۆرەکانی ئازادیی و هەموو مافێکی بۆ دابین دەکات.

زانایانی ئیسلامیش وەك بنچینەیەکی شەرعیی بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ (اهل الذمة)دا گوتوویانە[2] (لهم مالنا وعلیهم ما علینا)[3].

---

(١) بڕوانە: (المدونة) للإمام مالك ج٣ ص٤٦.

(٢) بڕوانە: (الحقوق والحریات في الشریعة الإسلامیة) د. رحیل محمد غرایبة، ص٣٤٨.

(٣) بڕوانە: (مجموعة الوثائق السیاسیة للعهد النبوي والخلافة الراشدة) محمد حمیدالله، ص١٨٨، ط٨، الوثیقة رقم: ٩٧، (نسختان لمكتوب النبي الی نجران)، کەواتە: ئەو قسەیەی کە وەك بنچینەیەك بەسەرزمانانەوەیە، لەبارەی چۆنیەتی هەڵسوکەوت کردنەوە لەگەڵ نامسوڵمانان دا، لەکۆمەڵگا و دەوڵەتی ئیسلامیی دا: (لهم مالنا وعلیهم ماعلینا)

وە (عەلی) - خوای لێ ڕازی بێ- لەو بارەوە گوتوویەتی:
(إِنَّمَا قَبِلوا عَقْدَ الذِّمةِ لِتَكُونَ أَمْوالُهُمْ كَأَمْوالِنَا وَدِمائُهُمْ كَدِمائِنَا)[١]
واتە: ئەوان بۆیە قبووڵی پەیماننامەی سەرانە دەکەن، تاکو ماڵیان وەك ماڵی ئێمە پارێزراو بێت و، خوێنیان وەك خوێنی ئێمە پارێزراو بێت!

**بەڵی بەڕێزان!** جەنگەکانی ئیسلامیی و جیهادی ڕزگاریخوازیی و ئازادیخوازیی ئیسلامیی، بەوجۆرەی خستمانە ڕوو، کراون، ئنجا ئەگەر ڕۆژێك لەڕۆژان حوکمڕانێکی ئومەویی و عەبباسیی و عوسمانیی، بە پێچەوانەی ئەوەوە کەباسمانکرد، جووڵابێتەوەو ڕەفتاری کردبێ، ئەوە وەك پێشینان گوتوویانە: (ماڵی قەڵب سەری خاوەنی دەگرێتەوە) و بێگومان ئیسلام لێی بەرپرسیار نیە، بەڵام دیسان مێژووی ئیسلامیی، نەك بەقسەی ئێمە بەڵکو بەدان پێداهێنانی مێژووزانە ڕۆژهەڵاتناسەکان، دەڵێن: هیچ کەسێك لەمسوڵمانان دادگەرترو بەڕەحمترو خێر خوازترو چاکەکار تر نەبووە، تەنانەت لەگەرمەی جەنگەکانیشدا بۆ وێنە: پیاوی وەك (صلاح الدين)ی ئەیبوبیی لەکاتێکدا (ریچارد قلب الأسد)ی فەڕەنسایی بریندار دەبێت و تێدەشکێ، (صلاح الدين) بۆ خۆی دکتۆری تایبەتی خۆی بۆ دەنێرێ بۆ ئەوەی چارەسەری بکات و، ئاوی ساردی بۆ دەنێرێ و، میوەی بۆ دەنێرێ، ئاوا بەشەهامەت و جوامێرییەوە ڕەفتاری لەگەڵ دا دەکات!.

---

ئەوە فەرموودەی پێغەمبەری خوایە (صلى الله عليه وسلم)؟، کەئەوە دەقەکەیەتی، کە لەسیاقێکی درێژدا هاتوە: [...لأني أعطيتهم عهد الله، على أن لهم ما للمسلمين، وعليهم ما على المسلمين، وعلى المسلمين ما عليهم، بالعهد الذي استوجبوا حق الذمام، والذبّ عن الحرمة، واستوجبوا أن يذبّ عنهم كل مكروه، حتى يكونوا للمسلمين شركاء فيما لهم، وفيما عليهم..]
واتە: چونکە من پەیمانی خوام پێداون، کە هەمان ماف کە مسوڵمانان هەیانە، ئەوانیش هەیانە، وەهەمان ئەرکی مسوڵمانانیشیان لەسەرشانە، بەپێی ئەو بەڵێنەی کە مافی هاوپەیمانێتییان پێ مسۆگەرکردوە، هەروەها بەرگریی کردن لەحورمەتەکانیان پێ دەستەبەرکردوە، وە ئەوەیان پێ دەستەبەرکردوە، کە هەموو ناخۆشییەکیان لێ دووربخرێتەوە، تاکو وەك مسوڵمانان هاوبەش دەبن، لەمافەکان و لەئەرکەکانیان دا.

(١) بڕوانە: (بدائع الصنائع)، للكاساني ج٧ص١١١، وە بڕوانە: (السير الكبير)، للشيباني، ج٣ص٢٥٠..

کەچی لەو لاوە، کە سەرنجی ڕەفتاری دڕندانەی کافرەکان دەدەی، جیاوازیی هێندەی ئاسمان و زەوی، لەنێوان دوو جۆرە شێوازو هەڵس و کەوتی ئیسلام و کوفردا دەبینی!!

کاتێك نەصرانییەکان (قودس) دەگرن، مێژوونووسان دەڵێن: زیاتر لە (٧٠٠٠٠) حەفتا هەزار کەس لەمسوڵمانانی نێو شارەکە قەتڵ عام دەکەن لەنێو مزگەوتی قودس (بيت المقدس)[١] و دەوروبەری دا، بەڵام (صلاح الدين) کاتێك شاری قودسی ڕزگار کرد، لەساڵی (٥٨٣)ی کۆچیی[٢]دا زۆر بەشێوەیەکی دادگەرانەو جوامێرانەی مسوڵمانانە، هەموو ئەوانەی کەلەشارەکەدا دەبن، ئازادیان دەکات و، ئەورووپاییەکان خۆیان دانیان بەو ڕاستییەدا هێناوە، وە پێویستە لەو ڕاستییە بێ ئاگا نەبین کەسەرکردەی ناوازەی مسوڵمانان (صلاح الدين)ی کوردیی، چەندە بەئازایەتیی ناسراوە، چەند ئەوەندە بەشەهامەت و جوامێری و ڕەحم و بەزەیی و لێبوردن و سینگ فراوانیی، ناسراوە، کەبێگومان لە ئیسلامەوە، فێری هەموو ئەو بەها بەرزانە بووە.

ئنجا بەڕاستی کەسێك بیەوێ بەچەند وشەیەکی کورت لە ئامانجی جەنگ و جیهادی ڕزگاریخوازیی حاڵی بێت، با سەرنجی ئەو قسەیەی (ربعي بن عامر) نوێنەری سوپای ئیسلام بۆ لای (روستم)ی فەرماندەی سوپای فارس بدات، کە وەك گوتم: بەڕاستیی حیکمەت و فەلسەفەی فتووحاتی ئیسلامیی و جیهاد جەنگی ئیسلامیی، بۆ ئێمە کورت دەکاتەوە کەکاتێك ڕۆستەم لێی دەپرسێ: بۆچی هاتوون بۆ وڵاتی ئێمە؟! دەڵێ:

(نَحْنُ قوم ابتعثنا الله لنخرج من شاء من عباده، من عبادة العباد إلى عبادة الله، ومن جور الأديان إلى عدل الإسلام، ومن ضيق الدنيا إلى سعة الدنيا والآخرة) کە هەرکام لە (الطبري) و(إبن كثير) و(إبن الأثير)[٣] لە: (تأريخ الأمم والملوك) و

---

(١) بڕوانە: (الكامل في التأريخ) ج٨ ص١٨٩.

(٢) بڕوانە: (الكامل في التأريخ) لابن الأثير، ج١١ ص٥٤٦.

(٣) بڕوانە: (تأريخ الأمم والملوك) ج٢ ص١٠٦ تا١٠٧، وە: (البداية والنهاية) ج٧ص

(البداية والنهاية) و (الكامل في التأريخ)دا هێناویانە، واتە: (ئێمە كۆمەڵێكین كەخوا ڕەوانەی كردووین - دیارە مەبەستی ئەوەیە كە خوای مەزن پێغەمبەری ناردووە، ئەوانیش بە شوێنیەوە - تاكو هەر كەسێك لە بەندەكانی خوا كە بیەوێ، ڕزگار بكەین و دەربازی بكەین، لە كۆیلایەتیی بۆ بەندەكان، بۆ بەندایەتیی بۆ خوا، وە لە زوڵم و ستەمی بەرنامەكان، بۆ دادگەریی ئیسلام، وە لە تەسكی ژیانی دنیا، بۆ فراوانیی دنیاو دوارۆژ).

**ئنجا باسەرنجێكی كورتیش لە هەڵوێست و ڕەفتاری گەلانی نامسوڵمان بدەین لەو بارەوە:**

١- شتێكی ئاشكراو ڕوونە كەمسوڵمانان چەندسەدەیەك لە ئەندەلوس (ئیسپانیا) حاكم بوون، كەبەدان پێداهێنانی مێژوو نووسە ڕۆژئاواییەكان، یەكێك لەهۆیەكانی، بگرە كاریگەرترین هۆكاری سەرهەڵدانی ئەوەی كەناوی لێنراوە: (النهضة العلمية) ڕاپەڕینی زانستی (ڕێنسانس) لە ئەورووپا، گەیشتنی ئەو كلتوور و ڕۆشنبیریی و زانیاریی و زانستەی شارستانێتیی ئیسلامیی بوو، كە ئەورووپاییەكان لە ئەندەلوسی كاتی خۆی و (ئەسپانیا)ی ئێستا، وەریان گرت!

بەڵێ، پاش بەهرەمەند بوونی ئەورووپاییەكان، لە كلتووروو زانست و بەها بەرزەكان و پێشكەوتنی مسوڵمانان، بێداربوونەوەو هەنگاویان بەرەو چاخ و قۆناغی ڕێنسانس نا، كەچی دوای ئەوەی كەمسوڵمانان گلۆڵەیان كەوتە لێژی و دەستەڵاتیان نەما، لەلایەن نەصرانییەكانەوە لە ئەندەلوس چییان پێكرا؟! دادگاكانی پشكنینی بیروبڕوا (محاكم التفتيش عن العقائد) كە مێژوونووسە ڕۆژئاواییەكان دەڵێن: ئەو دادگا ناو بەدە، بەس لەنەصرانییە نەیارەكانی كڵێسا، كە هەردووك كۆمەڵی (پرۆتستانت) و (ئەرثذۆكس) بووە لەسەدەی سێزدەوە، تا حەفدە، دەوری (٩) نۆ ملیۆن كەسی كوشت[1].

---

٤٩،٥٠، وە: (الكامل في التأريخ) ج٢ ص٤٦٤،٤٦٣.

(١) بڕوانە: (محاكم التفتيش) د. زكي علي، ص٥٠٠، وە بڕوانە (الشباب المسلم في مواجهة التحديات) د. عبدالله ناصح علوان،ص١٣٢.

ئنجا لەو هەموو ملیۆن مسوڵمانەش، کە لە ئەندەلوس هەبوون، هیچیان نەمان، چونکە یان دەبوو بەزۆر ببن بە نەصرانیی، کەمێژوو نووسان دەڵێن: بەزۆریی گۆشتی بەرازیان دەرخوارد دەدان و، بەزۆر خاچ (صلیب)یان لەمل دەکردن و، بەزۆر دەیان بردن بۆ کەنیسە! یان دەیانکوشتن، یان دەریان دەکردن، باشترین حاڵەتیان ئەوە بوو، کە دەریان کردبانایە!! ئەوەش نموونەیەکە لەڕەفتاری گاورەکان لەگەڵ مسوڵمانانندا.

٢- یەکێك لە ڕەفتارەکانی تەتەر و مەغۆل لە هێرشەکانیاندا، ئەوە بوو کە قەڵایان دروست دەکرد لە کەللەسەری مسوڵمانە سەر بڕاوەکان و، مێژوونووسان دەڵێن: جاری وا هەبووە یەکێك لە فەرماندەکانی مەغۆل فەرزی دەکرد لەسەر فەرماندەیەکی ژێر دەستی و دەیگوت: دەبێ لەفلان شارە، ئەوەندە کەللەسەرم بۆ بهێنی، ئەگەر کەللەسەری پیاوت دەست نەکەوت هی ئافرەت، ئەگەر هی ئافرەت دەست نەکەوت، هی منداڵ! بۆ وێنە: دەیگوت: دەبێ بیست هەزار(٢٠٠٠٠) کەللەسەرم بۆ لەسەریەك دابنێی! وە مێژوونووسانی وەك (الطبري وإبن کثیر وإبن الأثیر) دەڵێن: ئەو قەتڵعامەی کەلەشاری بەغدادا کرا، کەپایتەختی دەوڵەتی ئیسلامیی بوو، لەساڵی (٦٥٦)ی کۆچی داو، لەسەر دەستی (هۆلاکۆ) و سوپایە دڕندە کافرەکەی زیاتر بەیەك ملیۆن کەس مەزەندە دەکرێ! ئاشکراشە کە ملیۆنێك کوژراوی (٧٥٠) ساڵ لەمەوبەر، کە دنیا هێندە قەڵەباڵغ نەبووە، زۆر زۆر بووە!

٣- لە مێژووی نیزیکمان، کەبریتیە لەو هەموو کوشت و کوشتارە زۆرەی کەلەلایەن هەردوو شۆڕش و ڕژێمی کۆمۆنیستی [ڕووسیا] بەڕابەرایەتیی (لینین وستالین) و [چین] بەڕێبەرێتیی (ماوتسی تۆنگ)ەوە، لەمسوڵمانانی ئەو وڵاتانەدا کرا، بەبێ هیچ بیانوو وپاساوێك، جگە لەوەی کە ئامادە نەبوون ببنە شیوعی و لەئایینەکەیان هەڵبگەڕێنەوە.

وە لەکتێبەکانی مێژوودا هاتوە، کە لە ژێر سایەی سیستەمی مارکسیزم - کۆمۆنیزم داو، لەسەرجەم ویلایەتە مسوڵمان نشینەکانی، یەکیەتی سۆڤـیێتی پێشوودا، زیاتر لەپازدە (١٥)ملیۆن مسوڵمان قەلاچۆکراون!

وە لەوبارەوە مێژوو، دیمەنی زۆر سەرسووڕهێنەر لە دڕندایەتیی کۆمۆنیست و مارکسیست و ماویستەکانی، هەڵگری دروشمی سۆسیالیزمی زانستیی (الإشتراكية العلمية) گێڕاوەتەوە، بۆ وێنە:

جاری وا هەبووە کە جەندرمەکانی ئەو ڕژێمانە خەڵکی شارو گوندەکانی ویلایەتە ئیسلامییە زەوتکراوەکانیان کۆ دەکردنەوەو، داوایان لێدەکردن کەدەست لەدینەکەیان هەڵگرن، جا ئەگەر ملیان نەدابێ مامۆستایەکەیانیان کوشتوەو، پاشان لەسەر خەڵکەکەیان فەرز کردوە، کە دەبێ هەموویان پیسایی خۆیان بێنن و، بەسەر مەلایەکەیانی دابکەن، ئەگەر بیانەوێ نەکوژرێن!

دیارە لە (چین)یش هەر بەهەمان پێودانگ ڕەفتارو مامەڵە لەگەڵ مسوڵمانان دا کراوە، لەلایەن ئەورژێمە بەناو پێشکەوتنخوازانەوە، کەلافی: مافی مرۆڤ و، چارەنووسی گەلان و، پشتگیریی چینی پرۆلیتاریان لێدەدا!

بەڵێ بەڕێزان!

ئا ئەوە حاڵ و گوزەرانی ملیۆنەها مسوڵمانی دانیشتووی ژێر سایەی ئەو ڕژێمە کۆمۆنیست و سۆسیالیستانە بووە، کەبەداخەوە زۆربەی هەرەزۆری خەڵکی لەو هەواڵ و باس و خواسانە بێ ئاگا بووە، هەتا بلووکی کۆمۆنیزم هەرەسی هێناو، لێفە لەسەر هەتیوان هەڵدرایەوەو، ئەوەی بن بەڕێ هاتە سەر بەڕێ! بەڵام خۆ مسوڵمانان هێندە مەزلوومن، دەشکوژرێن کەس پێیان نازانێ و، هێندە بێ کەسن، قەلاچۆو جینۆسایدیش دەکرێن، کەس لەسەریان بەدەنگ نایەت! وەك شاعیرێکی عەرەب دەڵێ:

قَتْلُ شَخص في غابة جريمة لا تغتفر　　إبادة شعب أعزل قضية فيها نظر

جابەڕاستی ئەو دێرەشیعرە زۆر باش بەسەر واقیعی مسوڵماناندا دەچەسپێ.

٤- کوشت و بڕی هیندۆسەکان و سیخەکان بۆ مسوڵمانان، لەکاتی جیابوونەوەی پاکستان لەهیندستاندا، کە تاکو ئێستاش هەر بەردەوامەو، هەر ئەمساڵی ڕابردوو ژمارەیەکی زۆریان لێ سووتاندن!

٥- قەتڵعامی جوولەکە بۆ مسوڵمانە فەلەستینی یەکان، کە هەر لە ساڵی (١٩٤٨)ەوە، هەتا ئێستاش هەر بەردەوامەو، ڕۆژئاواش بەکوێخایەتیی ئەمەریکا نەك هەر بێدەنگە، بگرە زۆر بێ شەرمانەش دژایەتیی فەلەستینی یەکان و، پشتگیریی جوولەکە داگیر کەرەکانیش دەکات!

ئنجا دیارە ئێمە باسی وەزعی خەڵکی کوردستان بەوردیی ناکەین، چ لە کوردستانی تورکیا، هەر لە ڕۆژگاری ڕەشی کەمال ئەتاتورکەوە هەتا ئێستاش، هەروەها لە کوردستانی ئێران، لەکاتی حوکمڕانێتیی دیکتاتۆرانەی ڕەزا شاو محمدی کوڕی دا، وە کوردستانی عێراق و، چ لەکوردستانی سووریا، چ لەسەردەمی عەفلەقییەکاندا و، چ پێشتریش لە ڕۆژگاری ڕژێمە دیکتاتۆرییەکانی دیکەدا، کە تەنها خوای پەنهان بین دەزانێ، چی کراوە بە گەلی مسوڵمانی کورد!! لە کوشتن و بڕین و جینۆسایدی خەڵکی بەگشتی و، کوشتنی چەند سەد هەزارکەس لە ژێر ناوی جۆراو جۆردا، بەتایبەتی لە کوردستانی عێراق: کیمیابارانی هەڵەبجەو، بەناو ئەنفالەکان و، وێران کردنی هەزاران ئاوەدانیی و.. هتد.

چونکە ئێمە لەو نموونانەدا کەدەیان هێنینەوە، دەمانەوێ بەراوردی نێوان هەڵس و کەوت و ڕەفتاری مسوڵمانان و ناموسڵمانان بکەین، جابەحیساب ئەو ڕژێم و دەوڵەتانەی، کەلە عێراق و تورکیاو سووریا و ئێراندا، گەلی کوردیان چەوساندۆتەوە، ڕژێم و دەوڵەتی گەلانی مسوڵمان بوون! هەرچەندە بەتەئکید هەرکەسێك ئەو تاوانانەی ئەنجام دابێت، مەگەر چۆن، دەنا بەشی بەئیسلامەوە نامێنێ! کەسێك خوێنی نەتەوەیەك هەمووی حەڵاڵ بکات و، بەو جۆرە قەتڵعامی بکات، بەبێ هیچ بیانوو و پاساوێکی ڕەوا، جگە لەخۆسەپاندن و زوڵم و زۆر، بێگومان ئەگەر هەر تۆسقاڵێك ئیمانی هەبێ، ڕێگریی ڕەفتارو هەڵوێستی وای لێدەکات.

٦- ڕەفتاری دڕندانەو، کوشتنی بەکۆمەڵ و ئەتك کردن و دەرکردن و قڕکردنی صیڕبییەکان بۆ مسوڵمانانی (بۆسنەو هەرسك)و (کۆسۆڤۆ)، کەبەهیچ قەڵەمێك نانووسرێ!

٧- سەرکوتکردن و داپڵۆسین و کوشتن و وڵات زەوتکردن و چەندان جۆرە دەستدرێژیی و زوڵم و ستەمی ڕووسیا بۆ (چیچانی یەکان) و هیند بۆ

(کشمیرییەکان)ی، ئەم ڕۆژگارەش کەڕۆژانە کەناڵەکانی ڕاگەیاندنی دنیا باسی دەکەن، لەکەس پەنهان و شێرراوە نین!

ئێستاش سەرباری هەموو ئەوانە، زلهێزێکی وەك ئەمریکا کەبەناوی دژایەتیی کردنی تیرۆرەوە، ئیعلانی جەنگی لەدژی هەموو ئیسلامییەکان کردووە، خۆیشی وەك گەورەو حوکمڕان و کوێخای دنیا ناوزەد کردوە، بێخەبەر لەوە کەتەنها کەسێك بەکەڵکی گەورایەتیی و حوکمڕانێتیی دنیا دێ، کە عەقڵی هێندەی گرفت و کێشەکانی سەرجەم ئەهلی دنیاو، دڵی هێندەی هەست و نەستەکانی خەڵکی دنیا، فراوان بێت و، ڕەوشتی بارتەقای تێکڕای خەڵکی دنیا مەزن بێت!

کەچی ئەمریکا دڵی هێندە گچکەیە، تەنانەت جێگای هەست و نەستی هەموو هاووڵاتییانی لە خۆیشی تێدا نابێتەوە، عەقڵیشی هێندە تەنگ و گچکەیە، بێجگە بۆچوونی خۆی، هیچ فیکرەیەکی دیکەو، هیچ بۆچوونێکی دیکە لەمێشکی دا جێگای نابێتەوە، خۆتان گوێتان لێ بوو (جۆرج بۆش) زۆر ڕاشکاوانە گوتی: (هەرکەسێك لەگەڵ ئێمە نەبێت، بەدژی خۆمانی دەزانین)، هەروەها ئەمەریکا زۆر بێپەردە دەڵێت: (ئێمە بەهاکان (قِیَم)ی خۆمان و تایبەتمەندییەکانی شارستانێتیی و کلتوورو فەرهەنگی خۆمان بەسەر خەڵکی هەموودنیادا فەرز دەکەین).

وە حەتمەن ئێوەی بەڕێزیش ئاگادارن و کەناڵەکانی ڕاگەیاندن بێ پەردە باس دەکەن، کە چۆن ئەمریکا فشار دەخاتە سەر وڵاتانی ئیسلامیی بۆ وێنە: سعوودیەو پاکستان و میصرو چەند وڵاتێکی دیکە، کە دەبێ بەرنامەکانی پەروەردەو فێرکردن (المناهج التربوية والتعليمية) یان بەگوێرەی ئارەزووو بەرژەوەندیی یەکان و، سیاسەت و ستراتیژی ئەمریکاو ڕۆژئاوا بگۆڕدرێن و، سەرلەنوێ دابڕێژرێنەوەو دەستکاریی بکرێن!! کە ئەوەش گەورەترین حاڵەتی تیرۆرەو، گەورەترین و زەقترین حاڵەتی ئیرهابە، کەبەرانبەر بەجیهانی ئیسلامیی بەکار دێت!

چونکە شتێکی ماقووڵ و گونجاوە، کە بڵێی: ئەو کەسەی کە دژمە دوژمنمە، بەڵام ئەوەی کەدژت نەبێ و، لەبەرانبەرت ڕانەوستێ، بۆ چی دەبێ هەر لەڕیزی

دوژمندا حیسابی بکەی و، بە زۆر بیکەیە دوژمن؟! ئاخر ئەمەریکا پێمان ناڵێت، کە ئایا بۆچی دەڵێ: خەڵکی، یان دەبێ تەسلیم بن، یان دەبێ بۆم بێنە مەیدان؟! کەسانێك کەشەڕی لەدژ ناکەن، بۆچی شەڕیان پێ دەفرۆشێ؟! مەگەر ئەمەریکا نازانێ کەتەحەممول نەکردنی فیکری بەرانبەر، چاوگی تیرۆرو ئیرهابەو، لەوێوە سەرچاوە دەگرێت؟! وەلە ڕاستییدا ئەو جۆرە بیکردنەوەیە، جەهەوری فیرعەونایەتییە، چونکە فیرعەون (خۆفو) سێچوار هەزار ساڵ پێش ئێستا، کاتێك لەگەڵ (مووسا) دا -علیه السلام- ڕووبەڕوو دەبێتەوە، ئەم قسەیە دەکات:

﴿مَآ أُرِيكُمۡ إِلَّا مَآ أَرَىٰ وَمَآ أَهۡدِيكُمۡ إِلَّا سَبِيلَ ٱلرَّشَادِ ۝٢٩﴾ غافر:٢٩.

واتە: بواری هیچ ڕاو بۆچوونێك نادەم، جگە لەهی خۆم، وەهەرچی من دەیڵێم، هەر ئەوەیە ڕێی ڕاست و، من تەنها ڕێی ڕاست تان پێشان دەدەم.

ئنجا وەك دەبینین خوای پەروەردگار، بەتانەو توانجەوە، ئەو قسەیەی لێدەگێڕێتەوە و دەفەرموێ: تەماشای فیرعەون بکەن! کە دەیگوت هەر ئەوەتان پێ دەڵێم، کەخۆم بەڕاستی دەزانم، ئەوەی منیش دەیڵێم، هەمووی ڕاستە!! کەواتە: بێگومان ئەوە فیرعەونایەتیی یە، کە یەکێك بڵێ: حەقیقەت بەس لەلای منە و، ڕێگاش بەغەیری خۆم نادەم، باسی حەقیقەت بکات!

## بەڵێ بەڕێزان!

هەرکەسێ لافی ئەوە لێ بدا، کە هەق لەسەر ئەو تاپۆکراوەو، ڕێگاش نەدا هیچ کەسی دیکە، باسی هەق و حەقیقەت بکات، ئا ئەوە چ فیرعەون (خۆفو) بیکات، چ (جۆرج بۆش)، بێگومان ئا ئەو جۆرە ڕەفتارو هەڵوێستە، چ لەسەدەی (٢١) زایین و سەردەمی تەکنۆلۆژیادا بکرێت و، چ لەسەدەی بیست و ئەوەندەی پێش زایینندا، هەر بەتیرۆرو تۆقاندن دادەنرێ و، ئەوەش هیچ لەمەسەلەکە ناگۆڕێ، کە (خۆفو) بەرانبەر بە (مووسا) و گەلی (بەنی ئیسرائیل) گوتوویەتی و، (بۆش)یش بەرانبەر بەجیهانی ئیسلامیی دەیڵێ! چونکە هەردووك ئیددیعایەکە یەك جەوهەرو کاکڵیان هەیە، کەبریتیە لەخۆ بەزلگریی و، خەڵك بەکەم سەیرکردن و، پڵیشاندنەوەی ئیرادەو کەسایەتیی یان!

بێگومان تیرۆر بەو شێوەیەی کەپێناسەمان کرد، کەبریتیە لە: (فەرزکردن و سەپاندنی ڕاوبۆچوونی خۆ، بەسەر بەرانبەردا، بەزۆر لێکردن و، پەنا بردنەبەر هێزو کوتەك و زەبروزەنگ و توندو تیژیی).

**بەهیچ شێوەیەك لەشەریعەتداجێگای نابێتەوە، لەبەر ئەم هۆیانەی خوارەوە:**

### یەکەم: حیکمەتی ژیانی دنیا:

لەڕوانگەی ئیسلامەوە، حیکمەتی ژیانی دنیا بریتیە لەتاقیکردنەوەی ئینسان، ئنجا ئایا ئینسان کەی و چۆن تاقی دەکرێتەوە؟!

خوێندکارێك کەمامۆستایەکەی دەیەوێ تاقی بکاتەوە، کەی تاقی دەکرێتەوە؟ دیارە کاتێك کە بتوانێ لە تاقیکردنەوەکانی دەربچێ و دەرنەچێ و، ئەگەری دەرچوون و دەرنەچوونی هەبێت، ئنجا پێی دەگوترێ: تاقیکردنەوە (إمتحان)، دەجا خوای پەروەردگار کە ژیانی دنیای وا هەڵخستوە: ئینسانی تێدا تاقی بکرێتەوە، بواری بەئینسان داوە، کە ئیمان بهێنێ، یان ئیمان نەهێنێ، دۆستی خوا بێ، یان دوژمنی بێ! دەرفەتی هەردووکیانی هەیە، خوای پەروەردگار دەفەرمووێ:

﴿ إِنَّا جَعَلْنَا مَا عَلَى ٱلْأَرْضِ زِينَةً لَّهَا لِنَبْلُوَهُمْ أَيُّهُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ﴿٧﴾ ﴾

الكهف: ٧.

واتە: ئێمە سەرزەوییمان ڕازاندۆتەوە - وەك شانۆیەك هەڵمان ختوە - تاکو تاقییان بکەینەوە، داخۆ کامەیان کردەوەی باشترە .

بەڵێ، دەبێ ئینسان دەرفەتی هەبێت و مەجال و مەودای پێ بدرێ، تاکو دەربکەوێ: داخۆ دۆستایەتیی خوای پەروەردگاری دەکات، یان دوژمنایەتیی؟ چاك دەکات، یان خراپ دەکات؟! وەك لەشوێنی دیکەدا دەفەرموێ:

﴿ إِنَّا هَدَيْنَٰهُ ٱلسَّبِيلَ إِمَّا شَاكِرًا وَإِمَّا كَفُورًا ﴿٣﴾ ﴾ الانسان:٣.

واتە: ئێمە ڕێگامان پیشانی ئینسان داوە، ئنجا دەتوانێ سوپاس گوزار بێ (بۆ خوا)و، دەشتوانێ سپڵەو پێنەزان بێ، واتە: هەردووك لای بۆ هەن.

كەواتە: زۆریی لەخەڵك كردن، بۆ وەرگرتنی عەقیدەو دین، كە بریتی بێ لە ئیسلام، پێچەوانەی حیكمەتی خوای پەروەردگارە، لەخوڵقاندنی ئینساندا و لەڕەخساندنی ژیاندا.

**دووەم: فیطرەت و سروشتی ئینسان:**

بەزۆر سەپاندنی بیروبڕوا بەسەر خەڵكدا، پێچەوانەی فیطرەت و سروشتی ئینسانیشە، چونكە: ئایا دەگونجێ ئینسان بەزۆرو تۆبزیی وا لێ بكەی، قەناعەتی وەك هی خۆت لێ بكەی؟! بێگومان ئەوە موستەحیلە، چونكە ڕەنگە بتوانی ناچاری بكەی، كردەوەیەكی بەزۆر پێ بكەی، بەڵام مەحاڵە بتوانی بەزۆر ناچاری بكەی و، وای لێ بكەی كەبەدڵ تۆی خۆش بوێ، لەحاڵێك دا كە خۆشی ناوێی! واتە: بەهیچ جۆرێك ناگونجێ دەروون و دڵی ئینسان داگیر بكرێ و كۆنترۆڵ بكرێ!.

**سێیەم: نێوەڕۆك و سروشتی ئیسلام:**

تیرۆر و ئیرهاب و فیكرە بەسەر خەڵك داسەپاندن، پێچەوانەی نێوەڕۆكی دینە، چونكە دین - واتە - ئیسلام - هاتوە، كە خەڵك ئازاد بكات، پاشان سەرپشكیان بكات، لەنێوان ئیمان هێنان و نەهێنان دا، وەبێگومان ئەو ئازادكردن و سەرپشك كردنەی خەڵكی لەنێوان ئیمان و كوفردا، لەهەردووك قۆناغی بانگەواز (دعوة) و دەوڵەتیشدا هەر هەیەو، بەردەوام دەبێ، ئەمەش بۆیە دەڵێم، چونكە هەندێك كەس، ئیسلامییەكان بەوە تۆمەتبار دەكات، دەڵێ: ئیسلامیی یەكانی كوردستانیش كەباسی ئازادیی بیروڕا دەكەن و، باسی ئەوە دەكەن كەئینسان ئازادە، لەوەدا كەئیمان دێنێ، یان ئیمان ناهێنێ، ڕاست نیەو كە دەستەڵاتیان كەوتە دەست، بەپێچەوانەوە ڕەفتار دەكەن! جا بەڕاستی من نازانم ئەو قسەیان

لە کوێ هێناوە! چونکە بە تەئکید ئەوە وانیەو لە ئیسلامدا بۆ هەڵس و کەوت لەگەڵ نەیاران دا، بە گشتی دوو قۆناغ هەن:

**١- قۆناغی بانگەواز:**

کە خەڵك بانگ دەکرێ بۆ ئیمان هێنان و کارکردن بە ئیسلام، ئنجا ئەوەی وەڵامی دایەوە، ئەوە باشەو، ئەوەی وەڵامیشی نەدایەوە، ئەوە ئاشکرایە کە دەستەڵاتێك نیە، تاکو زەبرو زۆر بەکاربهێنرێ و، بەزۆر ئیسلام بەسەر خەڵکدا بسەپێنرێ!

**٢- لە حاڵەت و قۆناغی دەوڵەتیشدا:**

ئێمە چەندان بەڵگەمان بەدەستەوە هەن، کەسەپاندن و تۆبزیی کردن دروست نیە، کە دوایی ئاماژە بۆ چەند ئایەتێکی قورئان دەکەین و لێرەش دا دەڵێین: زەقترین بەڵگە لەو بارەوە، سیرەو ژیانی پێغەمبەرمانە (صلی الله علیه وسلم) وەسیرەی خەلیفە ڕاشیدەکانیەتی خوا لێان ڕازی بێ، کەلەلای هەموو کەس ئاشکرایە، چۆن چۆنی لەگەڵ کەمایەتییە دینیەکان (الأقلیات الدینیة)دا ڕەفتاریان کردوە، کەدیارە بەدرێژایی مێژوو لە ژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامییدا، ژیان و کەرامەتیان پارێزراو بووە، وەهیچ یەزیدییەك و نەصرانییەك و جوولەکەیەك و زەردەشتییەك، بەزۆرو تۆبزیی مسوڵمان نەکراون، وەهەرکاتێك زوڵم لە (ذمي)[1]یەك کرابێت، مسوڵمانان هەموویان و بەتایبەت زانایان لەسەریان وەدەنگ هاتوون، بۆ وێنە: پیاوێکی وەك (إبن تیمیة) ڕەحمەتی خوای لێ بێ، کاتێك چووە بۆلای (قازان)، کە یەکێك بووە لە دەستەڵاتدارەکانی مەغۆل، بۆ ئەوەی، کە دیلە

---

(١) (ذمیّون) واتە: ئەوانەی کەمسوڵمان نین و لە ژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامییدا ژیان بەسەر دەبەن، کەدەبێ دەوڵەتی ئیسلامیی ئاگای لێیان بێ و مافەکانیان بۆ دابین بکات و ئازادییەکانیان بپارێزێ، بۆیەش ناونراون: (ذمي) چونکە مافەکانیان وەك ئەرکێکی شەرعی لەئەستۆی مسوڵمانان و دەوڵەتی ئیسلامییدان.
وشەی (ذِمَّة)ش وەك (مختار الصّحاح) ص٢٠٦، گوتوویەتی:
[هي العهد والعَقْد الـمُبْرَمُ بين طرفين أو أكثر].

مسوڵمانەکان ئازاد بکات، پاش گفتوگۆیەکی بوێرانە (قازان) پێی دەڵێ: من تا ئێستا هیچ زانا (عالم)ێکم وەك تۆ نەدیوە، ئەوەندە سام و ڕێزو هەیبەتی لەدڵمدا هەبێت، بۆیە تۆ هەر تەکلیفێك بکەی، من ڕەتی ناکەمەوەو، ئەوە هەموو دیلە مسوڵمانەکان بەتۆ دەبەخشم! (إبن تیمیة)ش دەڵێ: نەخێر دەبێ دیلەکانی (ئەهلی کیتاب)یشمان پێ ببەخشی، چونکە ئەوانیش وەك ئێمەن، (واتە: مادام هاووڵاتیی ئێمەن و هاوژینی ئێمەن، با هاودینیشمان نەبن، هەتا ئەوانیش نەبەمەوە، ناڕۆم![1]) ئیدی بەناچاریی هەموو ئەوانەی ئەهلی کیتابن (واتە: جوولەکەو نەصرانین) و گرتوونی، ئەوانیشی بۆ ئازاد دەکات!.

بەڵێ، ڕاستە ئیسلام لە هەردوو حاڵەتی بانگەوازو دەوڵەتدا، سروشتەکەی وایە، کەبەهیچ جۆرێك ڕێگا نادات: تۆبزیی لێکردن و ناچارکردنی ئینسانەکان هەبێت، وەك خوای دادگەر لەوبارەوە لەسووڕەتی (البقرة)دا زۆر بە ئاشکرا دەفەرموێت:

﴿ لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِ ﴾ البقرة: ٢٥٦.

واتە: (تۆبزیی لێکردن، لەوەرگرتنی دیندانیە)، توێژەرەوانی قورئان گوتوویانە: هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە، ئەوە بوو کەخەڵکی مەدینە - کە پێش کۆچی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)و هاوەڵانی بۆی (یثرب) یان پێگوتوە - وەك عادەتێکی نەفامییانە دابیان وابووە، کە ئافرەتەکانیان نەزریان دەکردو لەخوا دەپاڕانەوەو دەیانگوت: ئەگەر ئەمجارە خوا کوڕێکی پێداین و پێ بەخشین، بەڵێن بێ دەیکەین بە نەصرانیی، یان بە جوولەکە، چونکە دەیانزانی کە ئەوان ئەهلی کیتابن و بەحیساب دینێکیان هەیە، ئنجا دەیانگوت: بەڵکو خوا لەبەر ئەوەی کە کوڕەکەمان دەکەینە جوولەکە، یان نەصرانیی، کوڕمان بداتێ، ئیدی هەندێك لەوانەی کەکوڕەکانیان نەزر کردبوو بۆ ئەهلی کیتاب، کابرا خۆی و خێزانی بتپەرست و هاوبەش بۆ خوادانەر (وَثني و مُشْرِك)بوون، بەڵام کوڕەکەیان جوولەکە یان نەصرانیی بوو، ئنجا کاتێك پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم)

---

(١) ئەوەی نێوان دوو کەوانەکە خۆم زیادم کردوە، چونکە سیاقی قسەکانی (شیخ الإسلام) دەیگەیەنێ.

تەشریفی بردە مەدینەو، دەوڵەتی ئیسلامیی دامەزراند و، هەندێك لە تیرە جوولەكەكان ویستیان بڕۆن، هەندێك لەو كوڕانەش كەبووبوونە جوولەكە، یان بووبوونە نەصرانیی، كەس و كاریان ویستیان ئیزنیان نەدەن و، نەهێڵن لەگەڵ هاودینەكانیاندا بڕۆن و، شاری مەدینە بەجێ بهێڵن، ئیدی بەو بۆنەوە خوای دادگەر، ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوەو، ئەو ڕەفتارو هەڵوێستەی ئەو باب و دایكانەی قەدەغەكردو، بەشتێكی هەڵەو ناشەرعیی دانا، كەدەیانویست بەزۆر ڕۆڵەكانیان مسوڵمان بكەن و، بیانگێڕنەوەو نەهێڵن لەگەڵ جوولەكەكان دا بچن[١].

دیارە هۆی دەركرانی جوولەكەكانیش لەشاری مەدینە، ئەوەبوو كەئەو بەڵێن و پەیمانانەی لەگەڵ پێغەمبەری خواو مسوڵمانان دا بەستبوویان، شكاندنیانن و، خیانەتیان كرد، هەركام لەسێ تیرەكانی (بني قینقاع) و (بني النضير) و (بني قريظة)، بۆیە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) سزای هەرسێكیانی دا[٢]، جا باب و دایكەكان ویستیان تۆبزیی لەكوڕەكانیان بكەن، بەڵام خوا ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە:

﴿ لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِۖ قَد تَّبَيَّنَ ٱلرُّشۡدُ مِنَ ٱلۡغَيِّ ﴾ البقرة: ٢٥٦.

واتە: تۆبزیی كردن نیە لەوەرگرتنی دین دا، ڕێی ڕاست و ڕێی چەوت لەیەك جیا بوونەتەوە.

بەڵێ، مادام خوای كاربەجێ ڕێی داوە، كە ئینسان هەركام، لەڕێی ڕاست و ڕێی چەوت بگرێ[٣]، دەبێ بۆ خۆی سەرپشك بێ و نابێ زۆریی لێبكرێ و ئیجبار

---

(١) بڕوانە: (فتح القدير) للشوكاني، ج١ ص٣٥٧، كە گوتوویەتی: ئەو بەسەرهاتە هەركام لە (أبو داود: ٢٦٨٢، والنسائي: ٦٨و٦٩، وابن جرير(٣/١٠) وابن المنذرو ..الخ) لە (ابن عباس)ەوە گێڕاویانەتەوە، وە بڕوانە: الإستيعاب في بيان الأسباب، ج١ ص١٩٥. لەئاڵقەی یەكەم دا دەقی ئەو هۆی هاتنەخوارەوە (سبب النزول)مان لەعەرەبیی هێناوە.

(٢) بۆ زانینی بەسەرهاتی چۆنیەتی دەركرانی ئەو سێ تیرە جوولەكەیە لە شاری مەدینە، كە لە ئەنجامی پەیمان شكاندن و خیانەتیان دا، دووچاری سزاو تۆڵەبوون، بڕوانە: (السيرة النبوية) لابن هشام، ج٣ص ٥٠ تا٥٤، وە: ج٣ ص١٩٩، وە: ج٣ ص٢٤٤ تا٢٦٥.

(٣) بڕوانە: (مختصر تفسير ابن كثير)ج١ ص٢٣٩، وە: (فتح القدير) للشوكاني، ج١ ص٣٥٧.

بکرێ، خوای پەروەردگار هەر لەو بارەوە، کە تەنانەت ئەویش مافی ئەوەی نیە ئەو هەقە لەئینسانەکان زەوت بکات، بەپێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێ:

﴿وَلَوْ شَآءَ رَبُّكَ لَآمَنَ مَن فِى ٱلْأَرْضِ كُلُّهُمْ جَمِيعًا ۚ أَفَأَنتَ تُكْرِهُ ٱلنَّاسَ حَتَّىٰ يَكُونُوا۟ مُؤْمِنِينَ ﴿٩٩﴾﴾ یونس:٩٩.

واتە: وە ئەگەر پەروەردگارت بیویستایە -کەخەڵکی بەتۆبزیی ئیمان بێنن - ئەوە هەموو ئەوانەی کەلەسەر زەوین، تێکڕا ئیمانیان دەهێنا، ئنجا ئایا تۆ - ئەی موحەممەد! - زۆر لەخەڵکی دەکەی تاکو ئیمان بێنن؟!!

وەك دەبینین خوای کاربەجێ زۆر بەڕوونیی ڕفزی ئەوە دەکات، کەتەنانەت پێغەمبەری کۆتاییش(صلی الله علیه وسلم) مافی تۆبزیی لێکردنی خەڵکی هەبێت، بۆ ئیمان هێنان، چونکە ئەگەر خوای کاربەجێ ویستبای بەزۆر ئیمان بهێنن، هەموویان ئیمانیان دەهێنا، کێ هەیە بەرانبەر بەئیرادەی خوا بوەستێ؟! بەڵام کەخوا نەیویست بە زۆر ئیمان بەخەڵك بێنێ، ئایا ئەی (محمد) (صلی الله علیه وسلم) تۆ زۆر لەخەڵك دەکەی کە ئیمان بێنن؟! واتە: بۆت نیە، هەروەها خوای دادگەر (تبارك وتعالی) دەفەرموێ:

﴿لَّسْتَ عَلَيْهِم بِمُصَيْطِرٍ ﴿٢٢﴾﴾ الغاشیة -٢٢-.

واتە: تۆ دەستەڵاتت بەسەریاندانیە، یان دەفەرموێ:

﴿وَمَآ أَنتَ عَلَيْهِم بِجَبَّارٍ﴾ ق: ٤٥.

واتە: تۆ بۆت نیە زۆریان لێ بکەی.

**جا بەڕێزان!**

ئەو ئایەتانەی کەڕابردن، زۆر بەجوانیی دەیسەلمێنن، کە ئازادبوونی ئینسان لەبەرانبەر ئایین و بەرنامەی خوادا، کە ئیمانی پێ دێنێ، یان نا! حەقیقەتێکی شەرعیی گەورەو ڕوون و بێ چەندو چوونەو، ئینسان لەشەریعەتی خوادا، خاوەنی ئیرادەی ئازادانەی خۆیەتی.

بەڵام هەندێك کەس کەلە ئیسلام شارەزا نین و، جاروباریش دەبینن کەمسوڵمانێك، یان چەند مسوڵمانێك، یان لایەنێکی ئیسلامیی، بیرو بۆچوونێکی هەیە، کە لەگەڵ سروشتی ئیسلامداو، لەگەڵ ئەو حەقیقەتانەدا کەباسم کردن - دەربارەی شەریعەتی خوای دادگەر - ناگونجێ، لەسۆنگەی دیتنی ئەو هەڵوێست و ڕەفتارو بیرو بۆچوونە هەڵەو ناشەرعییانەوە، دووچاریی بەهەڵەدا چوون و چەواشەبوون دەبن و، وا دەزانن کە ئەوەی بینیویانەو بیستوویانە، ئەوە هەڵوێست و ڕای ئیسلامە! بەڵام من زۆر بەڕاشکاوییەوە دەیڵێم: کەبەهیچ ڕەنگێك شێوازو ڕێگای شەرعیی و سروشتی بنیات نانی قەوارە و دەوڵەتی ئیسلامیی، بریتی نیە لەتیرۆرو تۆقاندن و، زۆرو تۆبزیی لەخەڵك کردن! بەبەڵگەی ئەوە، کەهەموو دواندن(خطاب)ەکانی قورئان، کە لە شاری مەدینەو پاش دامەزراندنی قەوارە و دەڵەتی ئیسلامیی، بەمەبەستی ڕێکخستنی کاروباری ژیان و گوزەرانی مسوڵمانان، هاتوونەتە خوارێ، تێکرای ئەو دواندنانە (خطابات)، کەیاساشەرعییەکانیان گرتوونە خۆیان، بە: [يَاءيها الذين آمنوا] دەست پێ دەکەن، ئنجا ئایا ئەوە چی دەگەیەنێ؟! یانی: دەبێ سەرەتا کۆمەڵگایەك پێك بێت و خەڵکێك هەبن، ئیمان بهێنن، ئنجا خوای پەروەردگار بەشایستەی ئەوەیان دەزانێ، کە ئەمرو نەهییەکانی خۆییان ئاڕاستە بکات، لەبوارو لایەنە جیاجیاکانی ژیان و گوزەراندا، وەك چۆن بینایەك پاش دانرانی بناغەکەی، ئەوجار دیوارەکەی دادەنرێ!

**بەکورتیی:** دەبێ کۆمەڵگایەك هەبێ، ئنجا دەوڵەتی ئیسلامیی دەبێت، بۆیە هەرکەسێك بیەوێ دەوڵەتێکی ئیسلامیی بنیات بنێ، دەبێ لەپێکهێنانی کۆمەڵگایەکی ئیسلامییەوە دەست پێ بکات، ئەگەر بیەوێ کارەکەی وەك دیوار دانانی بێ بناغە، نەیەتە بەرچاوو، کردو کۆشەکەی نەبێتە جموجۆڵێکی عاطیفییانەو نەخشی سەر ئاو!

ئەگەر تەماشای سیرەی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) بکەین و سەرنج بدەین، کەئایا بۆچی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) لەشاری مەککە، ئیعلانی حوکمی ئیسلامیی ناکات و جاڕی دەوڵەتی ئیسلامیی نادات؟!! هەروەها سەرجەم پێغەمبەرانی خواش (علیهم الصلاة والسلام) بەگشتی و بەتایبەت پێغەمبەرانی دیکەی خاوەن عەزم (نوح، إبراهیم، موسی، عیسی) - علیهم الصلاة والسلام - بۆ چی هەر لەگەڵ دەستیان بە بانگەوازو گەیاندنی پەیامی خواو، کۆکردنەوەو فێرکردن و پەروەردەکردنی شوێنکەوتوانیان کردوە، یەکسەر نەیانگوتوە: ئێمە دەوڵەتین!! چونکە شەریعەتی خوای دادگەر لەسەر دەستی هەرکام لە پێغەمبەران هاتبێ، بەواقیع بینیی، مامەڵەی لەگەڵ دنیاو کۆمەڵگادا کردوەو، شتێکی ئاشکراو ڕوونیشە کە لەهەمووکات و شوێنێکدا، پێکهێنان و بنیاتنانی دەوڵەت و حکوومەت، پێویستیی بەسێ (٣) شتان هەیە:

١- خاك.

٢- خەڵك .

٣- دەستەڵات.

ئنجا ئاشکرایە کە دەستەڵات و خاکیش تابیعی خەڵکن، چونکە هەرکاتێك خەڵکێك لەسەر زەوییەك هەبوون، دەکرێ دەستەڵاتێکیشیان هەبێت، بۆیە تەماشا دەکەین پێغەمبەری ئێمە (صلی الله علیه وسلم) سێزدە (١٣) ساڵی ڕەبەق لەشاری مەککەدا خەریکی بانگەواز دەبێ، ئنجا هەرچەندە لەو قۆناغەدا زۆر نارەحەت دەکرێ و، ئازار دەدرێت و، هەندێك لەهاوەڵەکانی وەك (یاسر) و (سُمَیّة) شەهید دەکرێن و، خۆی بەچەندان شێوە ئیهانە دەکرێ و، قسەی ناشایستەی پێ دەگوترێ و، چەندان جۆر ئەشکەنجەو ئازار دەبینێ، بەڵام ئیجازە نادات بەهیچ کام لەهاوەڵانی دەست بۆ چەك ببا و، یەکێك لەسەرانی کوفر بکوژێت و ئیغتیالی بکات، چونکە دەزانێ کە دەوڵەتی ئیسلامیی بەو جۆرە بنیات نانرێ و، دەوڵەتی ئیسلامیی ئەگەر بویسترێ، بەشێوازی شەرعییانەی خۆی پێك بێت، دەبێ لەسەرشانی خەڵك و کۆمەڵگایەك بنیات بنرێ و دابمەزرێ، کە لەخودی خۆیاندا گەلێکی ئازادو سەربەست بن و، لەسەر خاکێکی ئازادیش بن و، ئامادەبن کەئەو دەستەڵاتەیان بدەن بەو قەوارە ئیسلامییە، ئەوجار بنیات دەنرێ.

**سەرنج بدەن!**

چۆن پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) پاش پێگەیاندنی كۆمەڵێكی هەڵبژاردە، دوای ئەوەی لەخەڵكی شاری مەككە نائومێد بووە، لەهەوڵی ئەوەدا بووەو گەڕاوە بەنێو تیرەكانی دەوری مەككەدا، بەڵكو خەڵكێك بدۆزێتەوە، كەخاكێكی ئازادیان هەبێت و، دەستەڵاتی خۆیان تەسلیمی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بكەن و، سەرەنجام دەوڵەتی ئیسلامیی لەسەر شانی خەڵكێكی سەربەست و لەخاكێكی ئازاددا بنیات بنرێ و، شەریعەتی خوا پیادەبكەن.

لەهەر كام لە (سیرة ابن هشام)[١] و (طبقات ابن سعد)[٢] و (زاد المعاد فـي هَدْی خیر العباد)[٣]ی (إبن قیم الجوزیة)دا بەدرێژیی باسی ئەو هەوڵدانانە (محاولات)ە كراوە، كە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) نزیكەی بیست (٢٠) عەشیرەتی بەسەركردۆتەوە و لەگەڵ هەموویاندا قسەی كردوە، بۆ پەیداكردنی خاك و خەڵكێكی گونجاو، كە ئیعلانی دەوڵەتی ئیسلامیی یان تێدا بكات و، لەگەڵ هەركام لەو تیرەو هۆزانەش دا، كە داوای لێكردوون پشتگیریی بكەن لەكارەكەی دا، بەم جۆرە دواندوونی و فەرموویەتی:

(هل من رجل یحملنی إلی قومه، فیمنعني حتی أُبَلِّغ رسالة ربي، فإن قریشاً قد منعوني أن أُبلِّغ رسالة ربي)[٤].

واتە: ئەرێ پیاوێك نیە بمباتەوە لای تیرەو هۆزەكەی و، پشتگیریم بكات و بەرگریم لێ بكات، تاكو پەیامی پەروەردگارم ڕابگەیەنم؟! چونكە قوڕەیش ڕێگریم لێ دەكەن، كەئایین و پەیامی خوا ڕابگەیەنم!.

---

(١) ج٢ ص٦٣ تا٦٩.

(٢) ج١ ص٢١٦،٢١٧.

(٣) ج٣ ص٤٣.

(٤) بڕوانە: (السیرة النبویة الصحیحة) أكرم ضیاء العمري ج١ ص١٩٣.

شتێکی ئاشکراشە کەمەبەستی پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) لەو فەرمایشتەی دا، تەنها بوار پێدانی بانگەواز نەبووە، چونکە ئەو قۆناغەی زۆر بەباشی لەشاری مەککەدا بڕیبوو، بەڵکو مەبەستی زەمینەسازکردن و هەل و مەرج ڕەخساندن بووە، بۆ ئیعلانی دەوڵەت، کەواتە: بەزاراوی ئەم چەرخ و ڕۆژگارە، فەرموویەتی: ئەرێ کەسێك نیە ئامادەبێت بۆم ببێتە قاعیدەی جەماوەریی و، من و پەیامەکەم لەباوەش بگرێت؟!

هەتا سەرەنجام پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەساڵەکانی: (١٢) و (١٣)ی پێغەمبەرایەتییدا، بەڵێن و پەیمانی یەکەم و دووەمی (العقبە)ی لەگەڵ هەردووتیرەی ناودارو بەهێزی (الأوس) و (الخزرج) لەشاری مەدینەدا بەست، کەبەپەسەندی دەزانم، چەند دەقێك لەو بارەوە بخەمەڕوو:

وەك لەسیرەی (إبن هشام)دا دەردەکەوێ، پەیمان بەستنی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەگەڵ خەڵکی (یثرب)دا و، لەگەڵ هەردووك تیرەی گەورەی (ئەوس و خەزرەج)دا بەسێ قۆناغان دا تێپەڕیوە:

### قۆناغی یەکەم:

**کە (إبن هشام) بەم جۆرە باسی کردووە:**

(فلما أراد الله عز وجل إظـــهارَ دينه وإعزازَ نبيه (صلى الله عليه وسلم) وإنجازَ موعده له، خرج رسول الله صلى الله عليه وسلم في الموسم الذي لقيه فيه النفر من الأنصار، فَعَرَض نَفْسَه على قبائل العرب، كما كان يصنع في كل موسم، فبينما هو عند العقبة، لقي رهطاً من الخزرج أراد الله بهم خيراً...) سيرة ابن هشام،ج٢/ ص٧٠.

واتە: ئنجا کاتێك خوای زاڵ و پایە بەرز ویستی ئایینەکەی خۆی دەربخات و، پێغەمبەرەکەی خۆی (صلى الله عليه وسلم) باڵا دەست بکات و، بەڵێنەکەی خۆی بۆ بێنێتەدی، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەو مەوسیمەدا کە

تێیدا بەکۆمەڵێك لە ئەنصارییەکان گەیشت، چووە دەرو، وەك چۆن لەمەوسیمی حەجی هەمووساڵێکدا، خۆی بەتیرەو هۆزەکانی عەرەب دەناساند، خۆی ناساند - کەپشتگیریی بکەن - ئنجا لەکاتێك دا کەلەلای (عەقەبە) بوو، گەیشتە کۆمەڵێك لەخەزرەجیەکان، کە خوا دەیوست خێریان بێنێتە ڕێ.

**قـۆناغـی دووەم:**

**ئەمیش (إبن هشام) بەمجۆرە باسی کردوە:**

(حتى إذا كان العام المقبل وفي الموسم جاءَ من الأنصار اثنا عشر رجلاً، فلقوه بالعقبة، وهي العقبة الأولى فبايعوا رسول الله صلى الله عليه وسلم على بيعة النساء، وذلك قبل أن تفترض عليه الحرب...) سيرة ابن هشام، ج٢ ص٧٣.

واتە: ئنجا لەساڵی ئایندەدا، دوازدە کەس لەئەنصارییەکان لەو مەوسیمەدا هاتن و، لەلای عەقەبە پێی گەیشتن، وە ئەوە پەیمانی یەکەمی عەقەبە بوو، ئنجا بەگوێرەی پەیمانی ئافرەتان، بەڵێنیان بەپێغەمبەری خوادا (صلى الله عليه وسلم) وە ئەوەش بەر لەوە بوو، کە جەنگیان لەسەر پێویست بکرێ.
دیارە ئەمیش لەساڵی (١٢)ی پێغەمبەرایەتییدا بووە.

مەبەستیش لەپەیمانی ئافرەتان ئەوەیە، کە لەئایەتی ژمارە(١٢)ی سوورەتی (الممتحنة)دا هاتوە، کە ئەمە دەقەکەیەتی:

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا جَآءَكَ ٱلْمُؤْمِنَٰتُ يُبَايِعْنَكَ عَلَىٰٓ أَن لَّا يُشْرِكْنَ بِٱللَّهِ شَيْـًٔا وَلَا يَسْرِقْنَ وَلَا يَزْنِينَ وَلَا يَقْتُلْنَ أَوْلَٰدَهُنَّ وَلَا يَأْتِينَ بِبُهْتَٰنٍ يَفْتَرِينَهُۥ بَيْنَ أَيْدِيهِنَّ وَأَرْجُلِهِنَّ وَلَا يَعْصِينَكَ فِى مَعْرُوفٍ فَبَايِعْهُنَّ وَٱسْتَغْفِرْ لَهُنَّ ٱللَّهَ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ١٢﴾
الممتحنه:١٢

بۆیەش بەپەیمانی ئافرەتان (بيعة النساء) ناونراوە، چونکە باسی جەنگ و جیهادی تێدانەهاتوە، کەتەنها لەسەر پیاوان فەرزە.

**قۆناغی سێیەم:**

**(إبن هشام) لەبارەی ئەم قۆناغەشەوە، چەند قسەیەکی هێناون:**

**١- لەبارەی کات و شوێنەکەیەوە، گوتوویەتی:**

(ثم ان مصعب بن عُمير رجع الى مكة، وخرج من خرج من الأنصار من المسلمين إلى الموسم مع حجاج قومهم من أهل الشرك، حتى قدموا مكة فواعدوا رسول الله (صلى الله عليه وسلم) العقبة من أوسطِ أيام التشريق...) سيرة ابن هشام ج٢،ص٨١.

کەواتە: سەفیری پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) موصعەبی کوڕی عومەیر (خوا لێی ڕازی بێ)، سەرقافڵەی ئەو وەفدەی ئەمجارەی یەثریبییەکان بووەو، شوێنیش هەر (عەقەبە)یەو، کاتیش ساڵی (١٣) و نیوەڕاستی ڕۆژانی مانەوە لەمینا، پاش جێبەجێکردنی حەج بووە.

**٢- وە لەبارەی ژمارەیانەوە گوتوویەتی:**

(... وكانوا ثلاثة وسبعين رجلاً وامرأتين...) سيرة ابن هشام، ج٢ ص٩٧.

واتە: ژمارەیان، حەفتاو سێ پیاوو دوو ئافرەت بووە.

**٣- وە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بۆ ڕێکخستنی کاروباریشیان، دوازدە (١٢) کەسی لەنێودا دیاریی کردوون بەناوی (نقیب) کە (٩)یان لەخەزرەج و (٣)شیان لەتیرەی ئەوس بوونە:**

(وقد قال رسول الله (صلى الله عليه وسلم): أخرجوا إليَّ منكم اثني عشر نقيباً، ليكونوا على قومهم بما فيهم، فأَخْرجوا منهم اثني عشر نقيباً، تسعة من الخزرج وثلاثة من الأوس...) سيرة ابن هشام، ج٢ ص٨٥.

**٤- دەقی پەیماننامەی دووەمی عەقەبە:**

(ابن القيم) لە: (زاد المعاد في هدي خير العباد) ج٣ ص٤٦، دا، بەم جۆرە دەقی

ئەو پەیماننامەیەی کەپاشتر بە (بيعة العقبة الثانية) ناوزەدکراوە، هێناوە، وەك (جابر بن عبدالله) خوا لێی ڕازی بێت گێڕاویەتەوە، کەپێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی:

{تُبَايِعُونِي عَلَى السَّمْعِ وَالطَّاعَةِ فِي النَّشَاطِ وَالْكَسَلِ، والنَّفَقَةِ فِي الْعُسْرِ وَالْيُسْرِ، وَعَلَى الأَمْرِ بِالْمَعْرُوفِ وَالنَّهْيِ عَنِ الْمُنْكَرِ، وَأَنْ تَقُولُوا فِي اللهِ لاَ تَخَافُونَ لَوْمَةَ لاَئِمٍ، وَعَلَى أَنْ تَنْصُرُونِي، إِذَا قَدِمْتُ عَلَيْكُمْ وَتَمْنَعُونِي مِمَّا تَمْنَعُونَ مِنْهُ أَنْفُسَكُمْ وَأَزْوَاجَكُمْ وَأَبْنَاءَكُمْ، وَلَكُمُ الْجَنَّةُ، فَقُمْنَا إِلَيْهِ فَبَايَعْنَاهُ} أخرجه أحمد برقم: (١٤٤٩٦) تعليق شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح على شرط مسلم.

واتە: بەڵێنم پێ دەدەن، کە لەکاتی گورج و گۆڵیی و تەنبەڵیی دا، گوێم بۆ بگرن و فەرمانبەرم بن، وەلەکاتی گرانیی و هەرزانیی دا، ماڵی خۆتان خەرج بکەن، وە کەفەرمان بەچاکەو ڕێگریی لەخراپە بکەن، وە کە لەڕێی خوادا هەقبێژ بن و، لەپێناوی خوادا لە لۆمەی سەرکۆنەکەران بێباك بن، وە کەپشتم بگرن و بەرگرییم لێ بکەن، هەرکاتێك هاتمە نێوتان، لەهەر شتێك بەرگریی تێدالەخۆتان و هاوسەرەکانتان و منداڵەکانتان دەکەن، وەلەبەرانبەریشدا بەهەشتتان هەبێت.

(جابر) دەڵێ: ئێمەش هەڵساین و بەڵێنمان دایە.

**٥**- ئنجا دوای ئەوە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بەوجۆرە بەڵێن و پەیمان لە نوێنەرانی خەڵکی شاری (یثرب) وەردەگرێ و، بنکەی جەماوەریی (القاعدة الشعبية) لەو شارە موبارەکەدا بنیات دەنێ، کەلەڕاستییدا چوون و پەیمان پێدانی حەفتاو پێنج کەسەکەو، پاشان هەڵبژاردنی دوازدە نەقیبەکە، کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) کردوونی بەمشوور خۆرو نوێنەری هەر دووك هۆزی بەهێزی ئەوس و خەزرەج، وەك (إبن هشام) لە (عبدالله بن أبی بکر)ەوە (خوا لێیان ڕازی بێ) هێناویەتی، کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بە (نقباء)ی فەرمووە:

(أَنْتُمْ عَلَى قَوْمِكُمْ بِمَا فِيهِمْ كُفَلاَءُ كَكَفَالَةِ الْحَوَارِيِّينَ لِعِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ ، وَأَنَا كَفِيلٌ عَلَى قَوْمِي "يَعْنِي الْمُسْلِمِينَ" قَالُوا: نَعَمْ) سيرة ابن هشام ج٢ص٨٨.

بەڵێ، ئەم مەسەلەیە وەك هەڵبژاردن (إنتخاب)ی ئەم ڕۆژگارەی ئێمەیە بێ كەم و زیاد، چونكە حەفتاو پێنج كەسەكە (٧٣ پیاوو ٢ئافرەت) نوێنەرو هەڵبژاردەی خەڵكی مەدینەو، دوازدە كەسەكەش، نوێنەرانی ئەو حەفتاو پێنج كەسە بوونە!

٦- ئنجا دوای ئەو بنكەی جەماوەریی دروستكردنە، ئەوجار پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمان بەهاوەڵانی بەڕێزی دەكات، كەكۆچ بۆ مەدینە بكەن و، پاشان دوای ئەوان خۆیشی لەگەڵ ئەبوبەكردا (خوا لێی رازی بێت)، كۆچ دەكات و سەرەنجام بەگەیشتنی بۆ ئەوێ، جاڕی پێكهێنانی دەوڵەتی ئیسلامیی دەدات، پاش ئەوەی كۆمەڵ و كۆمەڵگاو جەماوەرێكی ئیسلامیی پتەوو تۆكمەی تێدا بنیات نراوەو، ڕەگ و ڕیشەی تێدا داكوتاوە!

كەواتە: با بۆ هەموو لایەك ڕۆشن بێت، كە تاكە ڕێی شەرعیی و سروشتی پێكهێنان و بنیاتنانی دەوڵەت و قەوارەیەكی ئیسلامیی، ئەوەیە كەپێغەمبەری پێشەوامان (صلی الله علیه وسلم) گرتوویەتەبەرو، لەو چەند لاپەڕەیەدا ئاماژەمان بۆ كرد، كەوەك بینیمان: نەك هەر لەبنیاتنان و دامەزراندنی ئەو دەوڵەتەدا، هیچ جۆرە تیرۆرو ئیرهاب و زەخت و زۆرێك بەكارنەهاتوە و، هیچ جۆرە هەڕەشەو گوڕەشەو ترساندن و تۆقاندنێك لەئارادا نەبووە! بگرە یەك دڵۆپە خوێنیش لەو ڕێیەدا نەڕژاوەو، تاكە زللەیەكیش لەكەسێك نەدراوەو، دەوڵەتی ئیسلامیی لەسەر دەستی موبارەكی پێغەمبەرو (صلی الله علیه وسلم) هاوەڵانی (خوا لێیان ڕازی بێ)، بەشێوەیەكی زۆر سروشتییانەو مەنتیقییانە، لەنێو گەرمەو جەرگەی بانگەوازو تێگەیاندن و پێگەیاندن و، بەدەست و بازوو و ئیرادەو هیممەتی كۆمەڵی مسوڵمانی هەڵبژاردە، كە تەفاعولیان لەگەڵ جەماوەردا كردوەو، لەهەناوی كۆمەڵگای خاوەن ئیمان و عەقیدەو عیبادەت و ئەخلاقی شەرعیی یانەدا، هەڵقوڵاوە!

**بەڕێزان!**

لەم خاڵی پێنجەمەشدا بە پێویستی دەزانم، کە ئەگەر بەکورتیی و گوشراوییش بێت، ئاماژە بۆ سێ مەسەلان بکەم، کە لەمێشکی زۆر کەسدا جۆرێك لە دوو دڵیی و بەرچاو لێڵییان دروست کردوە، لەبواری هەڵوێستی شەریعەت بەرانبەر بە تیرۆرو ئیرهاب.

**یەکەم : مەسەلەی جەنگ و جیهاد:**

کەسانێك - کەوەك پێویست لە نێوەڕۆکی تیرۆرو، لەمەسەلەی جەنگ و جیهادی ئیسلامییش حاڵی نەبوونە - دەپرسن و دەڵێن:

چۆن ئیسلامێك کە بڕوای بەجیهاد هەیەو، دەڵێ: دەبێ جەنگ لە گەڵ ئەهلی کوفردا بەردەوام بێت، هەتا بستە خاکێکی سەر زەمین نامێنێ، کە بانگەوازی پەیامی خوای پەروەردگاری نەگەیشتبێتێ؟[1] دەگونجێ بگوترێ: دژی زەبرو زەنگ و ئیرهابە؟!

**لەوەڵامدا دەڵێین:**

١- جەنگ و جیهاد لە ئەسڵدا و لە حاڵەتی ئاسایی و سروشتیی مسوڵماناندا، دەوڵەتی ئیسلامیی پێی هەڵدەستێ، (الماوردي) لەکتێبی: (الأحكام السلطانية) داو، باقی شارەزایانی سیاسەتی شەرعیی لەکتێب و سەرچاوەکانیان دا هێناویانە، کە پێکهێنانی سوپای جەنگاوەر و جەنگ و جیهاد کردن، یەکێکە لە ئەرکە

---

(١) ئەو قسەیە بەو ڕەهاییە ڕاست نیە، چونکە قەوارەی ئیسلامیی دژی سەرجەم ئەهلی کوفر ناجەنگێ، بەڵکو تەنیا دژی دوژمنانێك کەلە دژی دەجەنگن، دەجەنگێ، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿ وَقَٰتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ يُقَٰتِلُونَكُمۡ وَلَا تَعۡتَدُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُعۡتَدِينَ ١٩٠ ﴾ البقرة -١٩٠- کە لەئاڵقەی یەکەمی ئەم زنجیرە بابەتەدا قسەمان دەربارەکرد، دیارە گەیاندنی پەیامی خواش لەم ڕۆژگاری گەشەکردنی تەکنۆلۆژیایی زانیاریی و ڕاگەیاندن دا، ئاسان بووە و پەکی لەسەر سوپا و هێز نەکەوتوە.

گرنگەکانی حوکمڕانی مسوڵمانان، کە (الماوردي)[١] لە دە(١٠) خاڵاندا کورتی کردوونەوە.

٢- بەڵام لەحاڵەتی نائاسایی مسوڵمانان دا، کە دەوڵەتیان نامێنێ - وەك وەزعی ئێستای ئۆممەت کە قەوارە و سایەو سێبەرێکیان نیە کۆیان بکاتەوە - ئەوە لەو حاڵەتانەدا، وەك شتێکی ناچاریی و هەڵاواردن (إستثنائي) لەسەر هەر کۆمەڵێك لەمسوڵمانان پێویستە، کە بەپێی توانا، خۆیان بۆ جەنگ و جیهاد ئامادە بکەن، چونکە ناکرێ هەموویان دەست لەکراسی دەربێنن و[٢] دەستیان لە ئەژنۆیان وەربێنن و، لێبگەڕێن ئەهلی کوفر تێکڕای دینەکەیان بفەوتێنن، دیارە چەندان فەرموودەش هەن کەباسی کۆمەڵی سەرکەوتوو (الطائفة المنصورة)و کۆمەڵی دەربازبو (الفرقة الناجية) دەکەن و، موژدەی ئەوە بەمسوڵمانان دەدەن، کەلەحاڵەتی شپرزەیی وەزعی ئۆممەتیشدا، کۆمەڵێك هەردەمێنن، کە درێژە بەفیداکاریی و جەنگ و جیهادی ئیسلامییانە دەدەن، بۆ وێنە:

{لَنْ يَبْرَحَ هَذَا الدِّينُ قَائِماً يُقَاتِلُ علية عِصَابَةٌ مِنَ الْمُسْلِمِينَ حَتَّى تَقُومَ السَّاعَةُ} أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ برقم: (١٩٢٢).

ئنجا بەسەرنج دانی سەرجەم دەقەکانی قورئان و سوننەت، بۆمان دەردەکەوێ، کە ئەو قسەیەی زانا و پێشەوایانی ئیسلام، زۆر ڕاست و بەجێیە، کە گوتوویانە: جەنگ و جیهاد دوو جۆرە:

١- جەنگی بەرگریی کردن (قتال الدفع).

٢- جەنگی هێرش بردن (قتال الطلب)[٣].

---

(١) بڕوانە: (الأحكام السلطانية)ص٦و٧.

(٢) بۆ کەسێك بەکاردێ، وەك مردوو تەماى لە خۆی نابێ، چونکە ئینسان کەمرد، پێش ئەوەی لاشەی ڕەق ببێ، دەستەکانی لە کراسی دێننە دەرێ، چونکە کە ڕەق بوو، دەبێ جلەکانی لەبەردا بدڕێنی، ئەگەر نا دەستەکانی نایەنە دەرێ.

(٣) لەبەرگی حەوتەمی کتێبی: ( الإسلام كما يتجلى في كتاب الله)دا تاڕادەیەکی باش لەبارەی جەنگ و جیهادەوە دواوین، هەروەها لەو کتێبەدا کە تەرخانمان کردوە بۆ

**ئنجا دەڵێین:** ئەگەر جەنگی بەرگریی - ئەویش لەهەموو حاڵێکدا نا - بگونجێ بەبێ هەبوونی دەوڵەت و سوپایەکی جەنگاوەر ئەنجام بدرێ، ئەوە بێگومان مەحاڵە جۆری دووەم، کە جەنگی هێرش بردن و ڕێگا تەخت کردنە لەبەردەم گەیاندنی بانگەوازی پەیامی خوادا، لەکاتێك دا ڕێی لێ دەگیرێ، بەبێ دەوڵەت و قەوارەیەکی شەرعیی ئەنجام بدرێ.

بەڵکو دەوڵەتی ئیسلامیی، تەنها کاتێك ئەوئەرکە گەورەو گرنگەی پێ ئەنجام دەدرێ، کەخاوەنی هێزو پێزو دەستەڵاتێکی وابێت، کە لەبەرانبەر دوژمن و ناحەزانی دا، باڵا دەستی بکات.

ئێستاش باسەرنجی هەرکام لەو دوو جۆرەی جەنگ و جیهادە بدەین، داخۆ هیچ جۆرە حاڵەتێکی تیرۆرو ئیرهابیان تێدا بەدی دەکرێ؟!

١- جۆری یەکەمیان کە (قتال الدفع) جیهادی بەرگرییە، ئاشکرایە کەهیچ جۆرە تۆبزییکردن (إكراه) و گوشار خستنە سەر خەڵکی تێدا نیە، بەڵکو بریتیە لەبەرپەرچدانەوەی تۆبزیی کردن و سەرکوتکردن و زەخت و زۆری خەڵکێکی ستەمکارو دەستدرێژکار:

﴿ فَمَنِ ٱعۡتَدَىٰ عَلَيۡكُمۡ فَٱعۡتَدُواْ عَلَيۡهِ بِمِثۡلِ مَا ٱعۡتَدَىٰ عَلَيۡكُمۡۚ ﴾ البقرة: ١٩٤.

٢- جۆی دووەمیشیان کە (قتال الطلب)ە، وەك پێشتریش باسمان کرد لە ئەسڵدا بۆ ڕێگا پاك کردنەوەو زەمینە خۆشکردنە لەبەردەم کاروانی بانگەوازی ئیسلامییداو، بەهیچ جۆرێك پەیوەندیی بەتیرۆرو ئیرهابەوە نیەو، خەڵکی دەخاتە بەردەم سێ ڕیانێکەوەو، سەرپشکیان دەکات لەبەردەم هەڵبژاردنی یەکێك لەسێ شتاندا، بەئیرادەی ئازادانەی خۆیان و، بەبێ هیچ جۆرە چاو لێ سوورکردنەوەو فشارێك، کەبریتین لە : یان مسوڵمان بوون، یان سەرانە (جزیة)دان، یان بەناچاریی جەنگ لەگەڵ کران، واتە ئیسلام بەو جۆرە خەڵکە دەڵێ:

---

قسەکردن لەبارەی (ڕێکخراوی داعش)ەوە، وە لەسەرەتای تەفسیری سوورەتی (الأنفال)دا کە بەرگی حەوتەمی: [تەفسیری قورئانی بەرز و بەپێز]ە، کورتە باسێکی حەوت خاڵییمان لەوبارەوەکردوە.

لەسۆنگەی ئەوەوە، کە من دوایین بەرنامەو پەیامی خوای بەخشندە و پەروەردگارم، پێویستە ئیمانم پێ بێنن، تاکو بەختەوەری دنیاو سەرفرازی دوا ڕۆژ بن، بەڵام ئەگەر ئیمانتان نەهێنا، ئەوە من ڕێگا نادەم، زۆرتان لێ بکرێ، بەڵکو لەسەر ڕێچکەو بەرنامەکانی خۆتان بمێننەوە، بەڵام تاکو بیسەلمێنن کە دژایەتیی ناکەن و ئیحتڕامی ئەو دەوڵەتە دەگرن، کە بۆ ئەوە دروست بووە سایەو سێبەری سەرجەم مرۆڤەکان بێت، دەبێ سەرانە بدەن[1]، هەم وەك نیشانەی ڕێزگرتنتان لەو دەوڵەتەو، هەم وەك دەستبار بۆ گرتن و هاوکاریی کردنیشی، چونکە ئەویش خزمەت بە ئێوە دەکات و، ماف و پێداویستییەکانتان بۆ دابین دەکات، ئنجا ئەگەر سەرانەش نەدەن، ئەوە مانای وایە، ئێوە وەك گابەردێك وان، کە دەکەوێتە زاری کانی و سەرچاوەیەکەوەو، نەبۆ خۆی ئاو دەخواتەوەو، نەڕێگای خەڵکیش دەدات بخۆنەوە، بۆیە پێویستە دەمی کانییەکەی لێ پاك بکرێتەوەو ئەوگابەردە دوور بخرێتەوە!!

بەڵگەی ئیسپاتی ئەوەش کە جەنگ و جیهادی ئیسلامیی لەحاڵەتی هێرش بردنیش دا، هیچ جۆرە زۆرلێکردن (إكراه) و ئیرادە لێزەوتکردنێکی تێدانیە، بۆ ئیمان هێنان و مسوڵمان بوونی خەڵکی، ئەوەیە کەهەرچەندە زاناو پێشەوایانی ئیسلام لەو بارەوە تاڕادەیەك ڕاجیایی و مشت و مڕیان هەیە، کە ئایا هۆکاری کوژران (علة القتل)ی ئەهلی کوفر، کوفرەکەیانە، یان دژایەتیی کردنیان بۆ ئیسلام و دەوڵەتی ئیسلامییە؟! کە زۆربەو جەماوەریان دەڵێن: هۆکاری کوژرانی

---

(١) ئەوەکاتی خۆی گوتوومە، بەڵام ئێستا دەڵێم: - وەك پێشتریش گوتوومە - کە سەرانەدان شتێکی حەتمیی نیە، بۆ ئەوەی نامسوڵمانان ببنە هاووڵاتیی لە دەوڵەتی ئیسلامیی دا، بەڵکو ئەوە پەیوەندیی بەچۆنیەتی ڕێککەوتنی نێوان هەردووك لاوە هەیە و، دەگونجێ پابەندیی دارایی (التزام مالي) هەبێ، وە دەشگونجێ نەبێ، وەك ئایەتی ژمارە (٩٠)ی (النساء) بەڕوونیی ئاماژەی پێدەکات کە ئەوە دەقەکەیەتی:

﴿إِلَّا ٱلَّذِينَ يَصِلُونَ إِلَىٰ قَوۡمِۭ بَيۡنَكُمۡ وَبَيۡنَهُم مِّيثَٰقٌ أَوۡ جَآءُوكُمۡ حَصِرَتۡ صُدُورُهُمۡ أَن يُقَٰتِلُوكُمۡ أَوۡ يُقَٰتِلُواْ قَوۡمَهُمۡۚ وَلَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ لَسَلَّطَهُمۡ عَلَيۡكُمۡ فَلَقَٰتَلُوكُمۡۚ فَإِنِ ٱعۡتَزَلُوكُمۡ فَلَمۡ يُقَٰتِلُوكُمۡ وَأَلۡقَوۡاْ إِلَيۡكُمُ ٱلسَّلَمَ فَمَا جَعَلَ ٱللَّهُ لَكُمۡ عَلَيۡهِمۡ سَبِيلٗا ٩٠﴾.

کافران، دژایەتیی کردنیانە، نەك خودی کوفرەکەیان، وەك (شیخ الإسلام إبن تیمیة) لەکتێبی (السیاسة الشرعیة)ص ١٣٢،١٣٣دا گوتوویەتی: هەرچەندە لەو بارەوە زانایان مشت و مڕێکیان هەیەو، ڕای ڕاستیش ڕای جەماوەری زانایانە، بەڵام لەوبارەوە کە ئەگەر ئەهلی کوفرێك ئامادەی هیچ کام لە: مسوڵمان بوون و، سەرانەدان، نەبوون و، لەگەڵ سوپای ئیسلام دا چوونە جەنگەوە، پاشان لە گەرمەی جەنگدا ئامادەییان پێشان دا، کەسەرانە بدەن، لەو بارەوە تێکڕای زانایان و پێشەوایانی ئیسلام کۆك و یەکدەنگن، کە پێویستە دەستبەجێ جەنگ بوەستێنرێ و، وەك هاووڵاتیی حیساب بکرێن و، سەرانەیان لێ وەربگیرێ.
کەواتە: ئەو کاتە ئیسلام بەزمانی حاڵ بەو خەڵکە دەڵێت:

منتان ناچار کرد کەلەگەڵتان بجەنگم، چونکە بەهەر حاڵ هەقی خۆتانەو خوای خاوەنتان مافی ئەوەی پێداون کەمسوڵمان نەبن و، هیچ کەسیش بۆی نیە زۆرتان لێ بکات! بەڵام بەچ هەقێك و بەچ عەقڵێك، هەق بەخۆتان دەدەن، کە ئەو هەق و ڕووناکییەی خواتان قبووڵتان نەکردوە، لەڕێی دا ببنە کۆسپ و پەرچ و، نەهێڵن خەڵکی دیکەش ڕووی گەش و جوانی ببینێ و، دەنگی زوڵاڵی ببیستێ؟!

کەواتە: بابزانن کە من بۆ زۆر لێکردنتان بۆ مسوڵمان بوون، دەستم بۆ چەك و هێز نەبردوە، بەڵکو لەسۆنگەی ئەوەوە دەستم بۆ چەك بردوە، کەڕێگاتان لێگرتووم و، منیش ناچارم ڕێگای خۆم پاك بکەمەوەو، دیفاع بکەم لەهەق و مافی ئەو خەڵکەی دیکە بکەم، کە پێویستە ببینن و بمناسن، تاکو بیانوویان بەدەستەوە نەمێنێ و، ئیمان بێنن یان نا، لەبەر ڕۆشنایدا بێت، وەك خوای پەروەردگار فەرموویەتی:

﴿لِّيَهۡلِكَ مَنۡ هَلَكَ عَنۢ بَيِّنَةٖ وَيَحۡيَىٰ مَنۡ حَيَّ عَنۢ بَيِّنَةٖ﴾ الأنفال: ٤٢.

هەربۆیەش هەرکە ڕێتان بۆ چۆڵ کردم و وازتان لەدژایەتیی هێنا، جەنگی منیش لەگەڵتان کۆتایی پێ دێت، بێ ئەوەی مسوڵمانیش ببن، چونکە هەر لەسەرەتاوە جەنگەکەم بۆ مسوڵمان کردنتان بەرپا نەکردبوو، بۆیە بەهاتنەدی

ئامانجەكە، كە دەست هەڵگرتنتانە لە دژایەتیی كردنم، جەنگەكەش دەوەستێ و كۆتایی پێ دێت!!.

ئنجا ئەم ئایەتەش كەدەفەرمووێ:

﴿وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا ٱسۡتَطَعۡتُم مِّن قُوَّةٖ وَمِن رِّبَاطِ ٱلۡخَيۡلِ تُرۡهِبُونَ بِهِۦ عَدُوَّ ٱللَّهِ وَعَدُوَّكُمۡ﴾ الأنفال: ٦٠.

شتێكی یەكجار ڕەوایەو مافێكی سروشتیی هەر دروستكراوێكە، كە دوژمنی خۆی بترسێنێ، دیارە هەم لەڕووی عەقڵ و هەم لەڕوانگەی شەریعەتیشەوە، هەموو مەخلووقێك ئەوە بۆ خۆی بەهەق دەبینێ، كە دوژمنی خۆی بترسێنێ، وە ئەوە كە ئینسان دەستەڵات و سام و هەیبەت و هێزێكی هەبێت كە دوژمنەكەی بترسێنێ، بۆ ئەوەی نەتوانێ دەستدرێژیی بكاتە سەر، بەهیچ پێودانگ و عەقڵێك تۆقاندن و ئیرهاب نیە، واتە: ئەو ئیرهابە نیە كەهاوتای تیرۆرە، بەڵكو ئەوە ترساندنێكی ڕەواو شەرعییەو، هیچ تۆزو گەردێكی لەسەر نیەو، بەپێچەوانەوە: بەرگریی لەخۆنەكردن و تەسلیم بوون، گوناحێكی یەكجار زلە، چونكە تۆ دەبێ دوژمنی خۆت بترسێنی، بۆ ئەوەی تەماعت تێنەكات و، بەنێچیرێكی ئاسان و تووك نەرمت تێنەگات، چونكە هەركەسێك بەهۆی تەسلیم بوون و خۆبەستەوەدانی یەوە، دوژمنەكەی هان بدات كەستەمی لێبكات و، دەستدرێژیی بكاتەسەر، ئەوە لەزوڵم و ستەمەكەیدا بەشدارە! بەڵام ئیسلام دەڵێ: دەبێ بەشێوەیەكی بەهەق و لەسنووری شەرعدا ئەو هێزو توانایەت بەكاربهێنی و، خۆت گیرۆدەی ستەم و دەستدرێژیی و تێپەڕاندن نەكەی!

بەڵێ ئیسلام دەڵێ:

﴿وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا ٱسۡتَطَعۡتُم مِّن قُوَّةٖ وَمِن رِّبَاطِ ٱلۡخَيۡلِ تُرۡهِبُونَ بِهِۦ عَدُوَّ ٱللَّهِ وَعَدُوَّكُمۡ﴾ الأنفال: ٦٠.

واتە: چیتان پێ دەكرێ لەهێزو تواناو، ئەسپی بەستراوەو تایبەت، ئامادەی بكەن، تاكو دوژمنی خواو دوژمنی خۆتانی پێ بترسێنن، ئنجا جێی سەرنج

ئەوەیە كەخوای كاربەجێ نەیفەرمووە: (تُهْلِكون بە..) پێی بفەوتێنن و بنبڕ بكەن، بەڵكو تەنها دەفەرموێ: پێی بترسێنن! كەواتە: هەرئەوەندە كە دوژمنەكەت بترسێ و شەڕت پێ نەفرۆشێ و وازت لێ بهێنێ و، هێندە بترسێ كەڕێگرییت لێنەكات و، لێت بگەڕێ، شەریعەتی خوا ڕابگەیەنی و، لەژیان و گوزەرانی خەڵكیدا بەڕێوەی بەری، مادام سەرانە دەدات و مل بۆ دەوڵەتی ئیسلامیی كەچ دەكات ـ تۆش وازی لێبێنە، با لەسەر كوفری خۆشی بمێنێتەوە.

### دووەم: مەسەلەی ئیغتیال (پەنهانكوژیی):

**(الإغتیال)** واتە: پەنهانكوژیی، ئەم مەسەلەی ئیغتیالیش یەكێكە لەو مەسەلانەی كە لەمێشكی هەندێك كەس دا، دوو دڵیی و گومانی دروست كردوە.

بەڵێ بەڕێزان!

هەندێك كەس لەبەر ئەوەی كەپێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) یەكێك لەهاوەڵانی بەناوی (محمد بن مسلمة)ی ناردوە بۆ كوشتنی (كعب بن الأشرف) سەرۆكی جوولەكەكانی (خەیبەر) وەك لە (صحیحي: البخاري ومسلم)دا هاتوە، هەروەها كە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) (عبدالله بن عتيك)ی ناردوە بۆ كوشتنی (إبن أبي حُقَيق) كە كونیەكەی (أبو رافع)ە و ئەوەش لە (صحيح البخاري)دا هاتوە، ئەمیش یەكێك بووە لەسەرانی كوفرو شیرك.

هەندێك كەس دەڵێن: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) نەفەری تایبەتی ناردوە بۆ ئیغتیال كردنی هەركام لە: (إبن الأشرف) و (إبن أبي حُقَيق)، ئنجا دیارە ئەوانە ئیغتیالیش بەتیرۆر تێگەیشتوون!، بۆیە پێیان وایە كەپەنهانكوژكردنی ئەو دوو سەركردەیەی ئەهلی كوفر، بەڵگەیە لەسەر هەبوون و ڕەوابوونی تیرۆر لەئیسلامدا!

بەڵام لەڕاستیدا بەڵگە هێنانەوەكەیان ڕاست و تەواو نیە، چونكە ئێمە پێشتر پێناسەی تیرۆرمان كردو گوتمان: بریتیە لە بەزۆر سەپاندنی بیرو ڕاو سیاسەتی خۆت بەسەر غەیردا،بەڵام ئیغتیال واتە: پەنهانكوژیی!

**پاشان پێویستە بپرسین:** کە ئایا پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) کەنازناوی (رحمة للعالمین)ی هەیە! کەی و چۆن ئیجازەی داوە کە ئەوانە بکوژرێن؟!

**لەوەڵامدا دەڵێین:** ئەو مۆڵەت دانەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لەکاتێك دا بووە، کە دەوڵەتێکی ئیسلامیی هەبووەو، پەیمانی مۆر کردوە لەگەڵ ئەو سەرکردانەدا، لەگەڵ (کەعبی کوڕی ئەشرەف) کەسەرۆکی جوولەکەکانی خەیبەر بووەو، لەگەڵ (ئیبن و ئەبی حوقەیق)دا، کە هاووڵاتییەکی باش و سەر ڕاست بن، کەچی ئەوان غەدریان کردوەو، پەیمانیان هەڵوەشاندۆتەوەو، دەستیان کردوە بەخیانەتکاریی و دوژمنایەتیی ئیسلام و مسوڵمانان و، ژێربەژێرکاریی لەگەڵ دوژمن و ناحەزە ئاشکرایەکانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)و دەوڵەتە ئیسلامییەکەی دا، ئیدی خوای دادگەر ئەم ئایەتەی ناردۆتە خوارێ لەوبارەوە کەدەفەرموێ:

﴿ وَإِن نَّكَثُوٓاْ أَيۡمَٰنَهُم مِّنۢ بَعۡدِ عَهۡدِهِمۡ وَطَعَنُواْ فِي دِينِكُمۡ فَقَٰتِلُوٓاْ أَئِمَّةَ ٱلۡكُفۡرِ إِنَّهُمۡ لَآ أَيۡمَٰنَ لَهُمۡ لَعَلَّهُمۡ يَنتَهُونَ ﴿١٢﴾ ﴾ التوبة:١٢.

واتە: ئنجا ئەگەر هات و دوای ئەوەی کەپەیمانیان داوە، پەیمانەکەیان هەڵوەشاندەوەو، تانەو تەشەریان لەدینی ئێوەداو، دژایەتییان کردن، ئەوە لەو حاڵەتەدا سەرانی کوفر بکوژن، چونکە ئەوانە خاوەن بەڵێن نین، بۆ ئەوەی وازبێنن - لەو دژایەتیی و خیانەتەیان -، کەواتە: کوژرانی سەرانی بێ بەڵێنی کوفر، بەشێوەی پەنهانکوژیی، بۆ ئەوە بووە، کە میللەتەکەیان لەگەڵیان نەفەوتێ و، تەنها سەری مار پان بکرێتەوە، ئاخر بۆ چی ئەو خەڵکە بەبێ خەتا بکوژرێ، لەحاڵێکدا کەبابای سەرکردە پەیمانی هەڵوەشاندۆتەوەو خیانەتی کردوەو، ڕەنگە خەڵکەکە ئاگای لەهیچ نەبێت، بۆچی باجی لەگەڵ بدەن؟! ئەو کەین و بەینی لەگەڵ موشریکەکاندا کردبێ، کەپیلان بگێڕن دژی ئیسلام، میللەتی بێ خەتاو بێ ئاگا، هیچ پاساوێك نیە بۆ کوشتنیان، کەواتە: باشترین چارەسەر ئەوەیە کەسەری ئەو مارە پان بکرێتەوە، ئەوە شتێکی زۆر ڕەوایەو، وەك عەرەب گوتوویانە: (لا غبار علیه).

ئنجا ئێمەش وەك گەلی كورد لەخەباتی ڕزگارییخوازیماندا، كە بەرپرسان و سەرانی (بەعس)مان دەكوشتن، هەر لەسەر ئەو بناغەیە بووە، هەروەها هەر میللەتێكی دیكە كەبەرپرس و سەرانی دوژمنەكانی خۆی دەكوژێ، شتێكی مەنتیقیی و ڕەوایە، جابەئاشكرا بێت، یان بەپەنهانیی، چونكە چۆن باشتر زەفەر بەدوژمنت بەری و، زیانت كەمتر بێت، ئەوە چاكترە، مادام ئەو هەرچی لەدەستی بێت و، پێی بكرێ لە دژت ئەنجامی دەدات و، لەهیچ شتێك سڵ ناكاتەوەو، بەهیچ بەڵێن و پەیمانێكەوە پابەند نیە!

**سێیەم: مەسەلەی كوشتنی خەڵكی بێ دیفاع و لاشەڕ:**

ئەمیش ئیشكالی سێیەم و كۆتاییە، كە بەپێویستی دەزانم تیشكی بخەمەسەرو ڕوونی بكەمەوە.

**خەڵكێك دەڵێن:** چۆن تیرۆر لەئیسلامدا نیە! لەحاڵێكدا كە ئیسلام ڕێگا دەدات، خەڵكی بێ دیفاع وەك: ئافرەت و منداڵ و پیرو نەخۆش و ڕەبەن و كرێكار، بكوژرێن؟! ئێمەلەوەڵامی ئەو قسەیەشدا بە پێویستی دەزانین ئەم چەند ڕاستییە بخەینەڕوو:

١- زاناو پێشەوایانی ئیسلام تێكڕا لەسەر ئەوە یەك دەنگن، كە (ئافرەت و منداڵ) نابێ بكوژرێن، چونكە دەقی فەرمایشتی پێغەمبەری خوای (صلی الله علیه وسلم) لەسەرە، وێڕای حوكمی گشتی ئایەتی:

﴿ وَقَٰتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ يُقَٰتِلُونَكُمۡ وَلَا تَعۡتَدُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُعۡتَدِينَ ١٩٠ ﴾ البقرة:١٩٠.

یەكێك لەو حەدیسانەش كەبەڕاشكاویی لەگەرمەی جەنگیشدا كوشتنی ئافرەت و منداڵ قەدەغە دەكات، ئەو فەرمایشتەیە، كە دەفەرموێ:

{وُجِدَتْ امْرَأَةٌ مَقْتُولَةً فِي بَعْضِ مَغَازِي رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ علية وَسَلَّمَ فَنَهَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وَسَلَّمَ عَنْ قَتْلِ النِّسَاءِ وَالصِّبْيَانِ} أَخْرَجَهُ مَالِك فِي (الموطأ) برقم: (٢٧٧)، وَأَحْمَد برقم: (٤٧٣٩)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٢٨٥١)، وَمُسْلِم برقم: (٤٦٤٥) وغيرهم.

واتە: جەنازەی ئافرەتێکی کوژراو لەیەکێك لەجەنگەکانی پێغەمبەری خوادا (صلى الله عليه وسلم) بینرا، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمانی دەرکردو، کوشتنی ئافرەت و منداڵی قەدەغە کرد.

٢- هەروەها لەبارەی نەکوژرانی کرێکارو کارمەند (الأجير و الموظف) یشەوە فەرموودەی ڕاست و دروستی پێغەمبەری خوای (صلى الله عليه وسلم) هەیە، کە دەفەرموێ: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) نەفەرێکی نارد بۆ لای (خالیدی کوڕی وەلید) خوای لێ ڕازی بێ، کەسەرکردەی سوپا بوو، پێی فەرموو:

{إنْطَلِق إلى خَالِدِ بْنِ الوَلِيد، فَقُلْ لَهُ: إِنَّ رَسُولَ الله يأمرك يَقُولُ: لا تقتلَنَّ ذرِيَّةً ولا عَسِيفاً} أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٦٠٣٥)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٢٦٦٩)، وَالنَّسَائِيُّ فِي "الكُبْرَى" برقم: (٨٦٢٥)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٢٨٤٢)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٤٧٨٩)، وَالحَاكِمُ برقم: (٢٥٦٥)، وَقَالَ: صَحِيحٌ عَلَى شَرْطِ الشَّيْخَيْنِ.

واتە: بچۆ بەخالیدی کوڕی وەلید بڵێ: پێغەمبەری خوا فەرمانت پێ دەکات، کە ژن و منداڵ و کرێکار مەکوژە.

٣- هەروەها لەبارەی ئینسانی پیر (شیخ)یشەوە، ئەم فەرمایشتە هەیە، کەنابێ لەجەنگدا بکوژرێ، هەرچەندە فەرموودەی یەکەم و دووەم بەهێزترن و ئەمیان تۆزێك مشت و مڕی لەسەر هەیە، دەفەرموێ:

{وَلاَ تَقْتُلُوا شَيْخًا فَانِيًا وَلاَ طِفْلاً وَلاَ صَغِيراً وَلاَ امْرَأَةً} أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ برقم: (٢٦١٤).

٤- هەروەها دەربارەی جوتیارو کاسبکارانیش ئەم فەرموودەیە لە (عمر بن الخطاب)ەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتوە، کە گوتوویەتی[١]: (إتقوا الله في الفلاّحين، فلا تقتلوهم إلا أن ينصبوا لكم الحرب)، واتە: پارێز لەخوا بکەن لە بارەی جوتیارو کاسبکارانەوەو، دەستیان لێ بپارێزن و مەیانکوژن، مەگەر بۆتان بێنە مەیدانی جەنگەوە.

---

(١) بڕوانە: (سنن البيهقي) ج٩، ص٩١.

بەڵام پێویستە بزانرێ کەهەرکام لەمانە بەمەرجێك ناکوژرێن، کەبەشداریی جەنگ نەکەن، بەڵام ئەگەر بەشداریی جەنگ بکەن، ئەوە بێگومان دەکوژرێن.

دیارە پێشتریش باسمان کرد، کەڕای جەماوەرو زۆربەی هەرەزۆری پێشەوایان و زانایان ئەوەیە وەك (إبن تيمية) لەکتێبی: (السياسة الشرعية)دا[1] هێناویەتی، کە کوشتنی ئەهلی کوفر لەشەڕدا، لەبەر کوفرەکەیان نیە، بەڵکو لەبەر دژایەتییانە بۆ ئەهلی ئیسلام، هەربۆیەش هەرکاتێك سەرانەیاندا، دەست لەکوشتینان هەڵدەگیرێ، دیارە ئەمە هەڵوێستی شەریعەتە دەربارەی کوشتنی خەڵکی بێ دیفاع لەکاتی جەنگدا، بەڵام ئەگەر لەکاتی جەنگدا نەبێت، ئەوە چاکترو لەپێشتر دروست نیە، چونکە ئەگەر لەکاتی جەنگدا کوژرانی غەیری بەشداربوان دروست نەبێ، دیارە دروست نەبوونی کوژرانیان لەغەیری کاتی جەنگدا، شتێکی ڕوون و بێ چەندو چوونە.

بەڵام لەوبارەوە کە ئایا لەکاتێکدا دوژمنێکی وەك جوولەکە هەڵدەستێ بەقەلاچۆکردن و کوشتنی مسوڵمانانی وەك گەلی فەلەستین، بێ ئەوەی جیاوازیی بخاتە نێوان جەنگاوەرو مەدەنییەکانەوە، ئایا دروستە مسوڵمانانیش وەك بەرپەرچدانەوە، بەهەمان شێوەو، بەهەر شێوازێك، کە بۆیان بگونجێ، خەڵکی ئەوان بکوژن؟! لەوبارەوە زانایانی ئیسلام ڕاجیایی (إختلاف)یان هەیە، بەڵام واپێ دەچێ ڕای ئەوانە ڕاستتر بێت، کە دەڵێن: بەڵێ دروستە، چونکە خوای دادگەر فەرموویەتی:

﴿ فَمَنِ ٱعۡتَدَىٰ عَلَيۡكُمۡ فَٱعۡتَدُواْ عَلَيۡهِ بِمِثۡلِ مَا ٱعۡتَدَىٰ عَلَيۡكُمۡ ﴾ البقرة: ١٩٤.

واتە: جاهەرکەسێك دەستدرێژیی کردنەسەر، وەك خۆی دەستدرێژیی بکەنەوە سەر، هەروەها فەرموویەتی:

﴿ وَجَزَٰٓؤُاْ سَيِّئَةٖ سَيِّئَةٞ مِّثۡلُهَاۖ ﴾ الشورى: ٤٠.

واتە: وە تۆڵەو سزای خراپەیەك، خراپەیەکی وەك خۆیەتی.

---

(١) ص ١٣٢،١٣٣.

بەڵام پێویستە بزانرێ، كە هەر كارو كردەوەیەك زیانی لەقازانجی زیاتر بێت، ئەگەر لە خودی خۆیشیدا ڕەوا (مباح) بێت، لەبەر زیانی زۆری، هەر حەڕام دەبێت.

لە كۆتاییش دا دەڵێم:

تیرۆر وەك وشەو زاراوەیەكی فیكریی و سیاسیی، هەڵقوڵاوی كۆمەڵگایەكانی ڕۆژئاوایە، بەتایبەتی فەڕەنسا، وە تیرۆر كردنیش وەك جەوهەرو نێوەڕۆك، دیاردەیەكی جیهانیە، واتە: جەوهەری تیرۆركردن و ئیرهاب دیاردەیەكی جیهانیەو، هیچ پەیوەندییەكی بەئیسلام و مسوڵمانانەوە نیە، وەئەگەر مسوڵمانێك ڕۆژێك لە ڕۆژان ئیرهاب و تیرۆری كردبێ بەپیشە، ئەوە پێچەوانەی شەریعەتی خواو، پێچەوانەی ئایین و بەرنامەكەی خۆی جووڵاوەتەوە، بەڵام ترساندنی دوژمن لەحاڵەتی جەنگ و ڕووبەڕوو بوونەوەدا، هچ پەیوەندیی بەتیرۆرو ئیرهابەوە نیە، بەپێی پێناسەو چەمك و واتای ڕاستەقینەی وشەی ناوبراو، وەبێگومان بەرگریی لەخۆكردن و تەسلیم نەبوون بەدوژمنیش، شتێكی پیرۆزەو هەموو میللەتان و، هەموو خاوەن عەقڵێكیش ئەوە بەڕەوا دەزانێ، كە لە كاتی ڕووبەڕووبونەوەدا سامێكی هەبێت و عیززەت و هەیبەت و قووەتێكی هەبێت و، وابێ كە دوژمن لێی بسڵەمێتەوەو، نەتوانێ دەستدرێژیی بكاتە سەری و زوڵمی لێ بكات.

# ئەم ئاڵقەیە

**خوێنەرە خۆشەویستەکانم!**

ئەم ئاڵقەی چوارەمەش لەم زنجیرەیەدا، وەك هاوەڵەکانی دیکەی لەبنەڕەت دا، وتارێکی بەندەبووە و لەکۆڕێك دا دراوە، کە لەڕۆژی: ١٨ رمضان ١٤٢٣ك بەرانبەر: ٢٠٠٢/١١/٢٣زدا لەهۆڵی (ڕۆشنبیریی) لەشاری سلێمانی دا بەستراوە.

هیواشم وایە ئەم وتارە - بەهەرسێك حاڵەتی خوێندراو و بینراو و بیستراوەوە - مایەی بەرچاوڕوونیی و لابردنی تەم ومژبێ، لەبارەی مەسەلەی جیهانگیریی (عولمة)یەوە و، (کا) و (دان) و هەق و ناهەقی لەیەك جیابکاتەوە، تاکو لەهەڵە وپەڵەی کورتهێنان و تێپەڕاندن (تفریط و إفراط) دووربین و، هەمیشە هاوسەنگ (متَّزن)بین و، هەردەم هەرخەتی ڕاستی نێوەڕاست بگرین.

# ڕێ خۆشکردن

بــەڕێــزان!

هەموولایەکتان بەخێربێن و خۆشحاڵم بەدیدارتان، سەرەتا لەخوای پەروەردگار دەپاڕێمەوە: تاعەتی مانگی ڕەمەزان لەهەموو لایەکمان قبووڵ بفەرموێ، وەیارمەتیمان بدات کەلەم مانگی لەخوا نزیك بوونەوەو بەخۆدا چوونەوەیەدا، ئەنجامێکی زۆر باش لەبواری لەخوا نزیك بوونەوەو بەخۆدا چوونەوەدا، بۆ دنیاو دوارِۆژمان وەدەست بهێنین، چونکە بێگومان شەریعەتی خوای پەروەردگار هەموو ئەو ئەرکانەی خستوونیە سەرشانی ئینسان، پێش قیامەت بۆ دنیای لێیان بەهەرمەند دەبێ، ئەگەرنا خوای بێنیاز پێویستیی بەخۆ ئەزیەت دان و خۆ ماندووکردن و برسی و تینوو کردنی هیچ کەس نیە، بەڵام ئەوە ئینسانەکانن کەپێویستییان بەوە هەیە، کەبەوشێوەیەی خوای کاربەجێ بۆی دیاری کردوون، بژیین، وە ئەو ئەرکانەی کە لەشەریعەتدا خوای زانا وتوانا بۆی ڕوون کردوونەوە، جێ بەجێیان بکەن، بۆ ئەوەی لەدنیاو دوارِۆژدا پێی بەختەوەر ببن.

ناوونیشانی کۆڕەکەشمان ئاوایە: (جیهانگیریی ڕۆژئاواو جیهانێتیی ئیسلام).

هەڵبەتە دوای ئەوەی لەدوو توێی ئەو چوار بەشە سەرەکییەدا کەباسەکەیان تێدا پێشکەش دەکەین، لەهەرکام لە (جیهانگیریی) و (جیهانێتیی) حاڵی دەبین، ڕوون دەبێتەوە، کە بۆچی ئەوەی ڕۆژئاوا جیهانگیرییە؟

دیارە لەزمانی کوردیی هاوچەرخدا بەزۆریی وشەی: گڵۆبالیزەیشن، بە[جیهانگیریی] تەرجەمە کراوە، ئەگەرنا دەگونجێ بڵێی، گڵۆبالیزەیشن،

یانی: یەکخستنی جیهان، یان یەك شێوەکردنی جیهان، وەدەریش دەکەوێ بۆچی بۆ ئیسلام، گوتوومانە: (جیهانێتیی) کە دیارە لەزمانی عەرەبی دا (گلۆبالیزەیشن)، دەبێتە (العولمة)، وە (العالمية) بەکوردیی (جیهانێتیی)یە، وە ئاشکرایە کەمەسەلەی (گلۆبالیزەیشن - Gloablization)، لەم ڕۆژگارەماندا پانتاییەکی زۆر لەباس و خواسی سیاسی و فەرهەنگیی و فیکریی داگیر دەکات، نەك هەر لەسەر ئاستی ئەو وڵاتانەی کەبەکردەوە پێی هەڵدەستن، بەڵکو لەو شوێنانەی وەك ئێرەش دا (وەك کوردستانی ئێمە) کەهەتا ئێستا هیچ پشکێکمان تێیدا نیە، وە لەداهاتوودا دەردەکەوێ داخۆ: خێری بۆ ئێمە چی دەبێ، وەشەڕو زیانی چی دەبێ؟ هەرچەندە تارادەیەك شەڕو زیانەکانی دەرکەوتوون.

وە خوا پشتیوان بێ من لەچوار بەشی سەرەکییدا، ئەم باسە پێشکەش دەکەم:

**بەشی یەکەم:** پێناسەو سەرگوزشتەو بەرهەم و شوێنەوارەکانی، جیهانگیریی.

**بەشی دووەم:** پێناسەی جیهانێتیی ئیسلام و جیاوازیی لەگەڵ جیهانگیریی ڕۆژئاوایی دا.

**بەشی سێیەم:** بەراوردێك لەنێوان جیهانگیریی ڕۆژئاوا و جیهانێتیی ئیسلام دا.

**بەشی چوارەم:** هەڵوێست وەرگرتنی ڕاست و دروست، لەبەرانبەر جیهانگیریی دا.

# بەشی یەکەم

## پێناسەو سەرگوزشتەو ئامانج و بەرهەم و شوێنەوارەکانی جیهانگیریی (عەولەمە)

مەسەلەی جیهانگیریی شتێك نیە، كە ئێمە بتوانین لەكۆڕێكی ئاوادا ئەوەی كەپێویستە لەبارەیەوە بگوترێ، بیلێین، بەڵام وەك عەرەب گوتوویانە: (ما لا یدركُ كُلُّه لا یترَكُ جُلهُ) ئێمەش هەوڵ دەدەین زۆر بەگوشراویی ئەم مەسەلەیە باس بكەین، زیاتریش ئەوەی كە لەم كات و ساتەدا بۆ خەڵك و میللەتی خۆمان بەپێویستی دەزانین كە لەو بارەوە بیزانین، جەخت لەسەر ئەوە دەكەین، ئنجا وەك عادەتی خۆیشم: لە بەر ڕۆشنایی واقیعی (گلۆبالیزەیشن) و لەبەر تیشكی قورئان و سوننەتدا، لەچوار تەوەردا قسەو سەرنجەكانی خۆم دەخەمەڕوو:

### ١- پێناسەی جیهانگیریی:

وشەی جیهانگیریی تەرجەمەی وشەی (گلۆبالیزمیشن) (Globalization)ی ئینگلزییەو، عەرەبیش بە (عولمة) تەرجەمەیان كردوە، (عەولەمەش) واتە: جیهان كردنەوەیەك، وەك چۆن وشەی(قالب)، ئەگەر بگوترێ (قولبة)یانی لە قاڵب دان، (عالم)یش كەكردت بە (عولمة) واتە: دنیا كۆكردنەوە سەریەك و، دنیا یەك شێوە لێكردن. ئەم وشەیەش بۆ یەكەم جار لە ویلایەتە یەككگرتووەكانی ئەمەریكا، سەری هەڵداوە و بەكار هێندراوە، بۆیە هەندێك لە نووسەرو سیاسەتمەداران لە جیاتی (عەولەمە) دەڵێن: (ئەمرەكە) نەك بەجیهانیی كردن، بەڵكو بەئەمەریكایی كردن، واتە: بەئەمەریكایی كردنی هەموو شتێك، ئنجا ئەم پێناسە زمانەوانییە دەتوانین بڵێین: هەموو لێكۆڵەرەوان لەسەری یەك دەنگن، پاشان زۆربەی توێژەرەوان لەسەر ئەوەش یەك دەنگن، كە بڕبڕەی پشتی جیانگیریی و بناغەكەی بریتییە لەئابووریی (إقتصاد)، بەڵام هەرچەندە ئەوەی جیهانگیریی تێدا دەردەكەوێ، زیاتر ئابوورییە، بەڵام لەویشداكورت نەبۆتەوە، بەڵكو جیانگیریی فەلسەفەو دینێكی سەردەمەو، ڕێبازێكە دەیەوێ دەست بخاتە هەموو شتێكەوەو، دەست بخاتە بەرنامە ئاسمانییەكانیشەوە، چ ئەوەی كەوەك خۆی ماوەتەوەو دەستكاریی نەكراوە، كە ئیسلامەو، چ ئەوانەش كەدەستكاریی كراون، وە دەیەوێ دەست بخاتە كلتوورو عادەت و نەریتی میللەتانەوە و، تەنانەت دەست بخاتە شێوەی نان خواردن و بەرگ و پۆشاكیشیانەوە! كەواتە جیهانگیریی

لەئەسڵدا زیاتر دیاردەیەکی ئابوورییە، بەڵام دوایی چڵ و پۆپی هاویشتوە بۆ هەموو لایەنەکانی دیکەی ژیان،بەسیاسەت و کۆمەڵایەتیی و ئەخلاق و فیکرو فەرهەنگ و عادەت و نەریتیشەوە.

هەروەها شارەزایان لەسەر ئەوەش یەك دەنگن، کەهەرچەندە ڕۆژئاوا (کە دەڵێین: ڕۆژئاوا واتە: ئەورووپاو ئەمەریکاش کەلەڕاستییدا ئەمەریکاش هەر درێژبوونەوەی ئەورووپایە)، مەڵبەند و کانگای یەکەمی جیهانگیریی (گلۆبالیزەیشن)ە و، بەپلەی یەکەم جیهانگیریی لەڕۆژئاوادا بەرجەستە بووە، بەڵام لە ڕۆژئاواشدا زیاتر لە ئەمەریکادا بەرجەستە بووە، کە جڵەو بەدەستی بەجیهانیی کردنە، دیسان لێکۆڵەرەوان لەسەر ئەوەش یەك دەنگن، کە ڕەگ و ڕیشەی ئەو دیاردەیەی، کە پێیی دەگوترێ: بەجیهانیی کردن کە هەر هەمان شتە، کە بە: (سیستەمی نوێی جیهانی (النظام العالم الجدید)یش ناودەبرێ، ڕەگ و ڕیشەکەی بەقووڵایی مێژووی ئەمەریکاو ڕۆژئاوادا چۆتە خوارێ و شتێك نیە، کە تازە پەیدا بوو بێت و سەری هەڵدابێت، بەڵام وەك واقیعێك، پاش هەرەس هێنانی یەکیەتی سۆڤـیەت لە ساڵی (١٩٩٢)ەوە، بەزەقیی ئەو دیاردەیەی جیهانگیرییە (گلۆبالیزەیشن) هاتۆتە مەیدان، وە لەڕاستیدا لەوکاتەشەوە، کە ئەو مەسەلەیە هاتۆتە کایەوە، دەتوانین بڵێین: بۆتە تاکە بابەتێك، کە هەموو خەڵکی بەخۆیەوە مەشغووڵ کردوە، چ ئەوانەی لەگەڵی دان و پشت گیریی دەکەن و، چ ئەوانەش کە دژو نەیارینی، هەموویانی بەخۆیەوە مەشغووڵ کردوە.

هەروەها لێکۆڵەرەوان لەسەر ئەوەش یەك دەنگن، کە ئەوە یەکەم جارنیە وڵاتێکی وەك ئەمەریکا، یاخود شارستانیەتێکی وەك شارستانێتی ڕۆژئاوا، بیەوێ دنیا بۆ خۆی (کۆنتڕۆڵ) بکات و بیەوێ باڵ بەسەر دنیادا بکێشێ، بەڵکو لەقووڵایی مێژوودا، ئەو هەوڵانە هەر بوون:

١- (ئیغریقییەکان) کاتی خۆی هەوڵیان داوە، کە هەموو دنیا بخەنە ژێر دەستەڵاتی خۆیانەوە، بەتایبەتی لەسەردەمی (ئەسکەندەری مەقدۆنیی)دا.

٢- هەروەها ڕۆمانییەکانیش بۆ ئەو مەبەستە هەوڵیان داوە.

٣ و٤- هەر کام لە فارسەکان و، تەتەرو مەغۆلەکانیش هەوڵیان داوە، وە کاتی خۆی کە (جەنگیزخان) هات، زۆربەی دنیای خستە ژێر دەستەڵاتی خۆی.

٥ و ٦- هەروەها هیتلەریش و، بیری کۆمۆنیزمیش بەهەمان شێوە.

بەڵام ئەو شێوە جیهانگیریی و دنیا خستنە ژێر کۆنترۆڵ و دەسەڵاتی خۆیە، لەگەڵ ئەوەی ئیسلام دا، کە دوایی باسی دەکەین، دوو مەسەلەی لێك جیان، چونکە هەموو ئەو هەوڵ و تەقەللایانەی دیکە لەسۆنگەی ئەوەوە، کە لەسەر بناغەیەکی خوایی نەبوون، بەڵکو لەسەر بناغەی هەست و نەست و ئارەزوو ویستێکی ئینسانانەو، بگرە دڕندانە، بوون، ئامانجیان خۆسەپاندن و، کۆنترۆڵ کردن و دەست بەسەرداگرتنی دنیا بوون، بەڵام ئەوەی کە ئیسلام دەیەوێت و، لەسیستەمی ئیسلامییدا هەیە، شتێکی دیکەیە وەك دوایی باسی دەکەین.

بەڵام دیارە ئەو دەرفەتەی، کە ئەمڕۆ لەبەردەم جیهانگیریدا ڕەخساوە، وە ئەو زەمینەیەی کەبۆی ساز بووە، بەدرێژایی مێژوو ساز نەبووە، کە بگونجێ دنیا بەوجۆرە بخرێتەوە سەر یەك و، بکرێتە یەك و، یەك شێوەی لێبکرێت، دیارە ئەوەش بەهۆی ئەو تەکنۆلۆژیا بەرەو پێش چووەوەیە، کە بەدەست ڕۆژئاواوە هەیە، چ لەبواری ڕاگەیاندن دا، چ تەکنۆلۆژیای جەنگیی و ئاشتیی، بەڵێ، لەم ڕۆژگارەدا تەکنۆلۆژیایەکی زۆر گەورە بەدەست شارستانیەتیی ڕۆژئاواوە هەیە، کە بەئاسانیی دەتوانێ دوورییەکانی پێ نزیك بکاتەوە، وە دەست بەسەر دنیادا بگرێ، بەخۆشیی، یان بەترشیی!

## ٢- ئامانج و مەبەستی جیهانگیریی:

ئایا ئامانجی جیهانگیریی چییە؟! وە ئایا جیهانگیریی دەیەوێت چی بکات؟ نێوەڕۆکی مانا و مەبەستی وشەی جیهانگیریی لەناوەکەی دا دیارە، (جیهانگیریی) یانی: دەست بەسەرداگرتنی جیهان و گرتنەوەی جیهان و، جیهان خستنە ژێر کۆنترۆڵی خۆ[١]، بەڵام بۆ ئەوەی کە لە دەمی ئەهلی جیهانگیرییەوە، قسەکان وەربگرین، بەپێویستی دەزانم، گوێ لەدووکەس لەسیاسەت مەدارو بیریارو نووسەری ئەمەریکایی ڕابگرین:

١- یەکەمیان بریتییە لە (فرەنسیس فۆکۆیاما) کە بە ئەصڵ (یابانیی)یە، بەڵام دوایی بۆتە ئەمەریکیی، وە ئێستا وەك ئینسانێکی ئەمەریکیی خۆی دەناسێنێ، ئەو کابرایە کتێبێکی داناوەو بەعەرەبی تەرجەمە کراوە، بەناوونیشانی: (نهاية التأريخ وخاتم البشر) واتە: (کۆتایی مێژووو مرۆڤی کۆتایی)یان (نهاية التأريخ والإنسان الأخير) لەساڵی (١٩٩٣)ز دا ئەو کتێبە چاپ کراوە، جا دیارە (فۆکۆیاما) لە ژێر کاریگەریی خەڵکی پێش خۆیەوە، هەندێك قسەی کردوون، بەڵام لەهەر کەسە، شتێکی وەرگرتوەو فەلسەفەیەکی نوێی لێ بنیات ناوە، کەدەیەوێ (تنظير) بکات بۆ ئەم دیاردەی سیستەمی نوێی جیهانیی، یان ئەو دیاردەی (گلۆبالیزەیشن) وە دەیەوێ ئیسپاتی بکات، کە ئەو سیستەم و دیاردەیە، شتێکی حەق و ڕەوایەو، لەئەنجامی گەشەسەندن و بەرەو پێش چوونی بەشەریەتەوە پەیدابووە، وە پێویستە هەموو لایەك باوەشی بۆ بگرنەوەو تەسلیمی بن، چونکە حاڵ لەوە پێشکەوتووترو سیستەم لەوە چاکتر نەبووەو ناشبێ!! دیارە پوختەی قسەکانی (فۆکۆیاما) ئەوەیە کەمن عەرزم کردن، وەشایانی باسە: (فۆکۆیاما) زیاتر لە ژێر کاریگەریی فەلسەفەی (هێگڵ) دایە و، بۆ خۆشی لەکتێبەکەیدا ئاماژەی پێدەکات، هەروەها کەم و زۆر سوودیشی لەهەرکام لە

---

(١) کەواتە: (جیهانگیریی) بریتیە لەهەوڵدان بۆ کۆنترۆڵ کردن و داگیر کردنی جیهان بەهەموو ڕەهەندە جیا جیاکانی، کۆنترۆڵ کردن و داگیر کردنەوە.

(مارکس)و (داریۆن) و (نیتشە)یش وەرگرتوەو، لەبیرو بۆچوونەکانیان، چەند شتێکی وەرگرتوە، کە لەگەڵ بۆ چوون و ئارەزووی ئەودا دەگونجێ و، سەرەنجام لەهەموو ئەوانە، ئەو بیردۆزەیەی خۆی پێکهێناوە.

وە ئەوەی جێی سەرنج و تێرامانە، ئەوەیە کە هەرکام لە (هیگڵ و مارکس و نیتشە) ئەڵمانیی بوون و، ئەڵمانییەکانیش دەستپێشخەری هەردووك شەڕی جیهانیی یەکەم و دووەم بوون، بەتایبەتی جەنگی جیهانیی دووەم، کەهیتلەر بەبۆچوونە توندڕەوو شۆڤێنیەکانی دەیگوت: دەبێ هەموو گەلانی دنیا لەخزمەتی (نازیسم) دابن، ئەمەش دەستە چیلەی هەڵگیرسانی شەڕەکە بوو.

وە (فرەنسیس فۆکایاما) مەسەلەی کاریگەریی (ڕۆح و ئایدیا) لەسەر ماددەی، لە (هیگڵ) و، دژایەتیی و پێکەوە ناکۆکیی شتەکان و، گەشەکردن و بەرەو پێش چوون لەئەنجامی ئەو ناکۆکییەدای، لە (مارکس) و، هەندێك بیرو بۆچوونی ستەمکارانەو دیکتاتۆرییانەشی لە نیتشە وەرگرتوون، بۆ وێنە: (نیتشە)ی ئەڵمانیی بڕوای وا بووە، کە یەکسانیی لەنێوان دەسەڵاتدارو بێ دەستەڵاتاندا، لە بەرانبەر یاساو دادگادا، زوڵم و ستەمێکی بێ جێ و بێ مانایەو، هۆکاری بەرەو پێش نەچوونی ژیان و، مردنی تواناو ئامادەییە ناوازەکان (الإستعدادات الخارقة)یە، هەروەهاپێی وابووە، کە نابێ و زوڵم و ستەمەکە، دەوڵەمەندەکان لەگەڵ هەژارەکان دا یەکسان بن، وە دەڵێ: دادگەریی ئەوەیە، کە ئەوەی دەسەڵاتدارە، بەکەیفی خۆی دەستەڵات بەکاربهێنێ، وە ئەوەی کە دەوڵەمەندە بەکەیفی خۆی و بەبێ هیچ مەرج و بەندێك، بەهرە وەربگرێ لەپارەو سامانی خۆی، فەقیرەکەش دەمرێ، با بمرێ، کەیفی خۆیەتی!! ئەوە نیوەڕۆکی فەلسەفەی (نیتشە)یە!

وە فۆکایاما لە (داریۆن)یش مەسەلەی (مانەوەی بۆ بەهێزتر)، یان (مانەوە بۆ چاکتر) (البقاء للأقوى) أو (البقاء للأصلح) کە ئەوە یەکێکە لە گرنگترین بنەمایەکانی بیردۆزەی (داریۆنیزم) و (فۆکۆیاما) لەویش ئەوەی وەرگرتوە!

وە سەرەنجام فۆکۆیاما هاتۆتە سەر ئەو قەناعەتەو، کتێبەکەی هەموو لەوەدا خولاسە دەبێتەوە - دیارە شتی دیکەشی تێداهەیە، بەڵام ئەوەی کە ئێمە مەبەستمانە-کە: شارستانییەتەکان هەموویان، کەئەنجامی بەرەو پێش چوونی ژیان و گەشەکردنی بەشەرن، هەموویان مردوون و لەبەین چوون، یاخود بەرەو مردن دەچن، هەموو شارستانییەتەکانی دنیا بەگشتی و، بەتایبەتی ڕۆژهەڵات، بەئیسلامیشەوە!! وەدەڵێ فیکرو سیاسەت و عەقڵی بەشەر خولاسە بۆتەوە، لەشارستانیەتی ڕۆژئاوادا، کە ئەویش لە (دیموکراسی و لیبرالیزم)دا خۆی دەبینێتەوە! وە (فۆکۆیاما) قەناعەتی وایە دەڵێ: دەبێ هەموو بەشەریەت بێتەسەر ئەو فیکرەو ڕێبازە، وەهەموویان لەدەوری (کاپیتالیزم) کۆببنەوە، چونکە هیچ فیکرەو ڕێبازێکی دیکە شایستەی ئەوە نیەو بەکەڵکی ئەوە نایەت، کە ژیانی لەسەر بگوزەرێنرێ، وە (فۆکۆیاما) قەناعەتی وایە کە ئینسانی ژێر سایەی جیهانگیریی، چاکترین ئینسانە، بۆیەش ناوی لێناوە (خاتم البشر) دوامین ئینسان، وەباشترین ئینسان، وەك چۆن دەگوترێ: (سۆپەرمان)، واتە: دەڵێ: باشترین ئینسان ئەو ئینسانەیە، کەلە ژێر سایەی جیهانگیریی دا پێدەگات، وە دەڵێ: لەو قۆناغەدا، مێژوو بەیەکجاریی ڕادەوەستێت، دیارە (مارکس)یش بڕوای بەڕاوەستانی مێژوو هەبووەو، (هیگڵ)یش بڕوای وابووە، کەمێژوو دەبێت نیهایەتێکی هەبێ، بەڵام (مارکس) پێی وابووە بەپەیدابوونی کۆمەڵگای (کۆمۆنیستی)، مێژووی بەشەریەت ڕادەوەستێ، کەچی (فۆکۆیاما) بەپێچەوانەوە دەڵێ: نەخێر بەپەیدابوونی کۆمەڵگای سەرمایەداریی و بەحاکم بوونی ئەو سیستەمەی، کە ئەمڕۆ لە شارستانیەتی ڕۆژئاوادایە، بەسیستەمی ئابووریی و سیاسییەوە، بەوە مێژوو ڕادەوەستێ و ئینسان دەگاتە دوایین قۆناغەکانی گەشەکردنی خۆی! بەڵام (فۆکۆیاما) کە دەیەوێت بەڵگە بێنێتەوە بۆ سەلماندنی ڕاستیی قسەکانی، بەبۆچوونی من، کە تەماشای کتێبەکەیم کردوە، بەڕاستیی قسەکەی ئیدیعایەکی زۆر گەورەیە، بەڵام بەڵگەکەی زۆر بێ هێزە، وەك چۆن کەسێك قسەیەکی زۆر گەورە دەکات، بەڵام دوایی کەدێتە سەر بەڵگە، بەڵگەکەی زۆر بچووکە!! بەهێزترین بەڵگەی (فۆکۆیاما) ئەوەیە، کە دەڵێ: مادام لەلایەکەوە یەکێتی سۆڤییەت و بلووکی ڕۆژهەڵات و شارستانیەتی (سۆسیالیزم) هەرەسی

هێناوە، وە لەلایەکی دیکەشەوە، ئێستا ڕەقیب و مونافیسێکی زۆر بەقووەت لەبەردەم شارستانیەتی ڕۆژئاوادا نیە، کەواتە ئەم واقیعە دوایین قۆناغەو ئەم شارستانیەتەش دوایین شارستانیەتەو، هیچ هێزێکی دیکەو هیچ شارستانێتی دیکە، پەیدا نابێت، کە جارێکی دیکە لە بەرانبەر سەرمایەداریی و لەبەرانبەر ئەو فەلسەفەو سیستمەدا، کە لە ڕۆژئاوادا حاکمە، خۆی بگرێ!

پێموایە ئەو قسانەش بێجگە لەحاڵەتێکی لەخۆبایی بوون و، خۆبەزلگریی و خەڵك بەکەم گرتن، بەولاوە، چی دیکە نیە، ئەو خۆ بەگەورەگرتن و خەڵك بەکەم سەیرکردنەش، کە لە کتێبەکەی (فۆکۆیاما)دا دەبینرێ، دیارە لە قسەو لێدوانی گەلێك لەبیرمەندو سیاسەتمەداری دیکەی ئەمەریکیی و ئەورووپایش دا بیستراون، ئنجا ئەو حاڵەت و ڕووحی خۆپەسەندییەش، دیسان ڕیشەیەکی قووڵی هەیە لەمێژووی ڕۆژئاوادا، هەر لەسەردەمی (ئیغریقیی) و یۆنانییەکانەوە، تائێستا! بۆنموونە: (یۆنانییەکان) بەغەیری خۆیانیان دەگوت: (بەربەریی) واتە: خێڵەکیی و دەشتەکیی و بێ ئاگا.

٢- دووەم کەس، کە باسی جیهان گیریی (گلۆبالیزەیشن)ی کردووەو ویستوویەتی بیردۆزە ڕێژەیی (تنظیر)ی بۆ بکات، بەڵام بەشێوەیەکی دیکە، بریتیە لە (صموئیل هانتیگتون) کە ئەویش دیسان کابرایەکی ئەمەریکییەو، لەساڵی (١٩٩٦)دا کتێبێکی چاپ کردوە کەبەعەرەبی تەرجەمە کراوە، بەناوو نیشانی: (صدام الحضارات) یان (صراع الحضارات) (خۆبەیەکدادانی شارستانییەتەکان) یان (ململانێی شارستانییەتەکان) شایانی باسیشە، کە (صموئیل هانتیگتون) کابرایەکی جوولەکەیەو مامۆستای زانیارییە سیاسییەکانە لە زانکۆی (هارفارد)، کە زانکۆیەکی بەناوبانگە، ئەمیش [واتە: (هانتیگتون)] هەردەیەوێت خەڵك بگەیەنێتە هەمان ئەنجام و قەناعەت، کە (فۆکۆیاما) دەیەوێت بیانگەیەنێتێ، کەبریتیە لەوەی دەبێ شارستانیەتی ڕۆژئاوا، کە ئێستا لە (عەولەمە)دا خۆی دەبینێتەوە، حاکم بێت بەسەر هەموو دنیادا! بەڵام (هانتیگتون) بەشێوەیەکی دیکەو بەمیکانیزمێکی دیکە دەیەوێت بگاتە ئەو ئەنجامەو دەڵێ: وانیە کەشارستانێتیی تەنیا شارستانێتیی ڕۆژئاوا بێت، بەڵکو شارستانێتی دیکەش هەن، پاشان چەند

شارستانییەتێك دەژمێرێ، كە ئێستا هەن، هەندێكیان بەهێز و پێزەوە و، هەندێكیان بە لاوازیی، بەڵام دوانیان تێدا دەست نیشان دەكات، كە (شارستانێتیی چین) و (شارستانێتیی ئیسلامیی)ین و دەڵێ: ئەم دوانە بەهێزن، بەتایبەتی ئەگەر یەك بگرن، ئەوە شەڕێكی زۆر گەورە لەگەڵ شارستانیەتیی ڕۆژئاوادا بەرپا دەكەن!

ئنجا (هانتیگتۆن) بەشێوەیەكی ناڕاستەخۆ، جیهانی ڕۆژئاواو سەرمایەدار هان دەدا، لە دژی شارستانیەتیی (ئیسلامیی و چینیی) كەبەر لەوەی ئەوانە گەشە بكەن و، وەك پێویست لەسەر پێی خۆیان بوەستن و یەك بگرن، پێویستە ئەمەریكا خەمێكی خۆی بخوات!

(هانتیگتۆن) زۆر تەركیز دەكاتە سەر ئەوەی ململانێی شارستانییەتەكان، هەر بوودو هەر دەشبێت و بەردەوام دەبێت، دیارە ئەویش دەڵێ: باشترین شتێك، كە بەشەریەت خەوی پێوە بینیوە، ئەوە ئێستا هاتۆتەدی، كە ئەو جیهانگیرییەو ئەو سیستەمەیە، كە ئەمڕۆ لە ڕۆژئاوادا بەرقەرارە! وە دەڵێ: بۆ ئەوەی بەهێزەوە بمێنێتەوە، پێویستە زۆر لەخۆی وریا بێت، بەتایبەتی لەو دوومونا فیسە: شارستانیەتیی ئیسلامیی و شارستانیەتیی چینیی، دیارە (هانتیگتۆن) هەندێك شتی دیكەشی هەیە كەجیاوازە لەهی (فۆكویاما)، بۆ وێنە: دان بەسێ حەقیقەتدا دەنێ:

یەكەم: كە جگە لەشارستانێتیی ڕۆژئاوا شارستانێتی دیكەش هەن.

دووەم: كەجیهانی ڕۆژهەڵات بەعالەمی ئیسلامییشەوە، هیچ كاتێك تەسلیمی جیهانی ڕۆژئاوا نابێ، چونكە پاشخانی، فكیریی و، فەلسەفە و تێڕوانینیان بۆ ژیان جیایە، لەهی ڕۆژئاوا، بۆیە تەسلیمی نابن، بەڵێ، ئیستیفادە دەكەن لە تازەگەرییەك كە لە ئەورووپا و لەڕۆژئاوادا هەیە،بەڵام دەڵێ: هەرگیز (تَغَرُّب) ناكەن، واتە: ژیانی ماددیی خۆیان بەرەو پێش دەبەن و، نوێ دەكەنەوەو بەهرە وەردەگرن لەتەكنۆلۆژیای ڕۆژئاوا، بەڵام ئامادە نین، كە تەسلیمی فەلسەفەو سیاسەتی ڕۆژئاوا ببن.

سێهەم: كەبێداریی و هۆشیاریی ئیسلامیی، نیشانەی بووژاندنەوەو زیندووبوونەوەی مسوڵمانانە، وە دەڵێ: ئەو هەڵسانەوەو هۆشیارییە ئیسلامییە، كە لەعالەمی

ئیسلامیی دا هەیە، ئەو حاڵەتە بریتیە لە بووژاندنەوەی ئیسلامیی.

کەواتە: ئەگەر لەقسەو لێدوانی ئەو دوانەوە تەماشای جیهانگیریی بکەین، - شایانی باسیشە کە بەڕای ئەوانەی پشتگیریی لە (گلۆبالیزەیشن) دەکەن، ئەو دوانە بە دوونوێنەری شارستانێتی ڕۆژئاواو، دوو بیریاری زەبر بەدەستی ئەو حاڵەت و دیاردەیە دەزانن - دەگەینە ئەو ئەنجامەی کەجیهانگیریی ڕۆژئاوا، دەیەوێ خەڵکی دنیا بەخۆشیی، یان بەترشیی، تەسلیمی بن، ئنجا هەرچی (فۆکۆیاما)یە دەڵی: سەرجەم ئەو خەڵکانە بۆ خۆیان دەتوێنەوەو، ئەوەیان لەباراندا نیە، کە لەسەر پێی خۆیان بوەستن، بەڵام (هانتیگتۆن) دەڵێ: نەخێر دەبێ بەزۆر ملیان پێ کەچ بکرێ و هەرکەسێك سەری بڵند کرد، دەبێ لەسەری بدرێ، بۆ ئەوەی ئەم شارستانێتییە بمێنێتەوە! واتە: هەردووکیان دەیانەوێت خەڵك بگەیەننە ئەو قەناعەتەو ئەو ئەنجامە، کە دەبێ حەتمەن شارستانێتیی ڕۆژئاوا بەسەر هەموو گەل و میللەتانی جیهاندا فەرمان ڕەواو کوێخاو باڵا دەست بێ.

پێویستە ئەوەش بگوترێ کەمەسەلەی جیهانگیریی پێشتریش (واتە: پێش ڕووخانی یەکێتی سۆڤیەتیش) لەزاری زۆر لەسیاسەتمەدارانی ئەمەریکاوە، بیستراوە، بۆ وێنە: (روزفلت) سەرۆکی ئەمەریکا، ئەوکاتە، پاش کۆتایی جەنگی جیهانیی دووەم لێیەوە نەقڵ کراوە، کە گوتوویەتی: ئێستا کاتی ئەوە هاتوە کە جیهان بەئەمەریکایی بکرێ، (الآن یجب أمركة العالم)، هەروەها (ئیزنهاور)یش لەساڵی (١٩٥٢)دا وەك (حسن قطامش)[١] لەهەردووکیانەوە نەقڵ دەکات، گوتوویەتی: قەدەر ئێمەی هێناوە (واتە میللەتی ئەمەریکای هێناوە) کەقیادەی دنیا بکەین! کەواتە: ئەو بیرۆکەی کوێخایی کردنە بەسەر دنیاداو، دنیا خستنە ژێر ڕکێفی خۆ، لەپاشخانی فیکریی خەڵکی ئەمریکیی، بەڵکو خەڵکی ڕۆژئاواش دا بەگشتی، ڕەگ و ڕیشەیەکی قووڵی هەیە.

---

(١) بڕوانە: (نهایة الجغرافیة، سیادة الدولة أم سیادة العولمة) حسن قطامش.

### ٣- پاساو و بیانووی جیهانگیریی:

ئەمەریکاو ڕۆژئاواش بەگشتی، چەند پاساوێکیان بەدەستەوە هەن، بۆ ڕەوایی پێدانی ئەو جیهانگیریی و سیاسەتەی خۆیان، کە جارێك پێی دەڵێن: جیهانگیریی و، جارێك پێی دەڵێن: سیستەمی نوێی جیهانیی، وەك:

یەکەم دەڵێن: ئێمە دەمانەوێت دیموکراسیی بسەپێنین![1].

دووەم: دەڵێن: ئێمە لەسەر مافەکانی مرۆڤ وەدەنگ دێین و بەرگرییان لێ دەکەین.

سێیەم: دەڵێن: ئێمە دژی تیرۆرو ئیرهابین و دژایەتیی دەکەین.

چوارەم: دەڵێن: نابێ هیچ گەلێك بچەوسێتەوەو، ئێمە بەرگریی لە مافی چارەنووسی گەلان دەکەین.

پێنجەم: دابینکردنی خۆشگوزەرانیی بۆ خەڵك و کۆمەڵگا.

بەڵێ، ئەوانە چەند پاساوێکی ڕەواڵەتیین و، چەند دروشمێکن کەجیهانی ڕۆژئاوا بەرزیان دەکاتەوە، بۆ ڕەوایەتیی پێدانی دیاردەی جیهانگیریی، وەك پۆششێك بۆ هێنانەدی ئەو ئامانج و مەرامانەی کەلوتکەی ئاواتیانن، بەڵام بەڕاستی ئەگەر لەدنیای واقیعدا لەو درووشمانە ورد بینەوە، دڵنیا دەبین کەئەمەریکا و ڕۆژئاوا لەگەڵیان ڕاست نین، دیارە ئێمە پێشتر چەند کۆڕێکمان تەرخان کردوون، بۆ توێژینەوەی هەرکام لەدیموکراسی و، مافی مرۆڤ و، تیرۆرو (کا) و (دان) یانمان لەیەك جیاکردۆتەوە، بەڵام لێرەدا مەبەستمان ئەوەیە، کەچاوپۆشیی لەوە بکە، کە تاچ ڕاددەیەك لەخۆیان دا، چ تێبینیەکەمان لەسەر هەر کام لەو دروشمانە هەیە، بەڵام وێڕای تێبینیمان لەسەر ماناو نێوەڕۆکی خودی ئەو دروشمانە، دیسان ئەو زاراوەو دروشمانەش، بەچەند

---

(١) دیارە سەپاندنی دیموکراسی لەخۆی دا شتێکی سەیرە! چونکە ئەگەر ڕاست بێ دیموکراسی (حوکمی گەل) بێت، دەبێ گەل و کۆمەڵگا خۆی بیخوازێ و، هەوڵی چەسپاندنی بدات، نەك لەدەرەوەی ئیرادەی خۆیەوە، بەسەری دا بسەپێنرێ!

شێوەیەك بەكاردێنن، كە وەك كوردەواریی خۆمان دەڵێن: (بانێك و دوو هەوا، بەڵكو بانێكەو چەند هەوا) بۆ وێنە: (خەڵكی شیشان) بەڕەگەز ڕووسیی نین و، دینیان لەگەڵ هی ڕووسەكان جیایە و گەلێكی سەربەخۆن، ئنجا دانیشیان بۆ پێدا هێنرا، كە دەوڵەتێكی سەربەخۆیان هەبێت، كەچی ئێستا ڕووسیا بەتۆبزیی دەیان هێنێتەوە ژێر ڕكێفی خۆی و قەتلعامیان دەكات، ئەمریكاش هەر نێوچاوانیش گرژ ناكات، بەڵام (تەیمووری ڕۆژهەڵات) لەگەڵ ئەندۆنووسیا یەك قەومن، بەڵێ، زۆربەی خەڵكی تەیمووری ڕۆژهەڵات (نەصرانیی)ن، ئەویش كاتی خۆی هەر مسوڵمان بوون، بەڵام كرانە (نەصرانیی)، كە چی لەم حاڵەتەیاندا، بەپێچەوانەوە: ئەمەریكا دەست تێوەردان (تدخل) دەكات و دەڵێ: دەبێ تەیمووری ڕۆژهەڵات سەربەخۆیی (إستقلالیة) ی بدرێتێ!؟! چونكە ئەندۆنووسیا وڵاتێكی مسوڵمان نشینەو، گەورەترین وڵاتی ئیسلامییە كەنزیكەی (دووسەد ملیۆن٢٠٠,٠٠٠,٠٠٠) كەسە و لە (٩٠٪) ی زیاتر مسوڵمانە، بەڵام لەولاوە، چونكە بەپێچەوانەوە: ڕووسیا وڵاتێكی نامسوڵمانەو (شیشان)یش میللەتێكی مسوڵمانن، بۆیە ئەمەریكا چاو لە شیشان و ماف و چارەنووسیان دەپۆشێ و، لەسەر مافی چارەنووسی تەیموور وە دەنگ دێت!

ئنجا هەركام لە (مەسەلەی مافەكانی مرۆڤ) و (مەسەلەی دژایەتیی كردنی تیرۆر)یش بەهەمان شێوە: تەماشا دەكەین جوولەكە چی دەكات بەمسوڵمانانی فەلەستین، هەروەها هیندییەكیان چی بەكشمیرییەكان دەكەن، وە لەنێو خودی هیندستان دا، چی دەكرێ بەمسوڵمانەكان و چۆن تێكڕای مافەكانیان پێشێل دەكرێن، كەچی ئەمەریكا مەگەر بۆ چاوبەستەكێی خەڵك، ئەگەرنا نارەزایی دەرنابڕێ و دەنگی نارەزایی لێ بەرز نابێتەوە، بەڵام لەشوێنێكی دیكە، ئەگەر یەكێك لە كورەكەی خۆی توورە بێت، یان كەسێك لە دراوسێی خۆی توورەبێ، ئەمەریكا مادام بەرژەوەندیی لەوەدا هەبێت كەوەدەنگ بێ، وەدەنگ دێ!

## ٤- بەرهەم و شوێنەوارەکانی جیهانگیریی:

ئەوەی کە گرنگە لێرەدا بیخەینە ڕوو، بەرلەوەی بێینە سەر خستنەڕووی پەرێزی جیهانگیریی، ئەوەیە کە بزانین پێش پەیدابوونی ئەو دیاردەیەی کە پێی دەگوترێ: (سیستەمی نوێی جیهانیی)، یان پێی دەگوترێ: (جیهانگیریی) ئەو بەرەو پێش چوونە گەورەیەی تەکنۆلۆژیایە کەلە ئەورووپاو ڕۆژئاواداو لە دنیاشداهەیە بەگشتی، دیارە لە مێژووی کۆندا سەرچاوەکەی شارستانێتیی ئیسلام و، لە مێژووی تازەشدا ئەورووپا بوو، یانی: ئەوە کاتی خۆیشی هەر هەبوو، بەڵام ئێستاو لەسایەی جیهانگیریدا، تەکنۆلۆژیا زیاتر بەرەو پێش دەچێ و گەشە دەکات، بۆچی؟! چونکە وڵاتە زلهێزەکان پارەو ئیمکانیەتی زیاتریان دەکەوێتە دەست و، خەڵکی زیاتریش تەرخان دەکەن، پسپۆڕیی زیاتر پەیدا دەکەن و ئەمانەش دەوری کاریگەریان هەیە لە پەرەپێدانی تەکنۆلۆژیادا، ئەگەرنا پێشتریش تەکنۆلۆژیا هەر بووە.

**ئنجا پەرێزو بەرهەم و شوێنەواری جیهانگیریی، بەم دووشێوەیە تەماشا دەکرێت:**

**١- لایەنێکی چاك و ئیجابییە:** کە لە خزمەتی بەشەریەتدایەو لەخزمەتی بەرژەوەندییەکانی خەڵك دایە، لەزۆربەی بوارو لایەنەکانی ژیان و گوزەراندا،کە بێگومان ئا ئەوە خێرو بەرەکەتەو نیعمەتی خوایە و لەدەستی هەر کەسێك دابێ، دەبێ سوپاسی بکەین.

**٢- لایەنێکی خراپ و شوومە:** جیهانگیریی بەرهەمی زۆر خراپ و شوێنەواری زۆر شوومی لە ژیانی بەشەریەتدا هەن، هەرچەندە جارێ جیهانگیرییش تەواو دنیای نەخستۆتە ژێر دەستەڵاتی خۆیەوەو، ئەمەریکا جارێ هەر خەریکە کە جیهانگیریی و جیهان داگیرییەکەی خۆی بەسەرتەواوی دنیادا بسەپێنێ و، خۆتان ئاگادارن، کە جارێ جیهانگیریی بەتەواوی مانا نەبۆتە (جیهانگیریی) بەڵام لەگەڵ ئەوەش دا، ئەو قۆناغانەی کە بڕیونی، بێگومان پەرێزو شوێنەواری زۆر خراپیان لێدەرکەوتوون، بۆ وێنە:

**یەك: لەڕووی سیاسییەوە:**

شتێکی ڕوونە کەهەر گەلێك حەز دەکات لە وڵاتەکەی خۆی دا سەربەخۆ بێت و هیچ کەس زوڵمی لێنەکات، چونکە هەستی نیشتمان پەروەریی، هەستێکی خوارِسکەو، خوا (تبارك وتعالى) هەتا لەژیاندارانیش دا دایناوە و، تەنانەت پەلەوەریش بەرگریی لەشوێن و هێلانەکەی خۆی دەکا، بەڵام ئێستا لەسایەی جیهانگیریی دا، دەویستریٚ سەربەخۆیی وڵاتان نەمێنیٚ، ئنجا لەڕووی سیاسییەوە تەماشا دەکەین، ئەمەریکاو ئەوانەی لەگەڵ ئەمەریکادان، چاویان بەرینایی نادات کەوڵاتێك هەبیٚ بڵێ: جەنابی ئەمریکا! نابیٚ دەست بخەیتە کاروبارمەوە!! وە هەر وڵات و دەوڵەتێك لەبەرانبەر کوێخایەتیی و ملهوڕیی ئەمەریکادا ملەجیرِە بکات، بەهەر برِو بیانوویەك بێت، ئابڵووقەی ئابووریی دەخاتە سەرو شەڕی پیٚ دەفرۆشێت و، بەهەر شێوەیەك بۆی بلویٚ، فشاری دەخاتەسەر، هەر لەبەرئەوەی لە وەڵامیدا دەڵێت: نەء، وەبێگومان ئەو حاڵەتە سیاسییەی کە ئێمە باسی دەکەین، بەزەقترین شێوە لەو لێدوانەی (جورج W بوش)دا بەرجەستە بوو کەگوتی: (هەرکەسێك لەگەڵ ئێمە نەبێت، دژی ئێمەیە)! ئنجا هەرچەندە بۆش ئەو قسەیەی لەباسی دژایەتیی کردنی تیرۆردا کرد، بەڵام بەڕاستیی هەرچۆن بیٚ، ئەو قسەیە پرەنسیپ (مبدأ)ێکی گشتییە، وە ئەو جۆرە سیاسەتەش بەتەئکید فیرعەونایەتییەکی ڕووتەو، دیکتاتۆرییەتێکی تەواوەو، هەرکەسێك خۆی بەئازادو جوامێر بزانیٚ، بەهیچ شێوەیەك ناچێتە ژێر باری ئەو مەقوولەیەوەو، بەهیچ ڕەنگێك تەسلیمی ئەو بیرو بۆچوون و سیاسەتە چەوتە نابیٚ، چونکە بەر لەهەموو شتێك دەبیٚ بپرسین و بڵێین: جەنابی ئەمەریکاو ڕۆژئاوا! بیٚ زەحمەت تیرۆرمان بۆ پێناسە بکە، داخۆ تیرۆر چییە!؟ چونکە تیرۆر ئەگەر بریتی بێت لەوەی لایەنێك بە زۆر سیاسەت و فیکری خۆی بەسەر بەرانبەرەکەی دا بچەسپێنیٚ و، دەوڵەتێك بەزۆر خۆی بەسەر خەڵکێکدا بسەپێنیٚ و بیترسێنیٚ و بیتۆقێنیٚ، ئەوە شتێکە هەموومان ڕەفزی دەکەین، بەڵام ئەگەر هات و هەرکەسێك دژی سیاسەتی ئەمەریکاو ڕۆژئاوا بوو، یان دژی جوولەکە بوو، یان هەرکەسێك لەبەرانبەر (گلۆبالیزەیشن) و

جیهانی سەرمایەداریی دا گوتی: نەء، یەکسەر تۆمەتی تیرۆر و ئیرهابی بدرێتە پاڵ، ئەوە شتێکی سەیرو ناڕاستەو، شتێکی بێ مانایەو ناهەقییەکی زۆر قورسەو، ئەوە بەخەڵك ناسەلمێنرێ!

ئنجا دەڵێین:

بێگومان ئەو لێدوانەی (جۆرج بۆش) کەبەڕاشکاویی گوتی: هەر کەسێك لەگەڵ ئێمە نەبێت، دژی ئێمەیە، بەپێی ئەو قسەیە مانای وایە ڕەنگەکان تەنها دوو ڕەنگن: یان ڕەش، یان سپی، وە ئەوەش وەك دوایی باسی دەکەین، زۆر پێچەوانەی ئەو حیکمەت و ئامانجەیە، کە خوا (سبحانه وتعالى) بەشەری بۆ خوڵقاندوەو بۆی هاندەدات، وە شەریعەتی خوای پەروەردگار دانی هێناوە بەهەموو ڕەنگەکانداو، بەهەموو زمانەکانداو، بەهەموو شێوەکاندا، بەڵام (گلۆبالیزەیشن) دەیەوێ هەموو ئینسانەکان و سەرجەم گەلەکان، بەیەك ڕەنگ، ڕەنگ بکات، ئەویش تەنها ئەو ڕەنگە، کە بۆ خۆی دەیەوێت و، ڕەنگەکانی دیکە نابێ بمێنن، بگرە ئەمەریکا تەنانەت دان بەدوو ڕەنگەکەش دا ناهێنێ و، هەر هێندە، دان بەدوو ڕەنگەکەدا دێنێ، هەتا پاساوی شەڕی بەبیانووی جۆراجۆرەوە دەست دەکەوێ، بۆ ئەوەی کەشەڕ بەو ڕەنگەی دیکە بفرۆشێ!

ئنجا ئەگەر بەپێی ئەو سیاسەت و عەقڵیەتە بێ، دەبێ دنیا هەمووی بەیەك ڕەنگ، ڕەنگ بکرێ، کە دیارە ئەوەش پێچەوانەی سروشتی گەلانەو پێچەوانەی ئەو حیکمەتەشە، کە خوای پەروەردگار (جل جلاله) ئینسانی بۆ خوڵقاندوە، کەبریتیە لەوەی ئینسان لەسەر زەوی ئیمتیحان دەکرێ و، بەئیرادەو حیکمەتی خواش، بۆ چەند گەل و تیرەیەك دابەش کراوە، بۆیە بەڕاستیی ئەو هەڵوێستەی ئەمەریکای دەمراستی (جیهانگیریی) و (سیستەمی نوێی جیهانیی) هەر ئەو قسەیەی فیرعەون دێنێتەوە یاد، کە سێچوار هەزارساڵ پێش ئێستا، گوتوویەتی و قورئان بەتوانجەوە لەسەر زاری دەیگێڕێتەوە:

﴿ مَآ أُرِيكُمۡ إِلَّا مَآ أَرَىٰ وَمَآ أَهۡدِيكُمۡ إِلَّا سَبِيلَ ٱلرَّشَادِ ٢٩ ﴾ غافر:٢٩.

واتە: تەنیا ئەوەتان پێ دەڵێم، کەبۆ خۆم بەڕاستی دەزانم، وە ئەوەش کەمن

دەیڵێم، هەر ئەوە ڕاستە، ئنجا سەیر ئەوەیە کەعەلمانییەکان، ئیسلامییەکان بەوە تۆمەتبار دەکەن و دەڵێن: ئیسلامییەکان دەڵێن: هەق تەنیا لەلای ئێمەیەو، ئێمە قۆرخمان کردوەو لەسەر ئێمە تاپۆیەو، هیچ کەسێکی دیکە هیچ حەقێکی پێ نیە! بەڵام نەخێر ڕاست نیەو ئێمە ئەوە ناڵێین، بەڵکو ئێمە دەڵێین: حەق تەنیا ئەوەیە کەخوا[1] فەرموویەتی، بەڵام هیچ ئیسلامییەکی تێگەیشتوو ناڵێ: منی ئینسان هەموو حەقێکم لەلایە بۆچی؟! چونکە ڕەنگە ئەوەی کەخوا فەرموویەتی، من هەموویم وەرنەگرتبێ، یان من چونکە وەك ئینسانێك قسە دەکەم، هەڵە دەکەم، یان وەك ئینسانێك کە دەمەوێ دینداریی بکەم، ڕەنگە بەوشێوەیە کە دین دەڵێ، بەڕێوە نەچم، بۆیە ئێمە دەڵێین: حەق ئەوەیە کەخوا فەرموویەتی، بەڵام هیچ کاتێ ناڵێین: ئەوەی کە ئێمە دەیڵێین، هەمووی حەق و ڕاستە، وەخوای پەروەردگار زۆر بەڕاشکاویی ئەوەی خستۆتەڕوو کە هەق لەدەستی هیچ کەسێك دا کورت هەڵنەهاتوە، بەڵێ، هەموو هەق لەلای خوای پەروەردگار کورت هەڵاتوو (حصر)ە، بەڵام کە لەخوای تاك وتەنیا دێتە خوار، هەق تەنانەت لەپێغەمبەرانیشدا (علیهم الصلاة والسلام) کورت هەڵنەهاتوە، بۆچی؟ چونکە ئەو زاتە بەرزانەش لەبواری مەسەلە ئیجتیهادییەکان دا، هەرچەندە خاوەنی گەورەترین و کامڵترین عەقڵ و هۆشن، بەڵام دیسان دەگونجێ کەبەهەڵەدا بچن، با بۆ ڕوونبوونەوەی مەبەست، نموونەیەك بێنینەوە: لە (صحیح مسلم)دا دەگێڕێتەوە، کە ڕۆژێك پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) هەندێك لەهاوەڵەکانی بینی، تۆوی دارخورمایان دەبردو موتوربەیان دەکرد (تۆوی دارخورما نێرەکەیان دەبرد بۆ سەر مێیەکە) فەرمووی: بۆ چی وادەکەن؟ گوتیان: ئەگەر وانەکەین بەرناگرێ، فەرمووی: پێم وایە، ئەگەر واش نەکەن هەر بەر دەگرێ، ئیدی ئەوانیش دەستیان لەکارەکەی خۆیان هەڵگرت و، گوێیان نەدا بەموتوربەکردنی دار خورمایەکان، لەسەر قسەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، دوایی دار خورماکان بەریان نەگرت! ئەویش دوای هەواڵپێدرانی

---

(١) ئەوەش کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتیی، مادام وەحی بێت، هەمان حوکمی هەیە.

بە بەرنەگرتنی دارخورمایەکان فەرمووی: هەرکاتێك شتێکم پێ گوتن و گوتم: خوا (جل جلاله) فەرموویەتی وەك دین، ئەوە بەبێ هەر تێبینییەك لێم وەربگرن، بەڵام ئەگەر ڕایەکم دەربڕی، وەك شتێکی دنیایی:

{أَنْتُـمْ أَعْـلَمُ بِأَمْرِ دُنْيَـاكُمْ} أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ برقم: (٢٣٦٣).

واتە: (ئێوە خۆتان شارەزاترن لەکاروباری دنیای خۆتان)، وە بۆی ڕوون کردنەوە کە ئەو ڕێ ڕوونییەی لەبارەی پێویست نەبوونی ئەو کارەوە پێم گوتن، تەنها وەك بیروڕاو قسەیەکی خۆم گوتم، نەك وەك ئایین کە خوا وای فەرمووە[1].

بەڵێ، هەرکات خوا شتێکی فەرموو، دیارە حەق هەر ئەوەیە، بەڵام ئەگەر ئینسان شتێکی گوت، تەنانەت، ئەگەر پێغەمبەریش بێت، دەبێ تەماشا بکرێ: ئایا وەحییە، تاکو بێ مەرج و بەند وەربگیرێ، یان بیروڕا و ئیجتیهادە؟ کە دیارە ئەوکاتە حوکمەکەی جیاوازە.

**بەکورتیی دەڵێم:** لەڕووی سیاسییەوە ئەمەریکاو جیهانگیرییەکەی، وەزعێکی زۆر خراپی ڕەخساندوە، دیەوێ زۆر بەرەو خراپتریشی ببات، خوای پەروەردگار بمانپارێزێ و پەنامان بدات، ئاشکراشە کە لەڕووی سیاسییەوە، ئەمەریکاو سیستەمی نوێی جیهانیی لە ژێر پەردەی نەتەوە یەکگرتووەکان و ئەنجومەنی

---

(١) ئەمەش دەقی فەرموودەکەیە بەهەرسێك ڕیوایەتەکەیەوە:

١- (عن أبي موسى بْنِ طَلْحَةَ ، عَنْ أَبِيهِ ، قَالَ : مَرَرْتُ مَعَ رَسُولِ اللهِ (صلى الله عليه وسلم) بِقَوْمٍ عَلَى رُؤُوسِ النَّخْلِ ، فَقَالَ: مَا يَصْنَعُ هَؤُلَاءِ؟ فَقَالُوا: يُلَقِّحُونَهُ، يَجْعَلُونَ الذَّكَرَ فِي الْأُنْثَى فَتَلْقَحُ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (صلى الله عليه وسلم) : مَا أَظُنُّ يُغْنِي ذَلِكَ شَيْئًا. قَالَ: فَأُخْبِرُوا بِذَلِكَ، فَتَرَكُوهُ، فَأُخْبِرَ رَسُولُ اللهِ (صلى الله عليه وسلم) بِذَلِكَ فَقَالَ : إِنْ كَانَ يَنْفَعُهُمْ ذَلِكَ فَلْيَصْنَعُوهُ، فَإِنِّي إِنَّمَا ظَنَنْتُ ظَنًّا، فَلَا تُؤَاخِذُونِي بِالظَّنِّ، وَلَكِنْ إِذَا حَدَّثْتُكُمْ عَنِ اللهِ شَيْئًا فَخُذُوا بِهِ، فَإِنِّي لَنْ أَكْذِبَ عَلَى اللهِ عَزَّ وَجَلَّ) مسلم: ٦٠٧٩.

٢- (عن رافع بن خديج قال: قَدِمَ نَبِيُّ اللهِ (صلى الله عليه وسلم) الْمَدِينَةَ وَهُمْ يَأْبُرُونَ النَّخْلَ ، يَقُولُونَ: يُلَقِّحُونَ النَّخْلَ ، فَقَالَ: مَا تَصْنَعُونَ ؟ قَالُوا: كُنَّا نَصْنَعُهُ، قَالَ: لَعَلَّكُمْ لَوْ لَمْ تَفْعَلُوا كَانَ خَيْرًا، فَتَرَكُوهُ ، فَنَفَضَتْ أَوْ فَنَقَصَتْ ، قَالَ : فَذَكَرُوا ذَلِكَ لَهُ، فَقَالَ: إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ، إِذَا أَمَرْتُكُمْ بِشَيْءٍ مِنْ دِينِكُمْ فَخُذُوا بِهِ، وَإِذَا أَمَرْتُكُمْ بِشَيْءٍ مِنْ رَأْيِي، فَإِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ). رواه مسلم: ٦٠٨٠.

٣- (عن أنس أن النبـيَّ (صلى الله عليه وسلم) مَرَّ بقومٍ يُلَقِّحِون، فقال: لو لم يفعلوا لصلح، قال: فخرج شَيْصاً، فمرَّ بهم فقال: ما لنخلكم؟ قالوا: قلْتَ كذا وكذا، قال: أنتم أعلم بأمر دنياكم) رواه مسلم: ٦٠٨١.

ئاسایشی نێو دەوڵەتیی و، ئەو جۆرە دام و دەزگا نێو دەوڵەتیانەدا، ئەو کارو جم و جووڵە سیاسییانەی خۆی دەکات.

**دوو: لە ڕووی ئابوورییەوە:**

ئەمەریکا و باقی دەوڵەتانی جڵەوکێشی جیهانگیریی، کاری بەدی خۆیان لەڕێی بانکی نێو دەوڵەتیی و، کۆمپانیا فرە ڕەگەزەکان و، بازرگانیی جیهانیی و.. هتدوە، ئەنجام دەدەن، جا دیارە ئەوەش وردەکاریی زۆری هەیە، وە من خۆشم پیسپۆڕنیم لەم بوارەدا، بەڵام شتێکی هەر لێ دەزانم، کە ئێستا بوارنیە باسی ئەو وردەکارییە بکەین، کە چۆن سیستمی سەرمایەداریتیی و جیهانگیریی، دەیەوێ خەڵك بخاتە پێشبڕکێی ئەو کۆمپانیایانەوە، کەوەك سەرۆك وەزیرانی مالیزیا (مهاتیر موحەممەد) گوتی: جیهانگیریی و سیستمی نوێی جیهانیی، دەیەوێ میللەتانی بێ هێزو دەوڵەتانی تازە گەشەکردوو (الدول النامية) بێنێتە مەیدانی زۆرانبازیی ئابووریی و بازرگانییەوە، تاکو سەرەنجام جیهانی سەرمایەداریی و جڵەوکێشی جیهانگیریی، بەئیمکانیاتی زۆرو زەبەلاحیانەوەو، ئەو میللەت و ولاتانەش بەو تواناو ئیمکانیەتە کەم و کورتەیانەوە، وەك (مهاتیر موحەممەد) گوتی: وەك زۆرانبازیی نێوان بابایەکی خاوەن کێشی قورسی (١٥٠) کیلۆیی و بابایەکی لاوازی (٦٠-٧٠) کیلۆیی بێتە بەرچاو، کە هەر لەبەراییەوە ئەنجامەکەی ڕوونە، هەڵبەتە هەموو لایەکیش بینیمان، کە لە ئەنجامی زۆرانبازیی فێڵبازانەو نەخشە بۆ کێشراوی سەرمایەدارە زەبەلاحەکانی ڕۆژئاواوە، چۆن ئابووریی تازە گەشەکردووی ئەو شەش حەوت ولاتەی کە بەپڵینگەکانی ئاسیا (نمور آسيا) ناسراون، هەرەسی هێناو کەوتنە گۆڕێ[1].

وەشوێنەوارێکی دیکەی زۆر شووم و خراپی جیهانگیریی و سیستەمی نوێی جیهانیی، ئەوەیە کە هەر ڕژێم و دەوڵەتێك لێی تووڕە بن و، لەبەر هەر هۆیەك بێ بەدڵیان نەبێ، هەڵدەستن بەئابڵووقەی ئابووریی خستنەسەری، واتە: بۆ

---

(١) کە بریتین لەم ولاتانە: تایلاند، فیلپین، کۆریای خواروو، تایوان، ئەندۆنووسیا، مالیزیا، یابان، بڕوانە (في مواجهة العولمة) ص١٢٥/ البروفيسور، زكريا بشير إمام.

تەمبێ کردن و بە چۆکدا هێنانی، ئەو دەوڵەتانەی کە بەدڵی ئەوان ناجووڵێنەوە، گەل و میللەتەکانیان لەبرسان دەکوژن!! نموونەی ئەو جۆرە سزادان و شەڕ پێ فرۆشتنە، مۆدێرن و تازە مۆدیلەی ڕۆژئاواو ئەمەریکاش وەبەرهەم و پەرێزی شوومی لەعێراق و ئێران و سوودان و لیبیادا، زۆر ئاشکراو ڕوونە.

وەبەرهەم و پەرێزێکی دیکەی نەگبەت و بێخێری (گلۆبالیزەیشن) و بلووکی فەلسەفەی کاپیتالیزم، بریتیە لەو شێوە بازرگانییەی کە بەهیچ جۆرێك دین و بەها و ڕەوشتی تێدا ڕەچاو ناکەن، سەرنج دەدەن چ شتێك سوودو قازانجی زیاتری بۆ ئەوان هەبێت و، پارەو سامانی زیاتر بڕژێتە گیرفانەکانیانەوەو، لەبازاڕدا ڕەواجی چاکتری هەبێت، کۆمپانیاو کارگەکانیان زیاتر ئەو شتانە بەرهەم دێنن، هەرچەندە ئەوکەل و پەل و شتانە، نەك هەر خەڵك و میللەت پێویستییان پێیان نەبێ، بەڵکو ئەگەر گەورەترین زەرەرو زیانیشیان لێ بدەن، چونکە بناغەی فەلسەفەی کاپیتالیزم و سیکلۆلاریزم، کە (گلۆبالیزەیشن) لەوان پەیدابووە، لەسەر بێ دینایەتیی و حیساب بۆ خواو قیامەت و ویژدان نەکردن و، ژیان بەماددەی ڕووت و، ئینسان تەنها بەئاژەڵ حیساب کردن، بنیات نراوە!!

بۆیە تەماشا دەکەین لەڕووی ڕاگەیاندنەوە: زۆر فلیمی خیلاعیی و بێ ڕەوشتانە و خراپ و، بەرنامەی زۆر پیس، کەبەهیچ قیاسێك و بەهیچ پێودانگێك لەخزمەتی بەشەردانین، زۆر ڕەواجیان پێ دەدرێ، بۆچی؟ چونکەپارەی زیاتریان بەدواوەیە و، لەلای ئەوانیش ئەوە گرنگ نیە، کە ئەخلاقی خەڵکی دەڕووخێنێ و دەشێوێنێ و، خێزان هەڵدەوەشێنێتەوەو تێك دەدات!

هەروەها بەرهەمێکی دیکەی شوومی کاپیتالزم لە ژێر سایەی جیهانگیریی دا، ئەوەیە کە جیاوازیی نێوان دەوڵەمەندەکان و فەقیرەکان، زۆر زۆر دەبێت و هەندێك سەرژمێری سەرسووڕهێنەر هەن لەوبارەوە، بۆ نموونە: (روجیە گارودی) لەکتێبێکی دا بەناوی (نحو حرب دينية)[1]دا، کە کتێبەکە لەفەڕەنسییەوە

---

(١) (نحو حرب دينية)ص١١.

تەرجەمە كراوە، دەڵێ: لەسی (٣٠) ساڵی دوایی دا (كتێبەكەی لە ١٩٩٦دا نووسیوە) جیاوازیی دەوڵەتانی هەژارو دەوڵەمەند، واتە: ڕێژەی دەخلی ژیان لە: (١/٣٠) یەك لەسەر سی یەوە، لەماوەی سی (٣٠) ساڵ دا، بۆتە: (١/١٥٠) یەك لەسەر سەدو پەنجا، واتە: ئەوە پەیدابوو كە ئێستا پێی دەڵێن: وڵاتانی سەروو و خواروو (الشمال و الجنوب)، یانی: ئەگەر كاتی خۆی هاووڵاتییەكی یەكێك لەوڵاتانی عەرەبی، مانگی دۆلارێكی هەبووبێ و، بابایەكی ئەورووپیی و، ڕۆژئاوایی (٣٠) دۆلاری هەبووە، بەڵام ئێستا ئەو ڕێژەیە بەرز بۆتەوە بۆ یەك بۆ سەدو پەنجا، یانی: ئەمەریكییەك، یان ڕۆژئاواییەك، سەدو پەنجا بەرانبەر كابرایەكی ڕۆژهەڵاتیی دەرامەتی هەیەو، ئیمكانیەتی ماددیی هەیە، ئنجا دیارە ئەو سەرژمێرە لەساڵی (١٩٩٦)دا گوتوویەتی، بەڵام كێ دەڵێ: ئێستا چەند قاتی دیكە بەرز نەبۆتەوە!! هەروەها (روجیە گارودی) دەڵێ[١]: ساڵانە لەسەر ئاستی جیهان (١٥،٥) پانزە ملیۆن و نیو منداڵ لە برسان و بەهۆی ئەو نەخۆشیانەوە، كە لە ئەنجامی بەدخۆراكیی دا پەیدا دەبن، دەمرن! دیارە هەمووشیان لەوڵاتانی عالەمی ئیسلامیی و ئەفریقیی و وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ئاسیا دان!

دیسان دەڵێ: هەروەها دەرامەتی جیهان، ئەگەر بكرێتەسەد بەشەوە، لە (٨٣٪) لەدەستی خەڵكی ڕۆژئاوادایە، كە نزیكەی لە ٢٠٪ خەڵكی دنیا پێك دێنن، وە لە (١٧٪)یش لەدەستی باقی خەڵكەكەی دیكەدایە، كە ڕێژەی (٨٠٪)ی خەڵكی جیهان پێك دێنن! واتە: جیاوازییەكی زۆر گەورە، هەروەها گوتوویەتی: ڕۆژانە (٤٠,٠٠٠) چل هەزار كەس بەپێی سەرژمێری یەكانی ساڵی (١٩٩٦) لە ئەنجامی برسێتیی و بەدخۆراكیی دا دەمرن.

---

(١) سەرچاوەی پێشوو ص١١.

**سێ: لەڕووی کۆمەڵایەتییەوە، بەتایبەت لە بواری خێزان دا:**

ئەگەر لەو بوارەش دا تەماشای پەرێزو شوێنەواری جیهانگیریی بکەین، دیسان شتی زۆر خراپ دەبینین، بەتایبەت لە بواری لایەنی جینسیی و هەڵوەشاندنەوەی خێزان و، بڵاوکردنەوەی بەرهەڵدایی و ئیباحییەتدا؛بۆ وێنە: ئێستا نەتەوە یەکگرتووەکان کە زیاتر ئامڕازێکە بەدەست ئەمەریکاو سیستەمی نوێی جیهانییەوە، حەوت کۆنگرەی بەستوون، بەڵام بۆ چی؟! بێگومان بۆ ئەوە نا، کە بزانن ئافرەت لەکوێ کێشەی هەیە؛ یان لەکوێ ئافرەتان برسین؟! یان شیریان نیە بیدەن بەمنداڵان، یان لەبەرنەداریی، منداڵیان پێ بەخێو ناکرێ؟ نەخێر بۆ هیچ کام لەم شتانە نا، بەڵکو ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان، تائێستا حەوت کۆنگرەی بەستوون:

١- کۆنگرەی یەکەم لەساڵی (١٩٥٠)دا، کەویسترا لەشاری قاهیرە ببەسترێ، بەڵام میصر ڕازی نەبوو، دوایی لەشوێنێکی دیکە بەسترا.

٢- وە لەساڵی (١٩٧٥)دا کۆنگرەی دووەم لە (مەکسیك) بەسترا.

٣- هی سێیەمیش لەساڵی (١٩٨٥)دا لە (بەیروت) بەسترا.

٤- وە لەساڵی (١٩٩٤)دا لە قاهیرە کۆنگرەی چوارەم.

٥- پاشان کۆنگرەی پێنجەم لەساڵی (١٩٩٥)دا لە پەکین.

٦- لەساڵی (١٩٩٦)یشدا لە ئەستەنبووڵ کۆنگرەی شەشەم.

٧- وەلەساڵی (٢٠٠٠)دا لە نیۆیۆرك کۆنگرەی حەوتەم بەسترا، بەڵام ئایا ئامانجی بەسترانی ئەو حەوت کۆنگرەیە چی بوو؟! بۆ ئەوە بوو کە سەرجەم ئەو وڵاتانەی لەو کۆنگرەیەدا بەشدار دەبن، ئەو شتانە بسەلمێنن:

١- هەرکاتێك ئافرەت بەبێ شووکردنیش منداڵی بوو، بۆی هەیەو هیچ کەس هەقی گلەیی نیە، بەڵکو دەبێ دەوڵەت منداڵەکەشی بۆ بەخێو بکات!

٢- دەبێ هەم پیاو لەگەڵ پیاو بۆیان هەبێ پێکەوە خێزان پێکەوە بنێن و، هەم ئافرەت و ئافرەتیش بەهەمان شێوە!

٣- دەبێ ئینسان بۆی هەبێ جینسی خۆی بگۆڕێ، پیاو خۆی بکات بەژن و خۆی عەمەلیات بکات، وە ژن خۆی بکات بەپیاو!

هەروەها بۆ گەلێك ئامانجی دیکەی لەو جۆرە، هەموو ئەو کۆنگرانە بەستراون، ئنجا ئایا جیهانگیریی لەپشت ئەو کۆنگرانەوە چی کردوە، بۆ ئەوەی سەرو بەربگرن؟! گوتوویانە: هەر دەوڵەتێك ئامادەبێ ئەو شتانە بسەلمێنێ، بەرنامە و دەستووری وڵاتەکەی بگۆڕێ، ئێمەش یارمەتی دەدەین لەڕێی بانکی نێو دەوڵەتی و صندوقی دراوی نێو دەوڵەتیی و، لەڕێی ڕێکخراوی بازرگانیی جیهانییەوە، هەرکەسێکیش ئەوانە نەکات و، نەچێتە ژێر باری ئەو شتانەو، ئەوە ئێمە هیچ هاوکاریی ناکەین و سزایشی دەدەین، بەتایبەتی لەدوای ساڵی (٢٠٠٠)وە، زۆر بێ شەرمانە و زۆر بەزەقیی هاتوونە نێو ئەو مەیدانەوەو، دەیانەوێ، زۆر بەجیددیی ئەو مەسەلانە بکەن بەقانوون لەهەموو وڵاتاندا، بۆیە ئێستا ڕەنگە خەڵکێك هەبێ، کەدەبینێ خەڵکی ڕۆژئاوا دژی جیهانگیریی دەوەستنەوە، بڵێ: ئایا خەڵکی ئەورووپا کە لەو ژیانە خۆشەدا دەژین، لە ژێرسایەی جیهانگیرییدا، بۆچی خۆپیشاندان دەکەن و دژی جیهانگیریی دەوەستن؟ بەڵام، نەخێر ئەو خەڵکە شێت نین و ئەوان دەزانن چ باسە! خەڵکێك هەیە ویژدانێکی هەیە، ئەخلاقیکی هەیە، شەهامەتێکی ماوە و دەزانێ کە ئەو جیهانگیرییە، سەری بەکوێ دەگات؟ بۆ وێنە: کە لەپەرلەمانی وڵاتێکی ئەورووپیی دا بەئاشکرا باسی ئەوە دەکرێ: پیاو بۆی هەیە لەگەڵ پیاودا، خێزان دروست بکات و مارەی بکات و، ژن لەگەڵ ژن، ئنجا کچ پێش ئەوەی مێردی کردبێ، بەپێی ئەو ڕێبازو بەرنامەیەی خۆیان، بۆی هەبێ منداڵی ببێ، وە دەوڵەتیش منداڵەکانی بۆ بەخێو بکات، وەکچ لەقوتابخانە نابێ کەس ڕێی لێبگرێ، ئەگەر دووگیان بوو، بێ ئەوەی کەشووی کردبێ! هەر بۆیە ئێستا لەهەندێك لەوڵاتانی ڕۆژئاوایی دا، ڕێژەی منداڵی بێ باب، واتە: ڕێژەی ئەو منداڵانەی کەزۆڵن، گەیشتوونە (٧٥٪)!

بەڵێ، بۆ دژایەتیی ئەو جۆرە بیرۆکانەیە، کەئەو خەڵکە نارەزایی دەردەبڕن و خۆپیشاندان دەکەن، ئنجا پێویستە بزانین، کە ئەو جۆرە کەسانە وەنەبێ مسوڵمان بن و، ئیسلامەتیی پاڵیان پێوەبنێ، بەڵکو هەر فیطرەت و عەقڵ و ئەزموون و دووربینیی خۆیانە، چونکە تەماشا دەکەن ئەو وەزعەیان سەری بەزۆر شتی ترسناك دەگات، چۆن ترسناك نیە! ئەگەر بەو پێیە بێ و، خەڵك هەمووی قەرار بدات، پیاو لەگەڵ پیاو و، ژن لەگەڵ ژن جووت بن و خێزان دروست بکەن، وەچەی بەشەر بەیەکجاری دەبڕێتەوە لەسەر زەوی و، هەموو بەشەر قڕ دەبێت!!(١)

---

(١) ١- ئێستا -٢٠١٥/٣/٢١- کتێبێکم لە بەردەستە بەناوونیشانی: (خمسين حقيقة ينبغي أن تُغَير العالم) وە ناوونیشانە ئەسڵییەکەی ئاوایە:

[Facts that Should change the World 50] کە نووسراوی: (دیسیکا ویلیامز)ە و ساڵی: (٢٠٠٥) چاپ کراوە، حەزدەکەم هەندێك ڕاستیی تاڵ و دەرهاوێشتەی شوومی دیکەی جیهانگیریی و سیکۆلاریزمی ڕۆژئاوایی لێ نەقڵ بکەم:

١- یەك لەسەرسێی (٣/١)ی جیهان لەحاڵەتی جەنگ دایە. ص١٨٢.

٢- سی (٣٠) ملیۆن مرۆڤ تووشی ڤایرۆسی کەمیی بەرگریی بەشەریی (ئیدز)بوون، لە ئەفریقیا. ص٣١٨.

٣- ئەمریکاییەکان ساڵانە دە ملیار (١٠،٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠)دۆلار بۆ بەرهەمهێنانی فیلم و بڵاوکراوەی ئیباحیی خەرج دەکات و، هەر هەمان ئەندازەش حکوومەتی ئەمریکایی بۆ هاوکارییە دەرەکییەکانی تەرخان دەکات. ص٢٧٨.

٤- لەجیهانی ئەمڕۆدا بیست و حەوت (٢٧) ملیۆن کۆیلە هەیە. ص٢٩٢.

٥- ڕۆژانە دوو دۆلار و نیو (٢،٥) لە یەکیەتی ئەورووپادا بۆ هەر مانگایەك خەرج دەکرێ، ئەو ئەندازەیەش لەوە پترە کە لەسەدا حەفتا و پێنج (٧٥٪)ی ئەفریقاییەکان پێی دەژین. ص ٥٤.

٦- ساڵانە لەوڵاتە زۆر خۆشگوزەرانەکان دا، ملیۆنێك و بیست و پێنج هەزار (١٠٢٥٠٠٠) کچی هەرزەکار سکپڕ دەبن و، ئەمریکا و بەریتانیاش لەڕیزی پێشەوەدان.

٧- ڕۆژانە لەهەر پێنج کەسان، یەکێکیان ڕووبەڕووی برسیبوون دەبێتەوە لە دانیشتوانی جیهان، یانی: دەوری هەشت سەد (٨٠٠) ملیۆن کەس. ص١٦٦.

٨- ژمارەی خۆکوژان (مُنْتحرين) ساڵانە، لەژمارەی کوژراوانی تێکڕای شەڕ و کوشتارەکانی

بەڵێ، بەڕاستی جیهانگیریی لەڕووی کۆمەڵایەتیی و کلتووریی و فەرهەنگیی و ئەخلاقییەوە، پەرێزی شوومی زۆرە، بۆ وێنە: مۆدیلی سەیرو عەجایب لەبەرگ و پۆشاکی ئافرەتان، لەشمەکی خۆپێ جوانکردن و چەندان کەل و پەلی دیکە، کەبەکاریان دێنن، مۆدێل لەسەر مۆدێل، کارگەو کۆمپانیاکان بەرهەمیان دێنن و، ئەو ئافرەتانەی کە پێیان دەگوترێ: شاجوان (ملكة الجمال) کەساڵانە بەو بیانووەوە، ئاهەنگ و میهرەجانی زۆر گەورە گەورە ساز دەکرێن و، مەسرەفی زۆری بۆ دەکرێ و، پارەی زۆری بۆ تەرخان دەکرێ، بۆچی؟! بۆ ئەوەی ئەو خەڵکە پێشبڕکێ بکات لەو مەیدانەداو، ئافرەتەکان هەرچی زیاتر خۆیان بڕازێننەوەو، جوانیی خۆیان دەربخەن، بەپێی ئەو شێوازو پێوەرەی کەجیهانگیریی دای دەنێ و، بەپێی ئەو نەخشانەی کەئەو دەستە پەنهانانەی لەپشت کارگەو کۆمپانیاکانەوەن، دایان دەڕێژن، کە زیاتر دەستی جوولەکەو سەرمایەدارە زلەکانن و، دەیانەوێ ئافرەت بکەن بەبووکە شووشە، ئنجا ئافرەتی کلۆڵ، دەبێ هەر جارە بەنەوعێك خۆی بگۆڕێ، بۆ چی؟! چونکە مۆدێلەکەی گۆڕاوە، پاشان دەبێ ئەم جۆرەیان لەبەر بکات، نەخێر ئەو جار دەبێ ئەوەیان بگۆڕێ؟ بۆ چی؟ چونکە ئەو مۆدێلەش گۆڕاوە، ئیدی بەو جۆرە مەسرەفێکی زۆرو زەوەند لەڕووی ئابوورییەوە، وەپاشانیش هاڕین و تێکدانی شەخصیەتی ئافرەت، کەدەبێ تەماشا بکات خەڵك چۆن پێی سەرسام دەبێ، چۆن بەجوانی دەزانێ، وا لەخۆی بکات، کەهەندێك جاران خۆ جوانکردنەکەی پێچەوانەی فیطرەت و سروشتیشیەتی، چونکە خۆجوانکردن، ئەگەر درێژکردنەوەی جوانیی سروشتیی بێت، شتێکی سروشتیی و ئاساییە، بۆ وێنە: ئافرەت ئەگەر نینۆکی خۆی سوور بکات، یان لێوی سوور بکات، ڕەنگە ڕێی تێبچی، بەڵام نینۆك ڕەشکردن،

---

دنیا زیاترە. ص٢٣٢.

٩- مینە زەمینییەکان (الألغام الأرضية) بەڵای کەمەوە لەهەر سەعاتێك دا کەسێك دەکوژن، یان جەستەی دەشێوێنن. ص ٨٦.

١٠- ساڵانە لە ئەورووپای ڕۆژئاوا، دەوری سەد و بیست هەزار (١٢٠،٠٠٠) ژن و کچ، دەکەونە داوی بازرگانیی پێکردنەوە. ص ٣١٤.

یان نینۆك درێژکردن، یان پشتی چاوشین کردن... هتد ئەو جۆرە دەستکاریی خۆکردنانە، پێچەوانەی فیطرەتن و، پێچەوانەی جوانیی خوا ڕسك و سروشتیین.

**چوار: لەڕووی فیکریی و فەرهەنگییەوە:**

جیهانگیریی دەیەوێت دیکتاتۆریی فکیریی بەسەر دنیادا بەرقەرار بکات و، چەند بیرو بۆچوونێکی تەبەننیی کردوون، هەرکەسێك ئەو بۆچوونانە قبووڵ نەکا، سزای دەدات! واتە: دەبێ تۆ پێناسەی تیرۆر بەوشێوەیەی، کە ئەمەریکا دەیەوێ، قبووڵ بکەی، وە ئەگەر قبووڵی نەکەی، تووشی سزاو گرفت دەبی، وە دەبێ تۆ ئەوە قبووڵ بکەی، کە ئەگەر جوولەکە چەکی کۆمەڵ کوژیی و ئەتۆمیی هەبێ، زۆر ڕەوایە، بەڵام ئەگەر پاکستان هەیبێ، یان شوێنێکی دیکە هەیبێ، ئەوە نارەوایە بۆچی؟! چونکە ئیسرائیل، ئیسرائیلەو لەخزمەت ئەمەریکادایە، بەڵام وڵاتێکی ئیسلامیی، نابێ چەکێکی وای هەبێت، کەمایەی مەترسیی جوولەکەو، نیگەرانیی ئەمەریکاو ڕۆژئاوابێ! بەڵێ، ئەگەر بتەوێ نەکەویە بەر تووڕەیی ئەمەریکاو جیهانگیریی، دەبێ ئەو شتە ناهەقانە بسەلمێنی و قەناعەت بەخۆت بێنی، ئەگەرنا تووشی سزاو جەزرەبە دەبی و، تووشی ئابڵووقەی ئابووریی دەبی.

بۆ نمـوونـە:

یەکێك لەو مەسەلانەی ئەمریکاو ڕۆژئاوا وەك بیرۆکەو قەناعەتێك تەبەننیان کردوە و، شتێکی زۆر باوە لەئەورووپا، ئەوەیە کە گوایە کاتی خۆی هیتلەر لەشەڕی جیهانیی دووەمدا، شەش ملیۆن (٦،٠٠٠،٠٠٠) جوولەکەی لەفڕنی غازدا سووتاندوەو کوشتوە؟! ئنجا ئێستا کەمێژوو نووسە ئەورووپییەکان، لەو مەسەلەیان کۆڵیوەتەوەو، بۆیان ساغ بۆتەوە کەڕاست نیەو، ئەو مەسەلەیە تەنها بانگەشەیەکی جوولەکەکان بوو بۆ زێدە دەرخستنی مەزڵوومیەتی خۆیان و، بۆ ئەوەی پاساویان بکەوێتە دەست، وە خەڵك پشتگیرییان بکات و، وڵاتێك بۆ خۆیان داگیر بکەن، کە ئەوە بوو کەبەکردەوە (فەلەستین)یان داگیر کرد، ئنجا

هەندێك لەمێژوونووس و بیریارو فەیلەسووفەکانی فەڕەنسا و بەریتانیا، لە ئەنجامی ئەوەدا، کە نکوڵیی لە ڕاستیی ئەو مەسەلەیە دەکەن، لەلایەن ڕژێمەکانی خۆیانەوە، زۆر بەتوندیی و بێ ڕەحمانە دژایەتیی دەکرێن:

١- یەکێك لەوانە (بول راسينيه)یە، کە کابرایەکی فەڕەنسییە، لەساڵی (١٩٥٠)دا کتێبکی نووسی، کەبەعەرەبی تەرجەمەکراوە بەناوونیشانی: (أكذوبة أَوَ لَيسَ؟!) واتە: درۆیەکی زل، ئایا وانیە؟!

جا (بول راسينيه) سێ جاران لەسەر ئەو کتێبەی دادگایی کراوە، بەڵام ئەوە بوو کەسەرەنجام هیچی وای لەسەر ئیسپات نەبوو، کە مایەی تاوانبارکردنی بێت، چونکە شتەکانی مەنتیقیی بوون و بەڵگەکانی ڕاست بوون، بەڵام دوایی هەرچۆن بوو جوولەکە توانیان فشار لەدەوڵەتی فەڕەنسا بکەن و، قانوونێکی پێ دەربکەن، کەلە مەودوا هەرکەسێك خەڵك بخاتە گومانەوە، لەبارەی مەسەلەی (هۆڵۆکوست - المحرقة)وە، واتە: لەوبارەوە، کە جوولەکە بەملیۆنان سووتێنراون، ئەوە دەبێ دادگایی بکرێ و تاوانباریش بکرێ، وە ئێستا ئەوە لەفەڕەنسا قانوونە.

٢- کاتێك (ڕۆجیە گارۆدیی)یش کتێبێکی نووسی، کە دیارە کتێبەکەی فەڕەنسییەو، دوایی بەعەرەبی تەرجەمە کراوە بەناوی: (الأَساطير المؤسَّسَة للدولة الإسرائيلية) واتە: (ئەفسانە دامەزرێنەرەکانی دەوڵەتی جوولەکە)، وە لە کتێبەکەی دا باسی ئەوە دەکات، کە گوایە لەشەڕی جیهانیی دووەم داو، لەلایەن سوپای نازییەوە، شەش ملیۆن جوولەکە سووتێنران، دەڵێ: ئەوە وانیە و دەوری سەد هەزار کەسێك لەو جەنگەدا لەجوولەکەکان کوژران، (گارۆدیی) لەسەر ئەو کتێبەی دادگایی کراو غەرامەشی لێ ستێنرا.

٣- هەروەها یەکێکی دیکە لەوانە (دیفید ئیرفینیج)ە، مێژووزانی گەورەی بەریتانی کە (أحمد منصور) لەکەناڵی (الجزيرة) و بەرنامەی (بلا حدود)دا چاوپێکەوتنێکی لەگەڵ دا کرد، پاشان لە (٢٠٠٥/٥/١١)دا (أحمد منصور) لە ڕۆژنامەی (الشرق)ی قەتەریی دا، وتارێکی لەسەر بڵاوکردەوە، بەناوو نیشانی: (من يجرؤ على الكلام؟) واتە: کێ دەوێرێ قسەیەك بکات، کە جوولەکە پێیان

ناخۆش بێت؟! ئنجا ئەو فەیلەسووفە بەریتانییە دەڵێ: ئێستاش لەخۆم دڵنیانیم و، جوولەکەکان هەمیشە هەڕەشەم لێدەکەن، وە لەوڵاتەکەی خۆشم دا ئابڵووقەم خراوتەسەر، وەهیچ کەس دەنگم نابیستێ و، شتیشم بڵاو ناکەنەوە، بۆچی! دەڵێ: لەبەر ئەوەی کەگوتوومە: ئەو جوولەکانەی کەلە جەنگی جیهانیی دووەمدا کوژراون، نزیکەی سەد هەزارێکن و، شەش ملیۆن نابن، وەك جوولەکە دەڵێن!! ئنجا لە کۆتایی قسەکانماندا، دەربارەی جیهانگیریی، دەمەوێ دوو ڕاستییان ڕابگەیەنم:

ڕاستیی یەکەم:

ئێمە وەك مسوڵمان، دەبێ ئەو اقیع و حەقیقەتە تاڵە بسەلمێنین، کە ئەوانەی ئەمڕۆ جڵەوی جیهانگیرییان بەدەستەوەیە وە دەیانەوێت خۆیان بکەن بەکوێخای دنیا، خەڵکێکی لێهاتوو و بەتوانان لە ڕووی ماڵ و سامانەوە، لەڕووی زانیارییەوە، لەڕووی نەخشە دانانەوە، لەڕووی موخابەراتییەوە، لەڕووی ڕاگەیاندنەوە، لەڕووی چەکی جۆراو جۆری کۆکوژەوە، بەکورتیی: لەگەڵێك ڕووەوە خەڵکێکی بەتوانان و ئەوە حەقیقەتێکە، بەڵام باوا نەزانین، کە ئەوە پێچەوانەی سوننەت و یاساکانی خوایە، بەڵکو ڕاست موافیقی یاسای خوایە، چونکە خوای پەروەردگار دەفەرموێ:

﴿ وَأَن لَّيْسَ لِلْإِنسَٰنِ إِلَّا مَا سَعَىٰ ﴿٣٩﴾ ﴾ النجم:٣٩.

واتە: ئینسان بەرهەمی نیە، مەگەر تواناسەرف بکات.

ئنجا هەرچی ڕۆژئاواییەکانن، تواناو وزەیان سەرف کردوەو، خۆیان ماندووکردوەو، شەونخوونییان کێشاوەو، خۆیان نارەحەت کردوەو، زۆر جاران موغامەرەیان کردوە، وە ئەمەریکا هەروا بەئاسانیی نەبووەتە ئەو ئەمەریکایەی کەدەیبینین! بەڵکو یەك نەتەوەیان بەتەواویی قەلاچۆ کرد، کاتی خۆی کە ئەمەریکا دامەزرا، پێش ئەوەی کەببێ بەدەوڵەت، هیندەسوورەکانیان قەلا چۆکرد، دیارە ناڵێم شتێکی باشیان کردوە، بەڵام مەبەستم ئەوەیە کەتواناایان سەرف کردوە، ئنجا ئایا کارەکەیان حەڵاڵە، یان حەرامە، چاکە یان خراپە؟ ئەوە مەسەلەیەکی دیکەیە و ئاشکرایە، گرنگ ئەوەیە

قوربانییان داوەو، خۆیان ماندوو كردوە، بەڵام دیارە بەزۆریی بەباری شەڕدا خۆیان ماندوو كردوە، بەڵام توانایەكیان سەرف كردوە، بۆیە بەرهەمێكیان هاتۆتە دەست، وەخوای پەروەردگاریش پێمان دەفەرمویٚ:

﴿وَلَا تَبۡخَسُواْ ٱلنَّاسَ أَشۡيَآءَهُمۡ﴾ الاعراف: ٨٥.

واتە: شتی خەڵكی بەكەم مەگرن، ئێمە نابیٚ هەرلێرەوە بڵێین: ئەمریكا هیچ نیە، یان ڕۆژئاوا هیچ نیە وهیچیان بەكەڵك نایەت! بەڵكو شتی زۆرچاكیان هەیە و لە ڕاستییدا بەدەستەڵاتن، بەتوانان، لێزانن، شارەزان، فیداكارن، لێبڕاون، جیددیین .. هتد، وەبێگومان زۆر شتی چاكیان هەیە كە ئێمە دەتوانین لێیان فێربین و، زۆر شتی وایان هەیە، كە دەتوانین لێیان بەهرەمەند بین، وەك (هانتگتۆن)یش دەڵیٚ: عالەمی ئیسلامیی و عالەمی ڕۆژهەڵاتی ئاسیا لە تەكنۆلۆژیای ئێمە بەهرەمەند دەبن، بیٚ ئەوە كە بێنەسەر ڕێبازەكەمان، دیارە ئەو پێی ناخۆشەو دەڵیٚ: ئەوە شتێكی زۆر خراپە، بۆیە دەڵیٚ: پێش ئەوەی ئەوان ئەو تەكنۆلۆژیاو شتە چاكانەمان لیٚ وەربگرن، دەبیٚ سەركوتیان بكەین، چونكە ئەگەر بێت و دەستیان لەچەك و لە تەكنۆلۆژیا و شتە باشەكانی ئێمە گیربێت، دوایی ئێمە پێیان ناوێرین.

**ڕاستیی دووەم:**

بەداخەوە (سیستمی نوێی جیهانیی) كەپێی دەگوترێ: (جیهانگیریی) لەسەر سیٚ كوچكەیەكی شووم وەستاوە، كە بریتیە لە:

١- ماڵ و سامان.

٢- دەستەڵات و هێز.

٣- فڕو فێڵ و چاو بەستەكیٚ و خەڵك فریودان.

دكتۆر (عەلی شەریعەتی) خوا لێی خۆش بیٚ، قسەیەكی جوانی هەیە، كاتی خۆی دەربارەی شارستانیەتی ڕۆژئاوا، گوتویەتی: لەسەر ئەو سیٚ كوچكە شوومە بەندە: (زێڕ، زۆر، تەزویر)[1].

---

(١) دكتۆر عەلی شەریعەتی، كە بەفارسی نووسیویەتی گوتویەتی: (زر زور تزویر).

ئنجا ئەگەر سەرنجی مێژوو بدەین، زۆر چاك دەزانین داخۆ چ سیستمێك ئیستیفادەی لەو سێ کوچکە شوومەکردوە؟ دیارە تەنها سیستمە طاغووتیەکان، چونکە ئەو ڕژێمە دیکتاتۆرییانە بەهۆی زێڕەوە خەڵك برسیی دەکەن و، بەهۆی زۆرەوە خەڵك دەترسێنن و، بەهۆی تەزویرەوە خەڵك فریو دەدەن، ئەمڕۆ سەرنج بدەن! ئیعلام چ دەورێکی گەورە دەبینێ، لە چەواشەکردنی خەڵکدا، حەقیان لێ دەکاتە ناحەق و، ڕەشیان لێ دەکاتە سپی، وەسەرنج بدەن! کە جیهانگیریی چۆن بەهۆی چەك و دەستەڵاتەوە، خەڵك دەترسێنێ!! ئێستا ڕەنگە کەم کەس بوێرێ بڵێ: جیهانگیریی تەنانەت پشتی چاوی برۆیە، ڕەنگە (گلۆبالیزەیشن) فلان شتەی بەکەڵك نەیەت، دیموکراسی لەوانەیە دووسێ شتی تێدا بن، بەکەڵك نەیەن، زۆر کەس جورئەت ناکات و ناوێرێ هەر بڵێ: جەنابی ئەمەریکا! ئەو تیرۆرەی تۆ دژی دەوەستی، بێ زەحمەت بۆمان پێناسە بکە، داخۆ چۆنە؟ تاکو ئەگەر خراپ بێ، ئێمەش دژی بین و، ئەگەر مەبەستیش لەتیرۆر، دیفاع لەخۆکردن و بەرهەڵستیی خەڵکێکی مەزڵوومیش بێت، کەتۆ کەیفت پێی نایەت، بۆ چی ئێمە لەخۆوە دوای تۆ بکەوین و، بەچەپڵە ڕێزان لەخزمەتتدابین و، ببینە کۆڕسێك بێ ئەوەی، کە بزانین داخۆ ئەوە کە تۆ دەیڵێی چیە؟!

وە لەقورئاندا خوای کاربەجێ ئاماژە بەوە دەکات، کە ئەو سیستمەی لەسەر ئەو سێ کوچکە شوومە بنیات دەنرێ، هەمیشە سیستمێکی فیرعەونیی و طاغووتییە، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ:

﴿وَقَـٰرُونَ وَفِرۡعَوۡنَ وَهَـٰمَـٰنَۖ وَلَقَدۡ جَآءَهُم مُّوسَىٰ بِٱلۡبَيِّنَـٰتِ فَٱسۡتَكۡبَرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَمَا كَانُواْ سَـٰبِقِينَ ﴿٣٩﴾﴾ العنكبوت:٣٩.

وەك دەبینین ئەم ئایەتە پیرۆزە باسی (قارِوون)مان بۆ دەکات، کە کابرایەکی سەرمایەدار بووە، وەباسی فیرعەون دەکات، کە دەسەڵاتدارێکی سیاسی بووە، پاشان باسی (هامان) دەکات، کەوەزیری فیرعەون بووەو تەگبیرکەری بووە، واتە: هێزە ئیعلامییەکەی بووە، وە ئەو سێکوچکەیە دژی خەڵکی (مصر) و دژی (بەنی ئیسرائیل) بووەو گەلی میصری بەگشتی و (بەنی ئیسرائیل)ی

بەتایبەت دەچەوساندەوە، کە (موسى ) عليه الصلاة والسلام، چوو بۆ ئەوەی ڕزگاریان بکات، وەبێگومان ئەو جۆرە سیستمەی کەجەخت دەخاتەسەر پارەو کۆکردنەوەی هەرچی زیاتری، بەبێ گوێدانە حەڵاڵ و حەڕام، وەبەوەدەست هێنانی هەرچی زیاتری دەستەڵات، بەبێ گوێدانە ڕازی بوون و نەبوونی خەڵکی، وەپەیداکردنی هەرچی زیاتری هۆکارەکانی خەڵك چەواشەکردن، ئەوە لەڕاستییدا سیستمێکە، کە بۆبەشەریەت تاڵاوو نەگبەتییەو، جگەلە مەینەتیی،هیچی دیکەیان لەگیرفاندا نیە.

ئێمە زیاتر پانتایی باسەکەمان بۆ جیهانگیریی تەرخان کرد، بەڵام پێویستە ئەگەر بەکورتییش بێ، باسی (جیهانێتیی ئیسلام) بکەین: وەك گوتمان: (گلۆبالیزەیشن) بریتیە لەجیهانگیریی و جیهان خستنە ژێر کۆنترۆڵی خۆ، بەڵام ئایا ئیسلام بڕوای بەوە هەیە؟! سەرەتا هەر بەکورتیی دەڵێم: ئیسلام بڕوای وایە کە جیهان بۆ خۆی چۆنە، ئاوا مامەڵەی لەگەڵدا بکەین، نەیگۆڕین و دەستکاریی نەکەین و، خەڵکی جیهان چۆنە ئاوا مامەڵەی لەگەڵدا بکەین، مەگەر بەشێوەی بانگەوازو ئیقناع کردن و تێگەیاندن و لە دەروونەوە بیانگۆڕین، بابزانین چۆن؟

یەکـەم:

لەڕوانگەی ئیسلامەوە، لەسۆنگەی ئەوەوە کەبوونەوەر بەبێ خوا دروست نەدەبوو، وە بەبێ خواش بەڕێوە ناچێ، وە ئینسانیش بەشێکە لەبوونەوەرو، ئەمیش وەك چۆن پەیدابوونی پێویستیی بەخوایە (تبارك وتعالى) بۆ بەڕێوە چوونیشی پێویستیی بەخوایە، بۆیە دەبێ خوای پەروەردگار وەحی بۆ بنێرێ و، بەرنامەی ژیانی بۆ دابنێ، وەك مووسا (عليه الصلاة والسلام) لەوەڵامی فیرعەوندا، کاتێك فیرعەون لێی دەپرسێ: (فمن ربكما يا موسى؟) ئایا پەروەردگارتان کێیە ئەی موسا؟! دیارە فیرعەون خۆی بەپەروەردگار زانیوە، مووساش پێی دەڵێ:

﴿ قَالَ رَبُّنَا ٱلَّذِىٓ أَعۡطَىٰ كُلَّ شَىۡءٍ خَلۡقَهُۥ ثُمَّ هَدَىٰ ﴿٥٠﴾ ﴾ طه: ٥٠.

واتە: پەروەردگارمان ئەو زاتەیە بوونی بەهەموو شتێك داوە، پاشان ڕێنماییشی کردوە: (یانی: هەم دروستی کردوە، هەم بەرنامەشی بۆ داناوە چۆن بەڕێوە بچێ؟) کەواتە: ئەی فیرعەون! تۆ ئێمەت نەخوڵقاندوە، حەقیش نیە، بەرنامەمان بۆ دابنێی، چونکە بەتەنها بەدیهێنەر مافی خۆیەتی، کەبەرنامە بۆ دروستکراوانی خۆی دابنێ و، هەر خوای پەروەردگار بەرنامەی بۆ خۆرو مانگ و کەهەکەشان و گەردیلەکان داناوە، تەنها ئەویش بۆی هەیە بەرنامە بۆ ژیانی مرۆڤ دابنێ.

دووەم:

پاشان بەرنامەکانی خوا، کە بۆ هیدایەتی ئینسان و بۆ ڕێکخستنی ژیانی هاتوون، بەپێی ژینگەکان و بەپێی قۆناغەکانی مێژوو، وە بەپێی قۆناغەکانی ژیانی ئینسان هاتوون، کاتێك کەبەشەر ژیانی سادە بووە، بەرنامەیەکی سادەی بۆ هاتوە، ئنجا وردە وردە کە ژیانی گەشەی کردوەو ئاڵۆز بووە، وردەکاریی تێداپەیدابووە، بەرنامەیەکی پڕ وردەکاریی دیکەی بۆ هاتوە، کە بۆ هەموو مرۆڤایەتیی هاتوە، ئەو ڕاستییەشی تێداڕەچاو کراوە.

ئنجا هەندێك کەس لە ڕۆژهەڵات ناسەکان (المستشرقين) گوتوویانە: (محمد (صلى الله عليه وسلم))، هەتا لەشاری مەککە بووە و دەستەڵاتی نەبووە، گوتوویەتی: ئەی گەلەکەم! ئەی هۆزەکەم! من هاتووم بۆ هیدایەتی ئێوە، بەڵام دوایی کەدەستەڵاتی پەیدا بووەو، چووە بۆ شاری مەدینە، ئەو جار باسی ئەوەی کردوە، کە بۆ هیدایەت دانی هەموو عالەم هاتووم!! بەڵام بێگومان ئەوە ڕاست نیە، چونکە زۆربەی ئەو ئایەتانەی کەباسی (جیهانێتیی ئیسلام - عالمية الإسلام) دەکەن، ئایەتی مەککەیین:

١- یەکێك لەو ئایەتانە دەفەرموێ:

﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا كَآفَّةٗ لِّلنَّاسِ بَشِيرٗا وَنَذِيرٗا ﴾ سبأ: ٢٨.

واتە: تۆمان بۆ تێکڕای خەڵکی ناردوە، کەدڵخۆشکەرو ترسێنەریان بی.

٢- هەروەها لەسووڕەتی (الأنبياء)دا کەسووڕەتێکی مەککەییە دەفەرموێ:

﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا رَحۡمَةٗ لِّلۡعَٰلَمِينَ ١٠٧ ﴾ الانبياء: ١٠٧.

واتە: تۆمان نەناردوە، مەگەر بەڕەحمەت بۆ هەموو جیهانییان.

کەواتە: پێغەمبەرمان (موحەممەد) بۆ تێکڕای خەڵکی و گەلانی سەر زەوی هاتوە، بەڵام پێغەمبەرانی دیکە (عليهم الصلاة والسلام) زیاتر بۆ کۆمەڵگایەکی دیارییکراوو، بۆ قۆناغێکی دیاریی کراو هاتوون، وەك خوای

پەروەردگار دەفەرموێ:

﴿لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجًا﴾ المائدة: ٤٨.

واتە: بۆ هەرکامێکتان بەرنامەیەک و ڕێبازێکی دیارییکراومان داناوە، بەڵام دوای ئەوەی خوای باڵادەست و کاربەجێ زانیویەتی مرۆڤایەتی گەیشتۆتە قۆناغێك، شایستەی ئەوەیەو، دەتوانێ کە بەهۆی تەکنۆلۆژیاو پێگەیشتنی فیکرییەوە، کارێك بکات یەك کۆمەڵگای یەکگرتوو لەسەر زەوی بنیات بنێ و، وڵاتە دوورەکان لەیەك نزیك بخاتەوەو، پێکیانەوە گرێ بدات، وەك دەڵێن: دنیا بکاتە دێیەك، خوای زانا و شارەزا، کە ئەوەی لەبەر چاو بووە، دینێکی ناردوە کە بۆ هەموو مرۆڤایەتیی بشێ، بەڵێ ئەگەر سەرنج بدەین بەڕوونیی، دەبینین کە: ئایینەکانی دیکەی پێش ئیسلام، زیاتر بەرنامەی نەتەوەیی بوونەو، هەرکام لە: (هود و صالح و شعیب و لوط و موسی و عیسی و .. هتد) علیهم الصلاة والسلام، فەرموویانە: (یاقومي) هەرکامێکیان تەنها لەگەڵ نەتەوەی خۆیدا قسەی کردوە، بەڵام پێغەمبەری کۆتایی ((صلی الله علیه وسلم)) لەبەر ئەوەی، کە دوایین نوسخەی ئایین و پەیامی خوای پێیە، لەگەڵ هەموو بەشەردا قسەی کردوە، ئنجا بابزانین: (جیهانێتیی ئیسلام) ئەو بنەماو کۆڵەگە سەرەکییانەی کەلەسەریان وەستاوە، چین؟!

ئەگەر سەرنجی ئایەتی ژمارە (١٣)ی سورەتی (الحجرات) بدەین، دەبینین سەرجەم بنەمایەکانی جیهانێتیی ئیسلامی، تێدان، خوای پەروەردگار دەفەرموێ:

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَـٰكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَىٰ وَجَعَلْنَـٰكُمْ شُعُوبًا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓا۟ ۚ إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ ٱللَّهِ أَتْقَىٰكُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ ﴿١٣﴾﴾ الحجرات: ١٣.

واتە: ئەی خەڵکینە! ئێوەمان لەنێر و مێیەك وەدیهێناوە وەگێڕاومانن بەچەند گەل و هۆزێك بۆ ئەوەی یێك ئاشنابن. بێگومان بەڕێزترینتان لەلای خوا، پارێزکارترینتانە، بەدڵنیاییەوە خوا زانای شارەزایە.

ئێستاش با ئەم ئایەتە بەهێز و پیرۆزەی کتێبیی بەرز و مەزنی خوا سبحانه وتعالى بکەینە ئاوێنەیەك و هەوڵبدەین سەروسیمای جیهانێتیی ئیسلام (عالمية الإسلام)ی تێدابەدی بکەین.

ئنجا ئێمە پێنج بنەما و پایەی بنەڕەتیی جیهانێتیی ئیسلام لەم ئایەتە موبارەکە هەڵدەهێنجین:

# پێنج بنەمای بنەڕەتیی
# جیهانێتیی ئیسلام

**بنەمای یەکەم:**

خوای پەروەردگار بانگی هەموو بەشەر دەکا، کە هەموویان خوا خوڵقاندوونی و یەك بەدیهێنەریان هەیە:

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَـٰكُم ﴾ وە ڕەگەزو سروشتی ئینسانەکان یەکێکە، نەك وەك بیردۆزەو سیستەمە نەفامییەکان - بەجیهانگیریشەوە - دەڵێن، جیا جیاو جیاوازبن.

**بنەمای دووەم:**

﴿ مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَىٰ ﴾ هەموویان بێ جیاوازیی و ئیمتیاز لەیەك نێرو مێ دروست بوونەو یەك دایك و باییان هەیە، واتە: ئەی ئینسانەکان! هەمووتان خوشك و برای یەکدین و هەمووتان وەچەی یەك دایك و بابن و، ڕاست نیە وەك (ئەفلاتوون) لەکتێبی (کۆماری ئەفلاتوون)دا دەڵێ: پادشا زادەکان وەك زێڕوان و، فەیلەسووفەکان وەك زیوو، پاڵەوان و عەسکەرییەکان وەك ئاسن و، خەڵکی دیکەش وەك سواڵەت (خزف)!! خوای پەوەردەگار دەفەرمووێ: هەمووتان یەك ڕەگەزو نەژادتان هەیە. ئنجا ئایا کێ مرۆڤایەتیی بۆ گەل و تیرەی جۆراو جۆر دابەش کردوە؟!

بنەمای سێیەم:

﴿ وَجَعَلۡنَٰكُمۡ شُعُوبٗا وَقَبَآئِلَ ﴾ وە ئێمە کردوومانن بەچەند گەل و تیرەیەك، کەواتە: خوا ویستی وابووە، کەمن کوردبم و، ئەو عەرەب بێ و، ئەو تورك بێ و، ئەو ئەفغان و، ئەوی دیکە فارس، وەهەروەها ..هتد، ئا ئەوە ویستی خوایەو، کاری خوای کاربەجێیەو، هەر بۆیەش لەڕوانگەی ئیسلامەوە: هەرکەس و لایەنێك بەهەر بیانوو و پاساوێکەوە، بیەوێ ستەم لە گەل و تیرەیەك بکات و بیان چەوسێنێتەوەو، فەرهەنگ و کلتووریان بتوێنێتەوەو، نیشتیمانیان زەوت بکات و، خێرو بێریان داگیر بکات، ئەوە پێچەوانەی شەریعەت و ویستی خوا جوولاوەتەوە، چونکە خوا (جل جلاله) ویستی وابووە، کە بەشەر بۆ چەند گەل و تیرەیەك دابەش ببێ، ئنجا ئایا حیکمەت و ئامانجی ئەو جۆرە دابەش بوونە چیە؟!

بنەمای چوارەم:

﴿ لِتَعَارَفُوٓاْ ﴾ تاکو بەیەکدی ئاشنابن و یەکدی بناسن، نەك وەك (فۆکۆیاما) دەڵێ: دەبێ خەڵك هەموویان لەشارستانێتی ڕۆژئاوادا، یاخود ڕاستتر بڵێین: ئەمەریکادا بتوێنەوە. (هانتگیتۆن)یش دەڵێ: دەبێ خەڵك دابپڵۆسێنرێ و، لەژێر چەکمەی شارستانێتیی دا، بپلیشێنرێتەوەو لە ژێر سایەی سەرمایەدارییدا، هیچ کەس هیچ گەل و میللەتێك، نابێ خاوەنی بوونی خۆی بێ! بەڵام ئیسلام دەڵێ: ﴿لِتَعَارَفُوٓاْ﴾ بۆ ئەوەی یەکدی بناسن و بەیەکدی ئاشنابن، واتە: ئیسلام نەتەوەکانی وەك خۆیان، قبووڵن، بەڵام دەڵێ: وەرن یەکدی بناسن، هەربۆیە تەماشا دەکەین بەدرێژایی حوکمی ئیسلام، هەرگیز ڕۆژێك لەڕۆژان دەستەڵاتدارێکی ئیسلامیی، کە کەم و زۆر بەپێی شەریعەت بەڕێوە چوون، بیریان لەوە نەکردۆتەوە میللەتێك (جینۆساید)بکەن و بتوێننەوە، یان زمانی بتوێننەوە، کلتووری بتوێننەوە! هەرگیز ڕۆژێك لەڕۆژان دەسەڵاتدارێکی ئیسلام هەر بیریشی لەوە نەکردۆتەوە، چونکە زانیویانە کەخوای پەروەردگار ئیرادەی وابووە، کە میللەتەکان هەموویان، وەك چەپکە گوڵێك، یان وەك باخێك، گوڵی جۆراو جۆری تێدابێ، نەك هەمووی یەك ڕەنگ بێت، ئنجا ئایا تەرازوو و پێوەری هەڵسەنگاندنی ئینسانەکان چیە؟!

**بنەمای پێنجەم:**

﴿إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ ٱللَّهِ أَتْقَىٰكُمْ﴾ ئەوكەسەی لەهەموو كەس پارێزكارترە، لەهەموویان لەلای خوا، بەڕێزترە، ئنجا سەرنج بدەن، خوا فەرموویەتی: لەلای خوابەڕێزترتان ئەو كەسەیە، كە بەتەقواتر بێت، نەیفەرمووە لەدنیادا، بۆ ئەوەی كەس لەدنیادا نەڵێ: لەبەر ئەوەی من مسوڵمانم، ئاواو ئاوام.

بەڵێ، ئێمە قەناعەتمان وایە كە ئەوەی مسوڵمان بێت دەچێتە بەهەشت و، ئەوەی نامسوڵمان بێت دەچێتە دۆزەخ، بەڵام نابێ هیچ كەس مسوڵمانەتییەكەی، بكات بەپاساوی ئەوەی، كە لەفلان كەس بەڕێزترە، چونكە خوا فەرموویەتی:

﴿وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِىٓ ءَادَمَ﴾ الاسراء: ٧٠.

واتە: بێگومان ڕێزمان لەوەچەی ئادەم گرتوە، بەڵێ: سەرجەم ئادەمیزادەكان وەك ئینسان ڕێزیان لێ گیراوە، دینەكەی هەرچی بێ، ئینسان لە خۆی دا بەڕێزەو دەبێ ڕێزی لێ بگیرێ، لە سوننەت دا هاتوە، كە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ڕۆژێك لەشوێنێك دانیشتبوو، جەنازەیەكیان بەوێدا هێنا (جەنازەی كابرایەكی جوولەكە) ئەویش لەبەری هەڵسا، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ئەوە جوولەكەیە! (يا رسول الله إنها جنازة يهودي)، ئەویش فەرمووی: (أليست نفساً؟)[1] ئەدی نەفس نیە، ئینسان نیە؟! واتە: باجوولەكەش بێ، مادام ئینسانە، بەمردوویی و بەزیندوویی من ڕێزی لێدەگرم، چونكە خوا ڕێزی لێ ناوە، ئەمەش بۆ هەڵس و كەوتی ژیانی دنیایە، بەڵام ڕێزو پلەو پایەی ئینسان لەدوارۆژدا، پەیوەستە بەتەقواوە، تەقواش بەهەموو كەس وەدەست دێ، چونكە نەپەیوەندیی بەنێرایەتییەوە هەیە و، نەبەمێیایەتیی، نەبەدەوڵەمەندیی و نەبەنەداریی، نەبەخوێندەواریی و نەبەنەخوێندەوارییەوە، پەیوەندیی بەهیچ شتێكەوە نیە، كەئینسان نەتوانێ بەدەستی بهێنێ، وەك: ڕەگەزو ڕەنگ و زمان و ڕەچەڵەك و...هتد، بەڵكو هەمووكەس دەتوانێ تەقوا پەیدابكات، ئنجا ئیسلام،

---

(١) رواه البخاري: ١٢٥٠، ومسلم: ٢٢٦٩، وأحمد في المسند: ٢٣٨٩٣.

کە ویستوویەتی ببێتە سێبەری مرۆڤایەتیی و، ئایینێکی خوایی ئینسانییەو، بۆ هەموو بەشەر هاتوە، بەپێچەوانەی سیستەمە نەفامیی و طاغووتییەکانەوە، نەهاتوە: هەندێك لەخەڵکی بکاتە خزمەتکاری هەندێکی دیکەیان و، هەندێکی لە ژێر پێی هەندێکی دا بپڵیشینێتەوە، وە نەهاتوە کەخەڵك وەك کۆمپانیاو کارگە تەماشا بکات، کەهەرچی زیاتر بەرهەمیان پێ وەدەست بهێنێ! هەربۆیەش لەفتووحاتی ئیسلامییدا بە پێچەوانەی تێگەیشتنی زۆر کەسەوە: کاتێك کە سوپای ئیسلام هاتوەو، وڵاتێکیان ئازاد کردوەو، ئیسلامیان پێ گەیاندوون، وەخەڵکەکە هاتوون و گوتوویانە: ئەرێ چیمان لێ داوا دەکەن و، بۆچی هاتوون؟! گوتوویانە: تەنها ئەوەتان لێ داوا دەکەین، کەئەم ئایینەمان لێ وەربگرن، ئنجا ئەگەر ئیسلامتان لە ئێمە وەرگرت، ئەوە ئێوەش وەك ئێمەن: (لكم مالنا وعليكم ما علينا) هەمان ماف کە ئێمە هەمانە، بۆ ئێوەش هەیە، وە هەمان ئەرك کە لەسەرشانی ئێمەیە، لەسەرشانی ئێوەش، بەڵام ئەگەر وەرتان نەگرت، قەیناکات، بەس دژایەتیی ئیسلام مەکەن و سەرانە بدەن، وە وەك پێشتر باسمان کردوە[1]، قسەی بەهێزتری زانایانیش ئەوەیە، کە هەموو خاوەن فیکرەیەك: موشریك، مولحید، مەجووسیی، نەصرانیی، جوولەکە، سەرانەی لێ وەردەگیرێ و لێی قبووڵ دەکرێ، کە هاووڵاتیی بێت و لە ژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامییدا بژی[2]، چونکە خوای پەروەردگار ئینسانی بۆیە دروست کردوە، کەتاقی بکاتەوە، ئنجا چۆن تاقی دەکرێتەوە، ئەگەر بواری نەدرێ کافر بێ؟! خوای دادگەریش فەرموویەتی:

﴿ وَقُلِ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّكُمۡۖ فَمَن شَآءَ فَلۡيُؤۡمِن وَمَن شَآءَ فَلۡيَكۡفُرۡ ﴾ الكهف:٢٩.

واتە: بڵێ: هەق لەپەروەردگارتانەوەیە، ئنجا کێ پێی خۆشە، بائیمان بێنێ و، کێ پێی خۆشە باکافربێ.

---

(١) وەك لە ئاڵقەی (دووەم) و ئاڵقەی (سێیەم) دا ڕوونمان کردۆتەوە.

(٢) پێشتریش باسمان کردوە، کە سەرانە (جزية)دان، مەرجی حەتمیی هاووڵاتیی بوونی نامسوڵمانان نیە و، ئەوە دەکەوێتەسەر جۆر و چۆنیەتی ئەو ڕێککەوتنە، کە لەنێوان ئەوان و دەوڵەتی ئیسلامیی دا دەکرێ.

دیارە کەکافریش بوو، وەك هاوولاتییەك مادام لەژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامییدا بێت، ڕێزی لێدەگیرێ، وەك ئینسانێك ڕێز لە ئایین و پیرۆزییەکانی دەگیرێ، تەنانەت خوای پەروەردگار دەفەرموێ:

﴿ وَلَا تَسُبُّوا۟ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ ﴾ الأنعام: ١٠٨.

واتە: جنێو بەپەرستراوەکانیان کە لە جیاتی خوا دەیان پەرستن، مەدەن، یانی: جنێو بەبت و صەنەمەکانیان مەڵێن و، قسەی ناشیرینیان پێ مەڵێن، چونکە ئەو ئینسانە مادام خۆی ئەوەی هەڵبژاردووە، خوای پەوەردگار، کەخاوەنیەتی ئەو بوارەی پێداوە، کەس بۆی نیە ئەو مافەی لێ زەوت بکات، وە هیچ کەسیش بۆی نیە بەبیانووی کافر بوونەوە، یەخەی پێ بگرێ، چونکە ئەو لێپرسینەوەیە، تەنها مافی خوایەو لەدادگای خوا لەقیامەتدا دەکرێ، وە ژیانی دنیا جێی تاقیکردنەوەیەو، نابێ لێرە ئەنجامەکەی وەربگیرێتەوەو لەقیامەت خوا بۆخۆی وەری دەگرێتەوە، بەڵام ئێستا دەبێ هەموو کەسێك بواری پێ بدرێ، چ ڕێیەك دەگرێ، بیگرێتە بەر، وە ئیسلام هەرکات دەسەڵاتی بوو، تەنیا لەدوو شتاندا تەدەخخول (تدخل)دەکات:

یەکــەم:

لە لابردنی زوڵمدا، وەك خوای کاربەجێ ڕوو لەمسوڵمانان دەکات و دەفەرموێ:

﴿ وَمَا لَكُمْ لَا تُقَـٰتِلُونَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱلْمُسْتَضْعَفِينَ ﴾ النساء: ٧٥.

واتە: ئەوە چیتانە! بۆچی لەڕێی خواو چەوساوان دا ناجەنگن؟! بەڵێ، ئەگەر ئیسلام دەسەڵاتێکی هەبێ و، دەوڵەتێکی هەبێ، قبووڵ ناکات هیچ کەسێك زوڵمی لێ بکرێ، بامسوڵمانیش نەبێ، قبووڵ ناکرێ بچەوسێنرێتەوە، چونکە ئیسلام دەڵێ: خوا تبارك وتعالى ئەو خەڵکەی بۆ ئەوە دروست کردوە، کە بەندایەتیی بۆ بکەن، بۆیە ئەی حوکمڕانەکان! مەیانچەوسێننەوەو مەیانکەن بەکۆیلەو، با ئازاد بن، تاکو بزانین بەندایەتیی بۆ خوا دەکەن، یان نایکەن؟ بابەوجۆرە تاقی بکرێنەوەو، ئیمتیحانی ژیانی دنیایان بدەن.

دووەم:

هەروەها ئیسلام بۆ چەسپاندنی دادگەرییش، هێز بەکاردێنێ: وەك خوای دادگەر بەپێغەمبەری (صلى الله عليه وسلم) فەرمووە، کە بفەرمویٚ:

﴿وَأُمِرْتُ لِأَعْدِلَ بَيْنَكُمُ﴾ الشورى-١٥-.

واتە: فەرمانم پێکراوە کەلەنێوانتاندا دادگەر بم. هەڵبەتە چەسپاندنی دادگەرییش پەکی لەسەر هێز و دەستەڵات کەوتوە.

# بەشی سێیەم

## بەراوردێك لەنێوان جیهانگیریی ڕۆژئـــاوا و جیهـانێتیی ئیسلامدا[1]



(١) دیارە ئەم بەراوردکردنە، زیاتر پێداچوونەوەی هەردووك بەشی یەکەم و دووەم و، دووبارە سەرنج دانەوەو، زیاتر ناسینی ماهیەتی هەرکام لە جیهانگیریی و جیهانێتیە.

لە ئەنجامی ئەوەدا، کە ئیسلام دەڵێ: خوا خاوەنی بوونەوەرو ئینسان و ژیانە، وە دنیا جێی تێدا تاقیکردنەوەیە، وە ئینسان تەنیاجەستە نیەو ڕووحیشە، وە ئینسانەکان هەموو پێکەوە خوشك و بران و لەباب و دایکێك، کەبریتین لە ئادەم و حەووا، هاتوون، وە دەڵێ: مادام خواو قیامەت هەبن، دەبێ شتەکان هەموویان پەیوەست بن بەئەخلاق و بەهاکانەوە.

بەڵام ڕۆژئاوا لەسۆنگەی ئەوەوە کە: یان دەڵێ: خوا نیە (سبحانه وتعالى)، یان دەڵێ: ئەگەر هەش بێت، مافی ئەوەی نیە دەست بخاتە کاروباری ئێمەوە!! وەك کاتی خۆی دەیانگوت: لەبلووکی سۆسیالیزم و (یەکێتی سۆڤیەت)دا دەڵێن: خوا نیە، بەڵام لەئەورووپاو ڕۆژئاواو جیهانی کاپیتالیزم دا دەڵێن: خوا هەیە، بەڵام ئەو خوایە خۆمانین، (سبحان الله عما يصفون)!! هەروەها جیهانگیریی ڕۆژئاواو جیهانێتیی ئیسلام لەتێڕوانینیشیاندا، بۆ ئینسان و ژیان زۆر جیاوازن، چونکە لەڕوانگەی شارستانیەتی ڕۆژئاواوە، ئینسان هەر جەستەیەو غەریزە ماددیی و ئاژەڵییەکانیەتی، وە لەبارەی ڕۆژی دوایی و قیامەتەوە، یان هەر بڕوای پێی نیە، یان بەڕواڵەت بڕوای پێی هەیە، بەڵام هیچ حیسابی بۆناکات، هەروەها لەو ڕوانگەیەوە، ئینسانەکانیش یەکسان نین[1]، هەر بۆیە فەلسەفەی (نیتشە) و ژمارەیەك لەفەیلەسووفەکانی ڕۆژئاوا دەڵێ: هەرکەسێك بێ هێزو بێ دەستەڵات بێ، مافی ژیانی نیە، هەربۆیەش دەبینین ساڵی وا هەبووە کەوڵاتانی ڕۆژئاوا بەتایبەتی ئەمەریکا، چەندان ملیۆن تەن گەنم و دەغڵ و دانی خستۆتە دەریاکانەوە، کەلێی زیاد بووە، هەروەها کەل و پەلی دیکە کە لێیان زیاد دەبێ، دەیفەوتێنن و دەیسووتێنن، لەکاتێکدا کە لە ئەفەریقیاو ڕۆژهەڵاتی ئاسیاو، لەزۆرێك لەوڵاتانی دنیادا، ساڵانە هەزاران کەس لەبرسان دەمرن! چونکە هاندەرێك نیە پاڵیان پێوەبنێ و بڵێن: با ئەوانەش لە برسان نەمرن و وەك ئێمە مرۆڤن و، ئێمە دنیامان پڕ کردوە لەباسی مافەکانی مرۆڤ، بۆچی ئەوەی لێمان زیادە لێرە خەساری بکەین، بابەلای کەمەوە هەر بەرماوەکەیخۆمان بدەین

---

(١) هەرچەندە لە ئەورووپا و ئەمەریکا زۆر بانگەشە بۆ مافەکانی مرۆڤ و یەکسانیی و ئازادیی دەکرێ، بەڵام بەکردەوەو لەواقیعدا ئەو ستەم و بێدادیی و فەرق و جیاییەی لەوێ هەیە، وێنەی لەدنیادازۆر کەمە، وە لووت بەرزیی و خۆ پێ زۆریی و لافی ئیمتیاز هەبوون لێدانیان بەسەر غەیری خۆشیان دا، هەرباس ناکرێ و وێنەی نیە.

بەوان و، پاشماوەكانی خۆمانیانی پێ بدەین! بەڵام نەخێر، بیردۆزە فەلسەفەكانیان دەڵێن: مادام توانایان نیەو نەدارو بێچارەن، باهەرنەژین.

وەلە كاتێكدا كە ئینسانێكی ئەمەریكی (٧٠) بەرانبەر، (١٠٠) بەرانبەر ئینسانی شوێنێكی دی دەخل و واریداتی هەیە، سۆزو بەزەیی ناجوولێ بەرانبەر بەكەسانێك، كە (نان)ێكیان دەست ناكەوێ؟ بەڵام هەرگیز ئەو جۆرە دیاردەو حاڵەتانە لەئیسلام و سیستمی حوكمڕانییەكەی دا جێیان نابێتەوە، ئنجا وەك پێشتریش ئاماژەمان بۆ كرد، هۆكاری سەرەكی ئەو دیاردەیە دەگەڕێتەوە بۆ لەززەت وەرگرتنی زیاتری ماددیی و زاڵكردنی بەرژەوەندیی تایبەتی، ئاشكراشە كەلەسایەی سیستمی سەرمایەداریدا، لەززەت و بەرژەوەندیی ئەوانەی كەسەرمایەدارن و هەبوون و خاوەن دەسەڵاتن، تاكە بەرژەوەندییەكە كە ڕەچاو بكرێ و حیسابی بۆ بكرێ، بەڵام ئیسلام هەموو شتێك لەڕوانگەی بەهاكان و ئەخلاقەوەو لەڕوانگەی قیامەت و بەزەیی و ویژدانەوە، تەماشا دەكات.

ئێستاش با بۆ چاكترو زیاتر لەیەك جیاكردنەوەی ئەو دوو جۆرە تێڕوانین و ڕێبازە، سەرنجی كتێبی خوا بدەین، داخۆ چۆن بۆمان باسی هەركام لەو دوو جۆرە ڕێبازە دەكات:

خوای پەروەردگار باسی فیرعەونمان بۆ دەكاو، باسی (ذو القرنین)یشمان بۆ دەكات، وەك دوو نموونە، بۆ شێوەیەك لەجیهانگیریی، وەشێوەیەك لەجیهانێتیی:

## (( ذوالقــرنين ))

## وێنەیەكی گەشی جیهانێتیی

كە نموونەی سیستمی جیهانێتییە، خوای پەروەردگار لە سوورەتی (الكهف) لە ئایەتەكانی: (٨٣-٩٨)دا بەسەرهاتەكەی باس دەكات، كە سەرەتا تاكو رۆژئاواو، پاشان تاكو رۆژهەڵات چووە، واتە هەموو دنیای گرتوە، ئنجا ئایا ئەو پیاوە كێ بووە؟ هەندێك دەڵێن: (ئەسكەندەری مەقدوونیی) بووە، بەڵام زۆربەیان دەڵێن: ناگونجێ (ذو القرنين) (ئەسكەندەر) بووبێت، چونكە ئەو ئەسكەندەرە كابرایەكی بتپەرست و هاوبەش دانەر بووە، بەڵام (ذو القرنين) پیاوێكی صالح و خواپەرست بووە، ئنجا بەهەر حاڵ بابزانین (ذو القرنين) بەرنامەو سیاسەتی چۆن بووە؟ خوای دادگەر دەفەرموێ:

﴿قُلْنَا يَٰذَا ٱلْقَرْنَيْنِ إِمَّآ أَن تُعَذِّبَ وَإِمَّآ أَن تَتَّخِذَ فِيهِمْ حُسْنًا ﴿٨٦﴾﴾ الكهف: ٨٦ .

واتە: گوتمان: ئەی (ذو القرنين)! بۆت هەیە ئەوانەی كەخراپەكارن، ئەشكەنجەیان بدەی و، ئەوانەش كە چاكە كارن، چاكەیان بدەیەوە، (ذو القرنين)یش لە بارەی سیاسەت و بەرنامەی مامەڵەكردنی لەگەڵ میللەتانی ژێر ركێفی یەوە، دەڵێ:

﴿قَالَ أَمَّا مَن ظَلَمَ فَسَوْفَ نُعَذِّبُهُۥ ثُمَّ يُرَدُّ إِلَىٰ رَبِّهِۦ فَيُعَذِّبُهُۥ عَذَابًا نُّكْرًا ﴿٨٧﴾ وَأَمَّا مَنْ ءَامَنَ
وَعَمِلَ صَٰلِحًا فَلَهُۥ جَزَآءً ٱلْحُسْنَىٰ ۖ وَسَنَقُولُ لَهُۥ مِنْ أَمْرِنَا يُسْرًا ﴿٨٨﴾﴾ الكهف:٨٧-٨٨.

واتە: گوتی: هەركەسێك ستەم و خراپە بكات، ئەوە ئێمە لەمەودوا ئەشكەنجەی دەدەین، پاشان دەگێڕرێتەوە بۆ لای پەروەردگارو خاوەنی و ئازارێكی سەختی

دەدات، بەڵام کەسێك ئیمان بێنێ و کردەوەی چاك بکات، ئەوە پاداشتی هەرە چاکی لەلای خوای هەیەو، ئێمەش بێگومان لەلایەن خۆمانەوە قسەیەکی خۆش و ئاسانی لەگەڵ دەکەین!

بەڵێ، وەك ئاماژەم بۆ کرد: ئیسلام کاتێك دەستەڵاتی هەبێ، بەهیچ ڕەنگێك ڕێ نادات زوڵم و ستەم بکرێ و، توند یەخەی ستەمکار دەگرێ و لەگەڵی تێك دەگیرێ! ئەوە ڕاستییەکە، دەیان دەقی قورئان جەختیان لەسەر کردۆتەوە، سەرنج بدە! چۆن (ذو القرنين) نموونەی حوکمڕانی صالح و پەسەندی لای خوا (تبارك وتعالى) باسی کوفری ئەو میللەتانە ناکات، کە بێگومان کافر و بێ دینیش بوونە، واتە: باسی ئەوە ناکات، کەلەسەر کوفرەکەیان لێیان تووڕە بێت و سزایان بدات، بەڵام باسی ستەم و دەست درێژیی یەکەیان دەکات و، سزاو جەزرەبەی خۆیشی لەبەرانبەری دا دەخاتە ڕوو! بەڵێ، دەستەڵاتی ئیسلامیی، دەتوانێ لەگەڵ (کفر)دا بژیەت و مەدار بکات، بەڵام ئەوەی لەگەڵی هەڵناکات، ستەم (ظلم)ە، واتە: دەوڵەت و دەستەڵاتی ئیسلامیی، ڕێ دەدات خەڵك کافر بێت، چونکە دنیا جێگای تێدا تاقیکردنەوەی بەندەکانەو، دەبێ دەرفەتی ئەوەیان پێ بدرێ، ئیمان بێنن یان نەهێنن، بەڵام دەوڵەتی ئیسلامیی، ڕێ بەستەم و دەستدرێژیی نادات، چونکە دنیا بۆ ئەوە دانەنراوە، کەفیرعەون و تاغووتەکان کوێخایەتیی و ستەم و زۆری تێدابکەن.

پاشان (ذو القرنين) لە کۆتایی ئازادکردنی وڵاتان و ڕزگارکردنی گەلانی چەوساوەو ژێر دەستەدا، دەگاتە شوێنێك کە زۆر دوورو پەڕیدە بووە و میللەتێکی لێ بووە، زۆر بەجێماو بوون و تەنانەت بەزەحمەت توانیویانە لەقسان حاڵی ببن:

﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ بَيۡنَ ٱلسَّدَّيۡنِ وَجَدَ مِن دُونِهِمَا قَوۡمٗا لَّا يَكَادُونَ يَفۡقَهُونَ قَوۡلٗا ﴿٩٣﴾ ﴾ الكهف:٩٣.

پاشان ئەو گەلە بێچارەو بەجێماوە، داواکارییەك ئاڕاستەی حوکمڕانی صالح و دەستڕۆیشتوو دەکەن، کە بریتیە لەوەی بەربەست (سدّ)ێکیان بۆ دروست بکات، لەنێوان ئەو دوو چیایەدا، کە دەکەونە بەینی خۆیان و (يأجوج مأجوج)ەوە،

کەگەلێکی هارو بەد ڕەفتار بوونە، بۆ ئەوەی لەشەڕو زیانیان سەلامەت بن:

﴿ قَالُواْ يَٰذَا ٱلْقَرْنَيْنِ إِنَّ يَأْجُوجَ وَمَأْجُوجَ مُفْسِدُونَ فِى ٱلْأَرْضِ فَهَلْ نَجْعَلُ لَكَ خَرْجًا عَلَىٰٓ أَن تَجْعَلَ بَيْنَنَا وَبَيْنَهُمْ سَدًّا ﴿٩٤﴾ ﴾ الكهف:٩٤.

ئنجا جێی سەرنج ئەوەیە، کە ئەو میللەتە بێچارە، بۆ (ذو القرنین) پێشنیار دەکەن کە پارەو پیتاکی بۆ کۆبکەنەوە، بۆ مەسرەف و خەرجیی ئەو بەربەستە! بەڵام ئایا (ذو القرنین) ئامادەیە، کە وەك ئەمریکای کوێخای جیهانگیریی، بەبیانووی دیفاع لێکردنیانەوە، هەر هەقدەستشیان لێ وەربگرێتەوە، چ جای هەموو خێرو بێری وڵاتیان بەتاڵان ببات و کۆبکاتەوە؟! نەخێر، بەڵکو:

﴿ قَالَ مَا مَكَّنِّى فِيهِ رَبِّى خَيْرٌ فَأَعِينُونِى بِقُوَّةٍ ﴾ الكهف: ٩٥.

دەڵێ: ئەوەی کەخوا (جل وعلا) منی تێدا باڵا دەست کردوە، چاکترەو پارەو سامانم هەیەو، پێویستییم بەپارەی ئێوە نیە، بەڵام بەدەستی کرێکاران (الأیدی العاملة) یارمەتییم بدەن، بۆ ئەوەی بەربەستێکتان لەبەیندا دروست بکەم، وە سەرەنجام بەربەستێکی لەبەیندا دروست کردن.

کەواتە: (جیهانێتیی ئیسلام) ئەو سیستمە جیهانییەی، کە ئیسلام دەیەوێ، دەبێ ئاوا بێت و دژی زوڵم بێ و، دیفاع لەمەزڵوومان بکات، ئنجا بەپارەی خۆیشی دیفاع لەمیللەتە مەزڵوومەکان بکات، نەك وەك ئەمەریکا، کە لە ساڵی (١٩٩١) دا بەپارەی حکوومەتە خەلیجییەکان بەحیساب هات سوپای (صەددامی) لە کوێت دەرکرد، بەڵام هێندەی مەسرەف پێکردن، ئێستاش قەرزداری ئەمەریکان!! واتە: نەك تەنها ڕۆنی خۆیانی لەسەری خۆیان دایەوە، بگرە زۆر زۆریشی لەسەر قەرزدار بوونەوە، چونکە ئەگەر بایی دۆلارێك دیفاعی لێ کردبن، بایی هەزار دۆلار لێیان بەهرەمەندە بووە!! ئنجا ئەوە سیاسەت و تێڕوانینێکی ماددییانەو جیهان گیرییانەیەو، ئەوەی دیکەش سیاسەتێکی ڕەببانییانەو جیهانییانەیە.

## (( فـیرعەون ))

## نموونەیەكی دزێوی جیهانگیریی

سیستەم و سیاسەتی فیرعەونیش نموونەیەكی مێژوویی جیهانگیرییە، جابزانین فیرعەون لەسەر ئەو سێ كوچكە شوومە: (زۆر و زێڕو تەزویر) چی لە خەڵكەكە دەكرد؟! خوای پەروەردگار دەفەرموێ:

﴿ إِنَّ فِرْعَوْنَ عَلَا فِي ٱلْأَرْضِ وَجَعَلَ أَهْلَهَا شِيَعًا يَسْتَضْعِفُ طَآئِفَةً مِّنْهُمْ يُذَبِّحُ أَبْنَآءَهُمْ وَيَسْتَحْيِۦ نِسَآءَهُمْ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ مِنَ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٤﴾ ﴾ القصص:٤.

واتە: بێگومان فیرعەون لەسەر زەوی دەستەڵاتی پەیداكرد، وە خەڵكەكەی بەش بەش كرد، هەندێكیانی دەچەوساندنەوە، كوڕەكانیانی سەر دەبڕی و ئافرەتەكانیانی دەهێشتەوە، بێگومان ئەو لەخراپەكاران و تێكدەران بوو.

بەڵێ، پەرێزو بەرهەمی شوومی ئەو سیستمە جیهانگیرییە مێژووییەی فیرعەونیش، ئاوا بووە، بۆیە خەڵك دەبێ بپرسێ: بۆچی خوای پەروەردگار لەو هەموو شوێنانەی قورئاندا بەسەرهاتی فیرعەون دەگێڕێتەوەو، بۆچی هێندە بەسەرهاتی (مووسا) دەگێڕێتەوە؟! بێگومان خوای دادگەر دەیەوێ ئێمە (موسی) (علیه الصلاة والسلام) بكەینە سەر مەشقی خۆمان، وە دەیەوێ كە دیكتاتۆرو طاغووتەكانیش پەند لەفیرعەون وەربگرن، فیرعەونەكان هەرچەندە دەستەڵات داربن، سەرەنجامیان هەر تێچوونە، مووسا و مووسا ئاساكانیش، هەرچەندە مەزڵووم و بێ دەست و گرفتار بن، بەڵام سەرەنجام بەپێی یاسا و سوننەتی خوا، مادام خۆڕاگرو پشوو درێژوو بەردەوام بن، هەر سەر دەكەون،

چونکە ویستی خوایان لەپشتەوەیە، وەك خوا فەرموویەتی:

﴿ وَنُرِيدُ أَن نَّمُنَّ عَلَى ٱلَّذِينَ ٱسۡتُضۡعِفُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَنَجۡعَلَهُمۡ أَئِمَّةٗ وَنَجۡعَلَهُمُ ٱلۡوَٰرِثِينَ ٥ ﴾ القصص:٥.

واتە: وە دەمانەوێ کە چاکە لەگەڵ ئەوانەدا بکەین، کە لەزەوی دا، چەوسێنراونەوە، وە بیانکەینە پێشەوا و بیانگێڕین بەمیراتگر (ی ستەمکاران).

لە کۆتایی ئەم توێژینەوەشدا، لەبارەی گلۆبالیزەیشن (عولمة)ەوە، دەڵێم: هەڵوێستی شەرعیی و ڕاست و دروست، بەبۆچوونی ئێمە لەبارەی جیهانگیرییەوە، ئەوەیە، کە ئێمە جیهانگیریی، هەمووی بەیەك چاو تەماشا نەکەین و، بەتەرازوی شەرع هەڵیسەنگێنین و، چاکەو خێرەکەی لەلایەك دابنێین و، نەگبەتیی و شەڕەکەشی لەلایەك دابنێین و بڵێین: پشتگیریی ئەو خێرو چاکانەت دەکەین و، دەست خۆشیشی لێ بکەین، بەڵام بوێرانەش بەرانبەر بەخراپەکانیشی بڵێن: ماڵی قەڵب سەر بەخاوەنیەتی، وە بڵێین: جەنابی ئەمەریکا! تۆ دەتەوێ لە بابۆڵە خواردنەوە، تاکو سەییارە دروست کردن و .....هتد، لەهەمووشتێکدا شوێن تۆ بکەوین!! نەخێر من نانی خۆم بەشێوەی خۆم دەخۆم، بۆچی دەبێ تۆ (هەمبەرگرو ساندویچ و پیتزا) و شێوەی بابۆڵە خواردنیشم بۆ بێنی؟! ئایا ئێمە تاکو ئێستا نەمان زانیوە، بەلای کەمەوە نان بخۆین؟! تۆ بۆچی دەتەوێ تەنانەت لەجل و بەرگ پۆشین و عادەت و نەریت و ژیانی ڕۆژانەو، تەنانەت لەئاو خواردنەوەشدا، وەك تۆ بکەین؟! بۆچی ئێمە تائێستا بنیادەم نەبووین و کلتوورو فەرهەنگێکمان نەبووەو ئایین و ڕێبازێکمان نەبووە؟!

بەڵێ، دەبێ بەئەمەریکاو ڕۆژئاوا بڵێین: ئەوانەی خۆت بۆ خۆت، تۆ بۆچی فەرهەنگ و کلتووری خۆت، عادەت و نەریتی خۆت، لەسەر ئێمە فەرز دەکەی؟ شتی خۆت کەتایبەتمەندیی خۆتە، بۆ خۆت، بەڵام تەکنۆلۆژیایەکەت، کە زادە و بەرهەمی فیکر و ئەزموونی سەرجەم بەشەرییەتەو بەتەنیا هی تۆ نیە، تاکو بیکەیە منەت بەسەرمانەوە و بەهۆی ئەوەوە منەتبار و چاوبەرژێرت بین! چونکە کاتی خۆی بەپێی[1] خۆی تەکنۆلۆژیاو بەرەو پێش چوونی پیشەسازیی و زانستی سروشتیی، لەسەر دەستی زاناو شارەزا مسوڵمانەکان بنیات نراوە و، دیارە دیسان ئەوانیش بەتەنێ هی خۆیان نەبووەو، ئیستیفادەیان کرد، لەشارستانێتیی میصر و ڕۆم و فارس و یۆنان و، کتێبەکانیان تەرجەمە کردن، بەڵام بێگومان زیادەی خۆشیانیان زۆر خستەسەری، وە ئەو تەکنۆلۆژیایە، بەرهەم و کەلەپوورێکی گشتییەو، هەموومان بەشمان پێیەوەیە، بەڵێ، با بەڕاشکاویی و بوێرانە بەرۆژئاواو جیهانگیرییەکەی بڵێین: چاکە و خێرەکانت بەسەرچاو، بەڵام شەڕو خراپەکانت و عادەت و نەریتی خۆت، بیردۆزەو فەلسەفەی پووچی خۆت، بۆ خۆت، تۆ کە پیاو

---

(١) واتە: لەقەدەر ئەوساو بەوگوێرەی ئەوکاتە.

لەپیاو مارە دەکەی، ئەوە لەلای ئێمە شتێکی نامەعقوولە، یان ژن لەگەڵ ژن، وەکچ پێش ئەوەی شوو بکات لەلای ئێوە جاری وایە سێ چوار منداڵی دەبن و، دەوڵەتیش ناچارە بەخێویان بکات!! ئا ئەو شتانە عادەت و نەریتی شایستەی خۆتانن و، بەکەڵکی ئێمە نایەن، چونکە دینمان ڕێمان نادا و، عەقڵیشمان پەسندیان ناکات!

بەڵێ، هەڵوێستی شەرعییانەو ژیرانە لەبەرانبەر جیهانگیرییدا، ئەوەیە کە: خێرەکەی لێ وەربگرین و، شەڕەکەشی بە سەردا بدەینەوە، وە تەنها ئەوە شتێکی شەرعییانەو عاقڵانەیە، نەك وەك هەندێك فەقیر حاڵی بەهەڵەداچوو دەڵێن: پێمان وابێ دەبێ لەهەموو شتێك دا تەسلیمی بین، یان هەموو شتێکیان ڕەفز بکەین و بەشەڕەکەیانەوە، خێرەکەشیان ڕەفز بکەین، وەك چۆن بابەخێرەکەیانەوە، شەڕەکەشیان قبووڵ نەکەین.

ئنجا ئێمە باهەر تەماشای خەڵکی ئەورووپا بکەین: دەبینین زۆر لەخەڵکی ڕۆژئاوا، زۆر نارەزایەو چەندە بێزارە لەو واقیعی گەندەڵی جیهانگیرییە، چونکە دەزانن سەری بەکوێ دەگات، وەك خوا فەرموویەتی:

﴿وَشَهِدَ شَاهِدٌ مِّنْ أَهْلِهَآ﴾ يوسف -٢٦-.

ئێمە ئەگەر هەر تەماشای ئەوان بکەین، دەبینین خۆیان چەندان خۆپیشاندان دەکەن و، چەندان کتێب دەنووسن، لەسەر (جیهانگیریی)، ئەگەر هەر شتەکانی خۆیانیش بخوێنینەوە، خێرو شەڕو چاك و خراپی جیهانگیریمان، تارادەیەك بۆ مەعلووم دەبێ، بەکورتیی: بائێمە وەك دارکەری شەوێ، جیهانگیریی هەمووی ڕەفز نەکەین، وە هەموویشی قبووڵ نەکەین، بەڵکو لەبێژینگی بدەین، بەبێژینگی عەقڵ و شەرع، چاك و خراپ و، (دان) و(کا)ی لەیەك جیا بکەینەوە.

خوای بەخشەرو بەبەزەیی بەکەرەمی بێ سنووری خۆی، میللەتانی مسوڵمان بەگشتی و، میللەتی مسوڵمانی کوردستان بەتایبەت، زیاترو چاکتر بخاتە سەر جادەی شەریعەت و، بیپارێزێ لەشەڕو زیانەکانی جیهانگیریی، وەتۆفیقیشمان بدات، کە لەخێرو چاکەکانی بەهرەمەند بین، بەشێوەیەکی شەرعییانەی گونجاو لەگەڵ بەرژەوەندییەکانماندا.

## ئەم ئاڵقەیە

ئەم ئاڵقەی پێنجەمەش لەزنجیرەی (چەند مەسەلەیەکی باوی سەردەم) وەك هاوەڵەکانی دیکەی، لەبنەڕەت دا وتارێکی بەندبووە، کە لەهۆڵی (ڕۆشنبیریی)دا دراوە، لەسلێمانی لەکۆڕێك دا کە لەڕۆژی: ٧ / رجب / ١٤٢٣ ك، بەرانبەر: ٢٠٠٢/٩/١٤ز دا بۆبەندە بەسترابوو.

هیواداریشم ئەم بەرهەمە تیشکێکی باش بخاتەسەر سیکۆلاریزم (Secularism)، کە بڵاوترین ئایینی دەستکردی ئەم ڕۆژگارەیە، هەرچەندە کاتی خۆی ڕۆژئاوا بەناچاریی پەنای بۆبردوە. بەڵام لەم ڕۆژگارەدا شوێنەوار و دەرهاوێشتە خراپەکانی، زۆر بەئاشکرا دەرکەوتوون و، هەرکەسێك عەقڵ و ویژدانی هەبێ و، خۆی بەدڵسۆزی کۆمەڵگا و ئۆممەتەکەی بزانێ، نکوولێی لەوەناکات.

**وە سیکۆلاریزم لەدوو ڕووەوە لەمسوڵمانان حەڕام و قەدەغەیە:**

**یەك:** چونکە ئایینێکی دەستکردی مرۆڤە و، جێگرەوە (بدیل)ی ئیسلامە و هەرکەس بڕوای پێبهێنێ - بەمەرجێك وەك خۆی بیناسێ و چەواشەنەکرابێ و بەسەهوونەبرابێ - فڕی بەئیسلامەوە نامێنێ.

**دوو:** ڕۆژئاوا لەسۆنگەی ڕووکردنە سیکۆلاریزمەوە، گیرۆدەی چەندان نەهامەتیی و قەیران و کێشەی بێڕەزابوون، کە پشوویان پێ سوارکردوە.

لەخوای بەرز و مەزنیش داواکارم، کە بەچاکە و لوتفی بێ سنووری خۆی، گەلی کوردی مسوڵمان و گەلانی دیکەی مسوڵمانیش، لەبەلای لەئیسلام لادان بپارێزێ و، ئەوانەش کە بەدەردی سیکۆلاریزمەوە گرفتاربوون و سەرگەردان بوون، شیفایەکی خێرایان بدات و لەوگێژاوە دەربازیان بکات.

# ڕێ خۆشکردن

سەرەتا بەخێرهاتنێکی گەرمی هەموو لایەکتان دەکەم، بێگومان شتێکی ڕوون و ئاشکرایە، کە ئێمە وەك گەلی مسوڵمانی کوردستان، بەڵکو فراوانتر وەك گەلانی مسوڵمانی عێراق و مسوڵمانانی جیهانی ئیسلامیی بەگشتی، لەهەموو سات و سەردەمێکدا زۆر پێویستیمان بەیەکدی ناسین و یەکدی خوێندنەوەو لەیەکدی تێگەیشتنێکی ڕاست و دروست هەیە، چ جای لەم بارودۆخە دژوارەدا، کە بەگشتی دنیای پێدا ڕەت دەبێ و، ئۆممەتی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) و عیراق و کوردستانیش بەتایبەتی تر، چونکە بەڕاستی گەلانی دنیا، بەدرێژایی مێژوو ئەگەر بۆیان کرابێ، کە ئامانجێکی باش و گەورە بۆ خۆیان بێننەدی، تەنها بە هاوکاریی و تەبایی و یەکدەنگیی و یەکڕەنگیی و هاوهەڵوێستیی نێوانیان بووە، وە بە پێچەوانەوەش هەرساتێك زەفەریان پێ برا بێت، لەلایەن نەیارانیانەوە، ئەوە لەو کون و کەلێن و درزانەوە بووە، کە لەڕیزەکانیاندا بوون، بۆیە من بەپێویستی دەزانم کەهەموو ئەو بابەتە گرنگانەی، کە پێویستە ئێمە وەك کۆمەڵگایەکی مسوڵمان، تێیاندا بگەینە بنج و بنەوان و حەقیقەت و، وەك خۆیان بیانناسین و، نوختەیان تێدابخەینەسەر پیت، لێیان بکۆڵمەوە و بەووردیی سەرنجیان بدەم، ئنجا چ مەسەلەی تەبایی و پێکەوەژیان بێ، چ مەسەلەی مافەکانی مرۆڤ، چ مەسەلەی عەولەمە و، چ مەسەلەی تیرۆربێت کە لەچەند کۆڕێکی پێشتردا باسمان کردن، چ مەسەلەی عەلمانییەت بێ، چ مەسەلەی دیموکراسیی بێ، چ هەر مەسەلە و بابەتێکی دیکەی گرنگ بێ، کە ئێمە وەك کۆمەڵگایەك، جارێ لەو چەمك و بابەتانەدا نەگەیشتووینە ڕێککەوتن (إتفاق)ێك، تاکو وەك خۆیان بیانناسین و تێیان بگەین، بۆیە بێگومان

ناتوانین یەکڕیزو یەکدەنگ و یەکڕەنگ و هاو هەڵوێست بین لەبەرانبەریاندا. ئنجا ئێمە لە چوار بەش دا باسی سیکۆلاریزم دەکەین:

**یەکەم:** پێناسەی سیکۆلاریزم دەکەین کەچییە؟، بۆ چی بەعەلمانییەت، یان بەعیلمانییەت تەرجەمە کراوە، ناودەبرێت؟!

**دووەم:** سیکۆلاریزم (عەلمانییەت)، کەی و لەکوێ و چۆن و بۆ چی سەری هەڵداوە؟!

**سێیەم:** بەرهەم و شوێنەواری سیکۆلاریزم لە ژیان و گوزەرانی خەڵکی خۆرئاوادا، چییە و چۆنە؟! چونکە نابێ ئێمە هەر لەخۆمانەوە، بانگەشە بۆ بیروبۆچوونێك بکەین، بێ ئەوەی کەبزانین و تێبگەین، داخۆ خەڵکی دیکەی سەرزەوی زیانی لێ کردوە، یان قازانج، چونکە ئەو جۆرە بیرو تێڕامانە لە ژیاندا، زۆر هەڵەیەو پێچەوانەی عەقڵ و لۆژیك (منطق)ە، وێڕای ئەوەی، کە پێچەوانەی شەرع و بەرنامەی ئیسلامیشە.

**چوارەم:** سیکۆلاریزم حاڵەتێکی بێ پاساوو ناشەرعیی و ناڕەوایە بۆ میللەتێکی مسوڵمان.

هەروەك لێرەدا لەو بارەیەوە هەڵسەنگاندن و بەراوردکارییەکی دادپەروەرانەو ژیر بێژانە لەبارەی سیکۆلاریزمەوە، دەکەین.

وشەی (عەلمانییەت) سەرجەم فەرهەنگەکانی زمانی عەرەبی لەسەر ئەوە کۆك و یەکدەنگن، کە وشەی عەلمانییەت تەرجەمەی وشەی [سیکۆلاریزم - Secularism]ی ئینگلیزیی و لائیك (laic)ی فەرەنسییە، وە بەهیچ شێوەیەك پەیوەندیی بەوشەی زانست (علم)ەوە نیە، نەلە زمانی فەرەنسیی و نە لە ئینگلیزیشدا. چونکە وشەی زانست، لەزمانی ئینلگیزییدا [ساینس- Science]ە، بەڵام مانای تەرجەمەی پڕ بەپێست و ڕاست و دروستی وشەی سیکۆلاریزم بریتیەلە[1]:

[دنیا پەرستیی، دنیا گەرایی و بێ دینایەتیی (الدنيوية واللادينية) ]، هۆی ئەوەش کەنووسەرە عەرەبەکان بە (العَلْمانيه) تەرجەمەیان کردوە، ئەوەیە کەسەرەتا بە (العالمانية)، واتە: (الدنيوية) تەرجەمەیان کردەوەو، پاشان بۆ ئاسان بوون لەسەر زمان ئەلیف(ا)ەکەیان گۆڕیوە بە سەر (فتحه) و بۆتە (العَلْمانية).

کەواتە: تەرجەمەکردنی سیکۆلاریزم بە (العِلْمانية) کەوا پێشان دەدرێ پەیوەندیی بەزانیاری (علم) یەوە هەیە، هەڵەیەو جۆرێکە لە چەواشەکردنی خەڵك و فێڵ لێکردنیان و گۆڕین و لادان (تغيير وتحريف)ی ڕاستیی و جەوهەری مەسەلەکان!

بەڵێ، لەڕاستییدا تەرجەمەکردنی وشەی (Secularism) بە (عیلمانییەت) فێڵ و تەزویرو ساختەکارییەکی ئاشکرایە، بەمەبەستی جوانکردنی بیچمی دزێوو ناشیرینی وشەو بیردۆزەی ناوبراو، چونکە زانراوە کە ئەگەر سیکۆلاریزم بەماناو چەمکی ڕاستەقینەی خۆی کەبریتیە لە: (بێ دینایەتیی و دنیا پەرستیی) تەرجەمە بکرێ، ڕووی نێو میللەتێکی مسوڵمانی نابێت، بەڵام ئەگەر بگوترێ: عیلمانیەت، ئەوە مانایەکی بریقەدارو فریودەری بۆ پەیدا دەبێ!

ئێستاش دوای ئەوەی ماناو چەمکی (سیکۆلاریزم)مان لەئەسڵی زماندا زانی، بابۆ زیاتر دڵنیایی و بەرچاو ڕوونبوونەوە لەو بارەوە، سەرنج بدەین، داخۆ فەرهەنگەکانی ڕۆژئاواو ئەورووپا، کەکانگاو مەڵبەندی سەرهەڵدانی ڕێچکەی

---

(١) (فەرهەنگی نوێ)یش لەپێناسەی سیکۆلاریزم داگوتوویەتی: (دنیا پەرست، باوەڕ بەکاروباری دنیایی و خۆشەویستی دنیاو، باوەڕنەکردن بەدەرەوەی ئەمانە) بڕوانە: لاپەرە (١٩٠) نووسینی، بورهان قانیع، چاپی یەکەم ١٩٨٥.

سیکۆلاریزمیشە، چۆن پێناسەی وشەی ناوبراو دەکەن:

١-لە (ئینسکلۆپیدیای بەریتانیی) (دائرة المعارف البريطانية)دا لەبارەی پێناسەی وشەی ناوبراوەوە، ئەمە هاتوە، کە من یەکسەر بەکوردیی تەرجەمەی دەکەم:

دەڵێ: [سیکۆلاریزم: جووڵانەوەیەکی کۆمەڵایەتییەو، دەیەوێ خەڵکی لە ئەمیەت و بایەخ دان بەدوارۆژەوە، بگۆڕێ بۆ گرنگیی دان تەنیا بەژیانی دنیا) هەروەها دەڵێ: (ئەو ڕێبازگەو دیاردەیەش لەوەوە سەری هەڵدا، کەپێشتر خەڵك لەسەدەکانی نێوەڕاستدا، زۆر خولیای خوا بوون و، زیاتر گرنگییان بەدوا ڕۆژ دەداو، خۆیان دوور دەخستەوە لە ژیانی دنیاو، بەشتێکی کەم و بێ بەهایان دەزانی و، زیاتر ڕوو لەخوابوون، نەك ڕوو لە دنیا، بۆیە بۆ بەرهەڵستیی کردنی ئەو بیرو بۆچوون و ئەو هەست و نەستە قووڵە، ئەو ڕێبازە (سیکۆلاریزم) پەیدابوو، بەو هیوایەی کە دوارۆژو خواو شتە پەنهان و نادیارەکان (غیبیات) لەدڵ و دەروون و لە بیروبۆچونی بەندەکاندا، لێڵ و ون بکاو بیانسڕێتەوە، تاکو لەبری ئەوە تەنهاخەریکی خۆو دنیاو هەواو ئارەزووەکانیان بن، بەتایبەت لە دوای (ڕێنیسانس)[1]ەوە، (واتە: لە دوای ڕاپەڕینی (شۆڕشی زانستی)) ئەو ڕەوتە هاتە کایەوە، کە لەسەدەی (١٦)دا، هەم ئەو ڕێنسانسە سەری هەڵداو، هەم ئەوبیروبۆچوونەش ئەوکات پەرەی سەندو، هەمیشەش داکۆکیی لەسەر ئەوە دەکرد، کە دەبێ هەموو خولیاو خواست و ئاواتەکانی مرۆڤ لەسەر ئەم زەوییەو، لەم ژیانەی دنیادا بێنەدی و، نابێ هیچ بیرێك لە خواو دین و دوارۆژ بکرێتەوەو، نابێ هەرگیز هەست و مێشکمان بەوەوە بەندو خەریك بکەین و هیچ بۆشاییەکی دڵ و دەروونمان بەوە پڕ ببێتەوە).

٢- لەفەرهەنگی جیهانی نوێ (قاموس العالم الجديد)دا گوتراوە: (وشەی سیکۆلاریزم بەدوومانایان دێت:

أ- واتە: گیانی دنیا گەرایی، یان ڕێڕەوی دنیا گەرایەکان، واتە: ئەوانەی کەتەنها بڕوایان بەدنیا هەیە.

---

(١) شۆڕشی فەرەنسی دژی کلێسا، کە لەساڵی (١٧٨٩)زدا ڕوویدا.

ب- بڕوابوون بەوەی، کە کاروباری کڵێساو ئایین، هیچ پەیوەندییەکیان بەکاروباری ئیدارەو وڵاتەوە نیە، بەتایبەت لەبواری پەروەردەی گشتیدا).

٣- وە فەرهەنگی (ئۆکسفۆرد) دەربارەی وشەی سیکۆلاریزم دەڵێت: (سیکۆلاریزم واتە: دنیا گەرایی، یان ماددە گەراییەك، کە دین و ڕووحی نەبێت، وەك پەروەردەی سیکۆلاریستیی، کە بریتیە لە بێ دینایەتیی و ئارەزووبازیی و تەپڵ لێدان و مۆسیقاژەنیی، وە دەستەڵاتی سیکۆلاریستیی، بریتیە لە حکوومەتی دژ بەدین و دژ بەکڵێساو، دژ بە بەندایەتیی کردن بۆ خوای کردگار، وەسیکۆلاریزم هەڵگری ئەو پەیام و بەیداخەیە، کەنابێ دین بناغەی ڕەوشت و پەروەردە بێت).

٤- (قاموس معجم الدولی الثالث الجدید) دەڵێت: [(سیکۆلاریزم) ڕێڕەوێکە لە ژیانێك کە بەڕێوە چوون و کاروبارەکانی لەسەر ئەو بنچینەیە بنیات نراون، کەنابێت ئایین و خەڵکی دیندار دەست وەربدەنە حکوومەت و کاروباری دەوڵەتەوە، وە (سیکۆلاریزم) بریتیە لە: سیستەم و ڕژێمێکی کۆمەڵایەتیی، بۆیە لەبارەی ئەخلاقی کۆمەڵگای مرۆڤایەتییەوە دەڵێت: پێویستە ئاکارو ڕەوشت و بەها ئەخلاقییەکان ڕەچاو نەکرێن، بەڵکو تەنهاخواست و بەرژەوەندییەکانی ژیانی نوێ و، هاوچەرخانە لەبەرچاو بگیرێت] واتە: ژیانی کۆمەڵگای مرۆڤایەتیی بەو شێوە بەڕێوە بچێت: لەڕووی دەوڵەت و کۆمەڵایەتیی و ئەخلاقییەوە، کەهیچ حسابێك بۆ خواو دین و دوارۆژ نەکرێت!

### جابەڕێزان!

ئەم پێناسانە بیرو بۆچوونی فەرهەنگەکانی ڕۆژئاوان، لەبارەی وشەی سیکۆلاریزمەوە، بۆیە کە لەنێو کوردەواریی خۆماندا، زۆر جار وشەی: (عەلمانییەت) بە (فصل الدین عن الدولة) یان (فصل الدین عن السیاسة) واتە: لەیەکدی جیاکردنەوەی ئایین و دەوڵەت، یان جیاکردنەوەو قرتاندنی ئاین لەکاروباری سیاسەت و حکوومەت، پێناسە دەکرێ، ئەوە لەڕاستییدا ئەو لێکدانەوەو مانا کردنە بۆ سیکۆلاریزم، ماناکردنێکی جوزئییەو، تەنها بەش و لایەنێك لەسیکۆلاریزم ئاشکراو ڕوون دەکاتەوە، بۆیە هەقە بۆ مانای پڕ بەپێستی

عەلمانییەت بڵێین: واتە: [لێك دابڕین و لێك جیاکردنەوەی دین و ژین] نەك تەنیا دین و دەوڵەت، یان تەنها دین و حکوومەت، چونکە سیکۆلاریزم بەر لەوەی سەروکاری لەگەڵ سیاسەت و حوکمڕانیی هەبێ، سەروکاری لەگەڵ ئەخلاق و چۆنیەتی بیرکردنەوەی بەشەرو بەهاو ڕەوشتە بەرزەکانی مرۆڤە، وە دەڵێ: نابێ هەموو ئەوانە لەدینەوە وەربگیرێن و، لەدینەوە هەڵبهێنجرێن، بۆیە ئەگەر بگوترێ: (سیکۆلاریزم) تەنها واتە: (جیایی دین و دەوڵەت)، بەڕاستیی ئەوە واتاو پێناسەیەکی بچووکی سیکۆلاریزمە، بەڵکو سیکۆلاریزم دەڵێ: دەبێ بەهەموو شێوەیەك ژین لەدین جیابکرێتەوەو، هیچ حیسابێك بۆ دین و دوارِۆژو لێپرسینەوە نەکرێ.

ئەوە بەکورتیی پێناسەو لێکدانەوەی واتاو چەمکی وشەی (سیکولاریزم) عەلمانییەت بوو، کە بریتیە لە دنیا پەرستیی و بێ دینایەتیی و گوێ نەدان بەدین و دوارِۆژو خواو پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم).

## بەشی دووەم

# (سیکۆلاریزم) کەی و لەکوێ و چۆن و بۆچی سەری هەڵدا؟!

دیارە ئەو پرسیارە لەناخ و مێشكی زۆر كەسدا خۆی مەڵاس داوەو دەخولێتەوە، كە داخۆ ئەو بیروبۆچوونە بۆچی پەیدابووە؟ وە خەڵكی ئەورووپا بۆچی ئەو ڕێگایەیان گرتە بەر؟! وە چەندان پرسیاری دیكە لەبیروهۆشی گەلێك كەس دا لەو بارەوە هەن، بۆیە ئێمەش بەر لەهەموو شتێك دەڵێین: نێوەڕۆك و كرۆكی ڕەوتی سیكۆلاریزم، كە بریتییە لە بێ دینایەتیی، واتە: حیساب نەكردن بۆ خواو پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و، حیساب نەكردن بۆ شەریعەتی خوای تاك و تەنیا، ئەو ڕێچكەو بیركردنەوەیە (جگە لەزاراوەكەی) شتێكی زۆر دێرین و لەمێژینەیە، هەر لەو ڕۆژەوە، كە خوای پەروەردگار ئادەمی لەسەر گۆی زەوی داناو، خستیە ژێر باری تاقی كردنەوەو، پاشان (قابیل و هابیل)ی ڕۆڵەكانی ئەو بەشەرهاتن و، هابیل لەترسی خوا، خۆی لەیاخیی بوون و سەرپێچیی خوا، گرتەوەو، دەستی نەچووە خوێنی (قابیل)ی برای، بەڵام قابیل لەبەر یاخیی بوون و بەرژەوەندیی خۆی، بێ فەرمانیی خوای تاكی كردو، گوێی نەدایە خوێن ڕشتن و، هابیلی برای خۆی كوشت، ئیدی هەر لەوساتەوە ئەو ناكۆكیی و ململانێیە و، ئەو دوو ڕێڕەوەی: گوێنەدان بەخواو بە دوارۆژو، گوێ دان بەخواو بەدوارۆژ، لەبەر چاونەگرتنی قەبرو قیامەت و لێپرسینەوەی خواو، لەبەرچاوگرتنی ئەو لایەنە، لەنێوان ئادەمزادەكاندا سەریان هەڵداو پەیدابوون، تاكو دنیاش دنیایە، بەردەوام دەبن، وە ئەو دوو ڕێڕەوە، دوو ڕووگەو ڕووكاری هاوتەریب و ناكۆك و پێچەوانەو دژ بەیەكدین و، هەمیشە ململانێی یەكدی دەكەن و، بەپێچەوانەی یەكدیەوە دەڕۆن و دەجووڵێنەوە. هەڵبەتە ئەو دوو ڕێڕەوەش هەڵقوڵاوی سروشتی ئینسانن و، خوای پەروەردگار هەر لەسەرەتاوە ئینسانی وا خوڵقاندوە، كە بتوانێ چاكەكار بێت، یان خراپەكاربێت، ڕێی ڕاست، یان ڕێ چەوت، ڕێی هەق، یان باطل بگرێتە بەر، وەك خوای دادگەر دەربارەی ئەوە دەفەرموێ:

﴿ فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَاهَا ﴿٨﴾ ﴾ الشمس:٨.

وە دەفەرموێ: ﴿ إِمَّا شَاكِرًا وَإِمَّا كَفُورًا ﴿٣﴾ ﴾ الانسان:٣.

وە هەر ئەوەشە کەوای کردوە ئینسان لەسەر ئەم زەوییە بەکەڵکی ئەوە بێت، کە جێنشینی خوای[1] بەرز بێت و، شایستەی هەڵگرتنی پەیام و بەرنامەی خوابێت:

﴿ إِنَّا عَرَضْنَا ٱلْأَمَانَةَ عَلَى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱلْجِبَالِ فَأَبَيْنَ أَن يَحْمِلْنَهَا وَأَشْفَقْنَ مِنْهَا وَحَمَلَهَا ٱلْإِنسَٰنُ ﴾ الأحزاب: ٧٢.

وە بەکەڵکی ئەوە بێت کەبۆ تاقی کردنەوە دابنرێت:

﴿ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْمَوْتَ وَٱلْحَيَوٰةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ﴾ الملك: ٢.

چونکە دەتوانێت بەرزبێ، یان نزم بێتەوە، هەڵەبکات، یان ڕاست بکات، ڕاست، یان خوار بڕوات، دەتوانێ هەم هەق وەربگرێ و، هەم بەدوای باطیڵ بکەوێت، وە ئەگەر تەماشای قورئان بکەین، دەبینین خوای بەرزو مەزن لەسەر زاری کۆمەڵێك لەبێ بڕوایەکان، ئاوا بۆمان باسی ئەو ڕێڕەوە دەکات، کە بریتیە لە دنیا گەرایی و بێ دینایەتیی، وەك دەفەرموێ:

﴿ وَقَالُوا۟ مَا هِىَ إِلَّا حَيَاتُنَا ٱلدُّنْيَا نَمُوتُ وَنَحْيَا وَمَا يُهْلِكُنَآ إِلَّا ٱلدَّهْرُ ۚ وَمَا لَهُم بِذَٰلِكَ مِنْ عِلْمٍ ۖ إِنْ هُمْ إِلَّا يَظُنُّونَ ﴿٢٤﴾ ﴾ الجاثية: ٢٤.

واتە: وە (کافرەکان) گوتیان: ژیان تەنها ئەم ژیانەی دنیایەو، دەمرین و دەژین، وەتەنها ڕۆژگاریش ئێمە لەنێو دەبات و دەمان فەوتێنێ، (یانی: ئێمە بەهیچ لەنێو ناچین، چونکە خوایەك ئێمەی دروست نەکردوەو، نامان مرێنێ، بەڵکو ئێمە بۆ خۆمان دەژین و دەمرین، ئنجا کاتێك کە تەمەنمان بەسەر چوو، ڕۆژگار ئێمە لەنێو دەبات و نامان هێڵێت! ئەوان وا دەڵێن)، ئەگەر چی هیچ نازانن و هیچ زانیارییەکیان لەو بارەیەوە نیەو، سەریان لێی دەرناچێ، چونکە ئەوە غەیبەو غەیبیش تەنها خوای دادگەر دەیزانێ، بەڵکو ئەوەی کە ئەوان دەیڵێن، تەنها گومانێکی ناڕەوایە.

---

(١) وەك خوای بەرزو مەزن دەفەرموێ: ﴿إِنِّى جَاعِلٌ فِى ٱلْأَرْضِ خَلِيفَةً﴾ البقرة: ٣٠.
واتە: کاتێك کە پەروەردگاری تۆ بەفریشتەکانی فەرموو، دەمەوێ (جێنیشین)ێك لە زەوی دا دابنێم، (کەبریتییە لە ئادەم و وەچەکەی).

دیارە ئەوەی خوای پەنهان بین فەرموویەتی، لەسەداسەد وایە، چونکە هیچ کافرو مولحیدێك نیە، کەلە کوفرو بێ دینایەتییدا بگاتە یەقین، وە چەندان جار (بەندە) لەگەڵ خەڵکی کافرو مولحیددا گفتوگۆم کردوە لەسەر ئەو مەسەلانە، وە کاتێك کە ڕاستگۆیانە قسەیان کردوە، دانیان بەو حەقیقەتە مەزنەداهێناوە، کەهەمیشە لەگومان و دوو دڵیی و دڵەڕاوکەدان، چونکە هەرگیز ئینسان لە بێبڕوایی و لەدوور لەخواییدا، دڵی ئارام ناگرێ و ناگاتە یەقین، ئەوپەڕی گومانێکی بەهێز (ظن راجح) یان، دەبێت، بەڵام هەر ناگەنە پلەی یەقین، چونکە ئینسان تەنها لە حەقدا دەگاتە یەقین.

هەروەها خوای بەرز بەسەرهاتی گەلی (شوعەیب)مان (علیه السلام) بۆ دەگێڕێتەوە، کە ئەوانیش گوتوویانە: نابێ ئایین ئاوێتەو تێکەڵاوی ژین بکرێ و، نابێ ئاین[1] بەشداریی حوکم و سیاسەت بکات، بەڵێ، ئەو مەسەلەیە شتێکی زۆر دێرین و لەمێژینەیە، ئەوەتا گەلی شوعەیب بەشوعەیب (علیه السلام) دەڵێن:

﴿ قَالُواْ يَٰشُعَيۡبُ أَصَلَوٰتُكَ تَأۡمُرُكَ أَن نَّتۡرُكَ مَا يَعۡبُدُ ءَابَآؤُنَآ أَوۡ أَن نَّفۡعَلَ فِيٓ أَمۡوَٰلِنَا مَا نَشَٰٓؤُاْۖ إِنَّكَ لَأَنتَ ٱلۡحَلِيمُ ٱلرَّشِيدُ ٨٧ ﴾ هود: ٨٧.

واتە: ئەی شوعەیب! ئایا نوێژ (و عیبادەت)ەکەت (بۆ خوا) فەرمانت پێ دەکات، کە ئێمە دەست لە دوو شتی سەرەکیی و باو هەڵبگرین، کە بریتین لە:

**یەکەم:** ئایا ئێمە دەست لەبت پەرستیی و سالەهایساڵمان هەڵبگرین، کە هەر لە دێرزەمانەوە باب و باپیرانمان پەرستوویانن؟!

**دووەم:** ئایا دەست لەوە هەڵبگرین، کە چەندان ساڵە بە ئارەزووی خۆمان تەسەڕڕوف لە ماڵ و سامانماندا دەکەین، بەبێ گوێ دانە بەهابەرزەکان و ئەخلاق و دوارۆژو بەرژەوەندیی گشتی؟ ئایا تۆ نوێژەکەت وات لێدەکات و فەرمانت بەوە پێ دەکات، کەڕێگا لەبت پەرستییەکەی ئێمە بگرێ، وە ڕێگا

---

(١) ئایین (دین) بەمانا و چەمکە عورفیی و باوەکەی، کە لەوەحی خواوە سەرچاوە دەگرێ، ئەگەرنا وشەی (دین) یانی: بەرنامەی ژیان، ئنجا لەخواوەوە هاتبێ، یان لەبەشەرەوە.

لە دەوڵەمەندبوون و سەرمایەداریتیمان بگری و، ببی بەبەربەست و ئاستەنگ لەڕێگای خواست و ئارەزووەکانمانداو، لێ نەگەڕێی بە کەیفی خۆمان بکەین؟! بۆیە بەتانەو توانجەوە پێی دەڵێن: بەڕاستی تۆ پیاوێکی زۆر هێمن و لەسەر خۆو سەر ڕاستیی:

﴿إِنَّكَ لَأَنتَ ٱلۡحَلِيمُ ٱلرَّشِيدُ ٨٧﴾.

کەواتە: ئەو ڕەوت و ڕێبازەی، کە دەڵێت: نابێ عیبادەت تیکەڵی سیاسەت بکرێت و، نابێ دین هەقی بەسەر ژینەوە هەبێت، ئەوە بیروبۆچوونێکی زۆر کۆنەو شتێکی تازە نیە، بەڵێ، بابزانین، کە (سیکۆلاریزم) وەك زاراوەیەك تازە پەیدا بووەو، ئێستا بەکاردێ، بەڵام لەمێژە وەك بیرۆکەیەك بووە و، هەرکاتێك ئینسان لەخوا دوور بووبێت، هەوڵی داوە هەر خەریك و سەرقاڵی دنیا بێت، وەهەرکاتێك ئیمانی بەخوا نەبووبێ، هەوڵی داوە، کە بۆخۆی بەرنامەی ژیان بۆ خۆی دابنێ، چونکە بێگومان هەرکاتێك ئینسان پەیوەندیی لەگەڵ خوا بپچڕێ، ئەوە پشت بەخۆی دەبەستێ، بۆیە سیکۆلاریزم وەك زاراوەیەکی فیکریی و سیاسیی لە ئەورووپا، لەجەوێکی ئاوادا سەری هەڵدا، وەکە دەڵێین: ئەورووپا، مەبەستمان پێی ڕۆژئاوای ئێستایە، کە ئەمریکاش دەگرێتەوەو تەواوکەری ڕۆژئاوایە، چونکە ئەمەریکییەکانی ئێستا، ئەوانەی کەلەوێ باڵادەست و دەسەڵاتدارن، هەر ئەورووپییەکان بوون کە چوونە ئەوێ، بەتایبەت ئینگلیزەکان چوونە ئەمەریکاو، لەوێ جێگیرو نیشتە جێبوون و، وە ئەوانە کاتی خۆی چەندان ملیۆنیان لەهیندە سوورەکان قەڵا چۆکردن و[1] تەنها کەمێکیان هێشتنەوە.

کەواتە: ئەمریکییەکانیش هەر ئەورووپییە کۆنەکانن، هەروەك شارستانیەتی ڕۆژهەڵات و بلۆکی سۆسیالیستیش هەر لە ژێر کاریگەریی شارستانیەتی ئەورووپا دایە، ئنجاکە دەڵێین ئەورووپا واتە: ڕۆژئاوا بەهەردوو سیستمی ڕۆژهەڵاتیی و

---

(١) بەڵێ، کیشوەری ئەمریکا بۆ یەکەمجار لە(١٥٠٠)ەکان دا، لەلایەن (کریستۆڤەر) دۆزرایەوە پاشان لە: ١٧٧٤دا، بۆیەکەمجار دەوڵەتی ئەمریکا لەلایەن (جۆرج واشنتۆن)ەوە دامەزرا، وە بەگشتی ئەمریکا لەسەر حیسابی خوێنی هیندەسوورەکان، بەمەچەك و بازووی ڕەشپێستە بەکۆیلەکراوە لەئەفریقا دزراوەکان، دروست بووە و دامەزراوە.

ڕۆژئاواییەكەوە، كە ئەوانیش دەرەنجام و درێژبوونەوەی شارستانیەتی ڕۆمانیی و ئیغریقیین، ئنجا ئەورووپا چ لەسەردەمی ئیغریقیی و ڕۆمانییەكانداو، چ دوای ئەوەی، كە عیسای مەسیح (علیه السلام) هات، هەر بت پەرست بوون و بەوەوە ڕاهاتبوون، وە زۆربەی كتێب و سەرچاوە مێژووییەكان، كە باس لە مێژووی دنیا بەگشتی و، مێژووی ئەورووپا بەتایبەتی دەكەن، لەسەر ئەو ڕاستییە كۆك و یەكدەنگن، كە ئیغریقییەكان و ڕۆمانییەكان بت پەرست (وثني) بوونە، ئنجا ئێستاش كە هەندێك لە ئەدیب و نووسەرەكان، لەبەرهەمەكانیان دا ئەو جۆرە تەعبیرە بەكار دێنن: خوای جوانیی و، خوای شەڕ، خوای ئاشتیی و، خوای با،...هتد، بێگومان ئەو زاراوانە لەبنەڕەتدا هی ئیغریقییەكانن، چونكە ئەوان بڕوایان بەچەند پەرستراوێتیی (تعدُّد الآلهة) هەبوو، ئیدی ئەورووپییەكانیش لەسەر ئەو جۆرە بیرۆكەو بیركردنەوەیە ڕاهاتبوون، بۆیە كاتێك كەعیسا (علیه السلام) وەك هەموو پێغەمبەرەكان (علیهم الصلاة والسلام) بە پەیامی خوابەیەكگرتن (توحید)ەوە بۆیانهات، ئەوان بۆیان هەزم نەكرا، كاتێك كەعیسا فەرمووی:

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ رَبِّي وَرَبُّكُمۡ فَٱعۡبُدُوهُۚ هَٰذَا صِرَٰطٞ مُّسۡتَقِيمٞ ﴿٥١﴾ ﴾ آل عمران:٥١.

واتە: بەڕاستیی تەنها خوا پەروەردگاری من و ئێوەیە، تەنها بەندایەتیی بۆی بكەن و هەر ئەو بپەرستن، وە ئا ئەوە ڕێگای ڕاستە.

بەڵێ هیچ كام لەپێغەمبەرانی خوا (سەلامی خوایان لێ بێ)، بەس بەخوا بەیەكگرتن (توحید)ەوە و بۆ ئەوە هاتوون، كەخەڵكی بەرەو پەرستراو (معبود)ی ڕاستەقینە بانگ بكەن، كەخوای تاك و تەنیایە، وە بۆئەوەی بەرەو شەریعەتی ئەو پەرستراوە ڕاستەقینەیە بانگیان بكەن. ئنجا ئەورووپییەكان بەجیددیی كەوتنە دژایەتییكردنی (عیسی)و لە بری ئەوەی، كە بەقسەی بكەن و پەیڕەویی لە ڕێبازەكەی بكەن، سەرسەختانە كەوتنە دژایەتییكردنی، بۆ ئەوەی بەرگریی لەو كەلەپوور (تراث)ە یان بكەن، كەبریتی بوو لە بت پەرستیی (الوثنیَّة) و، هەر لەدێرینەوە لەشارستانیەتی ڕۆمانەوە بۆیان جێمابوو، وە ئەو دژایەتییەیان بەپاڵنان و دەست لەپشت دانی جوولەكەكانیش دەكرد، چونكە جوولەكەكان گوتیان: (مریم)ی

دایکی عیسا، زینای کردوە، چونکە مێردی نیەو عیسا بێ بابەو بەزۆڵیی لەدایك بووە! ئیدی بەو شێوەیە بە ئەندازەیەك دژایەتیی عیسایان کرد، کە نەك هەر بەپێغەمبەری نەزانن، بەڵکو بەزۆڵ (بیژوو)یشیان لە قەڵەم دا!!

بەڵام خوای زاڵ، بۆ بەرگریی کردن لەپەیامبەرو بەندە ڕاستەقینەکانی خۆی و، بۆ ڕاست کردنەوەی هەڵەو پڕوپاگەندەکانی مێژوو، ئەو حەقیقەتەی لەقورئانێدا پشت ڕاست و ڕوون کردۆتەوە، بەڵێ، قورئان دەفەرموێ: عیسا تەنهادایکی هەبووەو بێ بابە، بەڵام خوای پەروەردگار بەتوانای خۆی عیسای خوڵقاند، وەك چۆن ئادەمی خوڵقاند، ئنجا ئەگەر عیسا دایکی هەیە، ئادەم نەدایکی هەبووەو نەباب!

﴿ إِنَّ مَثَلَ عِيسَىٰ عِندَ ٱللَّهِ كَمَثَلِ ءَادَمَ خَلَقَهُۥ مِن تُرَابٍ ثُمَّ قَالَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴿٥٩﴾ ﴾

آل عمران:٥٩.

ئیدی جوولەکەکان دەستیان لەپشتی دەوڵەتی ڕۆمانییەکان دا، بۆ دژایەتیی کردنی عیساو، بۆ خامۆش و خەفەکردنی ئەو بەرنامەو پەیامەی، کە پێی هاتبوو، تاکو سەرەنجام عیسایان دەرکردو بەناچاریی خۆی دالدەو پەنا دەدا لە حەشارگەکان دا، وە هەر قاچاغ و یاساغ بوو لەدەوڵەتی ڕۆمەکان دا، چونکە جوولەکەکان هەمیشەو دایم، هەر سیخوڕییان لەسەر دەکرد، تاکو بیگرن و بیکوژن و لەداری بدەن، تاکو سەرەنجام ڕۆژێك یەکێك لە قوتابیانی خۆی بەناوی (یهوذا الأسخريوطي) ناپاکیی لەگەڵ کردو هەواڵی لێداو درکاندی، کە عیسا لە کوێیە، ئەوانیش بە کۆمەڵ چوون کە بیگرن، بەڵام بۆ پووچەڵکردنەوەی هەوڵە بەدو گڵاوەکانی ئەوان، خوای مەزن بەکڵاو ڕۆژنەدا، لەو شوێنەی کەتێیدا بوو، سەری خست و بۆ ئاسمان بەرزیکردەوە، بێ ئەوەی کە هیچ زیانێکی پێ بگات، وەك خوای باڵادەست دەفەرموێ:

﴿ وَمَكَرُواْ وَمَكَرَ ٱللَّهُۖ وَٱللَّهُ خَيۡرُ ٱلۡمَٰكِرِينَ ﴿٥٤﴾ إِذۡ قَالَ ٱللَّهُ يَٰعِيسَىٰٓ إِنِّي مُتَوَفِّيكَ وَرَافِعُكَ إِلَيَّ وَمُطَهِّرُكَ مِنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَجَاعِلُ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوكَ فَوۡقَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِۖ ﴾ آل عمران: ٥٤-٥٥.

واتە: ئەوان پیلانیان گێڕا بۆ کوشتنی عیسا، خواش بە ویست و نەخشەی خۆی پیلانی ئەوانی پووچەڵ کردەوە، وە خوا باشترین نەخشە ڕێژە، کاتێك کە خوا فەرمووی: ئەی عیسا! من دەمەوێ کە تۆ بۆلای خۆم بەرز بکەمەوەو بەتەواویی وەرت بگرم و، پاکت بکەمەوە لە (پیسیی و گڵاویی) کافرەکان، کە شایستە نین چی دیکە تۆ لە نێویاندا بژی....

وە لە سوورەتی (النساء) دا دەفەرمووێ:

﴿...وَمَا قَتَلُوهُ وَمَا صَلَبُوهُ وَلَٰكِن شُبِّهَ لَهُمْ ...﴾ النساء: ١٥٧.

واتە: وە نەیانکوشت و هەڵیشیان نەواسی، بەڵکو وێنەی ئەویان بۆ برایە سەر یەکی دیکە.. بەم شێوەیە خوای پەروەردگار عیسای لە فرِوفێڵ و داوی جووەکان پاراست، کەچی ئێستاش گاورەکان (نەصرانییەکان) بەو پڕوپاگەندەیەی جووەکان بڕوا دەکەن و، پێیان وایە عیسا گیراوەو لە سێدارە دراوە، بەڵام قورئان ئەو ڕاستی یەشی باش ڕوون کردۆتەوە، کە نەخێر وانیە،بەڵکو کاتێك کە جوولەکەکان چوونە ژوورەوە، بۆ ئەوەی عیسا(علیه السلام) بگرن، خوای بەرز بۆ پاراستنی ئەو، عیسای بردە سەر شێوەی ئەو قوتابییە ناپاك و خائینەی، کە ئەو پیلانەی بۆ دارِشتبوو و جاسووسی لەسەر کرد، بە فەرمانی خوا شێوە (شکل) ی عیسای وەرگرت و ئەویان گرت و کوشت، وە عیساش بە کڵاو ڕۆژنەی ژوورەکەدا سەرکەوت و، لەلایەن خوای خۆیەوە بەرزکرایەوە[1].

ئنجا کە ئەو پیلان گێڕو جاسووسەیان گرت، گوتی: من عیسا نیم، بۆچی من دەگرن، من ئێوەم دەست ڕاکێش کردوە؟ بەڵام جووەکان گوتیان: نەخێر تۆ عیسای، دیسان گوتی: من ئەو نیم، بەڵکو ئەو تازە لێرە بزر بوو و بەرزکرایەوە، بەڵام هەر بڕوایان پێی نەکرد.

خوای پەروەردگاریش ئەو حەقیقەتە لە قورئانی پیرۆزدا، باش ڕوون دەکاتەوە، وەك دەفەرمووێ:

---

(١) لە هەرکام لەبەرگی (٣ و ٤)ی (تەفسیری قورئانی بەرزوبەپێز)دا، کە هەردووك سووڕەتی: (النساء) و (المائدة)یان تێدان، بەدرێژیی باسی ئەم مەسەلەیەمان کردوە..

﴿... وَمَا قَتَلُوهُ وَمَا صَلَبُوهُ وَلَكِن شُبِّهَ لَهُمْ ۚ وَإِنَّ ٱلَّذِينَ ٱخْتَلَفُوا۟ فِيهِ لَفِى شَكٍّ مِّنْهُ ۚ مَا لَهُم بِهِۦ مِنْ عِلْمٍ إِلَّا ٱتِّبَاعَ ٱلظَّنِّ ۚ وَمَا قَتَلُوهُ يَقِينًۢا ﴿١٥٧﴾ بَل رَّفَعَهُ ٱللَّهُ إِلَيْهِ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا ﴿١٥٨﴾﴾ النساء: ١٥٧-١٥٨.

واتە: وە نەیانكوشت و هەڵیان نەواسی، بەڵكو خوا شێوەی عیسای بردەسەر شێوەی یەكێك لەخۆیان و، ئەوان تێیداكەوتنە ناكۆكیی و راجیاییەوە، وە بەتەئكید نەیان كوشتن، بەڵكو خوابەرزی كردەوە.

ئنجا كاتێك عیسا لەنێویاندا نەما، جوولەكەكان كەوتنە دژایەتییكردنی قوتابیی و هاوەڵە دانستە (حواري)ە دڵسۆزەكانی عیسا و، سەرسەختانە دوژمنایەتییان كردن و، كەوتنە راوە دوونانیان، دەیانگرتن و دەیانكوشتن و، فشارێكی زۆریان لێكردن، تاكو هەڵگەڕێنەوە و پاشگەزببنەوە، بۆیە فریا نەكەوتن، كەئەو ڕێنماییانەی ئەو (ئینجیل)ەی عیسا هێنابووی وەك خۆی كۆی بكەنەوەو بینووسنەوەو بڵاوی بكەنەوە، وە سەرەنجام لەنێویاندا دابەش و پەرشوبڵاو بوو، ئنجا لەحاڵێك دا كە ئەو (ئینجیل)ەی خوا وەك پەیام و دەستوور بۆ عیسای ناردبوو [ئینجیل واتە: مزگێنیی ومژدە] یەك دانەبوو، بەڵام نەسرانییەكان (٧٠) ئینجیلیان هەبوو، وەك دواتر باسی لێوە دەكەین، بۆیە قەشەكانیان لەبەر عەیبەی دنیا كۆبوونەوەو گوتیان: چۆن دەبێ! خوا یەك (ئینجیل)ی ناردوە، كەچی ئێمە حەفتا (٧٠) ئینجیلمان هەیە، كێ پێمان بڕوا دەكا؟ چۆن بوونی ئەو هەموو ئینجیلانە پاساو بدەینەوە و پینەبكەین؟! باكەمیان بكەینەوە، ئەوە بوولە حەفتا (٧٠)ەوە كردویاننە چوار (٤)ئینجیل[1]، ئیدی لەو كاتەوە دەست كرا بەگۆڕان و تێكدان و شێواندنی ئایینی عیسای مەسیح: بۆ یەكەم جار یەكەم كەس بەناوی (شائوولی طەڕسووسیی) كە (بۆڵص)یشی پێ دەگوترێ، دەستیكرد بەگۆڕین و شێواندنی و ناوبراو، لەسەرەتادا زۆر دژایەتی مەسیحییەكانی دەكرد، كەچی دوایی لەناكاو جاڕی بوونە مەسیحیی خۆی دا، بەڵام هەندێك لە مێژوو نووسە ئەورووپییەكان، كە تەحقیقیان لەو مەسەلەیە كردوە، دەڵێن:

---

(١) ئەو چوار ئینجیلەش بریتین لە: (مَتّى، لوقا، مرقُس، يوحنّا).

دادگای باڵای جوولەکە بەپیلان ئەو پیاوەیان ناردۆتە نێو مەسیحییەکان، بۆ ئەوەی تێکیانداو ئایینەکەیان بگۆڕێ و بشێوێنێ، چونکە جوولەکەکان گوتیان: هەرچەندە زەخت و فشار لەحەوارییەکان و پەیڕەوانی عیسا بکەین، هەر سوورتر دەبن لەسەر ڕێبازی خۆیان و، زیاتر پەرە دەستێنن و گەشە دەکەن و زیاتر بەرگریی لە خۆیان و لەئاینەکەیان دەکەن و، بەرهەڵستییمان دەکەن، بۆیە وا چاکە کە بەو شێوەیە بچینە نێویان و لاڕێیان بکەین و ئاینەکەیان بشێوێنین، وەك کردیشیان.

وە یەکەم کەس کە لەنێوان نەسرانییەکان دا مەسەلەی پەرستراوێتیی (ألوهية)ی عیسای ورووژاند، (بۆڵص) بوو، کەوای لە خەڵکەکە گەیاند، عیسا کوڕی خوایەو دەبێ بپەرسترێ، دەنا پێشتر نەصرانییەکان هەر دەیانگوت: عیسا بەندە (عبد)ی خوایەو، دایکی هەیەو بابی نیە، بەڵام هەر بەندەی خوایە، بەڵێ، خوای بێ وێنە هەندێك موعجیزەی پێ داون: بە ئیزنی خوا مردوو زیندوو دەکاتەوەو، گولیی و بەڵەك و کەڕو کوێرو لاڵی زگماك، چاك دەکاتەوەو،هەواڵی پەنهان دەدات، بەڵام هەر عەبدی خوایەو نابێ بپەرسترێ، بەڵام (بۆڵص) گومان و جیاوازیی و دڕدۆنگییەکی گەورەی خستە نێوانیان و گوتی: مادام عیسا مردوو زیندوو دەکاتەوەو، ئەوهەموو شتانە دەکات، ئەوە کوڕی خوایە، ئەگەرنا ئەوە لە توانای مرۆڤدا نیە! بۆ ئەوەی بەهەڵەیانداببات و لاڕێیان بکات لە ئایینی ڕاستەقینەی عیسا.

وە هەر (بۆڵص) بیروبۆچوونی (لاهوت و ناسوت)ی هێنایە کایەو، گوتی: عیسا دوو بەشە، بەشێکی لاهووتەو پەیوەندیی بەخواوە هەیەو، بەشێکی دیکەی ناسووتە، کە پەیوەندیی بەمرۆڤ و خەڵکی سەرزەییەوە هەیە، ئیدی لەوساوە کێشەومشتومڕ کەوتە نێوان نەسرانییەکان و، لاڕێ بوون و لەئەصڵی ئایینەکەیان لایاندا، کە بریتی بوو لەخوا بەیەکگرتن (توحید الله)، وە لەو ڕۆژەوە تەوحیدەکەیان خڵتەی تێکەوت و، نەسرانییەکان بوونە دوو دەستە، دەستەیەك پێیان دەگوترا: لایەنگرو هەوادارانی (بۆڵص) کەبڕوایان بەسێ پەرستراوێتیی هەیە، واتە: (الأب، الإبن، الروح القدس) کوڕو باب و گیانی پاك، کە مەبەستیان پێیان: خواو عیساو جوبڕائیلە، واتە: بڕوایان بەسێکوچکە (ثالوث) هەیە، وەدەستەکەی دیکە

پێیان دەگوترا: لایەنگرانی خوا بەیەکگرتن (توحید) کە زیاتر شوێنکەوتووی (ئاریوس) بوون، بەڵام لەساڵی (٣٢)ی زایینی دا (قسطنطین)، کە یەکێك بوو لە ئیمپڕاتۆرە هەرە بەهێزەکانی ڕۆم، بووە نەصڕانیی، کەتا ئەوکاتەش کێشەو ململانێ هەر هەبوو لەنێوان شوێنکەوتوانی عیسای مەسیح (علیه السلام) و لادەرە بت پەرستەکاندا.

ئنجا ئەو (قسطنطین)ە، کە بووە مەسیحیی، کۆبوونەوەیەکی گەورە و فراوانی بەزیاتر لە دوو هەزار(٢٠٠٠) زاناو قەشەو گەورە پیاوانی مەسیحیی کرد بەناوی کۆبوونەوەی: (النیقیة) کە کۆبوونەوەیەکی زۆر ناودار بوو و لەو کۆبوونەوەیەدا، دوای تاوو توێکردن و مشتومڕێکی زۆر، بیرۆکەی خوا بەسێ زانین و بڕوا بەسێ پەرستراو هەبوون (ثالوث) پەسندکراو بڕیاری لەسەر درا، وە ئەوانە وەلانران و پەراوێز کران، کە لەسەر ڕێبازی تەوحیدیی عیسا بوون و دەیانگوت: عیسا گوتوویەتی: تەنهایەك خوا هەیەو، منیش بەندەی خوام، ئەوانە چەوسێندرانەوەو، سەرەنجام ئایینی نەسڕانیی، ئەو مەسەلەی سیانە (ثالوث)ی بەسەرداسەپاو چەسپا، دواتریش بۆ سەرگرتنی ئەو ڕێبازو بیرو بۆچوونەیان، ئینجیلەکانیشیان کەم کردەوەو، تەنها چواریان هێشتنەوە، کە ئینجیلەکانی: (مەتتا، لۆقا، مەرقۆس، یوحننا)ن و، ئەو چوارانەیان لەنێو (٧٠) ئینجیل دا هەڵبژارد، وە ئەوە ڕاستییەکەیە، کەئەوەی عیسا لە لای خواوە هێناوبووی، هیچ پەیوەندیی نەبوو بەوەوە کە دواتر لەکۆبوونەوەی (النیقیة)دا بەئایینی عیسا لەقەڵەم درا، وە هەموو مێژوونووسەکانی ئەورووپا دانیان بەوەداناوە، کە (بۆلص) (شائوولی طەرسووسیی) دامەزرێنەری نەسڕانییەتە، بۆ وێنە:

١- یەکێك لەزانا مێژوو نووسەرە ناودارەکانی ئەورووپا بەناوی (ویلز) لە کتێبی: (معالم التأريخ الإنساني) دا دەڵێ: [شائوول بەیەکەم دامەزرێنەری ڕاستەقینەی نەسڕانییەتی ئێستا دادەنرێ، وە نەسڕانییەت هیچ پەیوەندییەکی بەئایینی عیساوە نیە][1].

---

(١) بڕوانە: ج٣ص٦٩٥.

٢- كتێبی: (دائرة المعارف البريطانية) دەڵێت: [بێگومان سەیدمان (عیسى) هیچ كاتێك بانگەشەی ئەوەی نەكردوە لەڕەگەزی خوایە، یان كوڕی خوایە، یان لەڕەگەزێكی باشترو بەرزترە لەڕەگەزی مرۆڤ، بەڵكو هەر گوتوویەتی: بەندەی خوام، بەڵام ئەوە نەسرانییەتە ئەوەی داهێناوە، كە عیسا كوڕی خوایە،كە (شائوول) نەخشەی بۆ دارشت و دواییش (قسطنطين) بەڕەسمیی دانی بەوە داناو پەیرەویی لێی كرد][1].

٣- (مۆریس بۆكای) كە كابرایەكی ئەورووپییە لەكتێبی: (دراسة الكتب المقدسة في ضوء العلم)دا دەڵێت: [هیچ شتێك لەبەرهەمەكانی مەسیح نەماوە لەو ئینجیلانەدا كەهەن، تەنانەت وشەیەكی ڕاستەقینە نیە، كە وەك خۆی هەڵگیرابێ و نووسرابێتەوە، لەئینجیلەكانی ئێستادا، چونكە خوا تەنها (ئینجیل)ێكی بۆ عیسا ناردەوە، كەچی ئەوان (٧٠) ئینجیلیان هەبووە، دوایی كردوویانی بەچوار ئینجیل، ئنجا دەبێ لەو چوارەشیان كامەیان ئەو ئینجیلە ڕاستەقینەیەی عیسا بێت، كە بێگومان هیچ كامیان لەوانە ئەو ئینجیلە نیە، كە خوای بێ وێنە ناردوویەتە خوارەوە بۆ عیسا (عليه السلام)].

ئەوە كورتەو پوختەیەك بوو لەسەرگوزشتەی نەسرانییەت وەك ئایین، ئەو ئایینەی، كە لە خوابەیەكگرتن (توحيد)ەوە گۆڕدرا بۆ خوا بەسێكردن(تثليث)، ئەو ئایینەی، كە تام و بۆنی وەحی پێوە نەمابوو.

بەڵام بابزانین داخۆ پیاوانی دین و دام و دەزگاكانی كڵێسا، چییان كردو چییان لێهات !؟ دیارە هەر لەو ڕۆژەوە، كە زانایانی نەصرانیی ناوی پیاوانی ئایینی (رجال الدين)یان لەخۆیان نا، كۆمەڵگای نەصرانییەتیان بەرەو شتێكی دیكە ئاڕاستەو ڕێنمایی كردو، بەجۆرێكی دیكەی دوور لەئایینی مەسیح، هەڵسوكەوتیان دەكردو، بەشتێكی دیكە لەخۆیان دەگەیشتن، ئەگەرچی ئەو زاراوەیە، واتە: (پیاوانی ئایینی) لەڕوانگەی حەقیقەتی دینی خواوە هیچ ئەسڵێكی نیە، بەڵكو تەنها هەڵقوڵاوی كۆمەڵگای ئەورووپیی و ئەو واقیعەیە،

---

(١) بڕوانە: ج٥ص٦٣٢.

کە باسکرا، چونکە زاراوەی (رجال الدين) لەیەك ئایەت و حەدیسی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) نەهاتوە، بەڵکو لەئیسلام دا وشەی: [زانایانی ئایین] هەیە، کەزاراوەیەکی گشتگیرەو ڕەگەزی پیاوو ئافرەت دەگرێتەوە، چونکە لەئیسلامدا، پیاوو ئافرەتی مسوڵمان، هەموویان بەندەی خوان و دین تەنها لەسەر پیاوان تاپۆ نیە، بەڵکو دینی پیاوو ژن و تەنانەت هی منداڵانیشەو، هەموویان لەبەرانبەری دا بەرپرسیارن، بۆیە زاراوەی (پیاوانی دین) کە کۆمەڵە پیاوێك هەبن، تایبەت بن بەئایینەوە و، هەر ئەوان خزمەتی بکەن و مشووری بخۆن، ئەوە هیچ پەیوەندییەکی بەئیسلامەوە نیە،بەڵکو ئیسلام هەموو مسوڵمانێك دەگرێتەوە، بەهەموو چین و توێژو ڕەگەزەکانی کۆمەڵگای مۆڤـایەتییەوە، وە ئەو وشەیە (پیاوانی ئایین) وەك زاراوە، سەرەتا لە ئەورووپا سەری هەڵداو، وەك پڕاکتیکیش، لەوکاتەوە پیادەکرا، کە پیاوانی ئایینی نەصرانیی کەوتنە ژێر فشاری ڕۆمانەکان، بەتایبەت دوای ئەوەی، کە (شائوول) ڕێبازەکەی لێ گۆڕین و، پەیڕەوانیشی دەستیان بەتەنازول کردن کرد، وە دوای ئەوەی کە تەنازولیان لە تەنیا خواپەرستن (توحيد) کرد، تەنازولیان لەزۆر شتی دیکەش کرد، هەروەك خاوەنی کتێبی مێژووی ئەورووپا لەسەدەکانی نێوەڕاستدا (تأريخ أوروبا في العصور الوسطى)، کە لە ئینگلیزییەوە تەرجەمەکراوە، دەڵێ: [هۆشیاریی و لێزانیی پیاوانی کڵێسای مەسیح لەوەدابوو، کە کاتێك زانیان وا شاڵاوی بت پەرستیی (وثنية) و بیرۆکەی سێ پەرستراوێتیی (تثليث) زۆر بەهێزەو، زۆریان بۆ دێنێ و، ئەوانیش ناتوانن بەرپەرچی بدەنەوەو بەربەستی بکەن، هەستان ئاینی مەسیحییان لەگەڵ ئەو بیرۆکە و شاڵاوە بت پەرستییدا گونجاند و، ئەوان شتێکی ژیرانەیان کرد، بۆ ئەوەی ئایینی مەسیحیی بەیەکجاریی لەنێو نەچێت، ئاینەکەیان بە (تثليث) ەوە موتوربەکرد!]

وە دواتر هەرشتێکی دیکە کە پێچەوانەی بیروڕاو ئارەزووی کۆمەڵگاکەیان بوو، پیاوانی ئایینی بەوپێیە دەیانگۆڕی، کە لەگەڵ ئارەزووی خەڵکەکەدا بگونجێ، هەتاوای لێهات، زۆر شتیان دەستکاریی کردو (نەصرانییەت) بووە مایەی گاڵتەو گەپ و یاریی پێکراوی دەستی ئینسانەکان، وە ئەو ئایینە نەما

کەپێی بگوترێ: ئایینی خوا، بەڵکو وەك هەر بیردۆزەو ڕێچکەیەکی ئینسانیی لێهات، کەبەپێی بیرو بۆچوونی ئینسانێك دارێژراوە، دوور لە ئایین و ڕێبازی خوا، وە هەرلێرەوەش هۆکارو عیللەتی ئەوە دەزانین، کە بۆچی ئەورووپییەکان هەرچەندە خۆیان بەمەسیحیی دەزانن، کەچی لەهەمان کاتدا: گۆشتی بەراز دەخۆن و، شەراب دەنۆشن و، زینا دەکەن و، سوود (ربا) دەخۆن و، خۆیان خەتەنە (سوننەت) ناکەن و، هەموو ئەو شتانەو زیاتریش لەناشەرعییەکان دەکەن و، بەشتێکی حەڵاڵ و ڕەواو ئاسایی یان دەزانن، وە لەمێژووی وڵاتانی ئەورووپادا هاتوە، کە هەموو ئەوشتانەی باسکران، دوایی لەئایینی مەسیحیی دا زیاد کران، چونکە ئەوانە هەموویان لەفەرهەنگ و کلتووری ئیغریق و ڕۆمانییەکاندا هەبوون، وەپیاوانی ئایینی مەسیحیی لەحەقیقەتی ئایینەکەیان دابەزین و چوونە سەر بیروڕای ئەوان و بەدوای ئەوان کەوتن و، ئەو شتە خراپ و پڕوپووچانەیان خستە نێو ئایینەکەیانەوە.

# ئەو شتانەی کڵێسا لە ئایینی مەسیحیی دا دایهێنان:

کڵێسا (کنیسة) لەچوار بواری سەرەکیی دا، ئاینی مەسیحی (علیه السلام) شێواند و بەلاڕێی دابرد:

١- دروستکردنی چینی کەهەنووت (ئەکلیرۆس).
٢- لەڕووی رووحییەوە.
٣- لەڕووی سیاسییەوە.
٤- لەڕووی ئابوورییەوە.

**١- دروستکردنی چین (طبقة)ی (کەهەنووت): واتە پیاوانی ئایینی (ئەکلیرۆس):**

ئەوە یەکەمین دەردو بەڵا بوو، کە پیاوانی کڵێسا بەسەر ئایینی عیسایان داهێنا، ئەگەرنا عیسا (علیه الصلاة والسلام) پێغەمبەرێکی زۆر زاهید بوو و بەسادەیی دەژیا، چونکە لە ژیانی دا ژنی نەهێناوە، هەر باسی لایەنی ڕووحیی و دنیا بە کەمگریی کردووە، زۆر باسی ئاکارو ئەخلاقی کردووە، باسی پەروەردەو ڕاهێنانی دڵ و دەروون و ئەندامەکانی جەستەی مرۆڤی کردوە لەسەر چاکە، بۆیە هەرگیز ڕۆژێك نەهاتوە ئایین وەك هۆکارێکی ژیان لەبەرژەوەندیی خۆی دا بەکاربێنێ و، بارزگانیی پێوە بکات بۆ ژیان و بژێوی خۆی، بەڵکو هەمیشە تەنها، پەیڕەویی لەفەرمایشتەکانی خوای پاك و بێگەرد دەکردو،

لەفەرمانەکانی وی لای نەدەدا، کەچی پیاوانی ئارەزوو بازو دنیا ویستی کڵێسا، بەناوی ئایینەوە خۆیان بەچینێکی جیا لەچین و خەڵکانی دیکەی نێو کۆمەڵگا پێشاندا، لەهەموو ڕوویێکی ژیانەوە: لەجل و بەرگ و پۆشاك و سیمایان دا، لە چۆنیەتی ژیان و گوزەرانیاندا، لەعیبادەتیاندا، لە تەفسیرکردنی کتێبی موقەددەسیاندا، لەهەموو ئەو شتانەو گەلێك شتی دیکەش دا، خۆیان لەخەڵکەکەیان جیاکردەوە و، بەکەیفی خۆیان (کتێبی موقەددەس)یان دەگۆڕی و پێناسەیان دەکردو، تەنها بەموڵکی خۆیان دەزانی و، لەسەر خۆیان تاپۆیان کردو، لێکدانەوەو تەئویلی خراپیان بۆ دەقەکانی دەکرد.

وە کە لەئیسلامدا هەموو کەس بۆی هەیە قورئانی خوا بخوێنێ و، لێی وردبێتەوەو تێی بگات، لەلای کڵێساو پیاوانی ئایینی شێوێندراوی مەسیحیی، وانەبووە، بەڵکو تەنها لەدوای چاخی (ڕێنیسانس)ەوە خەڵکی ئەو بوار دەروازەیان بۆ کرایەوەو ڕێگایان پێدرا، کە لە (کتێبی موقەددەس) وردببنەوە، ئەگەرنا پێشتر جگە لە پاپاو حاخام و قەشەکان، کەس بۆی نەبوو سەرنجی (ئینجیل و تەوڕات) بدات، بەڵکو دەبوو تەنها پاپاو حاخام و قەشەکان (ئینجل و تەوڕات) بۆ خەڵك ڕاڤە (تفسیر) بکەن و کەسی دیکە ئەو صەلاحیەت و دەستەڵاتەی نەبوو، کە کاری وا بکات.

وە لەڕووی فیکرییەوە، کڵێسا کارەساتێکی زۆر گەورەی بەسەر ئایینی مەسیحیی دا هێناو، ئاشووب و ئاژاوەیەکی زۆری تێدابەرپاکرد وکتێبی پیرۆز (الكتاب المقدس - Holy Book)[1]ی گۆڕی و پڕی کرد لە بیرۆکە و فەلسەفەی پڕ وپووچی زادەی بیروهۆشی چەند مرۆڤێك، بۆ نموونە: (بطلیموس) و (ئیقلیدس) دووزانای گەردوونناسی ئیغریقیی بوون، ئەو بیردۆزانەی کە ئەوان هەیانبوون، دەربارەی بوونەوەر، هەموویان وەك حەقیقەتێکی ئایینی لەگەڵ (ئینجیل و تەوڕات)دا پەیوەست کردن، بۆ وێنە: (بطلیموس) دەربارەی بوونەوەر دەیگوت: زەوی چەقی بوونەوەرەو هەموو ئەستێرەکان وەك گلۆپ و چرا بەئاسمانەوە

---

(١) کتێبی پیرۆز (الكتاب المقدس) لەهەردووك: پەیمانی کۆن و پەیمانی نوێ (العهد القديم والعهد الجديد) کە هەرکامێکیان چەند کتێبێك دەگرنە خۆیان، پێکهاتوە.

چەسپیون، مەسیحییەکانیش هەموو ئەو شتانەیان وەك ئایین چەسپاند، وە بڕواشیان بەهەموو ئەو بیرۆکانە کرد، کە (ئەرستۆ) بەناوی فەلسەفە و زانستەوە دەربارەی سیاسەت و حوکمڕانیی و پزیشکیی و.. هتدەوە، دەیخستنەڕوو، ئەگەر چی لەئەسڵدا کەمتر حەقیقەتیان تێدابوو، وە هەرشتێك کە (ئەرستۆ)، یان (بطلیموس)، یان (ئیقلیدس) گوتبوویان، ئەوان بەموقەددەسیان دەزانی و لێیان لانەدەدا، بەڵکو هەر شتێکی دیکە پێچەوانەی بیروڕاو قسەو بیردۆزەی ئەوان بوایە، (پیاوانی ئایینی) ئەو شتەیان بەکوفر دەزانی و بەپێچەوانەی کتێبی موقەددەسیان دەزانی و ڕووبەڕووی دەبوونەوەو دەیانگوت: تۆچۆن ئەو شتە لەخۆڕا دەڵێی؟ بۆ وێنە: کاتێك (کۆپەرنیك) لەساڵی (١٥٤٣)ز دا کتێبێکی بەناوی: [جووڵەی خڕۆکەکانی ئاسمان] (حركة الإجرام السماوية)وە، نووسی، کە جارێ (تەلسکۆب)یش دانەهاتبوو، وە ناوبراو لەو کتێبەی دا گوتبووی: زەوی یەکێکەلە خڕۆکەکان و سەنتەر (مرکز)ی بوونەوەر نیە، کەدیارە ئەوەش تەواو پێچەوانەی بیرو بۆچوون و بیردۆزەکانی (بطلیموس) و (ئیقلیدس)بوو، سەبارەت بەگەردوون، بۆیە دادگای پشکنین (محكمة التفتيش) کە تایبەت بوو بەسانسۆری ئایدیۆلۆژیا (مراقبة العقائد)ی خەڵکی، کەلەلایەن کڵێساوە بۆ ئەو مەبەستە دروست کرابوو، داخۆ چ کەسێك و چ دەزگایەك قسەیەك دەکات، پێچەوانەی قسە و بیردۆزەی ئەو زانایانەو پێچەوانەی تەعالیمی کڵێسا بێت، ئەو دادگایە ویستیان (کۆپەرنیك) بگرن و لەسێدارەی بدەن، هەرچەندە ناوبراو قەشەش بوو، بەڵام بەر لەوەی دادگای ناوبراو دەستگیری بکات، وەفاتی کردو لەچەنگ ئەوان ڕزگاری بوو!

بەڵام دوای ئەو کاتێك (جۆردان برۆنۆ)ی ئیتاڵیی ئەو بیردۆزەیەی زیندوو کردەوەو تەبەننیی کرد، دادگا شەش (٦) ساڵی زیندانی کردو، لەساڵی (١٦٠٠)دا چیخێکیان تێوەرپێچاو نەوتیان پێداکردو، بەبەرچاوی ئاپۆرەی خەڵکەوە گڕیانداو، کردیانە سووتماك و خۆڵەمێش، تەنها لەبەر ئەوەی، کە دەیگوت: زەوی چەقی بوونەوەر نیە، بەڵکو خڕۆکەیەکە لەخڕۆکەکانی بوونەوەر!

وەچەند ساڵێك لەپاش وی: (گالیلۆ)[1] سەری هەڵداو (تەلسكۆب)ی داهێنا، وە لەبەر ئەوەی بەهۆی ئەو تەلسكۆبەوە، بڕوای بەبیردۆزەكانی (كۆپەرنیك برۆنۆ) كرد، لەسەر ئەوە دادگا (گالیلۆ)ی لەتەمەنی (٧٠) ساڵیدا گرت و زیندانیی كرد، پاشان لەوێ چەند (ویرد)ێكی لەسەر فەرزكران، كە دەبێ ڕۆژانە بیان خوێنێ و تۆبە بكات، تاكو پاك ببێتەوە! ئنجا دوای (٣) ساڵ چوونە لای و (گالیلۆ) پێی گوتن: ئەگەر ڕێگام بدەن پەشێمان دەبمەوەو ئازادم بكەن، با لە زینداندا نەمرم، وە لەبەردەمی (پاپا)دا لەبیروبۆچوونەكانی خۆی دابەزی و گوتی: ئەوە بیرۆكەیەكی شەیتانیی بوو، بۆم هات و ئێستا لێی پەشێمان دەبمەوەو، جارێكی دیكە ناچمەوە سەری و، هەڵەی وا ناكەمەوەو، ناڵێم زەوی خڕەو دەسووڕێتەوە!

وە لە كتێبی (قصة النزاع بين الدين والفلسفة)دا زۆر نموونە و بابەت لەوبارەوە هاتوون، بۆ وێنە: ڕۆژێك مامۆستایەكی ئایینی مەسیحیی لەكاتێك دا، كە دەرسی بەقوتابییەكانی دەگوت و لەو میانەدا باسی ئەسپ دەكرێت، قوتابییەكیش دەپرسێ: مامۆستا! دەبێ ئەسپ چەند ددانی لە شەویلاگەدا هەبن؟ مامۆستاكەش دەڵێ: كوڕم ئەوە لەكتێبی موقەددەسدا نەهاتووە باسی ئەو مەسەلەیە مەكە! [چونكە هەرشتێك لەكتێبی موقەددەسدا نەهاتبایە، كەس بۆی نەبوو باسی لێوە بكات] بەڵام یەكێك لە قوتابییەكان دەڵێ: مامۆستا! دەتوانین شەویلاگەی ئەسپێكی تۆپیو، یان ئەسپێكی زیندوو بهێنین و ددانەكانی بژمێرین، ئەوسا بەڕوونیی دەزانین ئەسپ چەند ددانی هەن! مامۆستایەكەش زۆر لێی تووڕە دەبێ و، پێی دەڵێ: ئەگەر لەو قسانەت پەشێمان نەبیەوە، دەرت (فصل)ت دەكەم و، دەتدەمە دادگای لێكۆڵینەوەو پشكنین، بۆیە بەناچاریی قوتابیەكە یەكسەر پەشێمان دەبێتەوە و، داوای لێبوردن لە مامۆستایەكەی دەكات!

وە(مارتن لۆپهر) كەبزووتنەوەی پرۆتستانتی لە ئەورووپا بەرپاكرد، بەئومێدی بژاركردنی نەصرانییەت لەهەڵەو پەڵەو تازەكردنەوەی ئایین، وە سەرەنجام كۆمەڵێك

---

(١) گالیلۆ: فەیلەسووفێكی گەردووناسە، لە (١٥٦٤) لە (بینرا)ی ئیتاڵیا لەدایك بووەو لە (١٦٤٢)دامردوە.

بیرۆکەی تازەو نوێی لە ئایینی نەسرانییەتدا داهێناو ورووژاند، لەدژی دەسەڵات و بیروڕای پاپاو قەشەکان، بەڵام پاپا و قەشە کاپۆلیکەکان لەساڵی (١٧٥٢)دا قەسابخانەو کوشتارگەیەکیان بۆ پرۆتستانەکان سازدا، بەناوی قەسابخانەی (سانتی بارتلی) کەلەیەك شەودا سەد هەزار(١٠٠٠٠٠) کەسیان لێ کوشتن!! وە تەنها لەسەدەی (١٣) تا سەدەی (١٨)دا، لەسەر فەرمانی دادگای تەفتیش (٩٠٠٠٠٠٠) نۆ ملیۆن مرۆڤیان کۆمەڵکوژو تارومار، کرد، کە زۆربەیان جوولەکە و نەسرانیی بوون و، کۆمەڵێکیشیان لە مسوڵمانانی (ئەندەلووس) بوون و هەڵنەگەڕانەوە.

دیارە ئێستا مەسیحییەکان سێ(٣) بەشن: (کاپۆلیك، پرۆتستانت، ئۆرپذۆکس)، وە ئەوانەی کەدادگای پشکنینیان داناو دەستەڵاتی ڕەها (مطلق) یان بەخۆداو، ئەو قەسابخانەیان بەرپاکرد، کاپۆلیکەکان بوون، لەدژی پرۆتستانتەکان.

### ٢- لادانی کڵێسا لەڕووی ڕووحییەوە:

### أ- گۆشە نشینی (الرهبانية):

یەکێك لەوشتانەی پیاوانی کڵێسا لەلایەنی ڕووحییەوە لەئایینی مەسیحیی دا دایانهێنا، بریتی بوولە گۆشەنشینیی (رهبانية) وەك خوای بەرز دەفەرموێ:

﴿ وَرَهْبَانِيَّةً ٱبْتَدَعُوهَا مَا كَتَبْنَـٰهَا عَلَيْهِمْ ﴾ الحديد: ٢٧.

واتە: گۆشە نشینییان (لەنێو خەڵکەکەدا) داهێنا، کە ئێمە لەسەرمان فەرز نەکردبوون، بەڵکو خۆیان دایان هێناو پەیدایان کرد. دیارە داهێنان و شت لەدیندا پەیداکردن، لادانێکی گەورە و ترسناکە، چونکە خوای بێ وێنە ئینسانی دروست کردوەو، هەر ئەویش دەزانێ کە ژیانی مرۆڤ پێویستیی بە چ بەرنامەیەك هەیە، ئنجا کە ئایینی خوا لێی زیادو کەم کرا، کەم وکوڕیی و گیرو گرفتی زۆر گەورەی تێدا پەیدادەبێ و، هاوسەنگییەکەی تێك دەچێ وە نەصرانییەکان ڕەهبانییەتیان لەسەر ئەو بناغەیە داهێناوە، کە ئادەم گوناهی کردوە، بۆیە خوا (عیسا)ی کوڕی خۆی ناردۆتە خوارێ، بۆ ئەوەی ببێتە قۆچی قوربانیی و، گوناهەکانی

ئادەم بسڕێتەوەو، مەسیح ببێتە بەلا گێڕەوەی بەشەرییەت! دەڵێن: ئادەم گوناهی کردوە، کەچی دەبێ عیسا باجەکەی بدات! وە دەڵێن: ڕەهبانییەت ئەوەیە کە زۆر خۆت ئەزیەت بدەی، چونکە عیسا کوڕی خوایەو، بوو بە بەلاگێڕەوەی مرۆڤایەتیی و، بوو بەباج و کەفارەتی گوناهەکانی ئادەم، ئنجا هەر کەسێکیش، کە بیەوێ گوناهی لەکۆڵ ببنەوەو، پاك ببێتەوەو، خوا لێی ڕازی بێ، دەبێ زۆر خۆی ئەشکەنجەو ئازار بدات و، خۆی نارەحەت بکات، هەربۆیەش ڕاهیبەکان ژنیان نەدەهێناو، خۆیان نەدەشۆرد و خۆیان بۆن خۆش نەدەکردو، خۆیان پاك و خاوێن نەدەکردو، خواردنی خۆشیان نەدەخوارد، وە هەموو ئەو شتانە، کە لەگەڵ سروشت (فطرة) و عەقڵ و ژین دا نەدەگونجان، ئەوانەیان ئەنجام دەدا.

### ب- قوربانیی پیرۆز:

یەکێکی دیکە لەوشتانەی کڵێسا دایهێنان، مەسەلەی قوربانیی پیرۆز (القربان المقدس)ە، کە ئێستاش هەر هەیەو بەردەوامەو، نەسڕانییەکان (عید الفصح)ی پێ دەڵێن، یان (العَشاء الربّانـي) کە مەبەستیان ئەوەیە گوایە ڕۆژێ عیسا، نەسڕانییەکانی داوەت کردوەو (حوارییەکان)یش نان و شەڕابیان بۆ داناون، ئنجادەڵێن: عیسا گوتوویەتی: هەرکەسێك ئەو نانە بخوات، ئەوە وەك گۆشتی منی خواردبێ و چووبێتە نێو جەستەی من وایە، وە هەرکەسێك ئەو شەڕابە بخواتەوە، وەك ئەوە وایە کەخوێنی منی چووبێە نێو جەستەوە! کەواتە: خواردنی ئەو داوەتە، یانی: خواردنی خوێن و گۆشتی من و، بەوە تێکەڵ بەمن دەبێت! بۆیە ئێستاش ئەوان جەژنێکیان هەیە، کەتێیدا نان و مەی (خمر) دادەنێن، گوایە نانەکە گۆشتی عیسایەو، شەڕابەکەش خوێنی عیسایە!

### ج- پەیکەرتاشیی و بت دروستکردن:

هەروەها کڵێسا و پیاوانی ئایینی نەصڕانیی، پەیکەرتاشیی و بت و سەنەم پەرستییان داهێنا، کە پێشتر نەبوو، وەك (ویل دیوڕانت)ی نووسەری کتێبی: (قصة الحضارة) دەڵێت: [لەسەرەتادا کڵێسا زۆر دژی پەیکەرتاشیی و وێنە

سازیی و ئەو جۆرە شتانە بوو، وە بەشوێنەواری بت پەرستەکانی دەدایە قەڵەم، بەڵام دوایی، کە کڵێسا ئینحیراڤی کرد، ئەوسا پەیکەرتاشیی و پەیکەرسازییان هەزم کرد][1].

**د- داهێنانی پسوولەی لێخۆشبوون:**

هەروەها کڵێساو پیاوەکانی، (صكوك الغفران)یان داهێنا، واتە: پسوولەکانی لێخۆشبوون، بۆ وێنە: پاپا بەیەکێکی دەگوت: هەر کەس بیەوێ خوا لێی خۆش بێ و، بەهەشتی پێ ببەخشێ، با ئەوەندە پارەیە دابنێ خوالێی خۆش دەبێ و، یەکسەر پسوولەیەکی بۆ دەکردو پێی دەگوت: ئەوە لەبەرانبەر ئەوەدا، من تۆم لەجیاتی عیسا عەفووکرد، وە عیساش لەجیاتی خوای بەخشندە، تۆ عەفوو دەکات، چونکە عیسا کوڕی خوایە! بگرە بەهەندێك کەسی دەگوت: لەبری ئەو پارەیەو بەو پسوولەیە، وا لەگوناهی ڕابردوو و داهاتووت خۆش بووم، بەڵکو لەوەش زیاتر زێدەڕۆیی (غلو)یان کرد، بۆ وێنە: بەهەندێك کەسیان دەگوت: وەرە باپسوولەی لێخۆش بوون بۆ مردووەکانیشیتان بکەین، تاکو لەمردووەکانیشتان خۆش بین! بەو شێوەیە خەڵکیان چەواشە دەکردو تەفرەیان دەدان.

ئنجا دەگێڕنەوە، کەپیاوێکی زۆر دەوڵەمەند هەبووەو زۆرزان بووە، تەماشای کرد: کەپاپا و قەشەکان و (کڵێسا) ئاوا ئەو خەڵکە دەچەوسێننەوەو، لەخشتەیان دەبەن و پارەیان بەخۆڕایی لێ دەستێنن، ڕۆژێك ئەو دەوڵەمەندە زۆرزانە چووە لای پاپاو پێی گوت: من هاتووم کە سەودایەکت لەگەڵدا بکەم، پاپا گوتی: سەودای چی؟ دەوڵەمەندەکە گوتی: دەمەوێ دۆزەخت لێبکڕم، پاپا سەری سوڕماو، گوتی: ئنجا دۆزەخت بۆ چییە، خەڵك بەهەشتی گەرەکە و دەیکڕێ؟! کابرا گوتی: من دۆزەخم دەوێ، بەڵام هەموویت لێدەکڕم بەگۆترە! پاپا نەیدەزانی چی بکات و چۆن پەشێمانی بکاتەوە، کابراش هەر دەیگوت: ئاخر من پێویستیم دۆزەخەو پارەی خۆمەو پێی دەدەم، دەرەنجام بەبڕە پارەیەکی دیارییکراو دۆزەخی لێکڕی، دوایی لە نێوخەڵکی دا بڵاوی کردەوە: کە من دۆزەخم لەپاپا کڕیوە،

---

(١) ج٢٤ ص١٥٤.

باکەس لەمەودوا لەدۆزەخ نەترسێ و، بەهەشت نەکڕێ، بەهەشتی بۆ چییە، من لێناگەڕێم بچنە نێو دۆزەخەوە و عایدی خۆمە، بۆچی پارە بەبەهەشت دەدەن؟!

کابرا ئەو قسانەی بڵاوکردەوە، تاکو خەڵك تێبگات، کە عەفووکردن و بەهەشت و دۆزەخ هیچیان بەدەست پاپا نین! دیسان (ویل دیورانت) لە کتێبەکەیدا دەڵێ: یەکێك لەپاپاکان گوتی: پاپا نوێنەری خوایەو سێبەری خوایە لەسەر زەوی، بۆیە دەبێ دەستەڵاتی ڕەها (السطلة المطلقة) هی ئەو بێت بەسەر هەمولایەك دا، بەجۆرێك کە هیچ پادشاو ئیمپراتۆرێك بۆی نەبوو بەبێ بڕیاری پاپا لەسەر تەخت و بارەگای خۆی دابنیشێ و کاربکات و بڕیار بدات، وە پاپا لەهەر دەسەڵاتدارو ئیمپراتۆرێك تووڕە بووبایە، ئەوە تەنها لەماوەی یەك ڕۆژدا، لای دەداو دایدەبەزاند.

## ٣- لادانی کڵێسا لەڕووی سیاسییەوە:

وەك باسم کرد: هەرچی حوکم و دەستەڵاتی سیاسییە، بەدەستی چینی ئەکلیرۆسەوە بوو.

**لێرەدا لەو بارەوە تەنها دوونموونەتان بۆ لە مێژوو دێنمەوە:-**

١- (هەنری چوارەم)ی ئیمپراتۆر، کە لە ساڵی (١٥٧٦)دا مرد، کاتێك کەپاپا لێی تووڕە بوو، سێ (٣) ڕۆژان لەنێو بەفردا بەپێخواسیی ڕای گرت و تەوبەی پێکرد، پاشان خەڵك تکا(شفاعة)یان بۆ کرد، ئنجا عەفووی کردو لێیگەڕا، ئەوەش تەنها لەبەر ئەوەی کەگوتبووی: بۆچی پاپا دەست لە کاروباری سیاسی دەوڵەت و حوکمڕانییەوە، وەردەدات!!

٢- وە (فریدریك) کەئیمپڕاتۆرێکی دیکە بوو، لەساڵی (١١٧٧)دا مرد، بەهەمان شێوە، پاپا سزاو ئازارو ئەشکەنجەیەکی زۆر سەخت و دژوارو نامرۆڤانەی دا، تەنها لەسەر خستنەڕووی هەندێك بیروڕا و پێشنیار بۆ پاپا!

**٤- لادانی كڵێسا لەڕووی ئابوورییەوە:**

دەستەڵاتی كڵێساو، پیاوانی ئایینی لەڕووی داراییەوە بەشێوەیەك بوو، بەشێوەیەك دەژیان كە زۆر لە ئیمپراتۆرەكان ساماندارتر و دەوڵەمەندتر بوون، بەجۆرێك كە سامان و دارایی و زەوی و زارو كۆیلەیەكی زۆرو بێ ژماریان هەبوو، ساڵانە سەرانەو باجیان لەهەژارو نەداران وەردەگرت و، سۆغرەیان بەخەڵكی دەكردو، هەموو بارگرانییەكیان لەسەر هەژاران بوو، وە هیچ كەس خاوەنی هیچ شتێكی خۆی نەبوو، لە بەرانبەر پیاوانی كڵێساداو، كڵێسا و (پیاوانی ئایین) ستەم و خراپەی زۆریان بەناوی خوا و عیساوە لەخەڵك و جەماوەر دەكرد.

بەڵێ (سیكولاریزم) لەو هەل و مەرجە و باردۆخە سەخت و دژوارەداو، لەبەرانبەر ئەو ئایینە تێكدراوو شێوێنراوەدا و، لەبەرانبەر ئەو هەموو دام و دەزگا داپڵۆسێنەرو سەركوتكەرە بەناو ئایینییانەدا دروست بوو، كە ڕێیان لەزانست و بەرەو پێشەوەچوونی ژیان گرتبوو، كەواتە: (ماركس) گێل نەبوو كەدەیگوت: دین تلیاكی گەلانە (الدين أفيون الشعوب) كە، مەبەستی پێ ئایینی شێوێندراوی مەسیحیی بووە، ئەگەرنا هەركەس بەرانبەر بە ئیسلام ئەوە بڵێ، ئەوە درۆی كردووە بەهەڵەدا چووە، چونكە ئیسلام بەرنامەی گشتگیرو بێهەڵەو پەڵەی ژیانەو، كلیل و چارەسەری هەموو گیرو گرفتەكانە و، ئینسان بانگ دەكا بۆ خواپەرستیی ڕاستەقینەو، چەسپاندنی دادگەریی و، هەوڵدان بۆ پێشكەوتن و زانیاریی و ئاوەدانیی، بەڵام (ماركس) و ئەوان هەر شارەزای ئایینی شێوێندراوی نەصرانیی بوونە، بۆیە وایان بیر لەدین كردۆتەوەو، وایان حوكم داوە، ئنجا بەڕاستییش ئایینی گۆڕراوی نەصرانیی تلیاك بوو، خەڵكی پێ بەنج و سڕو بێ هۆش كرابوو، هەمیشە كۆسپ و تەگەرەو ئاستەنگ بوو لەبەردەم زانیاریی و پێشكەوتن دا، لەبەر دەم عەقڵ و هۆشدا، لەبەردەم بەرەوپێشچوون و بەرژەوەندیی خەڵكدا، لەبەردەم پێشكەوتن و وەرچەرخانی ژیاندا، بۆیە كۆمەڵگای ئەورووپا ناچاربوون، كە لە بەرانبەری دا بوەستن و لێی ڕاپەڕن، ئەوە بوو سەرەنجام زاناو فەیلەسووفەكانیان بەو واقیعە ڕازی نەبوون و، ڕەخنەیان

لێ گرت و، سیاسەتمەدارو چاکسازەکان کتێب و گوتاریان لەسەر ئەو بارودۆخە ناهەموارە داسەپاوە، نووسی و، شاعیرەکان لەشیعرەکانیاندا توانج و پلاریان لەپاپاو ئایین و دەسەڵاتدارەکان گرت، تاکو سەرەنجام شۆڕشی فەرەنسا لەساڵی (١٧٨٩)دا لە دژی کڵێسا بەرپابوو، وەك دوایین بزمار لە تابووتی ئایینی شێوێندراوی مەسیحیی و لە دام و دەزگا زۆردارەکانی کڵێسا دراو، لەو ڕۆژەوە گڵۆڵەی کڵێسا کەوتە لێژی و، خەڵك ڕزگاری بوو لەکۆت و زنجیری کڵێساو پاپا و قەشە خۆپەرستەکانی و، لەو کابووس و دێوەزمە ڕەشە رزگاری بوو، کە ساڵەهای ساڵ بوو، خۆی بەسەر خەڵك دا سەپاند بوو، وە خەڵکی لە دەستی چەوسێنەرو زۆردارو خوێن مژانی ڕزگاری بوو، ئەوانەی کەهەمیشەو بەهەموو جۆرێك وەك زەروو خوێنی گەلیان دەمژی و، لەبەرژەوەندیی خەڵکیان دەدا.

بۆیە یەکێك لە شیعارەکانی شۆڕشی فەرەنسا ئەوە بوو، کە دەیانگوت: (أعدموا آخر مَلِكٍ بأمعاء أخر قسيس) واتە: دوایین پادشا لەسێدارە بدەن، بەڕیخۆڵەی دوایین قەشە، واتە: سەرەتا قەشەکە بکوژن بیفلیقێننەوەو ڕیخۆڵەکەی دەربێنن، ئنجا بەڕیخۆڵەکەی ئەو پادشایە بخنکێنن و لەسێدارەی بدەن، تاکو لەهەردووکیان ڕزگارمان ببێ.

ڕۆژئاوا لەو بارودۆخەدا دەژیان، کە باسمان کرد، بۆیە شۆڕشیان بەرپاکرد بەرانبەر بەئایینی شێوێندراوی نەصرانییەت و، دام و دەزگا ستەمکارەکانی، چونکە هیچ چاریان نەبوو، یان دەبوو هەر لەو وەزعە دژوارو سەختەی خۆیاندا بژین و بمێننەوە، یان دەبوو دژی ئەو ئایینە بوەستن، کەهەر ئەو ئایینەشیان دەناسی، یان دەبوو ڕێگا چارەی سێیەمیان بدۆزیبایەوە وەك جێگرەوە (بدیل)ێك کەئیسلام بوو، بۆ ئەوەی شوێنی بکەوتبان و، خۆیان لەکۆت و پێوەندی نەصرانییەت ڕزگار کردبایە، دیارە ئەوەش کاتێك دەگونجا، کە هەم دەمارگیرییان بۆ ئایینی کۆنی خۆیان نەبوایە، هەم کۆنەقینیشیان بەرانبەر ئیسلام و مسوڵمانان لەدڵدا نەبوایە، کەبەداخەوە هەردووك کۆسپەکان هەبوون، چونکە خاچپەرستەکان چەندان جار شاڵاوی دڕندانەیان کردبۆ سەر وڵاتانی مسوڵمانان و، بەهەزارانیان لێ کۆمەڵکوژ کردبوون، وە مسوڵمانانیش ئەوانیان بە کوشتارو بەهێز لەوڵاتی خۆیان وەدەرنابوون، بەتایبەت لەسەردەمی (صلاح الدين)ی ئەییوبی گەورە سەرکردەی مسوڵمانان دا، ئیدی لەبەر ئەو ڕقەیان کە هەر مابوو، ڕوویان لەئیسلام نەکرد، ئەگەرنا بێگومان ئیسلام پڕ بەپێستی ژیانەو، ئەو ئایینەیە کە ژیان بەرەو پێشەوە دەبات و، ئینسان ئازاد دەکات و، بەرژەوەندییەکانی دنیاو دوارۆژی بۆ فەراهەم و دەستەبەر دەکات، وەکۆمەڵگای مرۆڤایەتیی تەنهابەئیسلام ئازادو ئاسوودەو بەختیارو گەشاوە دەبێت و، پێش دەکەوێ و پەرە دەستێنێت، بەڵام بەداخەوە بەهۆی ئەو کۆنە بوغزو قینەی، کە نەزانانە هەیان بوو، ڕوویان لەئیسلام نەکرد،بەڵکو لەجیاتی نەصرانییەتێکی شێوێندراو، ڕوویان کردە عەلمانییەتێکی لادەرو بێ دین و، لەکۆلك سڵەمینەوەو بەسەر بەرازدا کەوتن.

**ئنجا بابزانین داخۆ خەڵکی ڕۆژئاوا لەسایەی بەرنامەو ڕێبازی عەلمانییەتدا، ژیانیان چۆن بوو؟**

### ١- لەڕووی فیکریی و ڕووحییەوە:

بەکورتیی دەڵێین:

ئەورووپا لە کۆمەڵێك ئەفسانە و شتی پڕو پووچ و کۆسپ و تەگەرەو ئاستەنگ و شتی دژ بە عەقڵ و زانست و، ئەو کابووسەی کە نەصرانییەت دایهێنابوو، ڕزگاریان بوو، بەڵام لەبەرانبەردا خۆیان دووچاری کۆمەڵێك شتی خراپتر کرد لەڕووی ئایینیەوە، چونکە بەرەو بێ مەبدەئیی چوون و، لایەنێکی گرنگ و گەورەی ژیانیان وەلانا، کەبریتیە لەلایەنی دەروونیی و مەعنەویی، بەڵێ، ئەورووپییەکان ئایینیان یەکجاریی وەلانا، چونکە پێشتر لەسەردەمی نەصرانییەتدا، ئەوەندە لێی داخ لەدڵ و بوون، نەدەبوو کەس هەر باسی ئایین بکات، چ جای دواتر، کە پەیتا پەیتاو، بەرە بەرە زانست بەرەو پێش چوو، وەدوای ئەوەی، کە ئازاد بوون، لەداوو کۆت و زنجیرو کابووسی کڵێسا، وە دوای ئەوەی، کە چاویان زیاتر کرایەوەو لە دنیا گەیشتن، بەتایبەت دوای ئەوەی، کە کتێبەکانی زانایانی جیهانی ئیسلامیی تەرجەمەی زمانەکانیان کران، کەلەشەڕی خاچپەرستەکاندا چنگیان کەوتبوون،، وە لەڕێگای دوورگەی (صقلية)ەو لەڕێی ئەندەلوس (ئیسپانیای ئێستا)وە، کتێبەکانی جیهانی ئیسلامییان، پێگەیشتن، وە پاشان لەڕووی زانستەکانی (فیزیاو کیمیاو جەبرو هەندەسەو پزیشکیی و گەردووناسیی و..هتد)ەوە، زیاتر بەرەو پێش چوون، بۆیە بەهۆی بەرەو پێشەوە چوونی زانستەوە، ئەوان زیاتر لەئایین[1] بێمنەت بوون و، ڕۆژ بۆ ڕۆژێ، بێ دین تر دەبوون و هەڵدەگەڕانەوە، بەجۆرێك کە (جۆلیان هکسلی) لەکتێبی (الإنسان في العصر الحديث)دا - کە لە ئینگلیزییەوە تەرجەمەکراوە - دەڵێت: مرۆڤایەتیی بەسێ قۆناغدا تێپەڕیوە، کەئەمانەن:

١- قۆناغی ئەفسانە.

٢- قۆناغی ئایین.

٣- قۆناغی زانست.

---

(١) واتە ئایینی شێوێنراوو لەئەفسانە ئاخنراوی نەصرانییەت.

کە لێرەدا ناوبراو ڕاست ناکاو کەوتۆتە هەڵەوە، لەهەنبانەی خۆیدا گوێز دەژمێرێ، چونکە: ڕاستە ئەورووپا پێش هاتنی عیسا (علیه السلام) هەر خەریکی ئەفسانەگەریی بوون، وە دوای هاتنی عیسا، ئەوانەی کە خوا هیدایەتی دان، ڕاستەڕێ بوون و ئایینیان بەڕاستی وەرگرت، بەڵام دوای ئەوەی کەئایینیان گۆڕی و شێواند، هەر لە ئەفسانەگەریی دا مانەوە و دواییش، کە لە ئایینی نەصرانییەتیان لادا، ڕوویانکردە زانست و پێشکەوتن، بۆیە ئەوە بۆ ئەورووپا ڕاستە، کە وابووە، بەڵام بەنسبەت هەموو مرۆڤایەتییەوە، وانیە، چونکە ڕاست نیە، کە (دین) و (علم) دژی یەکدی بن و، پێکەوە ناکۆك بن، بەڵکو ئەوە بۆ ئایینێکی پڕ لە ئەفسانە و گۆڕاو وایە، بەڵێ، ئایینێکی پڕ لە ئەفسانە، لەگەڵ (علم)دا، هەردەم ناکۆکن و تێك دەگیرێن.

### ٢- لەڕووی حوکم و سیاسەتەوە:

وەلەڕووی حوکم و سیاسەتەوە، گۆڕانکاریی زۆر ڕوویدا، بەتایبەت دوای ئەوەی کە(نیکۆلای میکیاڤـیل) کتێبی (ئەمیر)ی دانا، کۆمەڵگای ئەورووپا زیاتر بەرەو بێ دینیی گۆڕاو وەرچەرخا، وە ئەگەر سەیری سیاسەتی وڵاتانی ڕۆژئاوا بکەین، دەبینین کەم و زۆر بەدوای بیرو بۆچوون و ڕێبازی میکاڤـیلیی کەوتوون، (الغاية تبّرُ الوسيلة) یانی: مەبەست پاساوە بۆ هۆکار[١]، بۆ وێنە: (نازیزم) کە لەسەر دەستی (هیتلەر) پەیدابوو، وە (فاشیزم) کەلەسەر دەستی (مۆسۆلینیی) پەیدابوو، پاشان دیکتاتۆرییەت لە بلۆکی ڕۆژهەڵاتدا بەناوی

---

(١) واتە: مەبەست پاساوە بۆ هۆکار، یانی: ئامانج و مەبەستی گرنگ هەقی بەسەر هۆکارو شێوازەوە نیە، گرنگ ئەوەیە تۆ مەبەستێکی گرنگت هەبێ و بەئامانج بگەیت، ئنجا هەر هۆکارو ڕێگاو شێوازێك دەگریەبەر، گرفت و سەیرنیە، جائەو هۆکارانە شەرعیی بن، یان ناشەرعیی، گرنگ ئەوەیە ئامانجی خۆت بپێکی و سەرکەوی وبراوەو باڵا بیت، بۆ وێنە: دەستەڵات بگرە دەست و دەوڵەمەندبە، با بەهۆی خوێن ڕشتن و زوڵم و زۆرداریش بێت! کە لەئیسلامدا ئەوە بەشێوەیەکی دیکەیە و، پێویستە مەبەست و هۆکار هەردووکیان شەرعیی و ڕەوا بن.

پرۆلیتاریا لەسەر دەستی (لینین و ستالین) پەیدابوو، لەولاش (ماوتسی تۆنگ) لە (چین) هەمان ڕێبازی پەیداکرد، هەموو ئەوانەو زیاتریش وەك ئایدیۆلۆژیاو بیردۆزەو ڕێبازگەیەك، بێگومان لەوسیاسەتەوە پەیدابوون، کە ئایینیان تورڕداو وەلانا و (نیکۆلا میکیاڤیل) و مەبدەئەکەییان کردە سەرمەشق!

### ٣- لەڕووی ئابوورییەوە:

وە لە ڕووی ئابووریی و داراییەوە، بێگومان کارگەی زۆر بنیات نران و سەروەت و سامانێکی زۆر پەیدابوو، بەڵام بەرهەم و سەرمایەکەی کەپێشتر چووبووە دەستی کۆمەڵێکەوە بەناوی: دەربەگەکان (إقطاعیین)و، بەس ئەوان بوو بوونە خاوەنی موڵك و زەوی و زار، دواتریش چووە دەستی سەرمایەدار (کاپیتالیست)ەکانەوە، بەجۆرێك کە تا ئەمڕۆش ئەوپارەو سامانە هەر لەدەستی ئەواندایەو، لە دژی چینی کرێکار بەکاری دێنن و، هەڕەشەی پێ لەگەلانی جیهان دەکەن، وە دەرەنجام بەهۆی: لەلایەکەوە؛ ستەمی بلۆکی کاپیتالیستیی و، لەلایەکی دیکەوە؛ بەرگریی کردنی بلۆکی سۆسیالیستییەوە، لە چینی پرۆلیتار، جەنگێك پەیدابوو کە نزیکەی نیو سەدەی خایاند، بەناوی جەنگی ساردەوە، جەنگێکی زۆر گەرم و سەختیان لەدژی یەکدی بەسەرمایەی گەلانی دنیا بەرپاکرد، کەبووە مایەی لەبرسان کوشتنی ملیۆنان کەسی هەژارو نەدارو، سیاسەتی برسییکردن (تجویع)یان بەسەر زۆر لەگەلانی دنیادا، سەپاند، بۆیە زانایەك لەبارەی یەکسانیی خەڵکی ژێر سایەی سیستەمی کۆمۆنیزمەوە دەڵێ: لە بلۆکی سۆشیالیزم دا خەڵك یەکسانە، بەڵام لەبرسیەتیی دا یەکسانن!! ئنجا لەبەر ئەوەی ئەو بیردۆزەو ڕێبازە، لە زۆر ڕووەوە پێچەوانەی سروشتی ئینسان بوو، خەڵك بەرگەی نەگرت و، سەرەنجام ئاژاوەو پەشێویی کەوتە نێو دەوڵەت و دام و دەزگاکانی یەکێتی سۆڤیەتەوە و پەشۆکاو، لە بەرانبەر سیستەمی کاپیتالیزم دا، خۆرئاوا بەچۆکدا هات و هەرەسی هێنا، کەچی جارێ بلۆکی جیهانی سەرمایەداریی (کاپیتالیزم) هەروەك خۆیەتی و لەجاران بەهێز ترە، وە کاپیتالیزم، ئابووریی ئەورووپاو خۆرئاواو جیهانی، بۆ خۆی بەکارهێنا، لە دژی گەلانی چەوساوەو ڕەش و ڕووت و ژێر دەستە، بۆ ئەوەی زیاتر کۆنترۆڵ و داگیریان بکات و، چاکتر خێرو بێری جیهان بخوات،

وەهەرچی زیاتر بۆ خۆی ئامێرو چەکی کوشندەو کۆکوژ لەکارگەکاندا ساز دەکات، بەسەرمایەو خێرو بێری براوو داگیرکراویی، وڵاتانی چەوساوەی جیهان، وە لەو چەکانەش هەندێکی دەدەنە ئەو وڵاتە نەزانانە، تاکو بەو چەکانە یەکدی قڕەبڕ بکەن، بۆ ئەوەی کارگەکانیان لەکار نەکەون و هەمیشە بەرهەمداربن، ئیدی خەڵك لەنێو دەچێ قەیناکات! بەو شێوەیە وڵاتە سەرمایەدارە بێ دینەکان، برەویان بەشەڕوکوشتاردا و، تۆوی ئاژاوەو دووبەرەکێیان لە نێو گەلاندا چاندو، دەستیان بەسەر دنیادا گرت و داگیریان کرد.

ئنجا لەم ڕۆژگارەی ئێمەدا دیاردەیەکی سەرنجڕاکێش هەیە: ئەویش ئەوەیە، کە لەڕووداوەکەی (٢٠٠١/٩/١١)ز دا،سێ هەزار(٣) کەس لەهەردووباڵەخانەی سەنتەری بازرگانیی جیهانی نیۆیۆرك و، پەنتاگۆن لە (واشنتۆن) کوژران و لەنێو چوون، بەڵام لەڕاپۆرتی ئەو دواییەی کۆنگرەی زەمین دا، گوترا ڕۆژانە سی هەزار(٣٠،٠٠٠) کەس بەس بەهۆی ئاوی پیسەوە لە جیهاندا دەمرن، واتە ڕۆژانە دە (١٠) هێندەی کوژرانی ڕووداوەکەی یازدەی سێبتەمبەر(٩/١١) لەنێودەچن، تەنها بەهۆی ئاوی پیسەوە!! وەبەگشتی لەجیهاندا دوو ملیار (٢٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠) مرۆڤ لەبرسێتییدا ژیان بەسەردەبەن[١]، هەروەها ڕۆژانە چەندهەزار مرۆڤ لە برسان دەمرن، وە بە هەزاران کەس بە نەخۆشییەکان دەمرن، چونکە دەردو بەڵای کوشندە لەجیهاندا زۆرن، کەچی کەس باسیان ناکا، بۆچی؟! چونکە هەموو ئەو شتانە، ئەوان لێی بەرپرسیارن و ئەوان هۆکاری ڕوودانیانن، بەڵام بەلای ئەوانەوە، پیاوی ڕەش و زەرد هەرچی لێی بێت، قەیناکات، گرنگ ئەوەیە خۆیان (خەڵکی سپی پێستی ڕۆژئاوایی)سەلامەت بن!!

---

(١) بەڵێ بێگومان ئەمڕۆ لەدنیادا لەسایەو بەرهەمی سیستەمی وڵاتانی کاپیتالیستیی دا بەملیۆن خەڵکی لەبرسان دەمرن، لەبەر بەد خۆراکیی و نەبوونی بژێو، بەتایبەت لەوڵاتانی ئەفریقادا و، بەتایبەتتر منداڵانی جیهان، کەزۆر بێ نازن و لە زۆر جێ لەبرسان لە ئاویلکەی مردن دان.

ئا ئەوەیە بەرهەمی شوومی سیستمی سەرمایەداریی بەئاوی پیسی بێ دینایەتیی و دنیاپەرستیی ئاودراو!!

وە هەر لەو بارەوە دیاردەیەکی زۆر زەقی دڕندایەتیی سیستەمی کاپتیالیزم بریتیە لە : هەردوو مەسەلەی سوودو قۆرخکردن (الربا و الإحتكار)، کە ئێستا لەلایەن وڵاتە سەرمایەدارەکانەوە، زۆر بێڕەحمانە لەدژی گەلانی هەژارو نەدارو بێ دەرامەت، بەکاردێن و خوێنی خەڵکیان پێ دەمژن، وردە وردە بەشێوەیەکی پلەپلەیی، کۆشکی زۆرداریی خۆیانیان زیاتر پێ هەڵدەچنن، وە وەك بەهێزترین چەك و کارتی بازرگانیی و خۆپێ دەوڵەمەندکردن و، فشار خستنە سەر بەرانبەرەکانیان و هەژارو نەدار کردنیان و، ئیفلاس پێ کردنیان، بەکاریانن دێنن.

لێرەدا بەپێویستی دەزانم ئاماژە بۆ ئەوە بکەم، کە کاتی خۆی لە کاردانەوەی ستەمی کاپیتالیزم و لیبرالیزم و بێ ڕەحمیی و بێ ویژدانیی سیستمە ئیمپریالیستەکانی ڕۆژئاوادا، بلۆکی ڕۆژهەڵات و سیستمە سۆسیالیستەکان سەریان هەڵدا، بۆ لەسەر کردنەوەی چینی هەژارو نەدارو چەوساوەو، دروستکردنی لەمپەرو ئاستەنگ لەبەردەم تەوژم و لێشاوی سەرمایەداریی داو، بەکردەوە سۆسیالیزم و بلۆکی ڕۆژهەڵات، کەم و زۆر کاریگەریی لەسەر تەوژم و لێشاوی سەرمایەداریی هەبوو، ناچاری کرد، کە لە زۆر ڕووەوە بەخۆیدا بچێتەوە، بەخۆداچوونەوەکەیشی بەقازانجی چینی کرێکارو چەوساوە تەواو بوو!

بەڵام سەیر ئەوەیە کە ئێستا پاش هەرەس هێنانی بلۆکی سۆسیالیزم، ئەو کەسانەی کە هەتا دوێنی مارکسیست و کۆمۆنیستی تۆخ بوون، ئێستا زات ناکەن، تەنانەت هەر ئاماژەش بکەن بۆ لایەنە چاکەکانی سۆسیالیزم! دیارە ئەوەش هەمووی لە ژێر فشاری سەرمایەدارییدا، نەوەك کوێخایەکانی ڕۆژئاوا بەتایبەت ئەمەریکا، لێیان نیگەران و تووڕە ببن!

من پێم وایە ئەو هەڵوێستە، وێڕای بێ جورئەتیی، جۆرێکیشە لە بێ وەفایی ئەو هاوڕێ و هەڤاڵانەو تەسلیم بوونیان لەبەرانبەر ئەو ئەمەریکاو جیهانی کاپیتالیستەدا، کەهەتا دوێنێ هەرکەسێك هەر تۆزێك بۆنی ئەو جیهانەی لێکرابایە، نەفرینی لێدەکراو زەربی بەسەردا دەهێنرا!

### ٤- لەڕووی کۆمەڵایەتییەوە:

وە لەڕووی کۆمەڵایەتییەوە، زۆربەی، یان سەرجەم کۆمەڵگاکانی ڕۆژئاوا، لەسایەی سیکۆلاریزمدا، کەهیچ حسابێك بۆ خواو بۆ ئایین و دوارۆژ ناکات، خێزان و کۆمەڵگا تارادەیەکی زۆر لێك هەڵوەشاوەو، ڕەوشت و ئاکار و ئەدەب لەزۆرلاوە ڕووخاوەو، بۆیە چەندان پەتاو نەخۆشیی عەقڵیی و سایکۆلۆژیی کۆمەڵایەتیی، سەریان هەڵداوە و پەرەیان سەندوە، بەڵێ، زۆرێك لەخەڵکی ئەورووپا نەخۆشیی نەفسیی و عەقڵییان هەیەو، پزیشکی تایبەتییان هەیە، کە ماوە ماوە خۆیانی پێشان دەدەن، لەئەنجامی ئەو پەشۆکانە دەروونییەدا کەتێیدا دەژین، وە نەخۆشییە جەستەییەکانی وەك ئیدزو زوهریی و ..هتدیش، سەربارە!

### ٥- لەڕووی زانستییەوە:

وە لەڕووی زانستییەوە، بێگومان زانست زۆر بەرەو بەرزایی و پێشەوە چووە، وە ئێستا رەنگە مرۆڤایەتیی لەترۆپك و چڵەپۆپەی پێشکەوتنی زانستدا بێت، نازانم ئایا چی دیکە زانست بەرەو بەرزبوونەوەو گەشەکردن هەڵدەچێ، یان بەرەو خوارەوە لێژ دەبێتەوە؟ بەڵام گرنگ ئەوەیە، ئایا بەرهەمی زانست، لەسەردەمی سیکۆلاریزم و لەسایەی بێ دینایەتییدا، لە خزمەتی مرۆڤدایە، یان لە دژایەتییکردن و لەقەلاچۆکردنی مرۆڤدایە؟! ئەگەر بڕوانین، دەبینین کە کارگەکانی چەك لە ئەورووپا و ئەمریکا چی بەرهەم دێنن!

بۆ وێنە: چەند جارە داوا لە ئەمریکا دەکەن کە هەندێك لەبەرهەمی چەك و تەقەمەنیی لەکارگەو کارخانە بەرهەمهێنەرەکانی خۆی، کەم بکاتەوە، چونکە پسپۆڕانی ژینگە دەڵێن: ٣٣٪ یان ٣٦٪ی ژینگەو هەوای دنیا، ئەمەریکا پیس و پۆخڵی کردوە، کە ئەوەش کاریگەریی خراپی لەسەر کۆی لایەنەکانی ژیانی مرۆڤ، هەیە، کەچی ئەمریکا ناچێتە ژێر باری بەجێهێنانی ئەو داوایە، لەکاتێکداکە زۆربەی بەرهەمی کارگەکانی، چەك و تەقەمەنی جەنگیین، دیارە بۆیەش کەمی ناکاتەوە، چونکە لەبەرژەوەندیی خۆیدایە، کەچەکی زیاتر

بەرهەم بێنێ، ئیدی دنیا تێکدەچێ، یان ژینگە پیس و پۆخڵ دەبێ، یان چینی (ئۆزۆن)[1] کون دەبێت و دوایی قوتبی بەستەڵەکیی سەروو خواروو دەتوێنەوەو، لافاو هەڵدەستێ و هەرچییەك ڕوودەدات، ئەوە هیچی گرفت و گرنگ نیە، بەڵکو گرنگ ئەوەیە کە ئەمەریکا، پارەی زۆربێ و تاکە دەستەڵاتدار بێت!! ئا ئەوەیە بەرهەمی زانست لەسایەی سیکۆلاریزمدا، کەهەرگیز گوێ نادرێ بەبەرژەوەندییەکانی مرۆڤایەتیی و، گوێ نادرێ بەئاوو هەواو ژینگەو ژیانداران، کە لە وشکانیی و لەدەریاکاندا هەراسان و قڕ دەبن! بۆیە هەندێك لەزاناکانی زیندەوەرناسیی ژینگە، تینیان بۆ هاتوەو دەڵێن: وەك کاتی خۆی دیناسۆرەکان لە نێو چوون و بڕاونەوە، با دنیا هێندە پیس و پۆخڵ نەبێ، نەك ئێمەش وەك وان لەنێو بچین، باتۆزێك پاکژیی ڕابگرین و هێندەپیس و پۆخەڵیی لەدنیادا نەکەین، بەڵام هیچ کەس لەوانەی، بە بەرهەمی کارگە پیشەسازییەکانیان، دنیا پیس دەکەن، گوێیان پێ نادەن!



---

(١) چینی ئۆزۆن (طبقه أوزون) چینێکی هەواییە، کە وەك چەترو قەڵغان دانیشتوانی سەرزەوی، لەگەڵێك جۆرە تیشکی زیانبەخش و بکوژ، دەپارێزێ.

**وەك باسمان كرد:**

بێ دینایەتیی و دنیاگەرێتیی (عەلمانیەت) هەڵقوڵاوی جیهانی ڕۆژئاوایەو، وەك كێم و زووخاوێك دەرهاویشتەی جەستەی خەڵكێكی بێ دین و نەخۆش و دەردەدارە، لەلای غەیری مسوڵمان، سیكۆلاریزم دەرمانی دەردو زامەكانە، وە لەڕاستییدا سیكۆلاریزم كەفی بێ هوودەی سەر دەریای ئەندێشەی خەیاڵ پڵاو و، پووش و پەڵاشی دەستی بابای بەئاوداچووە، كەلە بەر خنكانیی دەستی بۆ بردوە، هەرچەندە دادیشی نادات، بۆیە هیچ پەیوەندییەكی بەئێمەی مسوڵمانەوە نیە، بەڵام وەك باسمان كرد: ئەورووپییەكان ناچار بوون كە سیكۆلاریزم دروست بكەن و بەدواشی بكەون، لەبەر گۆڕان و شێواندنی دین و پەیدابوونی: چینی ئەكلیرۆس (پیاوانی ئایین) كە ئەوپەڕی ئەفسانە و خراپەكارییان پەیداكرد، بۆیە خەڵك بەناچاریی لەئایینی مەسیحیی لایدا،بەڵام لەئیسلامدا بەهیچ ڕەنگێك ئەو بیانوو و پاساوە نیە، كەخەڵكی بەرەو بێ دینایەتیی بچن و، لەڕێی خوا لابدەن و سیكۆلاریزم هەڵبژێرن، چونكە:

١- ئێمە وەك خودی ئایین و، دەقەكانی بەرنامەو ئایینەكەمان، هیچ كێشەو گرفتێكمان نیە: ئێمەی مسوڵمان قورئانێكمان هەیە، خوای پەروەردگارمان زەمانەتیی بۆ كردووین، كەئەو پەیام و (قورئان)ەمان بۆ دەپارێزێ، وەك دەفەرموێ:

﴿ إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ ﴿٩﴾ ﴾ الحجر: ٩.

واتە: ئێمە خۆمان زیكر (قورئان)مان بۆ ئێوە دابەزاندوە، وەهەر خۆشمان دەیپارێزین (لەهەموو گۆڕان و شێواندن و دەست تێوەردانێك). وەدەبێ تاكو دنیا تێك دەچێ، پارێزرا و و سەلامەت بێ. وەزانایانی جیهانی ئیسلامیی و غەیری جیهانی ئیسلامییش دەڵێن: تەنها پیتێك لەقورئانێ زیادو كەم نەكراوە، چونكە خوا ئەو قورئانەی بۆ هەموو مرۆڤایەتیی ناردوە، وەهەتا مرۆڤایەتیی لەسەر زەوی بێت، بێگومان پێویستیی بەڕێنمایی (هدایة)ی خوای بەرزو مەزن هەیە،

ئنجا دیارە ئەو قورئانەش هیدایەتە بۆ مرۆڤایەتیی و دەبێ بەسەلامەتیی و، بەبێ دەست لێدان بمێنێتەوەو بپارێزرێ، کەواتە: ئێمەی مسوڵمان قورئانێکمان هەیە، کەبەهیچ شێوەیەك دەستکاریی نەکراوە، وەسوننەتی پێغەمبەرمان (صلى الله عليه وسلم) هەیە، کە لەسەرەتادا ویسترا بشێوندرێ و، هەندێ قسە بەزاری پێشەوامانەوە (صلى الله عليه وسلم) هەڵبەستران، بەڵام سوپاس بۆ خوا، کەزانا زرنگ و بلیمەتەکانی ئیسلام قۆڵی خۆیان لێ هەڵماڵی و وەخۆکەوتن و، سوننەتی پێغەمبەری خوایان (صلى الله عليه وسلم) لە بێژینگ داو، دەقە ڕاستەکان و هەڵبەستراوەکانیان هەریەکە لەلایەك داناو، وەك (کا)و(دان) لێکیان جیاکردنەوە.

بەڵێ ئێمەی مسوڵمان، چ ئەوەی خوای بێ وێنە فەرموویەتی، چ ئەوەی کەپێغەمبەرەکەمان (صلى الله عليه وسلم) کردوویەتی و فەرموویەتی، هەر هەمووی زۆر بەرێك و پێکیی و، بە پوختەو بە پارێزراویی لەبەردەستمان دایە، کەباس لە هەموو لایەنەکانی ژیان دەکاو، بەرژەوەندیی دنیاو دوارۆژی مرۆڤەکانی دەوێ.

٢- وە لەڕووی بیروبڕوا (عقیدة) و شەریعەتەوە، ئەو ئایینەی ئێمە نەگۆڕدراوە و، وەك خۆی پارێزراوە و هەروەك خۆیەتی، چونکە مادام قورئان و سوننەت پارێزراون، دیارە عەقیدەو شەریعەتیش دەگرنە خۆیان و پێشەوایانی ڕەسەن و زانایانی ڕاستەقینەی ئیسلام، زۆرباش لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەت دا، هەم ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی و، هەم شەریعەتیان، ڕوون کردوونەوە و درەوشاندوونەوە، بۆیە هەرکەسێك کە بیەوێت، دینێکی ڕاست و دروست و پوختەو پاڵاوتەی لەبەر دەستدان بێ و، کاری پێبکات، ئەوە قورئان و سوننەت هەن، کە پارێزراون و دەست لێنەدراون و، هیچ خڵتەو خۆڵ و تۆزو گەردیان پێوە نیە، هەرچەندە بەداخەوە زۆر لە ڕۆشنبیران و خوێندەوارانی خۆشمان، هەر بەچاویلکەی بابایەکی ئەورووپیی سەیری قورئان و سوننەت دەکەن، وەك چۆن ئەو سەیری (ئینجیل و تەورات) دەکات، کە پڕن لە ئەفسانە و شتی پڕوپووچ و بێ هوودە و ناژیرانە و، دژ بەسروشتی ژیان و مرۆڤ.

٣- وە لەئیسلامدا خوا بەیەکگرتن (توحیدالله) پارێزراوە و تەنها خوا دەپەرسترێ و (محمد) (صلی الله علیه وسلم) بەبەندەی خواو پەیامبەرو، ڕەوانەکراوی خوا دەزانن و نایپەرستن، وە مسوڵمانان لە نوێژەکانیاندا دەربارەی ئەو زاتە، پاش گوتنی: (أشهد أن لا إله إلا الله) دەڵێن: (وأشهد أن محمداً عبده ورسوله) یان (وأشهد أنَّ محمداً رسول الله) واتە: من شایەدیی ئەوە دەدەم، کەجگە لەخوا (تبارك و تعالی) پەرستراوێکی دیکە نیە و، گەواهیی ئەوەش دەدەم، کە موحەممەد بەندە و پەیامبەری خوایە، ئا ئەوە بیروبڕوای مسوڵمانانە لەئیسلامدا.

وە پێغەمبەریشمان (صلی الله علیه وسلم) بۆ خۆشی لەکاتی بانگەوازی دا، زۆر جەختی لەسەر ئەوە دەکردەوەو دەیفەرموو: ئەی خەڵکینە! من بەندەی خوام و بۆ لای ئێوە هاتووم، تاکو ڕێگای ڕاستی خواتان پێشان بدەم، وەك مەسیحییەکان مەبن کەبەناوی ڕێزلێنانەوە زۆریان بەعیسا هەڵگوت و بۆ پلەو پایە (مقام)ی خوایەتیی بەرزیانکردەوە:[١]

(لا تطروني كما أطرت النصارى ابن مريم إنما أنا عبدالله ورسوله) رواه البخاري.

٤- وە دەربارەی بەگرنگ زانین و ڕێزگرتن لەعەقڵ و عیلم، ئێمە هیچ کێشەو گومانێکمان لەو بارەوە نیە، بەڵکو هەرکام لەعەقڵ و علیم بەگرنگ دەزانین و لەلامان خۆشەویست و ڕێزدارن، بەڵکو کێشەمان لەگەڵ نەفامیی (جهل) و نەزانییدا هەیە، وە ئیسلام زۆر هانمان دەدات لەسەر پێشکەوتن و وە دەست خستنی زانیاریی و زانست، وە خوای زانا قورئانی خۆی بۆ (محمد) پێغەمبەرێکی نەخوێندەوار (أُمِّي) ناردۆتە خوار، بەڵام هەر سەرەتا بەوشەی بخوێنە: (إقرأ) دەستی پێکردوە:

---

(١) دیارە هەم عیساو هەم هەموو پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێ بێ) هەرئەوە بانگەوازیان بووە و گووتویانە: ئەی گەلەکەمان! ئێمە بەندەی خواین و، بۆ لای ئێوە ڕەوانەکراوین، تاکو ڕێی ڕاستتان پیشان بدەین، دەجا وەرن بەدوامان بکەون بەو ڕێیەدا، کە ڕێبازی خوایە، تاکو خواتان لێ ڕازی ببێ و لە دۆزەخ ڕزگارتان بێ، بۆ وێنە: خوا بە پێغەمبەری خاتەمی فەرمووە بڵێ: ﴿إِنَّمَآ أَنَا۠ بَشَرٌ مِّثۡلُكُمۡ يُوحَىٰٓ إِلَيَّ﴾ الكهف -١١٠-، واتە: ئەی خەڵکینە! بەڕاستی منیش وەك ئێوە بەشەرم، تەنها وەحی پەروەردگارم بۆ دێ.

﴿ ٱقۡرَأۡ بِٱسۡمِ رَبِّكَ ٱلَّذِي خَلَقَ ١ ﴾ العلق:١.

وە قورئان بەناوی خوا (بسم الله الرحمن الرحيم) دەستی پێ کردووەو بەخەڵك ﴿ مِنَ ٱلۡجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ ٦ ﴾ الناس -٦-، کۆتایی پێهاتوە، چونکە ئەو قورئانە بۆ سەرجەم خەڵکی سەر زەوی هاتوە، تاتێی بگەن و بیکەنە بەرنامەی ژیانیان و کاری پێ بکەن، قورئان بۆیە بەناوی خوا: (بسم الله) دەستی پێکردوە، چونکە لەلایەن خواوە هاتوە و بەناوی خواوە هاتوە، وە ئەگەر قورئان لەنێو خەڵکیدا پیادە نەکرێ، نارەوایە، چونکە قورئان لەخواوە بۆ خەڵکی هاتوە:

﴿ إِنَّآ أَنزَلۡنَا عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ لِلنَّاسِ بِٱلۡحَقِّ ﴾ الزمر -٤١-.

وە شایانی باسە: وشەی (علم) لەقورئانێدا زیاتر لە(٧٥٠)[1] جار دووبارە بۆتەوەو، وشەی (عقل) و(فکر) زیاتر لە (٥٠) کەرەت دووپات بوونەتەوە، وە و خوای زانا کتێبی خۆی زیاتر تایبەت کردوە بەعاقڵمەندانەوە، وەك دەفەرموێ:

﴿ كِتَٰبٌ أَنزَلۡنَٰهُ إِلَيۡكَ مُبَٰرَكٞ لِّيَدَّبَّرُوٓاْ ءَايَٰتِهِۦ وَلِيَتَذَكَّرَ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ ٢٩ ﴾ ص:٢٩.

واتە: ئەم قورئانە کتێبێکی بەپیزەو بۆ تۆمان دابەزاندوە (ئەی موحەمەد!) بۆ ئەوەی ئایەتەکانی لێك بدەنەوەو بیریان لێبکەنەوە، وە خاوەن بیروهۆشەکان پەندو ئامۆژگاریی لێوەربگرن.

ئنجا لەئیسلامداو نەك هەر هیچ کۆسپ و تەگەرەو رێگرو ئاستەنگێك لەبەردەم پێشکەوتنی زانیارییدا دانەنراوە، بەڵکو ئیسلام ئینسان زۆر هاندەدا، کە لەرووی زانیارییەوە پێشبکەوێت، بۆ وێنە: خوای کاربەجێ دەفەرموێت:

﴿ فَلۡيَنظُرِ ٱلۡإِنسَٰنُ إِلَىٰ طَعَامِهِۦٓ ٢٤ ﴾ عبس:٢٤.

واتە: مرۆڤ سەیری خواردن و خۆراکەکەی بکات! وە دەفەرموێ:

---

(١) وشەی (علم) (٨٤) جار لە قورئاندا هاتوە، وە بەهەموو (مشتقات)یەوە (٧٨٢) جار دووپات بۆتەوە، وشەی (معرفة)یش (٢٩)جار هاتوە، کەواتە: بەهەردووکیان (٨١١)جار هاتوون، وە وشەی ئیمانیش (٨١١) جار هاتوە.

﴿ فَلۡيَنظُرِ ٱلۡإِنسَٰنُ مِمَّ خُلِقَ ٥ ﴾ الطارق:٥.

واتە: دەبا ئینسان سەیرێکی خۆی بکات، داخۆ لەچی دروست بووە، وە دەفەرموێ:

﴿ أَوَلَمۡ يَنظُرُواْ فِي مَلَكُوتِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ ﴾ الأعراف: ١٨٥.

واتە: ئایا تەماشای ئەو هەموو موڵکە فراوانەی خوایان نەکردوە، کە لەئاسمانەکان و زەویدا هەیە، وە دەفەرموێ:

﴿ قُلۡ سِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَٱنظُرُواْ كَيۡفَ بَدَأَ ٱلۡخَلۡقَ ﴾ العنکبوت:٢٠.

واتە: بڵێ: بەزەویدا بڕۆن و بگەڕێن، سەرنج بدەن و تەماشای بکەن، داخۆ (خوا) چۆن ئەو زەوی و بوونەوەرەی دروست کردوە!!

٥- پاشان دەڵێین: ئەورووپاییەکان کاتێك وازیان لەهەڵە ویەڵە و ئەفسانەکانی کڵێسا هێنا، کەناویان لێ نابوون: ئایینی مەسیح، وە کاتێك لەدەریای ئەو نەزانینە، کە تێیدا نقووم بووبون، قووتاریان بوو، بەدیداری زانست و پێشکەوتن شادبوون، بەڵام مسوڵمانان ئەوکاتە بەدیداری زانست شادبوون، کەچاك پابەندبوون بەقورئان و سوننەتەوە، وە ئەوکاتەش کەلە قورئانی خوا و سوننەتی پێغەمبەری پێشەوا (صلی الله علیه وسلم) دوورکەوتنەوەو، ڕوویانکردە ئەفسانە، دواکەوتن، وە ئێمە لە ئیسلامدا پیاوانی دینییمان نیە، بەڵکو (زانایانی ئایینی)، یان (زانایانی ئیسلامیی) [ علماء الإسلام ] یان (پێشەوایانی ئیسلام)مان هەن، بەڵام زانایان هیچ ئیمتیازو تایبەتمەندییەکیان نیە، لەنێو ڕەگەزو ڕەنگەکانداو، لەنێو گەل و تیرەو هۆزو مرۆڤەکاندا، بەڵکو مرۆڤەکان هەموویان بۆ بەندایەتیی خوا، دروست کراون، وەك خوای دادگەر دەفەرمووێ:

﴿ وَمَا خَلَقۡتُ ٱلۡجِنَّ وَٱلۡإِنسَ إِلَّا لِيَعۡبُدُونِ ٥٦ ﴾ الذاریات:٥٦.

واتە: وە جندو مرۆڤمم تەنها بۆ ئەوە دروستکردوون، کە بمپەرستن.

بۆیە لەئیسلامدا، لەڕووی سیاسیی و کۆمەڵایەتیی و فیکریی و ئابووریی و.. هتدەوە، هیچ مەلاو زاناو پێشەوایەك بۆی نیە، کار بەئایەت و حەدیسێك نەکات، یان بڵێ: ئەو ئایەتە، یان ئەو فەرموودەیە من ناگرێتەوە، یان دەستکارییەکیان بکات،یان هەر شتێکی دیکە بکات، کە پێچەوانەی قورئان و سووننەتە، چونکە لەئیسلامدا ئەو مەسەلەیە بڕاوەتەوە، کەس نابێ دەستکاریی دەقەکان (نصوص) بکات، بەڵام پیاوانی کڵێسا بەئارەزووی خۆیان ئەوشتانەیان دەکرد، کەچی لەئیسلامدا هەرکەسێك ئەوە بکات، بۆی بەکوفر لەقەڵەم دەدرێ، چونکە:

﴿وَمَنْ أَصْدَقُ مِنَ ٱللَّهِ قِيلًا ﴿١٢٢﴾﴾ النساء: ١٢٢.

قسەی کێ لەهی خوا ڕاستترو ڕێك ترە؟! بەڵکو لەئیسلامدا کێ لەهەموو کەس زاناترە، دەبێ لەهەموو کەسیش پابەندتر بێت بەبنەماو یاساو دەقەکانی قوڕئان و سوننەتەوە، هیچکەس لەسەرووی دین و یاسای خواوە نیە!

٦- ئنجا شەریعەتی ئیسلام وەك ئایینی شێوێنراوی مەسیحیی نیە، کە ژیانی پێوە بەرێ نەچێ، بەڵکو بەرنامەی تێرو تەواوی خوایە بۆ تێکڕای لایەنەکانی ژیان، وە لەڕاستیدا ئەورووپییەکان لەبواری ژیان بەڕێوەبردندا زۆر ئاتاجی بەرنامەیەکی بەڕێوەبردنی ژیان بوون، چونکە چوار (ئینجیل)ەکان، بەشێوەیەك دەستکاریی کراوبوون، پڕ بوون لەئەفسانەو بیروڕای هەڵە، بۆیە هەرگیز لایەنەکانی ژیانیان پێ بەڕێونەدەچوون، کێشەکانی بوارەکانی سیاسی و کۆمەڵایەتیی و ئابووریيان پێ حەل ناکرێن و، لەو ڕووانەوە هیچیان تێدا نیە، وە لەڕووی نەتەوایەتییەوە هیچیان تێدانیە، وە لەڕووی ئەخلاقەوە، هەرچەندە هەندێك شتی باشیان تێدایە، بەڵام لەلایەکی دیکەشەوە، بردو بەئیباحییەت و خراپەکاریی دەدەن، لەسۆنگەی ئەوەوە کە دەڵێن: مەسیح بۆتە بەلاگێڕەوە و کەفارەتی گوناحی نەصرانییەکان و، هەرچی بیکەن، مادام نەصرانیی بن، بۆیان دەبەخشرێ! ئەمەش هاندانە لەسەر گوناه و سەرپێچیی.

دیارە عیسا بۆ بەڕاست دانان (تصديق)ی ڕێبازی مووسا هاتبوو، وەك خوای کاربەجێ دەفەرموێت:

﴿ وَمُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيَّ مِنَ ٱلتَّوْرَىٰةِ وَلِأُحِلَّ لَكُم بَعْضَ ٱلَّذِى حُرِّمَ عَلَيْكُمْ ﴾ آل عمران: ٥٠.

چونکە (ئینجیل و تەورات) تەواوکەری یەکن و، کاتی خۆی ژیانیان پێ بەڕێوە دەچوو، بەڵام دوایی گۆڕدران و دەستکاریی نێوەڕۆکیان کرا، ئنجا چوار (ئینجیل)ەکان، کە تەنها ئامۆژگاریی کۆمەڵایەتیی و ڕووحیی و ئاکارییان تێداتۆمار کراون، کەدیارە ئەوەش بەتەنها ژیانی مرۆڤایەتیی پێ بەڕێوە ناچێت و، پێی ڕێك ناخرێ، بەڵام پەیام و کتێبەکانی خوای مەزن، کە دێن بۆ ڕێکخستنی کاروباری ژیانی کۆمەڵگای مرۆڤایەتیی دێن، لەهەموو ڕوویێکەوە، بەڵام ئێمە وەك مسوڵمان ئەو کێشەیەمان نیە، چونکە قورئانی بەڕێز لە بچووکترین شتەوە بگرە وەك: دەست نوێژ، تاکو دەگاتە: جەنگ و ئاشتی و حوکم و سیاسەت و، ئابووریی و گرێدانی پەیوەندیی نێوان گەل و وڵاتان و، نێوان سەرۆك و خەڵك، وە مامەڵەکردنی ئینسان لەگەڵ تاك و کۆمەڵ، لەگەڵ خزم و خێزان، لەگەڵ دەرەوەو نێوەوە، لەگەڵ دۆست و دوژمن، لەگەڵ چاك و خراپ، کتێبی تێرو تەواوی بێ هەڵەو پەڵەی خوا، هەموو ئەو شتانەی بەکورتیی و بەپوختیی ڕوونکردوونەوە، وە سوننەتی پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) ئەوەی بەکردار بۆ بەرجەستە کردووین، جائەوەی کەدەیزانێ ئەوە شتێکی چاکە، وە ئەوەی نایزانێ، ئەو خەتای خۆیەتی و خۆی کەمتەرخەم و تاوانبارە، کەواتە: کەسێك کە دەڵێت: ئیسلام، سیاسەت و حوکمی تێدانیە، ئەوە یان لەقورئان تێ نەگیشتوەو نایزانێ، یان هەر دژیەتی و، تانەو تەشەر لەئیسلام دەدات، دەنا هەرکەسێك تەواو دیراسەی قورئان و سوننەت بکات، باش دڵنیا دەبێ، کە ئەو جۆرە قسانە، جگە لەتۆمەت، چی دیکە نین! ئنجا ئەوە زۆر جێگای سەرنجە کەدەبینین: ئەو دەوڵەتەی کە لەسەر بناغەی شەریعەت و قورئان بنیات نرا، لەو ڕۆژەوە، کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لەشاری مەدینە بەردی بناغەی بۆ دانا، تاکو ئەو ڕۆژەی کە بەپیلانی ئیمپریالیزمی جیهانیی،

لەسەر دەستی (کەمال ئەتاتورك)[1]ی عەلمانیی لەساڵی (١٩٢٤)دا کۆتایی پێهات سێزدە، (١٣) سەدەی خایاند، ئنجا ئایا چ دەوڵەتێك لەمێژوودا (١٣) سەدەی خایاندوە، توانیویەتی بەرگەی ئەو هەموو گیرو گرفتانە بگرێ و، بەرگەی ئەوهەموو نەیارو دوژمن و پیلانانە بگرێ؟ دوژمنانی وەك جوولەکەو نەصرانیی و تەتەرو مەغۆل و مونافیقانی نێو خۆ؟!، بەڵێ ئیسلام ئاوایەو، کارو بناغەی هێندە مەحکەم و قایمە، کەبتوانێ دەوڵەتێك(١٣) سەدە لەسەر شانی خۆی ڕابگرێ، لەنێو ئەو هەموو گرفت و کێشەو هەرا و جەنجاڵەی ژیاندا، هەرچەندە کەم و کوڕیی و هەڵەو لادان هەبوون، بەڵام دیسان ئەو هەموو خۆڕاگرییە، هەرشتێکی گەورە و گرنگە، بۆیەش ئێمە دەڵێین: شەریعەتی خوا (ئیسلام) دەتوانێ هەموو کێشە: (کۆمەڵایەتیی و سیاسیی و ئابووریی و فەرهەنگیی و نەتەوایەتیی ..هتد)ە کانمان بۆ چارەسەر بکات، بەڵام بەمەرجێك ئێمەش بەچاکیی لە قورئان و سوننەت تێبگەین و، باش کاریان پێبکەین و لێیان لانەدەین، چونکە ئەو دوو سەرچاوەیە، دەرمان و چارەسەری هەموو دەردێکی ژیانیان تێدایە، دیارە شەریعەتێك کە هەڵقوڵاوی ڕەحمەت و حیکمەت و زانیاریی بێ کۆتایی خوا بێت، بەتەئکید دەتوانێت هەموو دەرد و کەم و کووڕییەکانی ژیان چارەسەر بکات و، کۆسپ و تەگەرەو ڕێگرەکانی بەردەم ژیان لاببات، وە بێگومان شەریعەت بۆ ئەوە هاتوە، کە لە ژیانداپەیڕەویی لێ بکرێ و، بکرێتە دەستوورو بەرنامەی ژیان لەهەموو ڕووێکەوە، کەچی هی وا هەیە وادەزانێ ئەگەر ئیسلام پەیڕەویی لێ بکرێ، ژیان ڕادەوەستێ و گوزەران نامێنێ و، خەڵك بەرەو دواوە دەچێت و، تەکنۆلۆژیا هەرەس دێنێت!! بەڵام بێگومان ئەو بیروبۆچوونە، هەڵەو بێ بناغەیە، بەڵێ مسوڵمانان لەم ڕۆژگارەدا لەچەند ڕوویێکەوە دواکەوتوون، بەڵام ئەوەش هۆیەکەی ئەوەیە، کە لە ئیسلام دواکەوتوون، چونکە ئەگەر پەیڕەویی تەواویان لەئیسلام کردبایە، ئەوە

---

(١) ئەتاتورك: بەتورکی واتە: بابی تورکان، لە(١٨٨١) لە (سالونیك) لەدایك بووە، لە (١٩٢٤) لەسەر دەستی ئەو و بەپیلانی زلهێزان، دەوڵەتی ئیسلامیی عوسمانی هەڵوەشایەوەو، دەوڵەتی عەلمانیی نوێ لە تورکیادا دامەزراو، لەساڵی (١٩٣٠) سوپای یۆنانی وەدەرنا و لە(١٩٣٨) دا مرد، پیاوێکی زۆر بێ ڕەوشت و خوانەناس بووە.

لەگەڵ ڕەوتی پێشکەوتنی زانستدا دەڕۆیشتن و، دەست بەرداری سازکردن و چنگ خستنی تەکنۆلۆژیای نوێ و تازە نەدەبوون، چونکە ئەوکاتەی مسوڵمانان باش بەدینەکەیانەوە پابەند بوون، لەڕووی زانستیی و پیشەسازییەوە، زۆر لە پێش ئەورووپاوە بوون، وەك لەمێژووی شارستانێتیی ئیسلامیی و، لەمۆزەخانەکانی جیهاندا، ئەوە دەردەکەوێت.

دکتۆر عەلی شەریعەتیی دەڵێت: کاتێك بوو ئەورووپییەکان کەشتێکیان دروست دەکرد، مۆری (الله)یان لێدەدا، کە مۆری جیهانی ئیسلامیی بوو، تاکو خەڵکی وابزانن، کە لەسەر دەستی مسوڵمانان دروست کراوەو، کەل و پەلەکەیان برەو (ڕەواج)ی هەبێت! دیارە ئەوەش لەبەر ئەوە بووە کە پیشەسازیی وڵاتان و جیهانی ئیسلامیی پێشکەوتوو بووە، وەك چۆن ئێستا پیشەسازیی ئەورووپییەکان پێشکەوتوەو، کاتێك کە ئامێرو شتێك دروست دەکەن، نیشانە و هێمای وڵاتەکەیانی لێ دەدەن، یان خەڵکی دەڵێن: فلانە کەل وپەلە ئەمریکیی، یان ئینگلیزییەو زۆر چاکە.

دەڵـێـن: جارێك (هارون الرشید) سەعاتێکی لم (ساعة رَمْلية)ی بۆ یەکێك لەپادشاو ئیمپڕاتۆرەکانی ڕۆم نارد، کە بۆ خۆی دەجووڵاو کاری دەکرد، ئنجا لەبەر ئەوەی کاتژمێرەکە بەلای پادشایەکەوە زۆر سەیر بووە، کۆمەڵێك لەزاناو شارەزایانی خۆیان کۆکردوونەوە، تاکو تەماشای سەعاتەکە بکەن و لێی بکۆڵنەوە، داخۆ چۆن ئاوا لەخۆوە کاردەکات؟! پاشان دوایین ڕایان ئەوەبوو، کە گوتیان:

حەتمەن (جند)ێك، یان ڕووحێکی خراپەکار خراوەتە نێو ئەو سەعاتەوە، ئەگەرنا، چۆن لەخۆیەوە دەجووڵێ و کاردەکات!!

پوختەی قسان ئەوەیە، کە سیکۆلاریزم (بێ دینایەتیی) هیچ جێ پێیەکی لەجیهانی ئیسلامییدا نیەو، بەهیچ جۆرێك هیچ بیانوو و پاساوێك نیە، بۆ پەنا بردنی مسوڵمانان بۆ عەلمانییەت، چونکە مسوڵمانان لەسایەی قورئان و سوننەت و شەریعەتی بێ هەڵەو پەڵەو پارێزراوی خواوەو، لەسایەی ڕێبازی پێغەمبەری پێشەواوە (صلی الله علیه وسلم)، لەهەموو ڕێچکەو ڕێبازێك بێ نیازن، بەتایبەتیش بێ دینایەتیی (سیکۆلاریزم)، کە ڕاست دژو پێچەوانەی ئایینەکەیانە.

# سێ ڕاستیی گرنگ

لەکۆتایی ئەم باسەش دا، بەپێویستی دەزانم سێ ڕاستیی ڕابگەیەنم:

**یەکەم: با لەلاسایی کردنەوە وریابین:**

وەرگرتنی عادەت و نەریت و خوو، یان وەرگرتنی جل و بەرگ و پۆشاك، لەهەر گەل و کۆمەڵگایەك لەسەر بنچینەی لاسایی کردنەوە، بێ ئەوەی کە کەڵك و حیکمەت و فەلسەفەکەی بزاندرێت، ئەوپەڕی دواکەوتنە، بۆ وێنە: یەکێك کە پۆشاکی [جینز - Jeans] (کاوبۆی) لەبەر دەکات، یان خەنافیز بەردەداتەوە، یان بەجۆرێکی سەیر سەری دەتاشێ، یان هەر کارێکی دیکەی نامۆو سەیر دەکات، کە لە عادەت و نەرێتی میللەتی ئێمەدا نیە، کە ڕەنگە لەجێی خۆی فەلسەفەیەکی هەبێ، یان لەبەرهۆیەك و بەبیانوویێکەوە بکرێت و، شتێکی تێوە پێچرابێت، بەڵام لێرە کە لە خۆڕا لاسایی دەکرێتەوە، بەبێ ئەوەی کەهیچی لێ بزانرێت! ئەوە دواکەوتن و نەزانینە، ئنجا پیاو بیکات، یان ئافرت، خوێندەوار بیکات یان نەخوێندەوار، چونکە ئێمە میللەتێکین دەڵێین: قەوارەو ناسنامەی نەتەوەییمان نیەو، جیهان دان بە قەوارەی سیاسییمان دانانێ، ئەدی بۆچی بۆ خۆشمان خەریکە بەو تەقلیدە کوێرانەیە ناسنامەو مۆرکی نەتەوایەتییمان ون دەکەین و لەخۆمانی دادەماڵین؟! ئەوەتا: هەر لەجل و بەرگ و، سەر وسیما و، ناوی کۆگا و شوێنی کار و، نەرێتەکانی دیکەی کۆمەڵایەتییمانەوە بگرە، تاکو دەگاتە شێوەی بەڕێوەبردنی وڵاتمان، لاسایی بێگانە و دەرەوە دەکەینەوەو، خۆمان بەخاوەنی هیچی خۆمان نازانین؟! هەندێك کەس لەسۆنگەی ئەوەوە، کە کەوتوونە ژێر کاریگەریی و ڕکێفی فەرهەنگ و سیاسەتی بێگانەو، بۆ

ڕازی کردنی ئەوان، ئایین و بەرژەوەندیی خۆیان وەلادەنێن، ئنجا ئەگەر لاسایی کردنەوە لە بواری عادەت و نەریتدا، هەڵە بێت، بێگومان وەرگرتنی فیکرەو فەرهەنگ و بیروبۆچوون و بیردۆزە مرۆڤکردەکانی ئەوان، کە دژی ئایین و نەریت و سروشتی ئێمەن، بەتەئکید ئەوە هەر زۆر هەڵەترو خەتەر ترە، چونکە بریتیە لەلادان لەڕێبازی خوای دادگەرو کاربەجێ، کە ئەوەش زلترین گوناهە، وەك خوا دەفەرموێت:

﴿ ثُمَّ جَعَلْنَـٰكَ عَلَىٰ شَرِيعَةٍ مِّنَ ٱلْأَمْرِ فَٱتَّبِعْهَا وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَ ٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٨﴾ ﴾ الجاثية: ١٨.

واتە: پاشان [ئەی (محمد!)] تۆمان خستۆتە سەر ڕاستە شەقامێك، دەجاشوێنی بکەوەو هەرگیز پەیڕەویی لەئارەزووی ئەوانە مەکە، کە (ڕێگای ڕاست) نازانن.

پێشتریش لەبارەی ئەورووپییەکانەوە گوتمان: چونکە ئایینێکی ڕاست و دروستیان لەبەر دەستدا نەبووە، کە پەیڕەویی لێ بکەن و، چارەسەرێکیان لەلانەبووە، کە زامەکانی ژیانیانی پێ سارێژ بکەن، بۆیە بە ئاودا چوونەو، ئەوانیش بۆ ڕزگاربوونیان لەخنکان، دەستیان بۆ هەموو چڵەگیاو پووش و پەلاشێك بردوە، تاکو دەرەنجام (سیکۆلاریزم)یان دەستکەوتوەو، دەستی خۆیانیان تێ گرتوە، بۆ ئەوەی لە چاڵاوی مەسیحیەتی شێوێنراو، قوتاریان ببێ، بەڵام کە لەو نەجاتیان بوو، کەوتنە چاڵێکی ڕەشی دیکەوە، کە سیکۆلاریزمە.

بەڵام میللەتانی مسوڵمان بەئاودانەچوون و، ئایینێکی ڕاست و دروستیان لەبەر دەست دایەو، ئەگەر بەدوای بکەون، سەرفرازی دنیاو دوارۆژ دەبن و، لە هیچ ڕوویێکەوە سەرگەردان نابن:

﴿ فَمَنِ ٱتَّبَعَ هُدَاىَ فَلَا يَضِلُّ وَلَا يَشْقَىٰ ﴿١٢٣﴾ ﴾ طه -١٢٣-.

**دووەم: با پەند لەغەیری خۆمان -عەرەب و تورك و فارس- وەربگرین:**

أ- عەرەب تاکو بەئیسلامەوە پابەندبوون و بۆ ئیسلام دەژیان، زۆر بەختەوەرو باڵادەست و سەربەرزبوون، بەڵام کەرِوویان لە ئیسلام وەرگێڕاو دەست بەرداری بوون، بەچ دەردو پەندێك چوون؟!

ب- هەروەها تورك پێشتر خیلافەتی ئیسلامییان هەبوو و، ئەوپەڕی دەستەڵاتیان لەدەست بوو و، گەلانی دنیا موحتاجی ئەوان بوون، وە زۆر جار بوێرانە بەرگرییان لە ئیسلام دەکرد، بەڵام کە بەدوای ڕێبازی کەمالیزم (کمال ئەتاتۆرك) کەوتن، و شوێن عەلمانییەت کەوتن، بەو حاڵە گەیشتن، کە ئێستا تێیدادەژین[1]!!

لەساڵی (١٩٩٦)دا چووم بۆ ئەستەنبووڵ، چاوپێکەوتنێکی ڕۆژنامەگەرییم لەگەڵ کۆمەڵێك لەڕۆژنامەنووسانی توورکییدا کرد، لەیەکێك لە پرسیارەکانیاندا گوتیان: چووی بۆ (طوب قاپی) و شوێنەواری خەلیفەو سوڵتانەکانی عوسمانیی؟! گوتم: بەڵێ، سەرنجێکی سەرسوڕهێنەرم بۆ دروست بوو، بەراوردێکم بۆ دروست بوو لەنێوان تورکیای تازە لەسایەی دەوڵەتی عەلمانییەتدا و، تورکیای پێشوو لەسایەی خیلافەتی ئیسلامییدا، گوتیان: چۆن هەستت چیە؟!، گوتم: تورکیای ئێستا بۆتە پاشکۆی بێگانەو، بەڵکو بەپاشکۆشی قبووڵ ناکەن و، بەهەزار تکاو ڕەجا لە یەکیەتی ئەوروویا (الإتحاد الأوربي) وەرتان ناگرن، کەچی ئەوسا پادشاو قەیسەرو دەسەڵاتدارانی ئەورووپا، مەمنوون بوون، ڕێگایان پێ بدرێ، بێنە دیدارو خزمەت سوڵتانەکانی عوسمانیی، چونکە لە ژێر سایەی خیلافەتی ئیسلامییدا (تورکیا) سەر قافڵەو کاربەدەست بوو، وەسەری لە کەهکەشانی ئاسمان بوو، کەچی ئێستا لەگەڵ زەوی تەخت کراوە، هیچ حسابێکی بۆ ناکرێت، لەدواییدا گوتیان: ئێمە ناتوانین ئەوە بڵاو بکەینەوە، گوتم: بەهەر حاڵ ئەوە ڕاو سەرنجی منە سەبارەت بەتورکیا و حەقیقەتە، ئێوەش کەیفی خۆتانە بڵاوی دەکەنەوە، یان نا!!

---

(١) دیارە ئێستا: (٢٠١٥/٣/٢٣ز) لەچاو ئەو ساکە، (٢٠٠٢ز) وەزعی تورکیا زۆر بەرە و باشیی گۆڕاوە، لەسایەی هەنگاونانیانەوە بەرەو ئیسلام.

ج- هەروەها ئێرانییەكان لەسەردەمی ڕەزا شاو موحەممەدی كوڕی دا، چۆن بوون، بەڵام دواتر كە شۆڕش (ثورة)ێكی ئیسلامییان كرد، بارەكە سەدو هەشتا پلە وەرچەرخاو گۆڕانكارییەكی گەورە لەهەموو لایەنەكانی ژیانیاندا ڕوویدا[١]، هەرچەندە بەرپرسانی كۆماری ئیسلامیی ئێرانیش بۆخۆیان دەڵێن: زۆر لەوەزعی خۆمان ڕازی نین، كەنەمان توانیوە ئیسلام باش پیادە بكەین، بەڵام جیاوازیی لەنێوان ئێرانی كۆن و ئێرانی تازەدا، لەسایەی ئەو وەرچەرخانەوە، ئاسمان و ڕێسمانە؛ ئێستا ئێران خاوەنی سیاسەت و هەڵوێستی خۆیەتی، خاوەنی چەندان شتی گەورەو گرنگی ژیار و ژیانی خۆیەتی[٢]، بۆیە دەتوانێ بەگەورەترین هێزی جیهانی بڵێ: نەء، كەچی كاتی خۆی ناویان لە شا نابوو: پۆلیسی ئەمەریكا، وەك چۆن ئێستا بە (تۆنی بلیر)ی سەرۆكی وەزیرانی بەریتانیا دەڵێن: وەزیری دەرەوەی ئەمەریكا، هەروەها بڕوانن: عەرەب بە (٢٢) دەوڵەت و بە زیاتر (٢٠٠) ملیۆن كەسەوە، چۆن زەبوونی بەردەستی بێگانەن، بۆیە هەر لەم شەوانەدا وەزیری دەرەوەی یەكێك لەوڵاتانی عەرەبی گوتی: ئەمڕۆ ئێمە دەستەپاچەو بێ دەسەڵاتین و، هەر هێندەمان لەدەست دێ كە بڵێین: (لا حول ولا قوە إلا باللە) و هیچی دیكەمان پێ ناكرێ و لەدەست نایەت!!

دیارە ئەوەش ئەوپەڕی زەبوونیی و چەوساوەییە، لەسایەی نەتەوەپەرستیی و عەلمانییەت و، ڕووكردنە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوادا.

---

(١) بەڵام بێگومان دوو خاڵی هەرە لاوازی ئەو دەوڵەتە بریتین لە:
١- سەرنەكەوتنی لە چارەسەری كێشەی نەتەوەی كورد دا، كە هەتا ئێستاش هەر بەردەوامە و هەر بیر لەڕێگا چارەی سەربازیی و ئەمنیی دەكاتەوە!
٢- بەداخراویی و دەمارگیریی تائیفیی، مامەڵەكردن لەگەڵ مسوڵمانانی غەیری شیعەدا، لەكورد و بەلووج و عەرەب و توركمان و .. هتد.

(٢) بەڵام بەداخەوە لەم ساڵانەی دوایی دا،ئێران سیاسەتی دەرەوەشی وەك هی نێوخۆی، گۆڕانی بەسەرداهات و زۆربەزەقیی بەلای تائیفەگەریی (الطائفية)دا شكایەوە و، لەئاكامی ئەوەش دا، شەڕ و كوشتارێكی زۆر لەعێراق و سوریادا ڕوویدا و، هەرخواش دەزانێ سەرەنجامی چۆن دەبێ!

## سێیەم: عەلمانییەت لە ئیسلام دا جێی نابێتەوە:

ئێمە لێرەدابێ پەرواو بەڕاشکاویی دەڵێین: عەلمانییەت، واتە: بێ دینایەتیی، بەهیچ ڕەنگێك لەئیسلام دا جێی نابێتەوە، بەڵکو هەر ئەوەش بێ دینییە کە بگوترێ: (عەلمانییەت لەدیندا جێگای دەبێتەوە، یان لەگەڵ دیندا دەگونجێ) چونکە وەك خستمانەڕوو: عەلمانییەت هیچ حیساب بۆ خواو پێغەمبەر و دین و دوارۆژو بەهەشت و جەهەننەم و حەشرو حیساب و زیندووبونەوە، ناکات، کەبێگومان هەموو ئەو شتانەش لەئیسلامدا جێ و پلەو پایەی تایبەتی خۆیان هەیەو، ئیسلام بریتیە لەوشتانە! وە بۆیەش لەم توێژینەوەیەماندا، ئەو ڕاستییە بەڕوونیی و ڕاشکاویی دەخەینەڕوو، بێ ئەوەی شەرم لەکەس بکەین، چونکە ئێمە فێڵ لەمیللەتی خۆمان ناکەین و چەواشەی ناکەین، کێ پێی خۆشە، یان پێی ناخۆشە، کەیفی خۆیەتی، ئێمە ڕاستییمان گوتوەو، هەقمان خستۆتەڕوو و نایشارینەوە، ڕاستیی بۆ خەڵکی خۆمان ڕوون دەکەینەوەو دەڵێین: عەلمانییەت لەڕوانگەی ئیسلامەوە، واتە: بێ دینایەتیی، بەڵام ناشڵێین: هەرچی عەلمانییە، یان هەرچی ناوی عەلمانیی لەخۆی ناوە، لەدین دەرچووە، چونکە ئەوانەی کەناوی عەلمانیی، لەخۆیان دەنێن، دووبەشن:

١- بەشێکیان باش لە عەلمانییەت تێگەیشتوون و وەك مەبدەئو ئایدیۆلۆژیا هەزمیان کردوەو، دەزانن، کە عەلمانییەت چییەو، چی دەڵێ و، چی دەوێ؟! بۆیە بەدوای کەوتوون، کەدیارە بابای وا هیچ پەیوەندیی بەئیسلامەوە نەماوە، چونکە ئایینێکی دیکەی جیالە (ئیسلام)ی گرتوە و دەستبەرداری ئیسلام بووە،

٢- وە بەشێکیان ئەوانەن، کە هەروا بەتەقلیدی کوێرانەو بەبێ دیراسەو تێگەیشتن، بەدوای عەلمانییەت کەوتوون، وەك چۆن بەتەقلید بەرگەکەی لەبەردەکات و، بەتەقلید پەیڕەویی لەعادەتەکانی ئەورووپا دەکات، بێ ئەوەی کە لە فەلسەفەکەی تێبگات، هەربەو شێوەیەش لەڕووی فیکرییەوە بەتەقلید دەڵێت: (عەلمانییەت) باشە، یان (عەولەمە) شتێکی زۆر چاکەو بەس خێرو بەرەکەتە، بێ ئەوەی بزانێ خێرو بەرەکەتەکەی چییەو لە کوێ دیارەو چۆنە؟ کەدیارە ئەو جۆرە کەسانە حوکمیان

جیاوازەو، هەتا بەڵگەیان لەسە تەواو دەکرێ و، بیانووبڕ دەکرێن، تا ڕاددەیەك چاوپۆشییان لەگەڵ بەکار دەهێنرێ، چونکە زانا و پێشەوایانی ئیسلام بۆ حوکمی کوفر و بێ دینیی بەسەر خەڵکی مسوڵمان، یان بەڕواڵەت مسوڵماندا دان، لەسەر ئەوە یەك دەنگن، کە دەبێ بنچینەی: چەسپانی مەرجەکان و لاچوونی پەرچەکان (ثبوت الشروط وانتفاء الموانع)[١] یان، لەگەڵ بەکار بێت، هەربۆیەش گوتوویانە: (قد يكون قولُ الرجل أو فعله كفراً، ولا يكون هو كافراً)[٢].

---

(١) مەرجەکانی بەکافردانان:

١- باڵغ بوون.

٢- عاقڵ بوون.

٣- گەیشتنی پەیامی خوا بەڕوونیی، یان بەڵگە لەسەر تەواوکران.

پەرچەکانی بەکافردانان:

پەرچەکانی بەکافردانانیش ئەم حەوتەن:

١- نەتوانین (العَجْز).

٢- نەزانین (الجهل).

٣- لەبیرچوونەوە (النِّسيان).

٤- بەهەڵەداچوون (الخطأ).

٥- تەئویلکردن.

٦- زۆرلێکردن (الإكراه).

٧- لاسایی کردنەوە (التقليد).

دیارە بۆچۆنیەتی جێبەجێکردنی ئەم بنچینەیەش (ثبوت الشروط وانتفاء الموانع) بەسەر کەسانێك، یان چەند لایەنێك دا، کە کوفر و شیرکیان لێ دەردەکەوێ، وردەکاریی زۆرهەیە و لێرەدا دەرفەتی خستنەڕووی نیە و، کورتەکەی ئەوەیە کە: چەسپاندنی ئەم بنچینەیە، تەنیا مافی زانایانی شارەزاو پسپۆڕە، نەك هەرکەس ڕاست بۆوە: حوکمی شیرك و کوفر بەسەر خەڵکی دا بدات!

شایانی باسیشە لەبەرگی کۆتایی کتێبی: (الإسلام كما يتجلى في كتاب الله)دا بەدرێژیی باسی ئەو بنچینە شەرعییەمان کردوە.

(٢) جاری وایە قسەی پیاوێك، یان کردەوەکەی کوفرە، بەڵام خۆی کافرنیە.

جالەو بارەوە، کە گوتمان: مەرج نیە هەرکەسێك عەلمانیی بێت، هەموویان یەك حوکمی شەرعیی بیانگرێتەوە، ئەم بەسەرهاتەتان بۆ دەگێڕمەوە، کەلەسەرەتای ڕاپەڕینی گەلی کورد لەئازاری (١٩٩١)دا برایەکی خۆمان بۆی گێڕامەوەو گوتی: دوای ڕاپەڕین گەیشتمە پێشمەرگەیەك کە خزمم بوو، لەگەڵ حیزبی شیوعیدا بوو، پێم گوت: فڵانکەس! ئەوە ئێستا لەکوێ و چی دەکەی و بۆچی دیار نی؟! ئەویش گوتی: وەڵڵا ئەگەر خوا قبووڵی بکات، ئەوە لەگەڵ حیزبی شیوعی دام!! بۆیە کەسێك وەك ئەوپیاوە لەعەلمانییەت حاڵی بووبێ، حوکمێکی دیکەی هەیەو، دەبێ بەرچاوی ڕوون بکرێتەوەو حاڵی بکرێ: کەنابێ بەهیچ جۆرێك بەتەما بی، خوا بێ دینایەتییت بە دینداریی بۆ حیساب بکات!

ئاخر چۆن دەگونجێ کە ئینسان بێ دین بێت و، لەگەڵ خەڵکی بێ دین دابێت، کەچی خواش بەدین و عیبادەت بۆی حیساب بکات! بێگومان ئەوە ئەستەم (محال)ە و هیچ بیردۆزەو فیکرەیەکی بەشەریش، ئەوە قبووڵ ناکات و پێی ڕازی نیە، چ جای ئایین و بەرنامەی خوای بەدیهێنەرو پەروەردگارو خاوەنی بوونەوەرو کائینات!!

سبحانك اللهم وبحمدك، أشهد أن لا اله الاّ أنت
أستغفرك وأتوب اليك

# ئەم ئاڵقەیە

**خوێنەرە خۆشەویستەکانم!**

ئەم ئاڵقەیەش وەك هاوەڵە پێشووەکانی، لەبنەڕەت دا وتارێکی بەندەبووە، کە لەکۆڕێك دا دراوە، لە هۆڵی (ڕۆشنبیریی)دا لەشاری سلێمانی.

پاشان لەبەر گرنگیی و هەستیاریی بابەتی دیموکڕاسی بەپەسەندم زانی، کە دوو ئاڵقەی چاوپێکەوتن لەگەڵ بەندەش دا لەبەرنامەی: (سۆراغ) و لەژێر ناوونیشانی:

[دیموکڕاسی و دیکتاتۆریی و هەڵوێستی ئیسلامییانە]دا بخەینە گەڵ ئەو ئاڵقەیە، بۆ ئەوەی تیشك بخەینەسەر سەرجەم ئەو لایەنانەی دیموکڕاسی و پێچەوانەکەی (دیکتاتۆریی)، کە نەگونجاوە لەدەقی وتارەکەدا قسەیان لەبارەوە بکرێ.

هیواداریشم ئەم بابەتەش ببێتە مایەی بەرچاو ڕوونیی زیاتری ئێوەی بەڕێز و خۆشەویست، لەبارەی دیموکراسییەوە، کە مشت ومڕی زۆری لەبارەوەکراوە و دەکرێ و، زۆرێك لەئیسلامییەکانیش، تێیدا تووشی کورت هێنان و تێپەڕاندن (تفریط وإفراط) بوونە.

# ڕێ خۆشکردن

**ئامادەبوانی بەڕێز!**

ئێوارە کۆڕی ئەمڕۆمان - وەك مامۆستا تۆفیق کەریم ئاماژەی بۆ کرد- لەبارەی دیموکڕاسییەوەیە، بەناوو نیشانی: (دیموکڕاسی لەبەر تیشکی عەقڵ و شەرعدا ).

واتە ئێمە لەم ئێوارە کۆڕەماندا، دەمانەوێ هەم تیشکی عەقڵ و هەم شەرعیش، بخەینە سەر دیموکڕاسی، بۆ ئەوەی دیموکڕاسی هەم وەك خۆی لەواقیع دا چۆنە ئاوا بیناسین و، هەم لەتەرازووی شەرعیشدا هەڵی سەنگێنین.

وە بەڕاستی ئێمە وەك خەڵکی کوردستان، کە لەم بەشە کوردستانەی سەر بەعێراق دا، بەرەو گۆڕانکارییەکی گەورە دەچین، جێی خۆیەتی کە لەم هەل و مەرجەدا، هەموو لایەکمان هەوڵبدەین، زۆر بەڕوونیی و ڕاشکاویی هەڵوێست و بیرو بۆچوونی خۆمان لەبارەی ئەو بابەت و مەسەلە باوانەوە، کە کاریگەرییان لەسەر ئاکام وچارەنووسی میللەتەکەمان هەیە، بخەینەڕوو.

جا ئێمە وەك ئیسلامیی، دوای ئەوەی لێکۆڵینەوەی وردو قووڵمان لەبارەی ئایین و بەرنامەی خوای بێ وێنەوە کردوە -وێڕای حوکمی ئیمان و عەقیدە- لەهەموو ڕووییێکەوە ڕاستییەکانی ئیسلام و شەریعەتی بێ هەڵەو پەڵەی خوای کاربەجێمان بۆ ڕوون بۆتەوە، زۆر بەدڵنیاییی و پشت ئەستوورییەوە، لەبارەی دینەکەمانەوە دەڵێین: ئیسلام هیچ شتێکی تێدا نیە لەگەڵ عەقڵ و فیطرەت دا دژو پێچەوانە بێت، یان لەگەڵ بەرژەوەندییەکی ڕاستەقینەی تاك و کۆمەڵدا تێك بگیرێ.

وە تەنها ئەوەش بەدڵسۆزیی بۆ میللەت و وڵاتمان دەزانین، کەبێ پەردەو بەڕاشکاویی هەڵوێست و بیرو بۆچوونی خۆمان دەربارەی هەر بابەت و مەسەلەیەکی گرنگ و پەیوەندیدار بەچارەنووسی هەموو لایەکەوە، بخەینە ڕوو، ئنجا یەکێك لە مەسەلە هەرە باوەکانی ئەم ڕۆژگارەمان، بریتیە لە مەسەلەی (دیموکڕاسی)، کەبەگشتی لەبارەی دیموکڕاسییەوە، سێ جۆرە هەڵوێست هەن:

١- هەڵوێستێك کە دیموکڕاسیی بەکوڵك و پێستەوە قبووڵەو، پێی وایە هیچ جۆرە هەڵەو کەم و کورییەکی تێدانیەو، بەفری بێ پەڵەیە!

٢- وە هەڵوێستێك کە پێچەوانەی هی یەکەمەو، دەڵێ: دیموکڕاسی یەکجار خراپ و زیانبەخشەو، بە هیچ جۆرێك خێری پێوە نیەو، بە کەڵکی هیچ نایەت!

٣- هەڵوێستی سێیەمیش ئەوەیە، کە دەڵێ: دیموکڕاسی بیردۆزەو ئەزموونێکی بەشەرە لەبواری حوکمڕانییدا و، هەم لایەنی چاك و هەم خراپیشی هەن و، ناگونجێ بەموتڵەقیی قبووڵ، یان ڕەفز بکرێ! ئنجا دیارە ئێمە هەڵوێستی سێیەممان بەلاوە ڕاست و پەسەندەو، خوا پشتیوان بێ، لەم برە توێژینەوەو هەڵسەنگاندنە شمان دا، دیموکڕاسی بژار دەکەین و لە بێژینگ دەدەین و (کا)و (دان)ی لەیەك جیا دەکەینەوە.

**بابەتەکەشمان لەم پێنج تەوەرەدا پێشکەش دەکەین:**

**یەکەم:** پێناسەی دیموکڕاسی و بنەما سەرەکییەکانی.

**دووەم:** سەرگوزشتەی دیموکڕاسی و، کەی و چۆن و لەکوێ سەری هەڵدا؟!

**سێیەم:** سەرنج دانی دیموکڕاسی لەبەر تیشکی عەقڵ دا.

**چوارەم:** هەڵسەنگاندنی دیموکڕاسی لە تەرازووی شەرعدا.

**پێنجەم:** ئەنجامگیریی.

سەرەتا پێویستە ئەوەش بڵێم:

کە ئێمە، ئەگەر بمانەوێ هەقی پێویست بدەینە هەرکام لەو پێنج تەوەرەیە، بێگومان پێویستییان بەکاتێکی زۆر زیاتر دەکات، بۆیە دەبێ هەموو لایەك بزانن، کە ئێمە زۆر بەپوختیی و گوشراویی بابەتەکەمان دەخەینەڕوو، وە هەموو شتێك ناڵێین، بەڵکو تەنها ئەو شتانەی، کە گوتنیان پێویست ترەو بۆمان دەلوێ: باسیان دەکەین.

لەبارەی پێناسەی وشەی (دیموکراسی)یەوە زۆر شت گوتراوە، گەلێك پێناسەی جۆراو جۆر لەوبارەوە لەکتێب و سەرچاوەکاندا هاتوون، بەڵام ئێمە لێرەدا هەر بەکورتیی دەڵێین:

وشەی دیموکراسی (Democracy)، وشەیەکی ئاوێتە (كلمة مركبة) یەو لە ئەسڵ دا ئیغریقییەو، لە هەردووك وشەی: دیمۆس (Demos) کە بەمانای گەل (شعب) دێ و، کراتۆس (kratos)، کە بەمانای حوکم دێ، پێکهاتوە.

**وەك زاراوەیەکی سیاسیش بریتیە لە:**

(حوکمی گەل، بەهۆی گەلەوە، لەپێناوی بەرژەوەندیی گەل دا) کەواتە: دیموکراسی ئەو شێوەو سیستەمەی حوکمڕانییە، کەخەڵك و میللەت تێیداخاوەنی دەستەڵاتە، چ لەڕووی یاسادانان و، چ لەڕووی هەڵبژاردنی بەرپرسان و کارپێ سپاردنیان و، چ لەڕووی دەستەڵاتی دادگایی و، چ لەڕووی دەزگاکانی چاودێریی و لێپرسینەوەی کاربەدەست و حوکمڕانانەوە.

هەروەها لەبارەی بنەمایەکانی دیموکراسیشەوە، دیسان گەلێك شت گوتراوە، هەندێك لە لێکۆڵەرەوان (٧-١٠) بنەمایان بۆ دیموکراسی ژماردوون، بەڵام پێم وایە ئەم چوار بنەمایەی دیموکراسی، تێکڕای بنەمایەکانی دیکەی دەگرنە خۆیان و، سەرجەم دیموکراسییخوازانیش لەسەریان کۆك و تەبان:

**١- باڵا دەستیی گەل (حاكمية الشعب):**

کە مەبەست پێی هەمەکارە بوونی خەڵك و میللەتە، لەهەموو ڕووەکانی یاسادانان (السلطة التشريعية)و، دیارییکردن و کارپێ سپاردنی کاربەدەستان (السلطة التنفيذية) و، دادگا (القضاء)ەوە، واتە : ئەم بنەمایە دەڵێ: دەبێ گەل و میللەت دەستەڵاتی ڕەها (السلطة المطلقة)ی هەبێت و چۆنی پێ باش بوو، وە چی پێخۆش بوو، وا بڕیار بدات.

شایانی باسیشە کەئەم بنەمای یەکەمە، بەبڕبڕەی پشتی دیموکراسی و گەورەترین و گرنگترین بنەمای دیموکراسی دادەنرێ و، بنەمایەکانی دیکە

هەموویان ڕیشەیان دێتەوە سەر ئەم بەردی بناغەیەی دیموکڕاسی.

### ٢- سەروەریی یاسا (سیادة القانون):

مەبەست پێی مل کەچیی هەموولایەکە، بە حوکمڕان و خەڵکەوە بەدەستوورو یاساوە، کەدەستوور بەزۆریی لەڕێی ڕاپرسی گشتی (الإستفتاء العام)ەوە پەیدا دەبێ و، یاساکان (القوانین)یش لەلایەن ئەنجوومەنی یاسادانان (مجلس التشریع)ەوە، دادەنرێن.

### ٣- مافەکانی مرۆڤ و ئازادییە گشتییەکان (حقوق الإنسان والحریات العامة):

مەبەستیش لەمافەکانی مرۆڤ، یان ئازادییە گشتییەکان، ئەوەیە کە هاووڵاتییان، هەم ئازاد (حرّ) بن و، هەم یەکسانیش بن، ئنجا ئازادیی زۆر بوار دەگرێتەوە، بەڵام ئەم چوار بوارە، سەرجەم دیموکڕاسییخوازەکان لەسەریان یەکدەنگن:

١- ئازادیی کەسایەتیی (الحریة الشخصیة).

٢- ئازادیی کۆمەڵایەتیی.

٣- ئازادیی ئابووریی.

٤- ئازادیی سیاسی.

یەکسانییش دیسان زۆر شت دەگرێتەوە، بەڵام لەم چوار ڕووەوە، هەموو لایەك لەسەریان کۆکن:

١- یەکسانیی لەبەرانبەر یاسادا.

٢- یەکسانیی لەبەردەم دادگاداو.

٣- یەکسانیی لەڕووی ئەرك پێ سپێرانەوە.

٣- یەکسانیی لەڕووی ئەرکەکانی سەرشانەوە.

**٤- لەیەك جیاکردنەوەی دەستەڵاتەکان (الفصل بين السلطات):**

کە مەبەست پێیان هەرسێك دەستەڵاتی: یاسادانان و، جێبەجێکردن و، دادگایی (التشريعية والتنفيذية والقضائية)ن.

دیارە وەك پێشتریش گوتمان: هەم لەبارەی پێناسەی (دیمۆکراسی) یەوەو، هەم لەبارەی بنەماو پێکهێنەرەکانیەوە، دەگونجێ گەلێك شت بگوترێ، بەڵام ئەوەی لێرەدا گوتمان، پوختەی ئەو قسەو باسانەیەو، هەموو لایەکیش لەسەری کۆك و تەبان.

بەم ئەندازەیەش کۆتایی بە خاڵی یەکەمی بابەتەکەمان دێنین و، دەچینە سەر تەوەرو خاڵی دووەمی بابەتەکەمان، کەبریتیە لەبەسەرهات و سەرگوزشتەی پەیدابوونی (دیموکراسی)، شایانی باسیشە، کە ئێمە قسەو باس و بۆ چوون و هەڵسەنگاندنی خۆمان لەبارەی دیموکراسییەوە، هەڵدەگرین بۆ خاڵەکانی داهاتوو، بۆیە لێرەدا تەنها باسی مەسەلەکان دەکەین، وەك خۆیان.

ئایا ئەو دیموکڕاسییەی، کە ئێستا وەك سیستمێکی حوکمڕانیی هەیە، لەسەرەتای سەرهەڵدانیەوە، هەر بەو شێوەیە بووە، یان بەجۆرێکی دیکە بووەو، پاشان وردە وردەو پلە پلە گۆڕانی بەسەردا هاتووەو گەشەی کردوە، هەتا سەری بەم سیماو سروشتەی ئێستای گەیشتوە؟!

هەندێك کەس وادەزانێ، کە دیموکڕاسی هەرلەسەرەتاوە بەوشێوەو چۆنیەتییەی، کە ئێستا هەیە، هەر وابووە!

بەڵام بەڕاستیی دیموکڕاسی، وەك هەر بیردۆزەو بۆ چوون و ئەزموونێکی دیکەی مرۆڤ، لەسەرەتاوە شێوەیەکی زۆر سادەو جیاوازی لەوەی ئێستای هەبووەو، پاشان وردە وردە گەشەی کردووەو، گۆڕانی بەسەرداهاتووەو کەم و زیادی تێدا کراوە،هەتا سەرەنجام لەسەر ئەو شێوەو چۆنیەتییەی ئێستاقەراری گرتوە، وە بێگومان ئێستاش بەردەوام لە گۆڕان و کەم و زیادی دایەو، بگرە ئێستاش دیموکراسی بەگوێرەی گۆڕان و جیاوازیی ژینگەو کۆمەڵگایەکان، شێوەو دیمەنی جۆراو جۆری بەخۆیەوە گرتوون!

بۆیەش ئاماژەم بۆ ئەو مەسەلەیە کرد، تاکو هیچ کەس وانەزانێ، کە دیموکڕاسی - وەك سیستمی حوکمڕانیی ئیسلام - لەچەند بنەماو پێکهێنەرێکی چەسپاوو نەگۆڕ پێکهاتووە، ناگونجێ گۆڕانکاریی چاك و خراپی بەسەردا بهێنرێ و، لەئەنجامی ئارەزوو و بەرژەوەندیی جەماوەرو دەستەڵاتدارانەوە، کارێکی بەسەر بهێنرێ، کە ڕاست پێچەوانەی جەوهەرو نیوەڕۆکی خۆی بێت و، بکرێتە بازیچە (العوبة) یەکی شووم و بێخێر!!

ئەگەر لەڕووی مێژووییەوە تەماشای دیموکراسی بکەین، دەبینین کەوەك کتێبەکانی مێژوو ئەو سەرچاوانەی، کە باسی ڕەگ و ڕیشەی دیموکراسی دەکەن، لە قووڵایی مێژوودا دەڵێن: یەکەمین[1] کۆمەڵگایەك کە بەو شێوازو

---

(١) بەڵام لە ڕاستی دا ئەوە وانیە و بەر لە (یۆنان) چەند شێوەیەک لەو سیستمە، دوو سێ هەزار ساڵ پێش زایین لە وڵاتانی میسر و عێراق و هیند و یەمەن دا کاریان پێکراوەو قسەکەی (ملكة سبأ)یش بەرانبەر بە بڕیار بەدەستانی گەلەکەی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمَلَؤُاْ أَفۡتُونِي فِيٓ أَمۡرِي مَا كُنتُ قَاطِعَةً أَمۡرًا حَتَّىٰ تَشۡهَدُونِ ﴿٣٢﴾﴾ النمل:٣٢، بەڵگەیەکی ڕوونە لەو بارەوە. بڕوانە: الديمقراطية: الجذور و إشكالية التطبيق، محمد الأحمدي، ص٢١-٤١، الديمقراطية هي الأصلى.

سیستەمە وڵاتیان بەڕێوە بردوە، (ئیغریقی)یەکان بوون، کە لەهەردووك شاری (یۆنان)ی ئێستادا (ئەثینا و ئیسبارطە)، کە ئەوکات هەر شارێك، دەوڵەتێك بووە، لەو دوو شارەدا بۆ یەکەمین جار، ئەزموونی دیموکڕاسی، بەشێوەیەکی سادەی ئەوکاتە، ئەو سیستمە کاری پێکراوە، بەڵام سەرچاوە مێژووییەکان باس دەکەن، کە دیموکڕاسی ئەو کاتە دیموکڕاسی ڕاستەوخۆ (الديمقراطية المباشرة) بووە، واتە: خەڵك هەمووی لەگۆڕەپانێکدا کۆبوونەتەوەو، بڕیاریان لەسەر هەر مەسەلەیەکی گرنگ و چارەنووسساز داوە، نەك لەڕێی پەرلەمان و ئەنجوومەنێکەوە، کەمیللەت هەڵی دەبژێرێ و، دوایی ڕاو مافەکانی خۆی تەسلیمی ئەو ئەنجوومەنە دەکات، بەڵکو لەدیموکڕاسی ئەوکاتەدا، خەڵك هەموو جارێ، بۆ هەر مەسەلەیەکی گرنگ کۆبوونەتەوەو بڕیاریان داوە.

بەڵام پێویستە بزانرێ، کە لە دیموکڕاسی یۆناندا، نە ئافرەتان مافی دەنگدان و ڕادەربڕینیان هەبووە و، نەکۆیلەکانیش، کە ئافرەتان ئاشکرایە نیوەی کۆمەڵگا بوون بەلای کەمەوە، کۆیلەکانیش هەندێك جاران زۆر لە خەڵکە ئازادەکە زیاتر بوون!

بەڵێ هەر لەو سەرەتایەوە (دیموکڕاسی) بەشێوەیەکی ئاوا هاتوە! کەواتە: ئەو دیموکراسیەی کەخەڵك ئەو هەموو خەون و خەیاڵە شیرینانەی پێوە دەبینن، لەسەرەتاوە بەو جۆرە نەبووە، ئنجا دوای ئەوەی یەکەمین ئەزموونی دیموکراسی لەمێژوودا لەبەین چوو، بەهۆی لەبەین چوونی ئەو دوو شارەوەو لەبەین چوونی ئەو دوو دەوڵەتەوە لەیۆنانی کۆندا، ئەزموونی دیموکڕاسیش یەکجاریی سەری ناوەتەوە، لەو کاتدا.

پاش کۆتایی پێ هاتنی ئەو یەکەمین ئەزموونەی دیموکڕاسی لەیۆناندا، سەرجەم وڵاتانی ئەورووپاو ڕۆژئاواش بەگشتی بەیۆنانیشەوە، هەم پێش هاتنی (عیسی) [عليه الصلاة والسلام] و هەم دوای هاتنیشی، سیستم و حوکمی دەرەبەگایەتیی (الإقطاعية)یان تێدا حاکم بووە.

وە لەژێر تین و فشاری (قيصر) و پادشایەکانی ئەو کاتەدا، هەر بەماوەیەکی کەم، دوای بڵاوبوونەوەی ئایینی (مسيح) [عليه السلام] و، بەهۆی تەنازول کردنی جیلەکانی دوای جیلی (حواريين) لەبانگەوازکارەکان، ئایینی (عیسی) گۆڕاو

شێوێنراو، لەنێوەڕۆکی خۆی خاڵی بۆوەو، تەسلیمی ئیرادەی طاغووتییانەی قەیصەرو پادشاو دەرەبەگە چەوسێنەرەکان بوو، وە بەزمانی عیساشەوە [علیه السلام] ئەو دروشمەیان بەرز کردەوە: (دع ما لله لله، وما لقیصر لقیصر) ئەوەی عایدی خوایە، بۆ خوای لێگەڕێ و، ئەوەش کە هی قەیصەرە، بۆ قەیصەری واز لێ بێنە!

مەبەستیش لەم درووشمە ئەوە بوو، کە بەڕەسمیی و بەناوی دینەوە، لەیەك دابڕان و جیایی دین و ژین، ڕابگەیەندرێ! بۆیە زۆر لەمێژوونووس و لێکۆڵەرەوان، ئەو قسەیەی نەصرانییەکان بەزاری عیساوە، دەیگێڕنەوە، بەدرۆو بوختانێکی هەڵبەستراوی دادەنێن، چونکە هیچ ماقووڵ نیە عیسایەك [علیه السلام] کەبۆ ئەوە نێرراوە، خەڵکی فێری بەندایەتیی کردن بۆ خوا بکات و، ژیان و گوزەرانیان بەپێی بەرنامەو ڕێبازی خوا ڕێك بخات:

﴿وَمُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيَّ مِنَ ٱلتَّوْرَىٰةِ وَلِأُحِلَّ لَكُم بَعْضَ ٱلَّذِى حُرِّمَ عَلَيْكُمْ ۚ وَجِئْتُكُم بِـَٔايَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿٥٠﴾ إِنَّ ٱللَّهَ رَبِّى وَرَبُّكُمْ فَٱعْبُدُوهُ ۗ هَـٰذَا صِرَٰطٌ مُّسْتَقِيمٌ ﴿٥١﴾﴾ آل عمران: ٥٠-٥١.

بەهیچ جۆرێك و لەژێر هیچ فشارێك دا، دەستبەرداری ئەو ڕاستییە گرنگ و گەورەیەی ئایینەکەی ببێ، کەلەڕاستییدا، جەوهەرو کاکڵی دینەکەی پێك دێنێ!!

## بەڵێ بەڕێزان!

هەر لە زووەوە نەصرانییەت، تەنازولی بۆ سیستمی طاغووتییانەی دەرەبەگایەتیی ژێر ڕکێفی قەیصەرو پادشا دیکتاتۆرەکان کردو، لەجیاتی ئەوەی ئەوان بگۆڕێ و، چاك بکات و ڕاست بکاتەوە، بۆ خۆی - لەسۆنگەی لاوازیی و خۆڕانەگریی پێشەواو دەمڕاستەکانیەوە - گۆڕاو شێواو خوار بوو!

ئنجا هەر چەندە ئەوە بەڵایەکی گەورەو بوو، کەبەسەر ئایینی مەسیحیی هات، کە ئیقراری کرد: هەقی بەسەر ژیان و گوزەرانی خەڵکەوە نیە! بەڵام بەڵاو گرفتی لەوە گەورەتری ئەو ئایینە ئەوە بوو، کەدواتر پێشەواو ڕیش

سپییەکانی، وەك قەرەبوو کردنەوەیەکی ئەو دوور خرانەوەیەی ئایینەکەیان، لەگۆڕەپانی ژیان و گوزەران، هەڵسان بەدروستکردنی چینی ئەکلیرۆس، واتە: چینی پیاوانی ئایینی: (طبقة رجال الدين).

کە لە ڕاستیی دا، ئەو کارە داهێنان (إبتداع)ێکی زۆر شووم و خراپ بوو، وە ئاکام و ئەنجامی یەکجار زیانبەخشی لێکەوتنەوە، کەلەئاڵقەی پێنجەم و لەباسی چۆنیەتی سەرهەڵدانی ڕێچکەی بێ دینایەتیی (سیکۆلاریزم)دا تاڕاددەیەك ئاماژەمان بۆ کردوون و، لێرەدا دووبارەیان ناکەینەوە.

بەڵێ، پاپاو قەشەکان ئەو ڕێزو حورمەتەی کەخەڵك و میللەت لێی دەگرتن، کەڵکی خراپیان لێوەرگرت و (إستغلال)یانکرد بۆ بەرژەوەندییە تایبەتییەکانی خۆیان و، خۆیان لەخەڵك و جەماوەر کردە چینێکی جیاواز، کە بە درێژایی مێژووی وڵاتانی ڕۆژئاوا، وردە وردە گەشەی کردو پەرەی ستاند، تاکو وای لێهات، کەنەك هەر توانای پێشبڕکەو مل بەملە (منافسة)و گوریس پچڕکێنەی لەگەڵ قەیصەرو پادشاکان دا هەبێت، بگرە بەسەریشیان دا زاڵ بێت و، بیانخاتە ژێر ڕکێفی خۆشیەوە!

بەڵام بەداخەوە ئەو چینی ئەکلیرۆسە دەستەڵاتەکەی خۆی بۆ سەرخستن و پیادەکردنی ئایین بەکارنەهێنا، بەڵکو بۆ دابین کردنی بەرژەوەندییە ناشەرعییەکانی خۆیان بەکاریان هێنا، وەسەرەنجام خەڵك و میللەت لە ژێر نیری سێ کوچکەی شوومی: (ئیمپراطور + پاپا + دەرەبەگ) دا قەراری گرت، ئیمپراتۆرو قەیصەر، وەك دەستەڵاتی سیاسی و، پاپا وەك دەستەڵاتی ڕووحیی و ئایینی و، دەرەبەگ (إقطاع)یش، وەك دەسەتەڵاتی ئابووریی، هەرچەندە هەرکام لەو سێ دەستەڵاتەش پەلیان هاویشت بۆ بوارەکانی دیکەی ژیان و گوزەران، بۆ وێنە: (پاپا) وێڕای دەستەڵاتی ڕووحیی، دەستەڵاتێکی زۆری سیاسی ئابووریشی هەبوو، هەروەها دەرەبەگ و خاوەن زەویش، دەستێکی باڵای لەبواری کاروباری سیاسییدا هەبوو، ئینجا (ئمپڕاتۆرو قەیصەرو پادشا)یەکانیش، وێڕای کاروباری سیاسەت و وڵاتداریی، نفووزی ئابووریی و فیکرییشیان هەر هەبووە.

ئەو سێ کوچکە شووم: (الثالوث المشئوم)ە بوو بەکابووس و ملۆزمێکی وا بەسەرشان و مل و سینگی خەڵك و میللەتی ڕۆژئاواوە، کە فزەی لێ بڕیبوون و، تەواو پشووی پێ سوارکردبوون، وە ئەو بارودۆخە ناهەموارو سەختەی خەڵکی ئەورووپاو ڕۆژئاوا، هەروا درێژەی کێشا و، بۆ ماوەی پتر لە هەزار (١٠٠٠) ساڵ بەردەوام بوو، واتە سەرجەم ساڵەکانی سەدەکانی نێوەڕاست، وەزع بەو جۆرە بوو، [مەبەست لەسەدەکانی نێوەڕاست سەدەی پێنجی زاینییە، تاکو سەدەی پازدەیەم] ئنجا لەو هەموو ماوە دوورو درێژەدا، ئەوەی کەبەهیچ جۆرێك هیچ حیسابێکی بۆ نەدەکراو، هیچ گوێی پێ نەدەدرا، خەڵك و جەماوەر بوو، بەڵێ میللەت و جەماوەر هیچی بەدەست نەبوو بەزاناو فەیلەسووفەکانیشەوە!

دیارە ئەوانەش - واتە ئیمپراتۆرو پاپاو دەرەبەگ - لەبەینی خۆیاندا ڕێك کەوتبوون، وەك چەند شەریکە دزێك لەسەر دابەش کردنی خێرو بێرو، لەسەر دابەش کردنی ئەمرو نەهی کردن بەسەر خەڵکدا: هەرچی (ئیمپراتۆر) پادشاو دەسەڵاتدارەکان بوون، کابرای دەرەبەگ (إقطاعی) یانی: خاوەن زەوییان، هەڵدەپێچا بۆ باج و سەرانە، وە بۆ عەسکەریی کردن، بەتایبەتیی ئەو کاتەی کە شەڕەکانی خاچ پەرستانەیان دەکرد، کابرای دەرەبەگیش جوتیارەکان و ڕەش و ڕووتەکانی هەڵدەپێچا، بە (باج) لێوەرگرتنی زیاترو چەوسانەوەی زیاتر، هەروەها سەربازیی پێکردنی زۆرە ملێ و بەلاش! ئنجا میللەت کەماوەیەکی زۆر لە ژێر زەخت و فشاری ئەوسێ کوچکەیەدا مەداری کرد، بەڵام وەك گوتراوە: جام کەپڕ بوو لەسەرریییەوە دەڕژێ، چونکە هەموو شتێك سنوورێکی هەیە، هەروەها کوردەواریی خۆشمان دەڵێن: هەموو پەتێك لەباریکییەوە دەپچڕێ، بەڵام پەتی زوڵم لەئەستوورییدا، ئەوە بوو کەسەرنجام خەڵك ڕاپەڕی، ئێمە لەکۆڕێکی دیکەدا کەباسی چۆنیەتی سەرهەڵدانی (سیکۆلاریزم)مان کرد، لە ئەورووپا بەڕوونیی و وردیی باسی ئەو مەسەلەمان کرد، کە چۆن چۆنی خەڵك ڕاپەڕی، وەسەرەنجام پەرلەمان جێگای (ئیمپراتۆری) گرتەوە، وەسەرمایەدارەکان جێگای دەرەبەگەکانیان گرتەوە، وە دۆزەرەوەو داهێنەرەکانیش (المکتشفین والمخترعین) یش جێگای کڵێساو جێگای قەشەو (پاپا)یەکانیان گرتەوە، واتە: ئەگەر پێشتر فەرمانکار و قەدەغەکار (آمر و ناهي) و حوکمڕانی موتڵەق و سیاسەت دانەر، تەنیا (ئیمپراتۆر) بوو، ئەمجار

(پەرلەمان) ئەو ئەرکەی گرتە دەست، وە ئەگەر پێشتر خاوەن زەوی هەمەکارە بوو، ئەمجارە سەرمایەدارەکان و خاوەن کارگەو فابریقە خانەکان چوونە جێیان، وە ئەگەر پێشتر (پاپا) و قەشەکان تەوجیهی خەڵکیان دەکرد، ئەمجارە فەیلەسووف و بیریار (مفکِّر)ەکان و دۆزەرەوەکان و، بەتایبەت زاناو شارەزایانی پسپۆڕ لە زانستە سروشتییەکاندا، جێگای ئەو مەرکەزە فیکرییەیان گرتەوە، جا لە هەل و مەرجێکی ئاوادا، کە میللەت شۆڕشی کردوەو، سێ کوچکەی شوومی: (ئمپڕاتۆر، پاپا، دەرەبەگ) نەماوە، کە چیدیکە خەڵك بچەوسێننەوە و، کەس نەماوە، کە بڵێ: وەکیل، یان سێبەری خوایە لەسەر زەوی!! ئاخر (ئیمپراتۆڕ)ەکان ئەوکاتە دەیانگوت: ئێمە سێبەری خواین لەسەر زەوی و، پاپاش دەیگوت: وەکیلی خوام.

[ شایانی گوتنە: لەم ڕۆژانەدا لەڕۆژنامەیەکدا بینیم، نووسەرێکی عەلمانیی نووسیبووی: کەلە ئیسلامیشدا شتی وابووەو، یەك دوو قسەو هەڵوێستی چەند بەناو خەلیفەی ئومەویی و عەبباسیی بەنموونە هینابۆوە، کەئەها! فلانیان گوتوویەتی: من سێبەری خوام و ئەوی دیکە گوتوویەتی: من چی بڵێم، ئائەوە حوکمی شەرعە! بەڵام دیارە ئەوبرادەرە خۆی لێ گێل کردوە، ئەگەرنا هەموو کەس دەزانێ کەبێگومان تەرازوو و پێوەری حوکمی ئیسلامیی، بەس قورئان و سوننەت و ئەو شێوە حوکمڕانییەیە، کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) وە چوار خەلیفە ڕاشیدەکانی (خوا لێیان ڕازی بێ)، بەڕێیانەوە بردوە، وە لە سەردەمی ئومەوییەکان بەملاوە، دەوڵەتی ئیسلامیی شووڕای تێدانەماوە، وە بەدەق (نص)ی فەرموودەی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بۆتە پادشایەتیی وەك فەرموویەتی:

{خِلَافَةُ النُّبُوَّةِ ثَلَاثُونَ سَنَةً، ثُمَّ يُؤْتِي اللهُ مُلْكَهُ مَنْ يَشَاءُ} أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ برقم: (٤٦٤٦)، وَالحَاكِمُ برقم: (٤٤٣٨)، قَالَ الأَلْبَانِي: حَسَنٌ صَحِيحٌ.

واتە: جێنشینایەتیی پێغەمبەرایەتیی سی (٣٠)ساڵ، پاشان خوا حوکمڕانیی و پادشایەتیی بەهەرکەسێ: دەدا کە بیەوێ.

ئنجا شتێکی ئاشکراو ڕوونە، لە نێو هەموو زاناو پێشەوایانی ئیسلامدا، کە موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیانیش بەخەلیفەی ڕاشید دانانرێ و، بەمەلیك دادەنرێ، چ جای (یزید)ی کوڕی، کە لەمێژوودا دیارە - وەك دوایی باسی دەکەین - چۆن کردی بەدەستەلاّتدار لەجێی خۆی، وەچۆن بەیعەتی بۆ وەرگرت!! کە پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) ئاماژەی بەوەکردوە، کە گۆڕینی حوکم لەڕاوێژەوە بۆ میراتیی (من الشورى الى الوراثة)، بەدەستی (معاوية ابن أبي سفيان) دەبێ، وەك فەرموویەتی:{أَوَّلُ مَنْ يُغَيِّرُ سُنَّتِي رَجُلٌ مِنْ بَنِي أُمَيَّةَ} واتە: یەکەمین کەس کە ڕێبازی من دەگۆڕێ، پیاوێکە لەبەنی ئومەییە[1].

ئیدی ئێستا هیچ کەسێك بۆی نیە، ئەگەر (یزید) شتێکی گوتبێ، یان (أبو جعفر المنصور) شتێکی گوتبێ، یان (هاوروون الرشيد) شتێکی گوتبێ، بێنێ ئەوە لەملی ئیسلام بپێچێ! چونکە ئیسلام تەنها لە کەسانێك بەرپرسیارە، کە بەپێی ئیسلام چووبنە سەر حوکم، بەلاّم کەسێك بەزۆرو بەدەستەلاّت، یان بەمیراتیی چووبێتە سەر کورسی حوکم، ئیسلام لێی بەرپرسیار نیە، چونکە ئیسلام نەیبردۆتە ئەو شوێنە، تاکو وەلاّمی ئیشکالەکانی بداتەوە].

بەڵێ، ئنجا لە هەل و مەرجێکی ئاوادا، کە لە لایەکەوە: (پاپا) دستەلاّتی نەماوە: بەناوی دینەوە خەڵکی فریو بدات و، دەرەبەگەکان دەستەلاّتیان نەماوە: خەڵك بکەنە کۆیلەو نەهێڵن لەو زەوییە جیا ببنەوە، کەلەوێدا وەك کۆیلەیەك کار دەکەن، وە (ئیمپراتۆر)یش تەخت و تاجی فەوتاوە، خەڵك و جەماوەر، کە دووچاری بۆشاییەکی سیاسیی و فیکریی بوون، بەناچاریی بەشێوەیەکی گشتی پەنایان بردەبەر (سیکۆلاریزم). واتە: دنیا گەرایی و بێ دینایەتیی و (دین)یان یەکجاریی لەهەموو شتێکدا (ڕەفز) کرد، چونکە زۆریان بەدەست ئەو دینەوە چێشبوو، ئنجا نەشیان دەزانی و وەك ئێمە، کە ئێستا سەرنج دەدەینە مێژوو و ئیسلامیشمان لەبەر دەستە، وەزعەکەیان ئاوا لێ ڕوون نەبوو، کە ئەو ئایینەی لەسەری بوون،

---

(١) أخرجه ابن أبي عاصم في (الأوائل) (٢٢/٧)، وابن كثير في (البداية)ج٢ص٢٣٤، والسيوطي في (الجامع الصغير): ٢٨٤١، وقال الألباني في السلسلة الصحيحة: ١٧٤٩، قلت: هذا إِسناد حسن، ولعلَّ المراد بالحديث، تغيير نظام اختيار الخليفة وجَعْلِهِ وراثة.

دینێکی شێوێنراوو تێکدراوو گۆڕڕاوەو، وایان دەزانی (دین) هەر ئەوەیە کەئەوان ناسیویانە!!

بەڵێ، لەسۆنگەی ئەوەوە، کە بەدەست ئەو دینەیانەوە، زۆر ئازاریان چێشتبوو، وە دینێکی ڕاستیشیان لەبەردەستدا نەبوو، بەگشتی ڕوویان لە بێدینیی کرد، وەپاشانیش وەك سیستمی حوکم، تەماشای مێژووی خۆیانیان کردو، مێژووو کلتووری فەرهەنگی خۆیانیان هەڵدایەوە: تەماشایان کرد باشترین شتێك، کە نەجاتیان بدات لەدیکتاتۆریی (إستبداد)وە لەحوکمی دەرەبەگایەتیی، بریتیە لە دیموکڕاسی.

**ئنجا دیموکڕاسی وەك سیستمی حوکمڕانیی، کە پێشتر ئاماژەمان بۆ کرد، بەچەند قۆناغێك دا تێپەڕێ:**

### أ- مافی ماڵ گواستنەوە:

مافی ماڵ گواستنەوە لەلادێ وە بۆ شار، یان لەشارێك بۆ شارێکی دیکەو لەشوێنێك بۆ شوێنێکی دیکە، کە پێشتر خەڵك ئەو مافەی نەبوو، جوتیار بۆی نەبوو بەبێ ئیزنی ئاغایەکەی و خاوەن زەویەکەی، ئەو شوێنە بەجێ بهێڵێ، کەوەك کۆیلەیەك دەبوو هەر ڕەنجی تێدا بدات و، لەوێ نیوەکاری ئەو دەستەڵاتدارو خاوەن زەویە بێت! ئنجا دوای هەوڵی زۆر لەپەرلەمانەکاندا، بڕیاردرا کەهەموو کەسێك بۆی هەیە لە لادێوە، ماڵ بێنێ بۆ شار، بەتایبەتی دوای ئەوەش کە سەرماریەدارەکان کارگەکانیان زیاتربوون، وەرمێنی زیاتر کەوتە سەر کەل و پەلەکان و، پێویستییان بەچینی کرێکار بوو، پێویستیش بوو کەخەڵك لەلادێوە بێ بۆ شار.

### ب- مافی ئیشکردن:

کەس بۆی نەبوو لەخۆوە ئیشێك هەڵبژێرێت، ئیشەکان هەموویان دیاریی کراو بوون، جوتیار دەبێ جوتیار بێت، ئەوەی دیکە دەبێ فلان کارەبکات، بەڵام وردە وردە ئەو مافەش دابین کرا، کە ئینسان جۆری ئیش بۆ خۆی هەڵبژێرێ و،

لەبەرانبەری ئەو ئیشەدا، کرێ چۆن وەربگرێ؟ ئەوەش دوای مانگرتنەکان (إضرابات) و خۆپیشاندانەکان (مظاهرات)ی زۆری کرێکارەکان، وردە وردە مسۆگەر کرا، چونکە سەرمایەدارەکان زۆر خوێنیان دەمژین و، نرخێکی کەمیان دەدانێ و، ئیشێکی زۆریان پێ دەکردن.

وە کاتی خۆی کۆمەڵگای (سۆسیالیزمی) لەکاردانەوەی زوڵم و ستەمێك پەیدابوو، کەسەرمایەدارەکان لەچینی کرێکاریان دەکرد، هەربۆیەش ئەگەر لەوێ دیکتاتۆریی سەرمایەداریی هەبوو، لەولاوە دیکتاتۆریی پرۆلیتاریا (الدکتاتورية البروليتارية) هەبوو، چونکە وەك قانوونێکی فیزیایی دەڵێ: بۆ هەموو کارێك کاردانەوەیەك هەیە، کە لە ئاراستەدا پێچەوانەیەتی و، لەتواناداا بارتەقایەتی (لكل فعل رد فعل، يساوية في المقدار ويعاكسه في الإتجاه)، ئەگەر لەرۆژئاوادا دیکتاتۆریی سەرمایەداریی هەبوو و هەموو شتێك بەدەست ئەوانەوە بوو، کە سەرمایەدار بوون، لەولاشەوە دیکتاتۆریی پرۆلیتاریا هەبوو، کە دەبوو هەموو شتێك بەدەست چینی کرێکارەوە بێ، ئنجا لە لایەکەوە بەهۆی زەخت و فشاری کرێکارەکان کە (إضراب) یان دەکرد، یەك ڕۆژ مانیان دەگرت و نەدەچوونە ئیش، ئەو سەرمایەدارە زەرەری دەکرد، بۆیە بەناچاریی سەرمایەدارەکان و خاوەن کارگەکان، وردە وردە تەنازولیان کرد: کرێیان بۆ کرێکارەکان زیاد کرد و، هەل و مەرجی ژیانیان بۆ خۆشکردن، وە لەولاشەوە: هەڕەشەی بلووکی ڕۆژهەڵات، کە (سۆسیالیزم) بەحەقیقەت ئەو چاکەیەی هەبوو بەسەر خەڵکی ڕەش و ڕووتەوە، کەوای کرد، سیستمی سەرمایەداریی بەخۆیدا بچێتەوەو، چاوێکی زیاتر بگێڕێتەوە، بەمافەکانی چینی کرێکاردا.

**ج- مافی فێربوون** (حق التعلُّم):

ئەوەش لە سەرەتاوە دیموکراسی دانی پێدا نەهێناوە، بەڵکو لەسەرەتاوە فێربوون و زانست وەرگرتن و خوێندن، تاپۆ کرابوو لەسەر چینی ئەشراف (الطبقة الأرستقراطية)، چینی ئورستوکراسەکان، ئەوانەی کە دەڵەمەندو خاوەن پایەی کۆمەڵایەتیی بوون، خوێندن و زانست وەرگرتن بەس عایدی ئەوان

بوو، وە شێوەی خوێندن و هەل و مەرجی خوێندن بەشێوەیەك بوو، کە کوڕی[١] بابای فەقیر، نەیدەتوانی بخوێنێ، هەتا لە پەرلەمانەکانی ئەورووپاو سەرجەم وڵاتانی ڕۆژئاوادا، چەندان جار شەڕە قسەو مشت و مڕ لەسەر ئەو مەسەلەیە کرا: یان دەیانگوت: ئاستی خوێندن دێتەخوارێ، ئەگەر کوڕی فەقیرو هەژارو نەدارو جوتیارەکان بخوێنن! یان دەیانگوت: بەمەسرەفیان ڕاناگەین! یان: دوایە کەس نابێت کرێکاریی بکات!! بەڵام دوای هەوڵدانی زۆرو، مشتومڕی زۆر، پەرلەمانەکان دانیان بەوەش دانا، کە کوڕە جوتیارەکانیش و کوڕە هەژارو نەدارەکانیش، بۆیان هەیە بچنە قوتابخانە، دوایی زۆر بەدرەنگەوە دانیان بەوەدا هێنا، کە کچەکانیش بۆیان هەیە بخوێنن، دواتر دان بەوەش داهێنرا، کە خوێندن بکرێ بەشتێکی خۆڕایی (مّجانـي).

**د- مـافی سـیاسیی:**

**ئەمیش هەروا بوو و دیموکراسیی پاش ماوەیەکی زۆر، دانی پێدا هێنا، کە ئەویش بریتی بوو لە:**

١- مافی هەڵبژاردن.

٢- مافی خەڵك کاندید کردن، بۆ چوونە نێو پەڕلەمان.

٣- مافی کۆبوونەوە.

٤- مافی دروست کردنی ڕێکخراوی سیاسی.

٥- مافی ڕۆژنامەگەریی.

٦- مافی خۆپیشاندان.

ئەوانە هەموویان پلە پلە و دوای هەوڵی زۆرو نارەحەتیی زۆر، وەدوای فرمێسك و خوێنی زۆر، ئەوجار پەرلەمانەکان و سیستمە دیموکراسییەکان، ئەو مافانەیان سەلماندو، بۆ خەڵك جەماوەریان سەلماند، کە ئەو مافانەیان پێ بدەن.

---

(١) دیارە (کچ) جارێ هیچ باسی نەبوو، بەڵکو ئافرەت بەگشتی هیچ ڕۆڵێکی پێ نەدەدرا!

**هـ- زەمانەتی دادوەریی:**

لەڕووی زەمانەتی قەزایيشەوە هەروابوو، کاتی خۆی لەسەردەمی دەرەبەگایەتیی (إقطاع) و لە ژێر سایەی دەستەڵاتی سێکوچکەی شوومی (ئیمپراتۆرو پاپاو دەرەبەگ)دا، هاووڵاتییان خاوەنی هیچ شتێك نەبوون، بەڵام دوایی پاش هەوڵی زۆر، هەم لەڕووی تۆمەتبار (إتهام)کردنەوە (ضمانة) یان پێدرا، کە هەر کەسێك بەریی بێت، نابێ لە خۆوە تۆمەتبار(متهم) بکرێت، وە هەم لە ڕووی لێکۆڵینەوە (تحقیق)ەوە (ضمانة)یان درایە، کە بەبێ بەڵگە نابێ هیچ کەس حوکم بدرێت، وەهەم زەمانەتی ئەوەش، کە نابێ هیچ کەس زیاد لەوەی، کە بەپێی قانوون شتێکی لەسەر ئیسپات بووە، سزا بدرێ. کەواتە: دیموکڕاسی بەکەندو لەندو هەورازو نشێوی زۆردا تێپەڕ بووە، هەتا گەیشتۆتە ئەو مەنزڵەی، کە ئێستا دەیبینین!

بۆیە باهیچ کەس وانەزانێ، کە دیموکڕاسی هەر لەسەرەتاوە، کە هاتوە ئەو شتانەی هەموو بەخەڵات بۆ خەڵکی هێناوە، بەڵکو دیموکڕاسی و هەر سیستمێکی دیکەی مرۆڤکرد، پلە پلە گەشەی کردوەو، هەتا خەڵك زیاتر عەقڵی بەشت شکاوە، شتێکی دیکەی لێ زیاد کردوەو شتێکی دیکەی خستۆتە پاڵ، وەهەتا خەڵك زیاتر فشاری کردوە، خاوەن دەستەڵاتەکان زیاتر چاویان بەخۆیاندا گێڕاوەتەوەو، دەستکاریی سیستم و بەرنامەکانیان کردوە، بەڵام ئیسلام بەپێچەوانەی هەموویانەوەیە، لەو سۆنگەیەوە کە خوا ناردوویەتی و خواش (جل جلاله) ئەو زاتەیە، کە بەرژەوەندیی مرۆڤەکان لەخۆیان باشتر دەزانێ و، پێش ئەوەی هیچ کەس داوایی مافی خۆی بکات، لەشەریعەتی خوای پەروەردگاردا، سەرجەم مافەکانی بۆ دیاریی کراون: کرێکارە، جوتیارە، ئافرەتە، منداڵە، چەوساوەیە، هەرکەسێك هەیە، هەم هەق و مافەکانی بۆ دیاریی کراون و بڕیاردراون و، هەم سەرجەم خەت و سنوورەکانیشی بۆ کێشراون، بێ ئەوەی هیچ کەسێك داوا بکات، یان هیچ کەسێك مان بگرێ، یان خۆپیشاندان بکات!!

لەم تەوەری سێیەمەدا، بۆ ئەوەی دیموکڕاسی لەمەحەکی عەقڵ بدەین، بنەماکانی دیموکڕاسی (ئەو چوار بنەمایەی کە پێشتر خستمانە ڕوو) هەڵدەسەنگێنین، تاکو لە سەرەتاوە بزانین، کە لەڕووی عەقڵ و واقیعەوە دیموکراسی چۆن دەردەچێت!

پێش ئەوەی بێینە سەر ئەسڵی مەبەستیش دووبارەی دەکەینەوە: کە دیموکڕاسی لەحاڵەتێکی ناچارییدا پەنای پێبراوەو، لە ژێر فشاریشدا زۆربەی ئەو شتانەی کە ئێستا تێیدا دەبینرێن، لێی زیاد کراون، کەواتە: هەر لە ژێر فشاریشدا دیموکڕاسی دەگونجێ گۆڕانی بەسەردا بێت، چ بەباری ئیجابییدا، ئەگەر خەڵکی خێر خواز زەخت لە دیموکڕاسی بکات، دەگونجێت شتی باشتری تێدا پەیدا بکرێت، هەروەها ئەگەر بەباری سەلبییش دا، زەختی لێ بکرێت، دەگونجێ زیاتر ڕووبەرەو شەڕ بڕوات، چونکە ئێستا هەندێك کەس لە ژێر پەردەی دیموکڕاسیدا دیکتاتۆریی دەکات! وە کاتی خۆیشی لەکۆمەڵگای سۆسیالیزمیش دا باسی دیموکڕاسییان دەکردو، ئەوانیش خۆیان بەدیموکڕاسی دەزانی، بەڵام لەهەمان کاتیشدا بڕواشیان بەدیکتاتۆریی پرۆلیتاریا هەبوو!!

کەواتە: لەلایەکەوە؛ دیموکڕاسی هی ناچارییەو، خەڵك لەناچارییدا پەنای پێ بردووەو، لەلایەکی دیکەش؛ دیموکراسی وەك زەرفێك وایە، چی تێ بکرێ، دەیگرێ، وە بەڕاستی زۆر ئامادەیە بۆ گۆڕان بەسەر داهێنان و، فشار لێکران و بەملاو لادا بران، چونکە چوارچێوەو قاڵبێکی دیاریی کراوی نیە کەڕێگا بگرێ لەوەی لادان (إنحراف)ی پێ بکرێت.

**بنەمای یەکەم: باڵادەستیی گەل (حاكمية الشعب):**

کە گرنگترین بنەمای دیموکڕاسییە، لەڕووی بەرنامە دانان و هەڵبژاردن و، دیاریی کردنی کاربەدەست و حوکمڕانەکان و، دەستاو دەست پێکردنی دەسەڵات و، لەڕووی دادگایی و دەسەڵاتی قەزاییەوە، دەبێ هەموو دەسەڵاتەکان بەدەست خەڵکەوە بن، ئنجا ئێمە ئەو بنەمایە وەك شیعارێك دەبیستین، بەڵام لەڕووی کردەوەییەوە، نەلەسەردەمی یۆنانیەکان دا، وە نەلەپێش ئێستاو، نە ئێستاش، ئەو شیعارە نەچۆتە قاڵبی کردەوەوە، واتە: وانەبووە کە بەکردەوە، خەڵك باڵا دەست

بێت، هەرچەندە ئێمە تێبینییمان لەسەر ئەوەش هەیە، وەك دوایی باسی دەکەین، لەڕووی شەرعییەوە، بەڵام لەڕووی واقیع و عەقڵیشەوە، ئەوە تەنها دروشمە و نەبووەو ناشبێ بەکردەوە، چونکە چەندان ئاستەنگ و کۆسپ هەن، لەبەردەم ئەوەدا کە خەڵك ببێتە حاکمی ڕەها، بۆ نموونە:

**یەکـەم:** وەك نەیارانی دیموکڕاسی و ڕەخنەلێگرانی و، ئەوانەی کە لەبەر ڕۆشنایی واقیعی ئێستای دەوڵەتانی سەرمایەداریدا، باسی دیموکڕاسی دەکەن و، سەرنجی واقیع بینانەی لێدەدەن دەڵێن:

میللەت و جەماوەر زۆربەی خەریکی ژیانی خۆیەتی، یان خەریکی گەمەو یاریی و کات بەسەر بردنەو، ئاگایان لە حوکم و سیاسەت نیەو، بواری ئەوەیان نیە کە چاودێری سیاسەت بن، تاکو بزانن: کێ هەڵبژێرن و کێ هەڵنەبژێرن؟ وە کەسێك لار بوو، ڕاستی بکەنەوە!!

**دووەم:** کاتێك خەڵك، واقیع و سیستمێك دەبینێ، کە ڕیشەی چووەتە خواری و چاك خۆی داکوتاوە، بۆ نموونە: سیستمێکی حوکمی وەك ئێستا، کە لەئەمەریکادا هەیە، دوو حیزبی: (دیموکڕاسی و کۆماریی)، یان لە (بەریتانیا) هەردووك حیزبی: (کرێکاران و پارێزگاران) تازە هەموو شتێکیان گرتۆتە دەستی خۆیان، ئیدی ئەو حیزبە نا، ئەو حیزبە، وەك دەڵێن: ئافرەتێك کوڕەکەی نەخۆش کەوتبوو، هیچ شتێکیان نەبوو (بەڕوو) نەبێت، پێی دەڵێ: ڕۆڵە! حەزت لە چییە؟! گوتی: دایە حەزم لەهیچ نیە، گوتی: حەزت لە(بەڕوو) نیە؟ گوتی: ئنجا (بەڕووی) چۆن؟ گوتی: (بەڕوو) بەکاڵیی، گوتی: نەخێر حەزم لێی نیە، گوتی: ئەدی (بەڕوو) بەکوڵاویی! گوتی: هەر حەزم لێ نیە، گوتی: ئەدی (بەڕوو) بەبرژاویی؟! گوتی: دایە! حەزم لە (بەڕوو) هەر نیە.

ئێستاش واقیعی ئەو وڵاتە دیموکڕاسییانە بەوشێوەیەیە، چونکە ئەو حیزبە لەگەڵ ئەو حیزبەی دیکە، چوار چێوەیەکیان دیاریی کردوە، بۆ حوکم و سیاسەت، ئنجا ئایا (زایۆنیزم) لەپیشتیەوەیەتی، یان کێ و چی لەپشتیەوەیەتی؟ گرنگ ئەوەیە چوارچێوە و قاڵبێك دیارییکراوە، کە بە کەس نەشکێنرێ، وە هاووڵاتییەك

کە ئەو واقیعە دەبینێ، نائومێدە لەوەی کە بیگۆڕێ، بۆیە زۆر جار هەر بەشداریی لە هەڵبژاردندا ناکەن!

**سێیەم:** پاڵێوراوەکان (کاندیدەکان)، کە حیزبەکان کاندیدیان دەکەن: هەروەك مەسەلەی بەرِووەکەی لێهاتوە، ئەو حیزبە کۆمەڵێك خەڵك (کاندید) دەکات، ئەوەی دیکەش کۆمەڵێك کاندید دەکات، ئیدی خەڵك ناچارە یان دەنگ بە ئەوە دەدات، یان بە ئەوی دیکەیان! ئنجا زۆرجار خەڵك هیچیشیانی بەدڵ نیە، بەڵام بەناچاریی دەبێت، یان هەر دەنگ نەدات، یان دەنگ بە یەکیان بدات، کەبەدڵی نیە!

**چوارەم:** مەسەلەی مەسرەفی هەڵبژاردنەکان، ئەویش هەروا بەقسە خۆشە، بەڵام کە دێیتە سەر ئەوەی کێ دەتوانێ ئەو مەسرەفە قورسەی ڕاگەیاندنی ئێستاو، پڕۆپاگەندە بۆ کاندیدەکان و هەڵبژاردنەکان بکێشێ و، کێ پێی دەردەچێت؟ دەزانی کە سەرمایەدارو خاوەن دەستەڵاتەکان نەبێت ئەو مەسرەفەیان پێ هەڵناستێ.

**پێنجەم:** ساختەکاریی و تەزویر لەهەڵبژاردنەکاندا، کە لە هەموو وڵاتاندا ئەوە دیاردەیەکی باوو بەرچاوە.

**شەشەم:** ڕێژەی بەشدارییکردن، کە لەوبارەوە تەنها نموونەیەك دێنمەوە: ڕادیۆی دەنگی ئەمەریکا لە ١٩٩٦/١١/٦کە (کلنتۆن) هەڵبژێردرا، گوتی: لە (٥٠٪)ی ئەوانەی کەبۆیان هەبوو بەشداربن، بەشدارییان کرد، وە (٤٩٪)ی ئەو دەنگانەی بەدەستهێنا کەواتە: دەمێنێتەوە (٢٥٪) بەڵکو کەمتر لە (٢٥٪)ی دەنگەکانیشی بەدەست هێناوە، واتە: چواریەکی ئەو خەڵکەی کە بۆیان هەبووە بەشداریی بکەن، ئەویش جارێ هەر ئەوانەی کە بۆیان هەبووە دەنگ بدەن، کەبەحسابی ئەوان چواریەکی ئەو خەڵکە دەنگیان بۆ داوە!! کەواتە: کوا حوکمی خەڵك؟! ئایا ڕاستتر نیە بڵێین: حوکمی چواریەکی خەڵك؟! بگرە ئەگەر بەقووڵیی لێکی بدەیتەوە، کەمتر لە چواریەك، چونکە ئەو خەڵکەش هەمووی کاریگەریی ئیعلامێکی لەسەرە، کە هەرهی ئەو حیزبانەیە!!

حەوتەم: وە لەکۆتاییدا پڕو پاگەندەی هەڵبژاردن، کە درۆو دەلەسەی زۆر دەکرێ و، گفت و بەڵێنی زۆر دەدرێ بەخەڵك؛ واتان بۆ دەکەین و وادەچێ و وا دەبێ، ئەو دەڵێ: کرێی کرێکار زیاد دەکەم و، یەکی دیکەیان دەڵێ: هەل و مەرجەکانی ژیان خۆش دەکەین و...هتد! بەڵام دوایی کەحکوومەتیان دەکەوێتە دەست، پێچەوانەی بەڵێنەکانی خۆیان ڕەفتار دەکەن، ئەوە بنەمای: (باڵا دەستیی گەل) ئەگەر وردی بکەینەوە، دەبینین بەهیچ جۆرێك ئەو بنەمایە ڕاست نیەو، گەل باڵا دەست نیە.

**بنەمای دووەم: سەروەریی یاسا (سیادة القانون):**

یانی قانوون بەسەر هەموو کەسەوە باڵا دەست بێت و، هیچ کەس قانوون نەشکێنێ، کە بێگومان ئەوە شتێکی چاکە، بەڵام لەسایەی دیموکڕاسیدا، کە بەرهەمی ئەو پەرلەمانەیە، کە بەو حەوت ئیشکالەوە، کە باسم کردن پەیدابووەو هەڵقوڵیوە، وێڕای فشاری ئەو لۆبیانەی، کە لەسەر ئەو پەرلەمانە هەن، وە لەسەر حکوومەت و سەرجەم دام ودەزگاکانی حکوومەت هەن، بەدەستەڵاتی قەزاییشەوە،وەك لۆبیی جوولەکەو لۆبیی سەرمایەدارەکان.

[ (لۆبی) واتە: ئەو خاوەن بەرژەوەندییانەی، کە یەك دەنگن و فشاردەخەنەسەر حکوومەت بەهەر شێوەیەك لەشێوە ئاشکراو پەنهانەکان]، ئنجا کاتێك لەبەر تیشکی ئەوەدا کە ڕابرد، تەماشای (سەروەریی یاسا) دەکەین، دەبینین یاسا وەك لاستیکێکی لێهاتوە، بەدەست ئەو کەسانەوە، کە دەستەڵاتیان هەیە، بەرژەوەندییان چۆن بێت، وای دەکێشن!

**بنەمای سێیەم: مافەکانی مرۆڤ و ئازادییە گشتییەکان:**

ئەویش وەك ئێمە لەکاتی توێژینەوەی باسی مافی مرۆڤیشدا باسمانکردوە، لەخودی خۆیدا شتێکی باشە، کەمرۆڤ مافی هەبێت و خەڵك ئازاد بێت و ستەمی لێنەکرێ! بەڵام کاتێك لەدنیای واقیع دا تەماشای دەکەین، دەبینین کە بەڕاستی مافەکانی مرۆڤ و ئازادییە گشتییەکان، زیاتر وەك قسەیەکی

بۆش و خۆش دێنە بەرچاو، چونکە بێگومان کاتێك میللەتێك دەسەڵاتدارو بێ دەسەڵاتەکەی، خاوەن پارەو بێ پارەکەی، تێکەڵ دەکرێت و پێیان دەگوترێ: ئێوە ئازادن چی دەکەن بکەن! بەزەرەری فەقیرەکان تەواو دەبێت و، ئەمە وەك ئازادیی نێو دارستان و یەکسانیی دڕندە و ئاژەڵانە لەجەنگەڵ دا، کە هەموویان ئازادن، بەڵام شێرو پڵنگەکان قازانج دەکەن و، ئاسك و گا کێوییەکان و ئاژەڵە فەقیرەکان زەرەر دەکەن! کاتێکیش میللەتێك ئازاد دەکرێ، یانی: تێك بەردەدرێ، دیارە ئەوەی کەڵبەو نینۆکی تیژترو بەهێز تر بن، ئەو قازانج دەکات، ئێستا لەبازاڕەکانی ئەورووپادا چ شتێك ڕەواجی هەیە؟ دیارە ئەوەی کەسەرمایەدارەکان پێیان خۆش بێت، ئەوانیش هەرشتێك کەبەرهەمی زیاتریان بۆ وەدەست بهێنێ ئەوەیان پێخۆشە، نەك شتێك کە کۆمەڵگا زیاتر بەرەو پێشەوە بەرێت و بەها و ئەدەب و ئاکاری ئینسانیی زیاتر گەشە پێ بدات، بەڵکو هەرشتێك کەگیرفانی ئەوان زیاتر پڕ دەکات و، جێگایان نەرمترو، پاروویان چەورتر دەکات! ئنجا بێگومان ئەو جۆرە ماف بەخەڵك دانە، بێ سنوور دیاریی کردن، بەزەرەری چەوساوەکان تەواو دەبێت، وە ئەو جۆرە یەکسان کردنەی خەڵك بەتەئکید بەزەرەری خەڵکە بێدەستەڵاتەکە تەواو دەبێت، وەك چۆن ئەگەر بزنێکی قۆچدارو مەڕێکی بێ قۆچ، تێك بەر بدەی و بڵێی هەردووکتان ئازادن، ئەنجامەکەی دیارە!

**بنەمای چوارەم: لەیەك جیاکردنەوەی دەستەڵاتەکان:**

بەدڵنیایی شتێکی باشە ئەگەر دەستەڵاتی قەزایی سەربەخۆ بێت، وە دەستەڵاتی یاسادانان، کەس فشاری لێ نەکات، بەڵکو بەرژەوەندیی خەڵك چۆن بێت، بەو شێوەیە یاسا دابنرێت، بێگومان شتێکی چاکە، بەڵام: گرفت و کێشە لەخودی دەزگاکانی ئەو حکوومەتەدا هەیەو، لەخودی دەستەڵاتی یاسادانان و جێبەجێکردن و قەزایی دا هەیە، وە پاشانیش بەهۆی ئەو فشارەوە کە لەلایەن لۆبییەکانەوە، دەکرێتە سەر ئەو دام و دەزگاو ئەو دەستەڵاتانە، زۆر لەنێوەڕۆکی خۆیان خاڵی دەبنەوەو، بەو جۆرە ئەو شیعارەی لێك جیاکردنەوەی دەستەڵاتەکان (فصل السلطات) دەبێتە درووشمێکی بێ نێوەڕۆك.

**وەك پێشتر باسمانكرد:**

كاتی خۆی ڕۆژئاواییەكان كە لە سۆنگەی ئەوەوە (دین)ی ڕاستیان لەبەر دەست دا نەبوو، ناچاربوون بۆ ئەوەی كە لە دیكتاتۆرێتیی پاپاو ئیمپڕاتۆرو دەرەبەگ و، غەدر و ستەمیان دەربازبن، ڕوو لە دیموكراسی بكەن،وە بەتەئكیدیش كاتێك مرۆڤ ناچار دەكرێت كە، یان دیموكڕاسی، یان دیكتاتۆریی هەڵبژێرێ، ئەوە دیموكڕاسی بەحەوت ئاوان شۆراوەتەوە لە چاو دیكتاتۆرییدا، چونكە وەك گوتراوە: (وبعض الشرِّ أهون)، بەڵام ئێمە كە لە ڕووی شەرعییەوە باسی دیموكڕاسی دەكەین، ئەوە بێگومان ئێمەی میللەتێكی مسوڵمان، ئەو ناچارییەمان نیە، چونكە بەرنامەیەكمان لەبەردەستە، بەداواكاریی و فشاری هیچ كەس پەیدا نەبووەو، هەموو ئەرك و مافەكانی گرتوونە خۆی، خوای پەروەردگار فەرموویەتی:

﴿ ثُمَّ جَعَلْنَاكَ عَلَىٰ شَرِيعَةٍ مِّنَ الْأَمْرِ فَاتَّبِعْهَا وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَاءَ الَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٨﴾ ﴾ الجاثية: ١٨.

واتە: تۆمان لەسەر بەرنامەیەك داناوە، دەجا شوێنی بكەوەو، بەدوای ئارەزووی ئەوانە مەكەوە كەنازانن.

**ئێستاش بابچینە سەر باسی بنەمایەكانی دیموكڕاسی و، یەك یەك لەتەرازووی شەرع دا، هەڵیان بسەنگێنین و لەمەحەكیان بدەین:**

## بنەمای یەكەم: باڵادەستیی گەل (حاكمیة الشعب):

**باڵادەستیی گەل لەڕووی شەرعییەوە، دوو چەمك و واتای هەن:**

یەكەم: كۆمەڵگا مافی بەرنامە دانان و یاسادانان (تشریع)ی هەبێ.

دووەم: كۆمەڵگا مافی ئەوەی هەبێ، كە حوكمڕان و كاربەدەستانی خۆی هەڵبژێرێ و، دەستەڵات بەم و بەو بسپێرێ و هەڵیان بژێرێ.

**مانای یەکەم:**

چەمك و واتای یەکەمیان، کە لە شەریعەت دا (الحاکمیة)ی پێ دەگوترێ، ئەوە بێگومان لەشەرع دا، بەڕەهایی (بإطلاق) تەنها مافی خوای تاك و بێهاوتایە، چونکە فەرمانڕەوایەتیی ڕەها (الحاکمیة المطلقة) تایبەت ترین سیفەتی خوای پەروەردگارە، ئەو حەقیقەتەش لەچەندان دەقی قورئان و سوننەتدا خراوتەڕوو، بۆ وێنە:

١- ﴿إِنِ ٱلۡحُكۡمُ إِلَّا لِلَّهِۚ أَمَرَ أَلَّا تَعۡبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلۡقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ ٤٠﴾ یوسف: ٤٠.

واتە: حوکم و بەرنامەدانان تەنها هی خوایە، فەرمانی کردوە، کە جگە لەو مەپەرستن، ئا ئەوەیە بەرنامەی ڕاست، بەڵام زۆربەی خەڵکی نازانن.

وەك لەم ئایەتە بەپێزەدا دەبینرێ، خوای کاربەجێ (تبارك وتعالی) ئەم ڕاستییە گەورەو گرنگانە، لەبارەی (حاکم)بوونی خۆیەوە ڕادەگەیەنێ:

یـەك: فەرمانڕەوایەتیی موتڵەق (بەرنامەی ژیان دانان و، حەڵاڵ و حەرام دیارییکردن) تەنهامافی خوایەو شایستەی ئەوە: [ان الحکم إلا الله].

دوو: خوا فەرمانی کردوە کە ئینسانەکان بێجگە لەوی، هیچ کەس و شتێکی دیکە نەپەرستن [أمر ألا تعبدوا إلا إیاه]، کەواتە: تەنها بەندایەتیی بۆ خوا کردن و، بەس خوای بەرزو مەزن پەرستن، لەگەڵ تەنها خوا بەفەرمانڕەواو بەرنامەدانەر زانین، دوو ڕووی یەك حەقیقەتن، واتە: تەنها کاتێك ئینسان ئیسپاتی ئەوە دەکات، کەبەس خوا دەپەرستێ، کە بێجگە لەوی بەرنامەی ژیان و گوزەرانی و، حەڵاڵ و حەرام لە هیچ کەسی دیکە وەرنەگرێ.

ســێ: پاشان خوای بێ هاوتا فەرموویەتی: [ذلك الدِّین القیّم] ئا ئەوەیە بەرنامەو ئایینی ڕاست و دروست، واتە: ئایین و بەرنامەی ڕاست و دروستی خوای کاربەجێ بریتیە لە: تەنیا خوا بەفەرمانڕەواو بەرنامەدانەری موتڵەق زانین و، بەس بەندایەتیی بۆ وی کردن.

٢- ﴿ وَأَنِ ٱحْكُم بَيْنَهُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَهُمْ وَٱحْذَرْهُمْ أَن يَفْتِنُوكَ عَنۢ بَعْضِ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ إِلَيْكَ ﴾ المائدة: ٤٩.

واتە: وە حوكم و دادوەرییان لەنێوان دا بكە، بەپێی ئەوە كە خوا ناردوویەتە خوار، وەمەكەوە شوێن ئارەزووەكانیان و، وریا بە، با لەهەندێك لەوەی، كە خوا بۆی ناردوویە خوارێ، لات نەدەن .

بەڵێ ئینسان - چ تاك چ كۆمەڵ - چاری ناچارەو دەبێ یەكێك لە دوو ڕێیان لە ژیانیدا هەڵبژێرێ: یان بەندەی خواو شوێنكەوتووی (هُدى)بێت، یان كۆیلەی غەیری خواو یەخسیری (هَوى) بێت، دیارە هیدایەتیش تەنها بریتیە لەو ئایین و بەرنامە كۆتاییە دەستكاریی نەكراوەی خوا، كە بە جوبرائیل دا (علیە السلام) بۆ سەروەرو كۆتایی پێغەمبەرانی خۆی (محمد) (صلی اللە علیە وسلم)ی ناردۆتە خوار، ئنجا هەركات ئینسان نەكەوتە شوێن هیدایەت و بەرنامەی دابەزێنراوی خوا، چاری ناچارە دەكەوێتە دوای ئارەزوو (هوی)، ئنجا چ ئارەزووی خۆی بێت :

﴿ أَفَرَءَيْتَ مَنِ ٱتَّخَذَ إِلَٰهَهُۥ هَوَىٰهُ ﴾ الجاثية: ٢٣.

وە چ ئارەزووی غەیری خۆی بێت:

﴿ ثُمَّ جَعَلْنَٰكَ عَلَىٰ شَرِيعَةٍ مِّنَ ٱلْأَمْرِ فَٱتَّبِعْهَا وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَ ٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٨﴾ ﴾ الجاثية: ١٨.

جائارەزووەكانی ئەوانەش، كە نەزان و نەفامن، زۆرو جۆراو جۆرن، جارێك هی: قەشەو پاپایەو، جارێك هی ئیمپڕاتۆرو پادشایەو، كەڕەتێك هی دەرەبەگ و سەرمایەدارەو، جارێك هی دیكتاتۆرێكی دوور لەخوایە، ئنجا چ تاك (فرد)ێك بێت، چ چین (طبقة)ێك، وەك چینی بورژواو چینی پڕۆلیتاریا!!

٣- هەروەها خوای كاربەجێ و دادگەر زۆر بەڕوونیی و ڕاشكاویی ڕایگەیاندوە، كە هەركەسێ هەستێ بە بەرنامەی ژیان و یاسادانان بۆ خەڵكی، بێ ئەوەی

گوێ بداتە وەحی خوا، مانای وایە لافی هاوبەشێتیی خوا لێ دەدات و، هەرکەسێکیش ئەو ڕەفتارە لەیەکێك بسەلمێنێ، مانای وایە دانی بۆ پێداهێناوە، کەهاوبەش و شەریکی خوابێ!! وەك خوای بەرزو بێ هاوتا فەرموویەتی:

﴿ أَمْ لَهُمْ شُرَكَـٰٓؤُاْ شَرَعُواْ لَهُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا لَمْ يَأْذَنۢ بِهِ ٱللَّهُ ﴾ الشورى: ٢١.

واتە: یان ئایا چەند هاوبەشێکیان هەن، دینێکیان بۆ دادەنێن، کەخوا ئیزنی لەسەر نیە؟!... دیارە تاکە بەرنامەو دینێك، کە خوا ئیجازە و مۆڵەتی لەسەر بێت و، ڕازی بێت بەندەکانی شوێنی بکەون، بریتیە لە ئیسلام:

﴿ وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ ٱلْإِسْلَـٰمِ دِينًا فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ مِنَ ٱلْخَـٰسِرِينَ ﴿٨٥﴾ ﴾

آل عمران: ٨٥.

ئنجا ئاشکراشە کەهاوبەش بۆ خوا دانان (الإشراك بالله) گەورەترین گوناحەو، هەرگیز قەڵەمی عەفوی بەسەردا نایەت :

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِۦ ﴾ النساء: ٤٨.

٤- دیسان خوای بێ وێنەو هاوەڵ (سبحانه وتعالى) بەدیهێنەرایەتیی و فەرمانڕەوایەتیی، تایبەت کردوە بە خۆیەوە، وەك دوو سیفەت و دوو مافی ڕوون و بێ چەندو چوونی خۆی، باسی کردوون، فەرموویەتی:

﴿ أَلَا لَهُ ٱلْخَلْقُ وَٱلْأَمْرُ ۗ تَبَارَكَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿٥٤﴾ ﴾ الأعراف:٥٤.

واتە: ئاگاداربن! دروستکردن و فەرمانکردن تەنها هی وین، پایە بەرزە خوای خاوەنی جیهانەکان.

٥- وە لەکۆتاییدا، خوای دادگەر جوولەکەو دیانەکانی بەوە ناوزەد کردوون، کەزانایەکان و ڕاهیبەکانی خۆیانیان لەجیاتی خوا پەرستووە، کردوویانن بەهاوبەشی خوا لە پەروەردگاریێتی و پەرستراوێتیی دا، چونکە حەڵاڵ و حەرامیان بۆیان دیاری کردوە، وەك فەرموویەتی:

﴿ ٱتَّخَذُوٓاْ أَحۡبَارَهُمۡ وَرُهۡبَٰنَهُمۡ أَرۡبَابٗا مِّن دُونِ ٱللَّهِ وَٱلۡمَسِيحَ ٱبۡنَ مَرۡيَمَ وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعۡبُدُوٓاْ إِلَٰهٗا وَٰحِدٗاۖ لَّآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۚ سُبۡحَٰنَهُۥ عَمَّا يُشۡرِكُونَ ٣١ ﴾ التوبة:٣١.

واتە: وە زانایەکان و[١] ڕاهیبەکانی[٢] خۆیانیان و مەسیحی کوڕی مەریەمیان لەجیاتی خوا کردە پەرستراوو پەروەردگار، هەرچەندە فەرمانیان پێ نەکرابوو مەگەر بەوە: کە تەنها یەك پەرستراو بپەرستن، بێجگە لەوی هیچ پەرستراو نین، پاك و دوورە لەوەی کە دەیکەنە هاوبەشی.

لە تەفسیرەکاندا، لە کاتی تەفسیر کردنی ئەم ئایەتەدا، توێژەرەوانی قورئان ئەم دوو فەرمایشتەیان هێناون، کەتیشکی زیاتر دەخەنە سەر تەفسیرو واتای ئایەتەکە:

أ- {عَن عَدِيٍّ بْنِ حَاتِمٍ قَالَ أَتَيْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عليه وَسَلَّمَ وَهُوَ يَقْرَأُ فِي سُورَةِ "بَرَاءَةٌ" : اتَّخَذُوا أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَانَهُمْ أَرْبَابًا مِنْ دُونِ اللَّهِ" قَالَ: أَمَا إِنَّهُمْ لَمْ يَكُونُوا يَعْبُدُونَهُمْ وَلَكِنَّهُمْ كَانُوا إِذَا أَحَلُّوا لَهُمْ شَيْئًا اسْتَحَلُّوهُ وَإِذَا حَرَّمُوا عليهمْ شَيْئًا حَرَّمُوهُ} أَخْرَجَهُ التِّرمِذِي برقم: (٣٠٩٥)، وحسّنه الألباني[٣].

واتە: عەدی کوڕی حاتەمی طائیی دەڵێ: چوومە لای پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم)، کە لە سوورەتی (البراءة) ئەم ئایەتەی دەخوێندەوە:

﴿ ٱتَّخَذُوٓاْ أَحۡبَارَهُمۡ وَرُهۡبَٰنَهُمۡ أَرۡبَابٗا مِّن دُونِ ٱللَّهِ ... ﴾

ئنجا فەرمووی: ئاگاداربن! ئەوان نەیاندەپەرستن، بەڵام ئەوەندە هەبوو کاتێك شتێکیان حەڵاڵ دەکرد، بە حەڵاڵیان دادەناو، کە شتێکیان لێ حەڕام دەکردن، بەحەڕامیان دادەنا!

---

(١) (أحبار) کۆی (حَبْر)ە، کە بەزاناو شارەزای ئایینی جوولەکە و نەصڕانیی دەگوترێ.
(٢) (رهبان) کۆی (راهب)ە، کە بەگۆشەگیرو عابیدەکانی نەصڕانیی دەگوترێ.
(٣) بڕوانە: فتح القدير، للشوكاني، ج٢ ص٤٣٠.

هەڵبەتە مەبەستی پێغەمبەری خواش (صلی الله علیه وسلم) لەوەدا، کە فەرموویەتی: ((أما إنهّم لم یکونوا یعبدونهم)) ئەوەیە، کە ئەو ڕەفتارەی جوولەکەو دیانەکان، بەگوێرەی تێگەیشتنی خەڵکانێك (نەك لە واقیع دا) ناکەوێتە جوغزو بازنەی بەندایەتیی و پەرستنەوە، چونکە وەك پێشتر خستمانەڕوو: حەڵاڵ و حەرام و، ئەمرو نەهی و (حاکمیة)، کاکڵ و جەوهەری خواپەرستییەو، خواپەرستیی لەبواری بەرنامەکان (شرائع)دا، زۆر فراوانەو خواپەرستیی لەبواری دروشمەکان (شعائر)یش دا، دەگرێتە خۆی، لەسۆنگەی ئەوەوە، کە دروشمەکانیش هەر بەئەمرو نەهی و یاسادانان (تشریع) دیاریی دەکرێن!.

شایانی باسە، فەرموودەکەی دووەمیش بەڵگەی ئەو قسەیەی ئێستامانە:

ب- ((عن عدي بن حاتم أنه لما بَلَغَتْه دعوةُ رسولِ الله صلى الله عليه وسلم، فَرَّ إلى الشام وكان قد تنصَّر في الجاهلية، فَأُسِرَتْ أُخْتهُ وجماعَةٌ من قومه، ثم مَنَّ رسولُ الله على أُخته وأعطاها، فرجعت إلى أخيها فرغَّبَتْهُ في الإسلام... فدخل على رسول الله (صلى الله عليه وسلم) وفي عنق عدي صليب من فضة، وهو يقرأ هذه الآية: (اتخذوا أحبارهم ورهبانهم أَرباباً من دون الله ...)، قال فقلت: إنهم لم يعبدوهم، فقال: بلى إنهم حرَّموا عليهم الحلال وأَحَلُّوا لهم الحرام: فاتبَّعوهم، فذلك عبادتهم إياهم)) رواه ابن جرير والترمذي[1].

واتە: کاتێك عەدی کوڕی حاتەم بانگەوازی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)ی پێگەیشت، ڕای کرد بۆ شام و، پێشتریش لەسەردەمی نەفامیدا بوو بووە نەصرانیی، ئنجا لە جەنگێك دا خوشکەکەی و کۆمەڵێك لەگەلەکەی بەدیل گیران، پاشان پێغەمبەری خوا، خوشکەکەی بەبێ بەرانبەر ئازاد کردو، خەڵاتیشی کرد، خوشکەکەی گەڕایەوە بۆ لای براکەی و هانیدا بۆ ئیسلام، ئنجا عەدی لەحاڵێك دا، کە خاچێکی زیوی لەمل دابوو، چووە لای پێغەمبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) و ئەویش ئەم ئایەتەی دەخوێندەوە:

---

(١) سنن الترمذي: ٣٠٩٥، وابن جرير في التفسير، ج١ص٨٠-٨١، وصححه الألباني في (صحيح سنن الترمذي).

﴿ ٱتَّخَذُوٓاْ أَحۡبَارَهُمۡ وَرُهۡبَٰنَهُمۡ أَرۡبَابٗا مِّن دُونِ ٱللَّهِ ... ﴾

عەدی دەڵێ: منیش گوتم: ئەوان زانایان و ڕاهیبەکانی خۆیانیان نەدەپەرست! فەرمووی : با، چونکە حەڵاڵیان لێ حەرام دەکردن و، حەرامیان بۆ حەڵاڵ دەکردن و، ئەوانیش شوێنیان دەکەوتن، ئنجا ئا ئەوە بەندایەتیی و پەرستنیان بوو بۆیان.

کەواتە: لەبەر تیشکی ئەو ئایەت و فەرمایشتانەدا، زۆباش ڕوون بۆوە کەچەمك و واتای یەکەمی حاکمیّتیی گەل (حاكمية الشعب)، نەك هەر شتێکی ناشەرعیی و هەڵەیە، لەڕوانگەی شەریعەتەوە، بگرە بریتیە لەهاوبەش بۆ خوا دانان (الشرك بالله) و ئەمەش گەورەترین گوناحە، ئنجادەبێ، چ گوناح و تاوانێك لەوە زلتر بێت، کەیەکێك لە دروستکراوەکان ببرێتە ڕیزی خواوەو بکرێتە پەرستراو (معبود)و، وێڕای خوای بەدیهێنەر بپەرسترێ و، بەندایەتیی بۆ بکرێ؟! بێگومان ئەوە گەورەترین و ناقۆڵاترین ستەم و تاوانەو، ڕاستەوخۆ لەگەڵ جەوهەرو کاکڵی ئیسلام و ئیمان دا، کە بریتیە لەخوا بەیەکگرتن (توحيد الله) و تەنها خوا بەپەرستراو (إله) زانین، و (لا إله إلا الله)، تێك دەگیرێ و دژ دەوەستێ.

بەڵام بەر لەوەی بچینەسەر ڕوونکردنەوەی چەمك و واتای دووەمی (حاکمیّتیی گەل)، پێویستە ئەم ڕاستییەش بخەینەڕوو، کەمەسەلەی ئیجتهادی زاناو پێشەوایان و، هەڵهێناجانیان بۆ یاسا شەرعییەکان (إستنباطهم للأحكام الشرعية)، هەرچەندە جۆرێکە لەیاسادانان (تشريع)، بەڵام جیایە لەو یاسا دانانەی، کە قەدەغەیەو ناشەرعییە، چونکە زاناو پێشەوایانی ئیسلام، کە یاسایەك هەڵدەهێنجن، یان فەتوایەك دەردەکەن، لەبەر تیشکی قورئان و سوننەت داو لەجوغزی شەریعەت دا، بەوکارەیان هەڵدەستن: نەك بەشێوەیەکی سەربەخۆ، ئەمە لەلایەك و لەلایەکی دیکەشەوە، زاناو پێشەوایانی ئیسلام، بەهیچ جۆرێك قسە لەمەسەلەو بابەتێك ناکەن، کە ئایەت و فەرموودەکان قسەیان لێ کردبێ و، نوختەیان تێداخستبێتەسەر پیت، وە لەو بارەوە زانایانی ئیسلام بنچینەیەکی شەرعیی

(قاعدة شرعية) يان داناوە، كە دەڵێ: ( لا إجتهاد في معرض النص) ئیجتیهاد لەبەرانبەر دەق دا ڕەوانیە، یان: (لاإجتهاد في مقابل النص) ئنجا لەلایەکی دیکەشەوە پێویستە بزانرێ، کەهەرچی بەرهەم و زادەی کۆشش و هەڵهێنجانی زانایانە، وەك تێگەیشتنی ئەوان بۆ دین ( فهمهم للدين) دادەنرێ و، نابێ بەهیچ جۆرێك لەگەڵ خودی دین و، دەقەکانیدا تێکەڵ بکرێ.

**مانای دووەم:**

بەڵام چەمك و واتای دوومی (حاکمێتیی گەل) کە بەکورتیی بریتیە لەگێڕانەوەی دەستەڵاتی سیاسی بۆ خەڵك و میللەت (إعادة السلطة للشعب)، ئەوە بێگومان شتێکە شەریعەت بەر لە دیموکڕاسی، فەرمانی پێکردوەو پیادەشی کردوە، وە چەندان دەق لەقورئان و سوننەت دا هەن، زۆر جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە، کە دەبێ خەڵك بەئیرادەی ئازادانەی خۆی حوکمڕان و کاربەدەستانی خۆی دابنێ و، پاشان چاودێرییشیان بکات و، هەرکاتێك لایان دا، لێپرسینەوەیان لەگەڵدا بکات و، ئەگەر هەر ڕاستیش نەبوونەوە، لاشیان بدات، کەواتە: ئەم چەمك و واتایەی (حاکمێتیی گەل)، شتێکی شەرعیی و ڕەوایە، بەڵام بێگومان میللەتێکی مسوڵمان بەهیچ ڕەنگێك بۆی نیە، کەسانێك بەحوکمڕان و کاربەدەست دابنێ و هەڵبژێرێ، کە لەخودی خۆیاندا مسوڵمان نەبن، یان خۆیان بەمسوڵمان دابنێن، بەڵام ئامادەنەبن شەریعەتی خوای دادگەر پیادە بکەن! چونکەخوای بەرزو تاك فەرموویەتی:

﴿ وَيَقُولُونَ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَبِٱلرَّسُولِ وَأَطَعْنَا ثُمَّ يَتَوَلَّىٰ فَرِيقٌ مِّنْهُم مِّنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ ۚ وَمَآ أُو۟لَـٰٓئِكَ بِٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٤٧﴾ ﴾ النور -٤٧-.

واتە: وە دەڵێن: بڕوامان بەخوا و پێغەمبەر هێناوە و فەرمانبەرین، پاشان کۆمەڵێکیان پشت هەڵدەکەن، وە ئەوانە بڕوادارنین.

ئەمەش چەند دەقێك لەوبارەوە، کە لەئیسلام دا هەرچەندە حاکمییەت و سیادەتی موتڵەق، تەنها ماف و شیاستەی خوای مەزن و باڵادەستە، بەڵام دەستەڵات و

سوڵتەی سیاسی، بەدەست خەڵك و میللەتە، واتە (الحاكمية لله والسلطة للشعب)، ئەمەش چەند نموونەیەك لەو بارەوە:

١- ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡ ﴾ النساء: ٥٩.

واتە: ئەی بڕوادارینە! فەرمانبەریی خوا و پێغەمبەر بکەن، وەهی حوکمڕان و کاربەدەستانێك، کە لەخۆتانن و، خۆتان هەڵتان بژاردوون و، کارتان پێیان سپاردوە، بەقسەیان بکەن: [فەرمانەکانیان جێبەجێ بکەن و وەك چۆن فەرمانبەریی خواو پێغەمبەرەکەی (صلى الله عليه وسلم) دەکەن] بەڵام دیارە گوێڕایەڵیی و فەرمانبەریی بۆ کردنی حوکمڕان و کاربەدەستانی مسوڵمان، تەنها لەسنووری شەریعەت دایە، وەك پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی:

(إنما الطاعة فـي المعروف) رواه البخـاري.

واتە: فەرمانبەریی کردن (بۆ کاربەدەستان) لەچاکەدایە.

٢- ﴿ وَٱلَّذِينَ ٱسۡتَجَابُواْ لِرَبِّهِمۡ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَمۡرُهُمۡ شُورَىٰ بَيۡنَهُمۡ وَمِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ يُنفِقُونَ ٣٨ ﴾ الشورى:٣٨.

واتە: وە ئەوانەی کەبەدەم بانگەوازی پەروەردگاریانەوە دەچن و، نوێژێ بەرپا دەکەن و، کاروباریان بەڕاوێژەو، لەوەی کەپێمان داون، دەبەخشن.

**وەك دەبینین:** لەم ئایەتەدا خوای بەرزو مەزن، چوار سیفەتی بنەڕەتیی لە کۆمەڵی مسوڵمانان دا باس دەکات، بۆ پێناسە کردنیان، وەڕاوێژ (شورى)ی خستۆتە نێوان نوێژ بەرپاکردن و، زەکات دانەوە، چونکە نوێژکردن عیبادەتێکی ڕووحیی و مەعنەوییە، وە زەکات عیبادەتێکی کۆمەڵایەتیی و ئابوورییەو، ڕاوێژیش عیبادەتێکی سیاسییە، تاکو بزانرێ کەمیللەتێکی مسوڵمان، دەبێ لەڕووی مەعنەوییەوەو، لەڕووی ئابوورییەوە و، لەڕووی کۆمەڵایەتییەوەو، لەڕووی سیاسییەوە، بەپێی فەرمانی خوا بەڕێوەبچێ، بەڵێ، وەك چۆن نوێژت لەسەر فەرزەو، زەکاتت لەسەر فەرزە، ئاواش ڕاوێژکردن (شورى) لەسەر کۆمەڵی مسوڵمان فەرزەو، دەبێ هەموو کاروبارێکیان بەڕاوێژ بێت، دیارە ئەو هەڵبژاردنانە

(انتخابات)ی کە ئێستاش دەکرێن، هەر پراکتیزە کردنی شووڕان، کە ئەنجوومەنێك هەڵدەبژێردرێ و، ئەوانیش لەشتەکان دەکۆڵنەوەو، دوایی مەسەلەکان دەچنە دەنگدانەوە، ئەوەش جێبەجێکردنی شوورایە، وەشوورا ئەصڵێکی گەورەیەو، هەرکام لەخەلیفە ڕاشیدەکان بەڕاویژ هەڵبژێردراون، ئەوەتا (عبدالرحمن ی کوڕی عەوف) ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لێبێت، پاش کوژرانی (عومەری کوڕی خەتتاب) خوا لێی ڕازی بێت، دەڵێت: پرسم بە ئافرەتانیش کرد و پرسم بەکچانی پشت پەردەش کرد، ئەوکچانەی، کە کەمتر دێنە دەر، پرسم بەهەموویان کرد بۆ هەڵبژاردنی خەلیفەی سێیەم، بەڵێ، لە ئیسلامدا هەموو کەس مافی هەیە، کە بۆ سەرجەم مەسەلەو کاروبارە گرنگەکان پرسی پێ بکرێت و، ڕاویژی پێ بکرێ، ئینجا (عومەر) خوا لێی ڕازی بێت وەك (إبن حجر) لە (فتح الباري) دا هێناویەتی کە (بخاري) لە صەحیحی خۆیدا دەگێڕێتەوە: کە ڕۆژێك بیستی، کە یەکێك گوتبووی: ئەگەر بێتو عومەر بمرێ، بەیعەت بەفلان کەس دەکەم، ئنجا عومەر (رضي الله عنه) ئەم ڕستەیەی گوتوە:

(مَنْ بايع رجلاً من غير مشورة من المسلمين، فلا يُتابَعْ هو ولا الذي بايعه، تغرَّة أن يُقْتَلا)(١).

واتە: هەرکەسێك لەخۆڕا بەیعەتی سەرۆکایەتی بەکەسێك بکات، بەبێ ڕاویژی مسوڵمانان (کە ئەوە ئیشێکی مسوڵمانانە و حەقی خۆیانە، نەك دوو سێ کەس کەین و بەین بکەن و، یەکێك بکەنە گەورەی خۆیان) ئەوە باکەس شوێنی نەکەوێ، چونکە حوکمەکەی کوشتنە، خۆی و ئەوەش، کە بەیعەتی پێکردوە.

کەواتە: نابێت سوڵتە لەمسوڵمانان زەوت (غَصْب) بکرێت، ئیدی دوایی، کە (عەبباسیەکان و ئەمەوییەکان) هاتوون و ئینحرافیان بەحوکمی ئیسلامیی کردوەو، کردوویانە بەمیراتیی، کە ئێستاش ئەو ڕەوتە چەوتە هەر بەردەوامەو، مەلیکەکان هەر باب دەمرێ، کوڕ لەجێگای دادەنیشێ، ئەوە بەڕاستی، هیچ پەیوەندیی بەئیسلامەوە نیەو، شەریعەتی ئیسلام لێی بەرپرسیار نیە و حوکمێکی نەفامییەو، زوڵمە لەسەر ئیسلام حیساب بکرێ.

---

(١) فتح الباري ج١٥ ص١٤٤-١٤٥، وە: صحيح البخاري: ٦٨٣٠.

**بنەمای دووەم: سەروەریی یاسا (سیادە القانون):**

باسەرنج بدەین، داخۆ لەڕوانگەی ئیسلامەوە، یاسا چۆن تەماشا دەکرێت؟! وەك پێشتر باسمان کرد: لەڕوانگەی شەرعەوە، تاکە زاتێك شایستەیی یاسادانانی ڕەها (مطلق)ی هەبێت، وەحەقی دیاریکردنی حەڵاڵ و حەرامی هەبێت، خوای پەروەردگارە، وەك خوا فەرموویەتی:

﴿أَلَا لَهُ ٱلْخَلْقُ وَٱلْأَمْرُ ...﴾ الأعراف -٥٤-.

وە خوای پەروەردگار ڕایگەیاندوە، کە حوکم دوو جۆرە:

أ- حوکمی خوا.

ب- حوکمی نەفامیی.

وەك دەفەرموێ:

﴿أَفَحُكْمَ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ يَبْغُونَ ۚ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ ٱللَّهِ حُكْمًا لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ ﴿٥٠﴾﴾ المائدة: ٥٠.

واتە: ئایا حوکمی نەفامیی دەخوازن، ئایا حوکمی کێ باشترە لەهی خوا، بۆ کەسانێك کەئەهلی یەقین بن؟! ئایا واباشە خوا حوکم دابنێ، کەمرۆڤەکان لە بەرانبەریدا هەموویان یەکسانن و وەك یەکن؟ یاخود مرۆڤێك دایبنێ، یان چینێك دایبنێ، یان قەومێك دایبنێ، کەحەتمەن بەرژەوەندیی خۆی و قەومەکەی، یاخود چینەکەی، یان بنەماڵەکەی، ڕەچاو دەکات و بەرژەوەندیی خەڵکی دیکە، پێشێل دەکات؟! دیارە ئەگەر خوا دایبنێ، مرۆڤەکان هەموویان بۆ خوا وەك یەکن و، زوڵم لەکەس ناکات بۆ کەس، بۆیە دەڵێین: ئەگەر مەبەست لە (یاسا) شەریعەت بێت، وە ئەو یاسایانە بن، کە لە شەریعەتەوە هەڵدەهێنجرێن، لەلایەن زانایانی ئیسلامەوە، ئەوە زۆر لەجێی خۆیەتی و، بێگومان هەر دەبێ شەریعەت سەروەر و باڵا دەست بێت و، لە ئیسلام دا هیچ کەس لەسەرووی شەرعەوە نیە، تەنانەت خەلیفەش، دەبێ لەپێش هەمووکەسدا ملکەچی شەرع بێت.

بەڵام ئەگەر مەبەست لە (یاسا) ئەوە بێت، كە مرۆڤێك دای دەنێ، یاخود كۆمەڵێك، یان حیزبێك دای دەنێ، ئەوە بەتەئكید ئەوەیە كەپێی دەگوترێ: یاسا مرۆڤكردەكان (القوانین الوضعیة)، واتە: ئەوەی كەخەڵك دای دەنێ، بێ ئەوەی پرس بەشەرعی خوا بكات و، لەكاتێك دا كە ئەو یاسایانە لەوجۆرەشن، كە پێویستە پرسی شەریعەتیان تێدابكرێ، حیساب بۆ خوا و پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) و شەرعی خوا بكات، ئەوە بێگومان ئەو بەرنامەو یاسایانە، هیچیان ڕەوایەتیی ئەوەیان نیە، كە مسوڵمانان پابەندبن پێیانەوەو بەقسەیان بكەن، نەك ڕەوایەتییان نیە، بەڵكو هەر كەسێكیش ئەو یاسایانە، وەك بەرنامەو قانوونێك تەماشا بكات، كەپێویستە پەیڕەوییان لێ بكرێ، لە كاتێكدا پێچەوانەو دژی ئایینی خوان، ئەوە كافر دەبێ، چونكە مافی بەجگە لە خوا داوە، كە حەڵاڵ و حەرامی بۆ دیاریی بكات.

بەڵام ئەگەر وا تەماشای نەكات كە لەسەری پێویستە، ئەوە پێی كافر نابێت، مادام بێ دەستەڵاتەو ئەو بەرنامەو سیستمەش باڵادەستە.

**وە پێویستە بزانرێ:**

كە ئەو حوكمە تایبەتە بەبواری حەڵاڵ و حەرام و سنوورەكانی شەریعەتەوەو، بوارەكانی ئیداریی و هونەریی و زانستیی ڕووت، كە دەقەكانی قورئان و سوننەت، كەمتر باسیان لێوە كردوون و، خوای پەروەردگارو كاربەجێ بۆ عەقڵ و ئەزموونی ئینسان و گۆڕانكاریی و بەرەو پێش چوونی ژیان و گوزەرانی بەجێهێشتوون، ئەوانە حوكمیان جیایەو، ئەسڵ تێیاندا ڕەوایی (مباح)یەو[1]، مەگەر پێچەوانەو دژی دەقێكی شەریعەت بن، ئەگەر نا، نەك هەر قەدەغە نین، بگرە زۆر جاران لەسەر مسوڵمانان فەرزیش دەبێ، كەهەرشتێك سوودو كەڵكی كۆمەڵگای تێدایە، لەهەر كەسێك و هەر سەرچاوەیەكەوە بێت وەری بگرن!

---

(١) بڕوانە: أصولُ الفقه المهمه، عبدالرحمن بن ناصر السَّعدی، ص ١٠٥، ١٠٦، كە ئەم بنچینەیەی هێناوە: (الأصل في العبادات: الحَظْرُ، الاّ ماورد الشارع تشریعُهُ، والأصل في العادات: الإباحة الاّ ماورد عن الشّارع تحریمُهُ) واتە: بناغە لە خواپەرستییەكان دا قەدەغەبوونە، جگە لەوەی شەرعدانەر دایناوە، وە بناغە لەهەڵس و كەوتەكان و عادەتەكان دا، ڕێ پێدرانە، جگە لەئەوەی شەرعدانەر قەدەغەی كردبێ.

**بنەمای سێیەم: مافەکانی مرۆڤ و ئازادییە گشتییەکان:**

ئەمەش کە بنەمای سێیەمی گرنگی دیموکڕاسییە، شەریعەتی خوا (تبارك وتعالى) دابین کردنی ماف و ئازادییەکان بۆ سەرجەم هاوولاتییان، بەگەورەترین ئەرکی سەرشانی حوکمڕان و دەوڵەتی ئیسلامیی دەزانێ و، لەسەر دەوڵەتی ئیسلامیی فەرزە، کە ماف و ئازادیی و کەرامەتی تەواو، نەك تەنها بۆ مسوڵمانان، بەڵکو بۆ سەرجەم هاوولاتییان دابین و مسۆگەر بکات.

**بەڵام شەریعەتی خوا وێڕای ئەوە، سێ ئیمتیازی گرنگیشی بەسەر دیموکڕاسی و، سەرجەم سیستمەکانی دیکەی حوکمڕانیی دا هەیە:**

**١- دیاریی کردنی میکانیزم بۆ چۆنیەتی دابین کردنی ماف و ئازادییەکان:**

بۆ ئەوەی (مافەکانی مرۆڤ و ئازادییە گشتییەکان) تەنها شیعاری بێ کردارو دروشمی بێ نێوەڕۆك و تیۆریی نەبن، چونکە بێگومان گرنگ قسەی خۆش کردن نیە، بەڵکو پراکتیزە کردن و بەرجەستەکردنە لەمەیدانی واقیع دا، کەخێرێ بداتەوە و بەهرەی لێوەربگیرێ، بەڵێ بۆ ئەوە: ئیسلام وێڕای بەرزکردنەوەی ئەو بەیداغەی داکۆکیی کردن لەسەر کەرامەت و ئازادیی ئینسان و، دابین کردنی مافەکانی، زۆر بەوردیی چۆنیەتی هێنانەدیشیانی دیارییکردوە، بەوجۆرە: هەر لەحوکمڕان و میللەت (الحاكم والمجتمع)ەوە، کە چ ئەرك و مافێکیان بەرانبەر بەیەکدی هەیەو لەسەر شانە، هەتا دراوسێ، لەگەڵ دراوسێ و باب و دایك لەگەڵ ڕۆڵەو ...هتد، بەدەق (نص)ی قورئان و سوننەتی ڕوون و ئاشکرا، ڕوون کردوونەتەوە.

**٢- دانانی پشتیوانە (ضمانة)ی جۆراو جۆر بۆ پارێزران و جێبەجێ کردنیان:**

بەڵێ، شەریعەتی خوای کاربەجێ، وێڕای میکانیزم و شێوەی جێبەجێکردن، هاندەرو سەنەدو پشتیوانەی جێبەجێکرانی ماف و ئازادییەکانیشی ڕەچاوکردوە، کە دەتوانین بەگشتی ئەو پشتیوانانە (ضمانات) لەدووشتان دا کورت بکەینەوە:

**أ- پشتیوانەی مەعنەویی (الضمانة المعنوية):** کەپاش ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی، لەپەروەردەکردنێکی ڕاست و دروست دا خۆی دەنوێنێ، کەسەرجەم ئەندامانی کۆمەڵگا لەو ڕاستییە مەزنە تێدەگەیەنێ و شارەزا دەکات، کەئینسان - وەك ئینسان - خاوەنی ڕێزوحورمەت و مەقامێکی بەرزە، چونکە خوای کاربەجێ ڕێزی لێناوە:

﴿ وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِيٓ ءَادَمَ ﴾ الاسراء: ٧٠.

وە لەسەر زەوی بەخەلیفەی داناوە:

﴿ وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي ٱلْأَرْضِ خَلِيفَةً ﴾ البقرة: ٣٠.

وە بێگومان ئینسانەکان، هەتا وەك بۆ مرۆڤێکی بەدانستە خوڵقێنراو و لەلایەن فریشتانەوە سەجدە بۆ براوو، ئاوەدان کردنەوەی سەرزەمین پێ سپێرراو، شایستەیە:

﴿ هُوَ أَنشَأَكُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ وَٱسْتَعْمَرَكُمْ فِيهَا ﴾ هود: ٦١.

تەماشایان نەکرێ و، مامەڵەیان لەگەڵ نەکرێ و، سەرجەم پێداویستییەکانی ژیان و گوزەرانێکی پڕ ڕێزو حورمەتانەی ڕاستەقینەیان بۆ دابین نەکرێ، ناتوانن ئەرکی خەلیفایەتی، سەر زەوی و ئەرکی تاقیکرانەوە (إبتلاء) جێ بەجێ بکەن، کەحیکمەتی خوڵقێنران و، فەلسەفەی ژیانی سەر زەوییانە!

**ب- پشتیوانەی ماددیی:** کەئەمیش لەو سزاو سنوورە شەرعییانەدا خۆی دەنوێنێ، کە هەم لە ژیانی دنیاداو، هەم لە ژیانی دواڕۆژیش دا، بەرۆکی ئەو کەسانە دەگرێ، کە قەدەغەکانی خوا دەشکێنن و، سنووری مافەکانی ئینسانەکان دەبەزێنن، وەشەریعەت حەوت جۆرە سزاو تۆڵەی سەخت و سامناکی دنیایی داناون، بۆ هەر کەسێك کەیەکێك لە حەوت شتە پێویستەکان (الضروريات السَّبع)ی خەڵکی پێشێل دەکەن، کە بریتین لە: دین، ژین، وەچە (نسل)، ئابڕوو (عرض)، عەقڵ،ماڵ، ئاسایش (الأمن)[1].

---

(١) کە هەرکام لە ئاڵقەی یەکەم و دووەم دا، تاڕاددەیەك تیشکمان خستەسەریان، وە لەکتێبی: [ئیسلام و دەوڵەتداریی] بەرگی دووەم و، کتێبی: [الإسلام كما يتجلّى في كتاب الله]

بەڵێ، لە ژێر سایەی کیان و دەوڵەتێکی ئیسلامیدا، پێویستە هەرکام لە هاووڵاتییان، هەرکام لەو حەوت شتە گرنگ و گەورانەیان پارێزراوبن، بۆیە شەریعەت سزایەکانی: هەڵگەڕانەوە، کوشتنەوە (قصاص)، داوێن پیسیی، بوختان کردن (قذف)، مەیخۆریی، دزیی، ڕێگرییکردن، بەئەرکی گرنگی سەرشانی دەوڵەتی ئیسلامیی، بۆ شکێنەرانی قەدەغەکانی خواو پێشێل کەرانی ماف و کەرامەت و ئازادیی بەندەکانی خوا، دەزانێ.

**٣- دیارییکردنی چوارچێوەی بۆماف و ئازادییەکان:**

وەك پێشتریش باسمانکرد، ئەگەر بێت و بەرەهایی و بەبێ بەندو مەرج (بصورة مطلقة وبدون قيد وشرط) ماف و ئازادییەکان بەخەڵکی بدرێن، وەك ئەوە وایە بزنی شاخدارو مەڕی بێ قۆچ تێکەڵ بکرێن و، تێك بەر بدرێن و، پێیان بگوترێ: هەموو لایەکتان ئازادن، یان ماسی گەورەو هی گچکەو، شێرو پڵنگ و، ئاسك و ڕێوی، بەناوی ئازادییەوە بەر بدرێنە یەکدی! کە بێگومان لەو حاڵەتەدا سەرەنجام و ئاکامی ئەو جۆرە ئازادکران و، مافی وەك یەك پێدران و یەکسانییە، زۆر ئاشکرایە!!

**بۆیە لەئیسلامدا جوغزو سنووری ڕوون، بۆ هەرکام لە ماف و ئازادییەکانی خەڵکی کێشراوە، بابۆ ڕوونبوونەوەی مەبەست، چەند نموونەیەك بێنینەوە:**

**یـــەك:** لەڕووی ئابووریی و مامەڵەو بازرگانییەوە: خوای دادگەر فەرموویەتی:

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَأْكُلُوٓا۟ أَمْوَٰلَكُم بَيْنَكُم بِٱلْبَـٰطِلِ إِلَّآ أَن تَكُونَ تِجَـٰرَةً عَن تَرَاضٍ مِّنكُمْ ﴾ النساء: ٢٩.

واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! بەناهەق ماڵ و سامانتان لەنێوان خۆتاندا مەخۆن، مەگەر بازرگانییەك بێت، لەڕووی ڕەزامەندییتانەوە.

---

المجلد السابع، دا، بەدرێژیی لەبارەیانەوە دواوین.

هەروەها فەرموویەتی: ﴿ وَأَحَلَّ ٱللَّهُ ٱلْبَيْعَ وَحَرَّمَ ٱلرِّبَوٰاْ ﴾ البقرة: ٢٧٥.

واتە:...وە خوا کڕین و فرۆشتنی حەڵاڵ و، سوود خۆریی قەدەغە کردوە.

وەفەرموویەتی:

﴿ فَلَكُمْ رُءُوسُ أَمْوَٰلِكُمْ لَا تَظْلِمُونَ وَلَا تُظْلَمُونَ ﴿٢٧٩﴾ ﴾ البقرة: ٢٧٩

واتە: با دەستمایەکانتان هی خۆتان بن، نەستەم بکەن و، نە باستەمیشتان لێ بکرێ.

وەك لەو ئایەتە بەپێزانەدا دەبینین، شەریعەتی خوای دادگەر (سبحانه وتعالى) سنوورەکانی نێوان ماڵ و سامان پەیداکردنی حەڵاڵ و حەرامی، دیاریی کردوون و، مامەڵەو بازرگانیی شەرعییانەی بەڕەواو، سوودخۆریی و کەسابەتی ناشەرعییشی بەناڕەوا داناوە، وە لەهەمان کاتدا کە دانی بەوە داهێناوە، ئینسان خاوەنی سەرمایەو ماڵ و موڵکی خۆیەتی، ئەوەشی فەرمووە، کە نابێ بەو سەرمایەو ماڵ و موڵکە، زوڵم و ستەم لەخەڵکی بکرێ و بچەوسێنرێنەوە، کە بێگومان سوودخۆریی، پیسترین جۆری ستەم و زوڵمی ئابووریی و چەوساندنەوەی خەڵکیە، چونکە ئابووریی زانەکان دەڵێن: بەهۆی ڕیباوە، وردە وردە بەشێوەیەکی هەرەمیی، ماڵ و سامان لەدەستی دەوڵەمەندە سوود خۆرەکان دا، کەڵەکەو پەزمەندە دەبێت و، ڕۆژ بۆ ڕۆژێ ژمارەی نەدارەکان زیادو، ئاستی دەخل و دەرامەتیان نزمترو، ژمارەی دەوڵەمەندەکان کەمترو، ڕێژەی سەرمایەیان پتر دەبێت، وە ئێستا (٢٠٪)ی خەڵکی سەرزەوی، کە بە زۆریی لەڕۆژئاوان، خاوەنی (٨٠٪)ی دەرامەت و پارەی دنیان و، (٨٠٪)ی خەڵکیش، کە بەزۆری لەئاسیاو ئەفریقیاو ئەمەریکای خواروون، خاوەنی (٢٠٪)ی پارەو دەرامەتی دنیان! واتە: پێچەوانەی ئەوە کەخوای دادگەر فەرموویەتی:

﴿ كَيْ لَا يَكُونَ دُولَةًۢ بَيْنَ ٱلْأَغْنِيَآءِ ﴾ الحشر: ٧.

واتە: بۆ ئەوەی ماڵ و دارایی لەدەستی دەوڵەمەندەکانتاندا کورت هەڵنەیەت و پەزمەندە نەبێ.

**بەكورتیی:**

وێڕای ئەوە كە شەریعەت مامەڵەو بازرگانیی و هەموو جۆرە كاروكاسبییەكی ڕەوای بۆ پەیداكردن و، وە دەست هێنانی ماڵ و سامان بەشەرعیی زانیوە، سەرجەم شێوەو شێوازە خراپ و زیانبەخشەكانی وەك: سوودو قومارو دزیی و ڕێگریی و زەوتكردن ..هتدی قەدەغەكردوە، بۆیە ئیسلام بەپێچەوانەی دیموكڕاسییەوە، هەرچەندە (ماف)و (ئازادیی) ماڵ و سامان پەیداكردنی بۆ ئینسان دابین كردوە، بەڵام شیرازەو سنوورێكی بۆ دیاركردوە، بەشێوەیەك كە سەرنەكێشێ بۆ زەرەرو زیان گەیاندن بەخەڵكی.

**دوو:** لەڕووی تەعبیرو بیروڕا دەربڕینەوە: هەرچەندە شەریعەت ئینسانەكانی ئازاد كردوە و، مافی ئەوەی پێداون كە تەعبیر لە بیرو بۆچوون و هەست و نەست و هەڵوێستی خۆیان بكەن، بەڵام بەپێچەوانەی دیموكڕاسییەوە، بەبیانووی ماف و ئازادیی دەربڕینەوە، ڕێی نەداوە كە ئینسان جنێوو قسەی ناشیرین بەخەڵكی بڵێت و، چی پێخۆش بوو بیڵێت، یان پاشملەو بەبێ پاساوی شەرعیی زەم و غەیبەتی ئەم و ئەو بكات، چونكە ئیسلام دەڵێ: هیچ جۆرە ماف و ئازادییەك نابێ لەسەرحیسابی بەرژەوەندیی و كەرامەتی خەڵكی دیكە بێت، لە سۆنگەی ئەوەوە، كە وەك چۆن تۆ مافی ڕادەربڕینت هەیە، خەڵكیش مافی هەست و نەست پارێزرانی هەیە، بۆیە قسە گوتن بەعەقیدە و موقەددەساتی خەڵكی، پێشێل كردنی گرنگترین مافیانەو، ئەوەش حەڕامە، هەربۆیەش خوای پەروەردگار، تەنانەت قسە پێگوتنی بیروبڕوا و موقەددەساتی كافرو موشریكەكانیشی قەدەغە كردوە:

﴿ وَلَا تَسُبُّواْ ٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ ﴾ الأنعام: ١٠٨.

**بنەمای چوارەم: لەیەك جیاكردنەوەی دەسەڵاتەكان:**

ئەمیش لەشەریعەتی ئیسلامییدا هیچ ئیشكالێكی تێدانیەو، بەكردەوەش بەدرێژایی مێژووی دەڵەتی ئیسلامیی، هەرسێك دەسەڵاتی یاسادانان (تشریع) و جێ بەجێ كردن (تنفیذ)و دادوەریی (قضاء)لەیەك جیاكراونەتەوە، چونكە:

جارێ هەرچی یاسادانان (تشریع)ە، وەك پێشتریش باسمان كرد، ئەوە لە ئەسڵ دا، تەنهامافی خوای بێ وێنەو هاوەڵە (تبارك وتعالی) كەبەرنامەو یاسا بۆ بەندەكانی دابنێ و، حەڵاڵ و حەرامیان بۆ دیاریی بكات، پاشان پێغەمبەری خواش (صلی الله علیه وسلم) هەم لەرێی وەحی و هەم لە رێی ئیجتیهادەوە، بەئیزن و فەرمانی خوا، مافی یاسادانانی هەیە، كە دیارە یاسادانانێكی سەربەخۆو رەها (تشریع مستقل ومطلق) نیە، ئنجا دوای پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) پێشەواو زانایانی ئیسلام، بەفەرمان و ئیزنی خواو پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) و، لەبەر رۆشنایی قورئان و سوننەتدا، رێی ئیجتیهادو فەتواو یاسادانانێكی جوزئیی و مەرجداریان پێدراوە.

كەواتە: یاسادانان و دەسەڵاتی یاسادانان لە ئیسلامدا، هەر بەسروشت سەربەخۆو جیایە، لەهەردوو دەسەڵاتی: جێ بەجێكردن و دادوەریی.

پێویستە ئەوەش بزانرێ، كە مەبەست لەئیجتیهادی زانایان، تەنها زانایانی شەرعزان (الفقهاء) نیە، بەڵكو سەرجەم شارەزاو پسپۆران لەهەموو بوارو لایەنەكانی ژیاندا، نەك هەر بۆیان هەیە، بەڵكو لەسەریشیان پێویستە، كە هەركەسە لەبواری پسپۆریی (تخصّص)ی خۆیدا، چۆن باشتر ئیسلام پیادە دەبێت و، ژین بەرەو پێشەوە دەچێت، عەقڵ و بیرو هۆشی خۆیان ماندوو بكەن و، بیرو بۆچوون و یاساو بریاری تازە بابەت و پێویست بخەنە روو.

ئنجا دەسەڵاتی جێبەجێكردن (السلطة التنفیذیة)یش جیایە لەدەسەڵاتی یاسادانان و، دادگاش، هەرچەندە دەسەڵاتی جێبەجێكردن لەكەسی یەكەمەوە (خلیفة، أمیر المؤمنین، سلطان، سەرۆك...) هەتا خوارێ، هیچ كەس بۆی نیە بەموو لە بڕیارەكانی شەریعەت و زاناو شارەزایان لابدات و سەرپێچیی بكات.

پاشان دەستەڵاتی دادگا (سلطة القضاء)یش بە درێژایی مێژووی ئیسلام، سەربەخۆیی (إستقلالية)ی خۆی پاراستوەو، نەکەوتۆتە ژێر ڕکێفی دەستەڵاتی جێبەجێکردنەوە، بەڵکو بەپێچەوانەوە: دادگا لەئیسلام دا هەموو حوکمڕانەکان و هەڵس و کەوتەکانیانی، خستۆتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە، هیچ کەس - تەنانەت خەلیفەش - لەوە گەورەتر نەبووە، کە لەکاتی پێویست دا، قاچی نەتوانێ دادگایی بکات.

بەڵێ، ئەوەندەی لەئیسلامدا ڕێزی سوڵتەی قەزایی گیراوە، هیچ دەستەڵاتدارو حوکمڕانێك جورئەتی نەکردوە دەست وەربداتە کاروباریەوە، لە ژێر سایەی هیچ کیان و دەوڵەتێکی دیکەداو، لە چوار چێوەی هیچ سیستەمێکی حوکمڕانیی دیکەدا، ئەو حاڵەتە نەبووە.

**بە پێویستی دەزانم کە لەو بارەوە تەنها دوو نموونە بێنمەوە:**

١- یەکەمیان لە ژیانی عومەری کوڕی خەتتابدا خوا (لێی ڕازی بێ)، لەکاتێك دا کە دووەمین خەلیفەی مسوڵمانان بووە: ڕۆژێکیان عومەر (رضي الله عنه) دەیەوێ ئەسپێك لەکابرایەکی خێڵەکیی (أعرابي) بکڕێ و، ئەسپەکەی لێ وەردەگرێ و، ماوەیەك بۆ جەڕباندن غارغارێنێ پێ دەکات و دەیهێنێ و دەیبات، پاشان لەمیانەی ئەوەدا، ئەسپەکەی عەیبێکی لێ پەیدا دەبێ و، بەکابرای ئەعرابیی دەڵێ: ئەسپەکەت عەیبدارەو نامەوێ! کابراش دەڵێ: کاتێك تەسلیمی تۆم کرد، عەیبی نەبوو، بۆیە لەسەر ئەوە دەبێتە کێشەو مشت و مڕیان و، بۆ یەکلاکردنەوەی کێشەکەیان، دەچنە لای قازی (شُرَیح)، کە پیاوێکی زۆر زاناو دادگەر بووە، ئنجا کاتێك بەسەرهاتی کێشەکەیانی بۆ دەگێڕنەوە، شورەیح بەخەلیفە دەڵێ: یەکێك لە دوو ڕێیان هەڵبژێرە:

یان ئەسپەکەی لێ بکڕە، بەو نرخەی کە ئەسپێکی ساغی شێوەی ئەم ئەسپەی پێ دەکڕێ، یان چۆنت لێ وەرگرتوە، ئاوا تەسلیمی بکەوە!

بەوجۆرە قازی شورەیح، حوکم بەسەر خەلیفەی مسوڵمانان دا دەدات، بەقازانجی کابرای ئەعرابیی! دیارە عومەریش (خوا لێی ڕازی بێ)، بەبێ هیچ مشت و مڕێك، مل بۆ حوکمی قازی کەچ دەکات[1]!

---

(١) بڕوانە: (تأريخ القضاء في الإسلام)، للشيخ عرنوس، ص٣١، وە: (النظام السياسي

٢- نموونەی دووەم لەژیانی عەلی کوڕی ئەبوو تالیب دا خوا (لێی ڕازی بێ)، لەکاتێکدا کە چوارەمین خەلیفەی مسوڵمانان بووە: ڕۆژێکیان لەکاتێکدا، کە عەلی (خوا لێی ڕازی بێ) لە جەنگی (صفین) دەگەڕێتەوە، لەنێو بازاڕی (کوفە)دا زرێ (درع)ێکی لێ دەکەوێتە خوارێ و، جوولەکەیەك زرێیەکەی هەڵدەگرێتەوە [زرێ شتێکە لەبەریان کردوە، بۆ ئەوەی شمشێرو تیر نەیانبڕێ، بەرگێکی ئەڵقە ئەڵقەیی لە ئاسن چنراو بووە] ئنجا جوولەکەکە هەڵی دەگرێتەوە، عەلی (خوا لێی ڕازی بێت) دەڵێ: ئەو زرێیە هی منە، جوولەکەکەش دەڵێ: نەخێر هی تۆ نیە، وە جوولەکەکە دەڵێ: بابچین بۆ لای قازی، کە دەچن ئەوکاتەش هەر (شریح) قازی دەبێت، بەسەرهاتەکەی بۆ دەگێڕنەوە، قازی بە(عەلی) دەڵێ: ئەمیری مسوڵمانان! کێ شاهێدتە، کە ئەو زرێیە هی تۆیە؟ عەلی دەڵێ: حەسەنی کوڕم، قازی دەڵێ: بۆ خۆت دەزانی شاهێدیی کوڕ بۆ باب ناشێ، دەڵێ: (سبحان الله) پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی:

(الحسن والحسين سيدا شباب أهل الجنة).

واتە: گەورەی گەنجەکانی ئەهلی بەهەشت (حسن و حسێن)ن، قاضی پێی دەڵێ: ئەوە پلەو پایەیەکە بۆ قیامەتێ، بەڵام بۆ دنیایە دوو شاهێدی دیکە بێنە، ئەگەر نا زرێیەکە دەدەم بەکابرای جوولەکە، چونکە شەرع دەست دەناسێ!

ئەویش دەڵێ: هیچ شاهێدی دیکەم نیە، قازیش دەڵێ: دەمادام شاهێدت نیە، زرێیەکە هی جوولەکەکەیە! جوولەکەکەش یەکسەر شایەتمان دێنێ و دەڵێ: وەڵڵاهی ئەوە حوکمی پێغەمبەرانە!

خەلیفەی مسوڵمانان لەگەڵ جوولەکەیەك، کە هاووڵاتییەکە ئیمانیشی نیە بەشەریعەتی ئەو وڵاتە، دەچێتە لای (قازی)و قازیش حوکم بەسەر خەلیفەدا دەدات و، دەشزانێ کە ڕاستیش دەکات، بەڵام لەبەر ئەوەی، کە بەپێی قانوون و، بەپێی بەڵگەی قەزائیی، بەڵگەی بەدەستەوە نیە، حوکمی بەسەردا دەدات!![1]

الإسلامي) للدكتور منير البياتي ص٢٦٩.

(١) بڕوانە: (البداية والنهاية) لابن كثير، ج٨ ص٤.

ئنجا لەکۆتاییدا بابزانین چ ئەنجامێکمان دەست دەکەوێت لەو توێژینەوەیەی، کە کردمان دەربارەی دیموکڕاسی؟! بەکورتیی لەم چەند خاڵەدا ئەنجامی ئەم بابەتەمان دەخەمەڕوو:

**یەکەم: هەڵسەنگاندنی شتەکان بە دادگەریی:**

پێویستە خوشك و برایانی ئیسلامییمان هەموو کاتێك و لەبەرانبەر هەڵسەنگاندنی هەرشتێك، هەر بیرۆدۆزەیەك، هەر قسەیەکی هەر کەسێکدا، دادگەرو بە (إنصاف) بن، هەرچەندە خەڵکێك زۆر جاران لەگەڵمان دا، بێ ویژدانەو، دەڵێ: ئیسلامییەکان هەڵەو خراپن و وان و وان و، هیچ خێرێکیان پێوە نیەو، هەموو شتێکیان هەڵەیە!! کە بێگومان ئەوە بێ ویژدانییە، بۆیە بائێمەش وانەبین، چونکە بەڕاستی ئینصاف زۆر شتێکی باشەو، ئینسان لەگەڵێك هەڵوێستی وا دەپارێزێ، کەمایەی عەیبداریی و گوناحبارییین، وە لەبارەی دیموکڕاسیەوە، من دەڵێم: دیموکڕاسی چاکی نێو خراپانە، وەك کوردەواریی خۆمان دەڵێن: (لەچاو شلان پەیتە)، چونکە دیموکڕاسی، ئەگەر بەراوردی بکەی لەگەڵ دیکتاتۆریی دا، ئنجا دیکتاتۆرێتیی پرۆلیتاریا بێت، یان هەرجۆرە دیکتاتۆرییێکی دیکە بێت، وە ئەگەر بەراوردی بکەی لەگەڵ (سیۆکڕاسیی)دا [کەهەندێ کەس بەهەڵە حوکمی ئیسلامیی لەگەڵ (سیۆکڕاسی) (الثیوقراطیة)دا تێکەڵ دەکەن، سیۆکڕاسیی ئەو حوکمە بوو، کەلە سەدەکانی نێوەڕاستدا لەئەورووپادا باو بوو، کە (پاپا) یان (ئیمپڕاتۆر) بەناوی خواوە حوکمی دەکردو دەیگوت: من خەلیفەی خوام و، سێبەری خوام لەسەر زەوی، بەڵام لە ئیسلامدا حوکمی سیوکڕاسیی نیە، چونکە لە ئیسلام دا حکوومەت مەدەنییەو خەڵك (حاکم)ەکان هەڵدەبژێرێ و، خوای دادگەر کەسی دیاریی نەکردوە، بەڵکو خوای پەروەردگار، تەنها پێغەمبەرانی ناردوون (علیهم الصلاة والسلام)، دیارە پێغەمبەرانیش هەتا خەڵك ئیمانی پێ نەهێنابن و، تا جەماوەریان لەگەڵ دا نەبوبێت، جاڕی حوکمی ئیسلامییان نەداوە، ئەگەر نا، لە پێغەمبەران بترازێ (علیهم الصلاة والسلام) هەموو خەلیفەو دەستەڵاتدارە شەرعییەکان، خەڵك هەڵی بژاردوون، وە حوکمڕانانێك بیانەوێ شەرعییەتیان هەبێ، دەبێت گەل هەڵیان بژێرێ].

ئنجا ئەگەر بەدیلی دیموكڕاسی دیكتاتۆریی و سیۆكڕاسیی و ئیرستۆكڕاسیی و ئەو شتانە بێ، ئەوە بەتەئكید دیموكڕاسی لە چاو ئەوان بە حەوت ئاوان شۆڕاوەتەوەو، ئەوان زۆر لەدیموكڕاسی خراپترن!

ئنجا ئێمە بۆ نرخاندن و هەڵسەنگاندنی دیموكڕاسی و هەرجۆرە ڕێچكەو بیرۆدۆزەیەكی دیكەش، دەبێ وریا بین و هەق و ناهەق تێكەڵ نەكەین، دادگەرانە لە بێژینگی بدەین و (كا) و (دان)ی لەیەك جیا بكەینەوەو، بۆ ڕاست و هەق، حیسابی هەق و، بۆ هەڵەو ناهەقیش، حیسابی ناهەق بكەین، باسەرنج بدەین: چۆن خوای كاربەجێ و دادگەر ڕووی دواندن (خطاب) لەئەهلی كیتاب دەكات و، لەسەر ئەوە سەرزەنشتیان دەكات، كە بۆچی هەق و ناهەق تێكەڵ دەكەن؟! دەفەرموێت:

﴿ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ لِمَ تَلْبِسُونَ ٱلْحَقَّ بِٱلْبَٰطِلِ ﴾ آل عمران:٧١.

یان دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَلْبِسُواْ ٱلْحَقَّ بِٱلْبَٰطِلِ ﴾ البقرة: ٤٢.

واتە: وە هەق و باطیل تێكەڵ مەكەن، موشكیلەی بیردۆزەو ڕێچەكەكان ئەوەیە، كە چاك و خراپ تێكەڵ دەكەن، حەق و باطیل تیكەڵ دەكەن، بەڵام ئێمە پێویستە هەم هەقەكەیان ببینین، وە هەم باطیلەكەشیان ببینین، خوای دادگەر دەفەرموێت:

﴿ وَلَا يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَـَٔانُ قَوْمٍ عَلَىٰٓ أَلَّا تَعْدِلُواْ ۚ ٱعْدِلُواْ ﴾ المائدة: ٨.

واتە: با ڕق هەڵسانتان لەكۆمەڵێك، واتان لێنەكات كە نادادگەربن.

ئیسلام ئاوا شوێن كەوتوانی خۆی ڕادەهێنێ، نەك بڵێی: فلان كەس! تۆ هیچ شتێكت بەكەڵك نایەت!! ئەوە حوكمێكی عاتیفییە، چونكە هیچ كەسێك نیە، هیچ شتێكی بەكەڵك نەیەت و، هیچ فیكرەیەك نیە، هیچ شتێكی باشی تێدا نەبێت، بۆ نموونە: (سۆسیالیزم) كەبۆ خۆی لە كاردانەوەی سەرمایەداریی (كاپیتالیزم)دا پەیدا بوو و، لە كاردانەوەی چەوساندنەوەی چینی كرێكاردا

سەری هەڵدا، چۆن هیچی بەکەڵك نایەت؟!! بێگومان شتی باشی تێدایە، بەڵام فەلسەفەکەی و کرۆکەکەی بەکەڵك نایەت، هەروەها دیموکڕاسییش، فەلسەفەکەی و کاکڵەکەی بەکەڵك نایەت، کە بریتیە لەوەی دیارییکردنی حەڵاڵ و حەڕام، دەداتە دەست خەڵك! کە ئەوە پیسترین و خراپترین لایەنی سەلبیی دیموکڕاسیە، کە لە ئەنجامی ئەوەدا چی ڕوو دەدات؟

**نموونەیەك دێنمەوە:** لەهەموو دنیادا باوە، بۆیە لێرەش باسی بکەین شتێکی سادەیە، کە لە پەرلەمانەکانی ئەورووپادا موناقەشە دەکرێت و، لەسەر (تەلەفزیۆن)ەکان بانگەشە دەکرێ، کەخێزانی یەك ڕەگەزیی دروست بکەن، یانی: پیاوێك و پیاوێك ببنە هاوسەری یەکدی، یان ئافرەتێك و ئافرەتێك!! ئا ئەوە لەپەرلەمان دا قەرار دەدرێ!! دیارە وەختێك حەڵاڵ و حەڕام دیاریی کردن و بەها دیاریی کردن، عایدی میللەت بێت، ئەومیللەتە چۆنی پێ خۆش بوو، وا دەکات و (کلنتۆن) کاتی خۆی وەك هەمووتان ئاگادارن، بۆ (پڕوپاگەندەی هەڵبژاردن) نێربازیی بە ڕەوا دانا لەنێو سوپای ئەمریکیی دا، بۆ ئەوەی دەنگی زیاتر بێنێ!! تەماشا بکەن! مرۆڤ کەخوای نەناسی، وە کە پەیوەست نەبوو بەحەڵاڵ و حەڕامێکەوە، کە خوا دایناون، دیارە چۆن ئارەزووی بێت وا دەکات، ئەگەر بڵێن: نێربازیی پێویستە، بۆ ئەوەی دەنگی زیاتر وەدەست بێنی، ئەوە ڕەوای دەکات، وە ئەگەر بڵێن: (سوود) ڕەوا بکەن، بۆ ئەوەی سەرمایەدارەکان خۆشیان بوێی، وا دەکات، وە ئەگەر قازانج لەوەدا بێت، کە بەبێ بەڵگە (قودس) بەپایەتەختی قەوارەی (ئیسرائیل) دابنرێت (ئاخیر پێم ناڵێی: کۆنگرێسی ئەمەریکیی، چ پەیوەندیی هەیە بەوڵاتێکی دیکەوە؟) ئەوە لەوێ ڕا، قودس بەپایتەختی قەوارەی جوولەکە دیاریی دەکات، بۆ ئەوەی (لۆبی) جوولەکە لەخۆی ڕازی بکات!!

## دووەم: شووڕای ئیسلامیی، یەکسان نیە بەدیموکڕاسی:

بەداخەوە هەندێك خەڵكی ئیسلامیی وا حاڵی بووە، کە شووڕای ئیسلامییش هەر دیموکڕاسییە!! بەڵام بێگومان شووڕای ئیسلامیی، لەگەڵ دیموکڕاسی زۆر جیایە، چونکە شووڕا لەئیسلام دا، ئەوەیە کەمسوڵمانان ڕاوێژ دەکەن و پرس و ڕا بەیەکدی دەکەن و لێدەکۆڵنەوە، بەڵام هەمووی لە چوارچێوەی شەریعەتداو، لەبەر تیشکی (قورئان و سوننەت)دا، نەك شەریعەت لەولا دابنێن و، گوێی پێ نەدەن، ئنجا بە کەیفی خۆیان حەڵاڵ و حەرام دیاریی بکەن!

هی وا هەیە دەڵێ: میللەتێکی مسوڵمان، ئەگەر دیموکڕاسی جێبەجێ بکات، خۆ هەر دەبێ بەپێی شەریعەت بێت! ئێمەش دەڵێین: ئاخر ئەوکاتە پێی ناگوترێ: دیموکڕاسی، یەکێك لەوانە (دکتۆر یوسف القرضاوي)، کەمن ڕێزم بۆی هەیە و، بەڕاستی نووسەرێکی بلیمەتەو زانایەکی گەورەی ئیسلامە، خوا پاداشتی بداتەوەو، کتێبی زۆر بەسوودی هەن، بەڵام بەڕاستی لەمەسەلەی دیموکڕاسی دا، پێم وایە بەهەڵەدا چووە، بۆ وێنە: لەکتێبێکی دا بەناوی (من فقه الدولة في الإسلام)، دەڵێت:

[إن جوهر الديمقراطية بعيداً عن التعريفات والمصطلحات الأكاديمية: هو أن يختار الناسُ مَنْ يحكمهم ويَسُوسُ أمرهم. وألاّ يُفْرض عليهم حاكم يكرهونه، أو نظامٌ يكرهونه، وأن يكون لهم: حق مُحاسبة الحاكم إذا أخطأ، وحق عَزْلِهِ وتغييره اذا انحرف..][1]

واتە: کاکڵی دیموکڕاسیی دوور لەپێناسەکان و زاراوە ئەکادیمییەکان، ئەوەیە: کە خەڵك ئەوکەسە کە حوکمڕانیانە و سەرپەرشتییان دەکات، خۆیان هەڵیبژێرن، وە کە: حوکمڕانێك و سیستەم و بەرنامەیەکیان بەسەردا نەسەپێنرێ، کە حەزی لێناکەن. وە کە: مافی لێپرسینەوەی حوکمڕانیان هەبێ، هەرکات هەڵەی کرد، وە مافی لادان و گۆڕینییان هەبێ، هەرکات لاڕێ بوو.

---

(١) بڕوانە: (من فقه الدولة في الإسلام) ص٣٢.

پاشان بینا لەسەر ئەوەی ڕابرد، گوتوویەتی:

[الواقع: إن الذي يتأمَّلُ جوهر الديمقراطية، يَجِدُ أنه من صميم الإسلام][١].

واتە: لەواقیع دا هەرکەس سەرنجی جەوهەری دیموکڕاسی بدات، دەزانێ کە لەنێوەڕۆکی ئیسلامە.

بەڵام ئێمە لەوەڵامدا دەڵێین: بەڵێ، ئەو شتانە هەندێك میکانیزمی دیموکڕاسیین و، لەخودی خۆیاندا شتی باشیشن، بەڵام بەمەرجێك، کە بخرێنە سەر ئەصڵێکی ڕاست و باش و سوودی خراپیان لێ وەرنەگیرێ، بەڵام بەڕاستی جەهەری دیموکڕاسی ئەو شتانە نین، بەڵکو کاکڵ و هەناوو جەوهەری دیموکڕاسی (حوکمی گەل)ە، ئەوەیە کە خەڵك و جەماوەر بۆ خۆی حەڵاڵ و حەرام و، خێرو شەڕو، بەکورتیی: بەرنامەی ژیانی خۆی دابنێ، بێ ئەوەی هیچ پرس و ڕایەك بەخواو پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) و بەئایین بکات!

ئا ئەوەیە جەوهەری دیموکڕاسی، ئنجا کاتێکیش دیموکڕاسی پابەند بکرێ بەشەریعەتەوەو، وای لێ بکرێ کە بەموو لێی لانەدات، ئەوە ئەوکاتە پێی ناگوترێ: دیموکڕاسی، وە ڕاستیش نیە وای پێ بگوترێ، چونکە لانەدان لە بەرنامەو شەریعەتی خوا، حوکمی خوا (حكم الله)یە، نەك حوکمی گەل (حكم الشعب)!

هەروەها ناو لێگۆڕینی دیموکڕاسیش، وەك هەندێك لە ئیسلامییەکان پێیان باشە بگوترێ: (شووراکڕاسی) شتێکی هەڵەو بێ پاساوە، چونکە ئەگەر ئەوەی کەمومارەسە دەکرێ، بەناوی دیموکڕاسییەوە، لەڕووی دیارییکردنی: حەڵاڵ و حەرام و سنورەکانەوە، پابەند بێ بەشەریعەت و حوکمی خواوە، ئەوە لەدیموکڕاسی شۆڕاوەو بۆتە ئیسلام، بۆیە ڕاست نیە پێی بگوترێ: دیموکڕاسی، وە ئەگەر گوێش بەشەریعەت و حوکمی خوا نەدات و، بەس بگەڕێتەوە بۆ ڕای جەماوەرو خەڵك، ئەوە هەر دیموکڕاسییەو غەدرو هەڵەیە هەر ناوێکی دیکەی لێ بنرێ!

---

(١) هەمان سەرچاوە، ص٣٢.

## سێیەم: سێ ڕاستیی گرنگ:

یەك: ئیسلام بەدیلە بۆ دیموكڕاسی[١] و، هەر ڕێچكەو ڕێبازێكی دیكەش، چونكە ئیسلام لایەنە چاك و ئیجابییەكانی هەموویانی لەخۆیدا كۆكردۆتەوەو، لەهەڵەو كەم و كوڕییەكانیشیان دوورە، ئنجا هەرچەندە قسەكردن لەبارەی سیستەمی سیاسیی ئیسلام (النظام السياسي في الإسلام) پێویستیی بەكات و شوێنێكی تایبەتی و تەرخان كراو هەیەو، خوا یاربێ لە داهاتوودا پێی هەڵدەستین[٢]، بەڵام هەر بەكورتیی ئاماژەیەك بۆ بنەما سەرەكییەكانی دەكەین، كە دەتوانین بڵێین: ئەم دەیەن:

١- حوكمڕانێتی باڵا (الحاكمية العليا) تەنها هی خوایە تبارك وتعالى.

٢- سەروەریی بۆ شەریعەتی خوایە (السيادة لشريعة الله).

٣- دەستەڵات هی خەڵك و میللەتە: (السلطة للشعب).

٤- ڕاوێژ بناغەی كاروبار بەڕێوەبردنە (الشورى أساس إدارة الأمور).

٥- دادگەریی ڕەها لەگەڵ هەموولایەك دا.

٦- خەڵكی بۆ دابین كرانی ڕێزو مافی ئازادیی دا یەكسانن (مساواة الناس في الكرامة والحقوق والحرية).

٧- پابەندیی بەدەستوور و یاسایەكانەوە.

٨- فەرمانبەریی تەنها لەسنووری شەرع دایە : (الطاعة في حدود الشرع فقط).

---

(١) دیارە هیچ ڕێگرێكیش نیە، كە سوود لە دیموكڕاسی و میكانیزمەكانی وەربگرین، كە پاش ئەزموون گەلی زۆر و تاڵ، بەرهەم هاتوون، چونكە مسوڵمانان لەسەریان پێویستە حیكمەت و زانیاری بەسوود لەهەر كەسێكەوەبێ، وەربگرن و پێشوازیی لێ بكەن، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿فَبَشِّرْ عِبَادِ ١٧ ٱلَّذِينَ يَسْتَمِعُونَ ٱلْقَوْلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحْسَنَهُۥ ...﴾ الزمر: ١٧-١٨.

(٢) پاشان لەزیاتر لەپەنجا (٥٠) ئاڵقەدا، لە تەلڤزیۆنی پەیامەوە، بەرنامەی (سەرنج) مان پێشكەش كرد بەناوونیشانی: (ئیسلام و دەوڵەتداریی و حوكمڕانیی) و ئێستاش كراوەتە كتێبێكی چوار بەرگیی.

٩- هەموو لایەك بەرپرسیارن و، فەرمان بەچاکەو ڕێگرتن لەخراپەو هەقبێژیی و چاودێریی و لێپرسینەوەو، ڕاستکردنەوەی بەرپرسان و، لەکاتی پێویست دا لادانیان، مافێکی شەرعیی و بگرە ئەرکێکی پێویستی سەرشانی سەرجەم هاووڵاتییانە.

١٠- خۆڕازاندنەوەی هەرکام لەبەرپرسان و کۆمەڵگا، بەڕەوشت و ئاکارە بەرزەکان[١].

دوو: ئیسلام سەرجەم خاڵە بەهێزو ئیجابییەکانی دیموکراسی گرتوونە نێو خۆی، بەڵام بەشێوەیەکی چاکترو بەدووریش لەکەم و کورِییەکانیان، وە لە خاڵە خراپ و بێ هێزەکانیشی بەرییە، بەتایبەت جەوهەرو نێوەڕۆکەکەی، کە بریتیە لە جیاتی خوا، بەپەرستراوداناني ئینسان (تأليه الإنسان)، کە لە پەرلەمان و ئەنجوومەنێك دا خۆی دەنوێنێ، کەبەبێ ئیزنی خوا، بەرنامەو دەستوورو یاسایەکانی ژیان بۆ خەڵکی دادەنێ!

وە لە ڕاستیدا لایەنە چاکەکانی دیموکراسی، کەبریتین لەمیکانیزم (آلية)ەکانی، لەسۆنگەی ئەو جەهەرو نێوەڕۆك و ڕووحە شیرکییەیەوە، وەك کۆمەڵە سەربازێکی باشی یەخسیری دەستی طاغووت و دیکتاتۆرێکیان لێ دێت و، لەجیاتی خێرو چاکە، شەڕو زیانیان لێ دەکەوێتەوە، بەڵام ئیسلام چونکە ئەو میکانیزمە باشانە، پەیوەست دەکات بەچەند بنەڕەت و سنوورێکی مەحکەمەوە، کەڕێیان لێدەگرن و دەیانپارێزن لەو تێکچوون و گەندەڵ بوونە،لەو سەرەنجامە شوومە پارێزراوە.

سێ: نکووڵیی لەوە ناکرێ، کە سیستمی حوکمڕانیی ئیسلام، پاش چاخی زێڕینی خۆی، کەسەردەمی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)و خەلیفە ڕاشیدەکانیەتی، لەسۆنگەی نەمانی شووراوە، بەهۆی سەپاندنی سیستەمی دەستەڵاتی تاکڕەوێتیی (نظام السلطة الفردية)یەوە، کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ناوی لێناوە: (ملكاً جبرياً) یان (ملك عضوض)، کە لە ڕۆژگاری موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیانەوە دەستی پێکرد، میکانیزمە

---

(١) شایانی باسە: بەرگی دووەمی کتێبی: [ئیسلام و دەوڵەتداریی] بەناوونیشانی: [بنەمایەکانی سیستەمی حوکمڕانیی لەئیسلام دا] شەرحێکی تێروتەسەلی ئەو دە (١٠) بنەمایەی کردوە.

ئیدارییەکانی وەك پێویست گەشەیان نەکردوە، بە پێچەوانەی دیموکڕاسییەوە، بەڵام لەبەر ئەوەی:

أ- مسوڵمان دەبێ هەمیشە بەدوا شتی چاك و بەسوودا بگەڕێ، وەك گوتراوە: (الحكمة ضالة المؤمن أينما وجدها فهو أحق بها).

ب- هەم پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) و هەم خەلیفە ڕاشیدەکانی، بەتایبەت (عمر بن الخطاب) خوا لەهەموویان ڕازی بێت، لە ڕۆژگاری خۆیاندا لەڕووی ئیدارییەوە لەدەوڵەتی فارس و ڕۆم بەهرەیان وەرگرتوە، گەلێك شت لەوانەوە فێربوون، بێ ئەوەی هەست بەهیچ جۆرە سەغڵەتییەك بکەن.

ج- زۆر لەو گەشەکردن و بەرەو پێش چوونە سیاسیی و ئیداریی و زانستییەی ئێستای ڕۆژئاوا، لەسەرەتاوە بەرهەمی ڕەنگدانەوەو کارتێکردنی شارستانێتی ئیسلامیی بووە، کورد گوتەنی: ڕۆنی خۆمانە لەسەری خۆمانی دەدەنەوە، بەدان پێداهێنانی خەڵکێکی بەویژدانی خۆیان، بۆیە:

بەهرە لێوەرگرتنیان نەك هەر ڕەوا (مباح)، بگرە فەرزیشە!

ئەمە کورتەیەکی گوشراو بوو، لەبارەی دیموکڕاسییەوە، لەبەر تیشکی عەقڵ و شەرعدا، هیوادارم توانیبم لەقەدەر ئەم دەرفەتە، هەقی خۆی پێ بدەم.

والحمد لله رب العالمين
وصلى الله على سيدنا محمد وآله وصحبه وسلم،
ومن سار بسيرته واهتدى بهديه الأقوم.

دوو ئاڵقە چاوپێکەوتنی (بەرنامەی سۆراغ)

سەبارەت بە دیموکڕاسی

# دیموکڕاسی و دیکتاتۆریی و

# هەڵوێستی ئیسلامییانە



# ڕێ خۆشکردن

**خوێنەرە بەڕێز و خۆشەویستەکانم!**

ئەم چەند لاپەڕەیە کە باسی دیموکڕاسی و دیکتاتۆریی و هەڵوێستی ئیسلامییانە لەبەرانبەریان دا، دەکەن، دەقی دیدارێکی دوو ئاڵقەییە کە بەڕێز: کاك تۆفیق کەریم لە تەلەڤـزیۆنی کۆمەڵی ئیسلامیی دا، لەگەڵی ئەنجام داوم، لە ڕۆژی: (١١ رمضان ١٤٣٢ك) بەرانبەر: (٢٠٠٢/١٢/١٦ز) لەگوندی ئەحمەداوا.

هیواداریشم ئەم دیدارەش تیشکی زیاتر و چاکتر بخاتەسەر بابەتی گرنگ و هەستیاری دیموکڕاسی و دژ و پێچەوانەکەی: دیکتاتۆریی.

## ئاڵقەی یەكەم لە بەرنامەی (سۆراغ)

### دەستپێك

خۆشحاڵین كە لەئاڵقەیەكی دیكەی بەرنامەی (سۆراغ)دا بەدیدارتان شاددەبینەوە، كە ئەمجارە: مامۆستا عەلی باپیر ئەمیری كۆمەڵی ئیسلامیی میوانی بەرنامەكەمانە.

**ئـــازیـــزان!**

زۆرجاران چەند پرسیارێك دەوروژێنرێن، نێوەرۆكەكەیان ئەوەیە، كە ئیسلامییەكان، هەڵوێستی ڕوونیان لەبەرانبەر چەند بابەتێكی گرنگ دا نیە، كە لە هەردووك مەیدانی فیكریی و سیاسی دا سەرهەڵدەدەن، بۆ وێنە:

ئیسلامییەكان چۆن تەماشای دیموكڕاسی دەكەن؟

وە چۆن دەڕواننە سیكۆلاریزم؟

وە هەڵوێستیان بەرانبەر بە كێشەی كورد چییە؟

هەروەها كێشەی ئافرەت و.. هتد.

ئەم پرسیارانە و هی دیكەش، سیكۆلاریستەكان ئاڕاستەی ئیسلامییەكانیان دەكەن و، پێیان وایە هەڵوێستی ڕوونیان لەبارەیانەوەنیە!

بەڵام دەگونجێ بڵێین:

ئەو مەسەلەیە گوێرەیی (نِسْبـي)یە و هەموو ئیسلامییەکان لەبەرانبەر ئەو مەسەلانەدا بێدەنگ نین، وە پێم وایە یەکێك لەدیارترینی ئەوانەی بەڕوونیی لەبارەی ئەو بابەتە و مەسەلانەوە دواوە و، باشیش لێیان تێگەیشتوون: مامۆستا عەلی باپیرە، کە هەر لەسەرەتای هەشتایەکانی سەدەی ڕابردووەوە، بیروڕای ئیسلامییانەی خۆی لەوبوارەدا دەربڕیوە، لەمیانەی: کۆڕ و کۆبوونەوە و وتار و کتێبەکانی دا.

دیارە پاش ڕاپەڕینی [١٩٩١/٣/٥]یش بوار فراوانتر و ڕەخساوتربوو، بۆیە ڕۆشنانەتر بیروڕایەکانی خۆی لەمەڕ مەسەلە و بابەتە زیندووەکان دەخستەڕوو. بەڵام پاش ئیعلانکرانی (کۆمەڵی ئیسلامیی) لە: ٢٠٠١/٥/٣١ ڕونکردنەوە و ڕاگەیاندنی بیروڕا و هەڵویستە فیکریی و سیاسییەکانی، چوونە قۆناغێکی پێشکەوتووترەوە.

لەم دواییانەش دا، لەشاری سلێمانیی چەند کۆڕێکی بەستن لەبارەی: مافەکانی مرۆڤ و، تیرۆر و، سیکۆلاریزم و، گلۆبالیزەیشن و، دیموکراسییەوە، وە لەبارەی زۆر مەسەلەی دیکەوە، لەبۆنە و دەرفەتی دیکەدا قسەی خۆی کردوە، ئەو مەسەلانەی کە نەك هەر لەگۆڕەپانی کوردستان و عیراق دا، بەڵکو لەسەر ئاستی دنیاش بەگشتی باس و خواسی گەرم و گوڕیان لەسەر دەکرێ.

ئنجا بابەتێکیش کە لەهەموان زیاتر کێشە و مشت ومڕی لەبارەوە کراوە و دەکرێ، بریتیە لە [دیموکراسی]، بۆیە ئێمەش بەمەبەستی زیاتر تیشك خستنەسەر ئەو بابەتە گرنگ و هەستیارە و، زانینی ڕای بەڕێزیان لەبارەیەوە، بەباشمان زانی، کە دوو ئاڵقەی (سۆراغ)ی بۆ تەرخان بکەین.

مامۆستا تۆفیق : سەرەتا بەخێرهاتنێکی گەرمت دەکەین - مامۆستا عەلی باپیر - خۆشحاڵین بە دیدارت، بۆ چونە نێو باسەکەش، دەمەوێ بەم شێوەیە دەست پێبکەین:

ئەم بابەتە کە ناوونیشانێکمان بۆ داناوە بە ناوی: (دیموکڕاسی و دیکتاتۆریی و هەڵوێستی ئیسلامییانە لەبەرامبەریان دا)، جەنابت زۆر بە کورتیی پێناسەیەکی هەردوو زاراوەکەمان بۆ بکە، واتە: (دیموکڕاسی) و (دیکتاتۆریی)!

بەڵێ، بسم الله الرحمن الرحيم، الحمدلله و الصلاة والسلام على رسول الله محمد و آله و صحبه و من اهتدى بهداه (ربّنا آتنا من لدنك رحمة و هيء لنا من أمرنا رشداً).

پێشەکی زۆر سوپاستان دەکەم و، دەست خۆشییتان لێدەکەم، بۆ هەڵبژاردنی ئەو بابەتە، چونکە بێگومان ئیسلام بۆ هەر پرسیارێك وەڵامی خۆی هەیە، وە بۆ هەر کێشەو گیروگرفتێك چارەسەری خۆی هەیە، بەڵام ئەوە مسوڵمانانن کە ئایا دەتوانن ئەوەی لە ئیسلامدا هەیە هەڵیهێنجن و بیخەنەڕوو، وە کێشەو گرفتی کۆمەڵگاکەیانی پێ چارەسەر بکەن و، وەڵامی پرسیارەکانی پێ بدەنەوە، یان نا ؟! ئەگەرنا ئیسلام وەك خۆی مادام بەرنامەی تێر و تەواوی خوایە و بۆ ڕێکخستنی ژیانی بەشەر هاتوە، بە درێژایی زەمان بە پانایی زەمین، دیارە دەبێ ئەوەی لە باران دا هەبێ و لە توانایدا هەبێ.

دەربارەی پێناسەی دیموکڕاسی، ئێمە ماوەیەك لەمەوبەر کۆڕێکمان لەوبارەوە بەست، وە ئەوەی کە لێرەدا بگونجێ بە کورتیی بیڵێم، دەربارەی پێناسەی دیموکڕاسی، هەر پێناسە باوەکەیەتی کە دەڵێ: (دیموکڕاسی بریتیە لە حوکمی گەل، بۆ گەل، وە لە پێناوی بەرژەوەندیی گەلدا) (حكم الشعب، للشعب، من أجل الشعب) دیارە هەر خودی وشەکەش، کە لە دوو وشەی یۆنانیی: [دیمۆس - Demos] و [کراتۆس- Kratos]، پێکهاتوە، (دیمۆس) واتە: گەل، نەتەوە، (کراتۆس) واتە : حوکم، کەواتە: مانای وشەکە دەبێتە (حوکمی گەل) بەڵام ئەگەر بویسترێ ڕوونتر پێناسەی بکرێ، دەبێ بگوترێ: (دیموکراسی): بریتیە لە سیستمێکی حوکمڕانیی و ڕێبازێکی سیاسیی، کە بە بێ لەبەرچاوگرتنی خوا (جل جلاله)، وە بە بێ لەبەرچاوگرتنی دینێك، کە خوا ناردوویەتی، وە بەبێ لەبەرچاوگرتنی ڕێ ڕوونیی پێغەمبەران (عليهم الصلاة و السلام)، هەر لە خودی گەل و کۆمەڵگا، سیستمی حوکم و چۆنیەتی بەڕێوەبردنی دەوڵەت و

میللەت، هەڵدەهێنجیٚ و وەردەگریٚ، وە دیموکڕاسی چەند بنەمایەکی هەن، کە گرنگترینیان ئەمانەن:

١- باڵا دەستێتی گەل (حاكمية الشعب).
٢- سەروەریی دەستوور و یاسا (سيادة الدستور و القانون).
٣- لەیەك جیایی سیٚ دەسەڵاتەکان.
٤- زۆرینە حوکم دەکەن بەسەر کەمینەدا و کەمینەش مافی پارێزراودەبیٚ.
٥- دابین کردنی ماف و ئازادییەکان بۆ سەرجەم هاووڵاتییان.

ئەوە بە کورتی پێناسەی دیموکڕاسی، بوو.

- ئایا پێچەوانەی دیموکڕاسی دیکتاتۆریی و (إستبداد)ە؟!

دیارە وشەی دیکتاتۆریی وشەیەکی بیانییە و لە عەرەبیدا بە: (الفردانية، الحكم الفردي، الإستبداد)وە لە کوردییدا بە: (تاکرەویی، خۆسەپاندن) تەرجەمە کراوە.

(عبدالرحمن)ی کەواکیبی زیاتر لە (١٠٠) ساڵ لەمەوپێش کتێبی: (طبائع الإستبداد و مصارع الإستعباد)ی داناوە، کە بە درێژیی باسی ئەو شێوە حوکمڕانییە دەکات و، باسی زیانەکانی و شوێنەوارە خراپ و شوومەکانی کردوە.

کەواتە: حوکمی دیکتاتۆریی، حوکمی تاکە، حوکمی حوکمڕانێکە، کە: هەم یاساش دادەنیٚ، هەم جێبەجێکردنیشی لەبەر دەست دایە، هەم دەستەڵاتی دادگاشی بەدەستە، واتە: هەر سیٚ دەستەڵاتەکانی دەوڵەت لە خۆیدا کۆدەکاتەوە، ئەوەش بە کورتیی پێناسەی دیکتاتۆریی بوو.

- مامۆستا گیان لە پێناسەی دیموکڕاسییدا فەرمووت: دیموکڕاسی تەنیا بەپشتبەستن بەئیرادەی خەڵك، حوکم دەکات، بەبیٚ ڕەچاوکردنی خوا و حیساب کردن بۆ بەرنامەی خوایی، ئنجا من دەڵێم: لەگەڵ ئەوەشدا، کە ئیسلام بەرنامەیەکی خوایی و سەربەخۆیە، بەڵام بێگومان بەرنامەکان، چ ئاسمانیی بن

چ ئەرزیی، هەرچۆن بن، خاڵی هاوبەشیان لە نێواندا هەر هەن، مەبەستم ئەوەیە: ئایا ئیسلام لە دیموکڕاسیەوە نزیکترە، یان لە دیکتاتۆرییەوە؟!

لێرەدا بۆ وەڵامی ئەم پرسیارەت، یاخود تیشك خستنە سەر ئەو مەسەلەیە، واتە: دووریی و نزیکیی ئیسلام، یان ڕاستتر بڵێین: سیستمی حوکمڕانیی ئیسلامیی: لە دیموکڕاسی و دیکتاتۆرییەوە، پێم باشە، دوو جۆرە سەرنج لەو مەسەلەیە بدەین، هەم سەرنجێکی مێژوویی و، هەم لە ڕوانگەی دەقە شەرعییەکانیشەوە، دیارە مێژووی ئیسلامیش ئەو کاتەی، کە مسوڵمانان بەشەریعەتی خواوە پابەندبوون، کەم و زۆر هەر پەیوەست بووە بە دەقە شەرعییەکانەوە، بەڵام وەختێك کە مسوڵمانان لە شەرع لایان دا، ئەوە مێژووی مسوڵمانانە، نەك مێژووی ئیسلام، واتە: مسوڵمانان وایان ڕەفتار کردوە، بەڵام ئایا چەندە وەفادار بوون بۆ دینەکەیان و، چەندە پابەند بوون بەبەرنامەکەیانەوە؟! ئەوە شتێکی دیکەیە، کەواتە: ڕەوا نیە، هەڵەو کەم وکوڕیی و لادانی مسوڵمانان، لەسەر ئیسلام حیساب بکرێ!

وەك پێشترش باسم کرد: دیموکڕاسی لەوەدا خولاسە دەبێتەوە کە: هەموو شتێك بخرێتە دەستی گەل، بەڵێ، هەموو شت خستنە دەستی خەڵك و جەماوەر، بەهێزترین بنەما و، کۆکەرەوەترین کۆڵەگەی دیموکڕاسییە، بۆ هەموو بنەمایەکانی دیکەی، چونکە ئەوانی دیکە هەموویان دەگەڕێنەوە بۆ ئەم و، لەسەر ئەو بناغەیە بنیات دەنرێن. وە بێگومان دیموکڕاسی خاڵی هاوبەشی زۆرن لەگەڵ سیستمی حوکمڕانیی ئیسلامدا، چونکە: لە دیموکڕاسیدا کۆمەڵگاو میللەت، هەم دەستوور و یاساکانی ژیانی خۆی دیاریی دەکات، بەهۆی هەڵبژاردنی ئەوانەوە، کە یاساکان دادەنێن، واتە: (پەرلەمان) کە دەسەڵاتی یاسادانان (السلطة التشریعیة)ی بە دەستە، وە هەم ئەو کۆمەڵەش کە یاساکان (پراکتیك) جێبەجێ دەکەن، واتە: (السلطة التنفیذیة)، وە هەم دەسەڵاتی دادوەریی (السلطة القضائیة)یش، چونکە ئەمیش، چ پەرلەمان هەڵیبژێرێ، چ ڕاستەوخۆ بەڕاپرسی (استفتاء)ی خەڵك هەڵبژێررێ، دیسان ئەویش دەگەڕێتەوە بۆ خەڵك و میللەت.

ئنجا لە ئیسلامیشدا و لە سیستمی حوکمڕانیی ئیسلامیشدا، ئەوەی لێ دەربچێ، کە خوای پەروەردگار بۆ خۆی دیاری کردوە بۆ بەندەکانی، کە کۆمەڵێك بنەمای بنەڕەتیین و پێیان دەگوترێ: (شریعة)، کە دیارە لە پێغەمبەرەوە (علیه الصلاة والسلام) تاکو خوارێ، هیچ کەس بۆی نیە دەستکارییان بکات، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ :

﴿ ثُمَّ جَعَلۡنَٰكَ عَلَىٰ شَرِيعَةٖ مِّنَ ٱلۡأَمۡرِ فَٱتَّبِعۡهَا وَلَا تَتَّبِعۡ أَهۡوَآءَ ٱلَّذِينَ لَا يَعۡلَمُونَ ١٨ ﴾
الجاثية: ١٨

ئاشکرایە، کە ئەم دواندن (خطاب)ە، لەگەڵ پێغەمبەردایە (صلی الله علیه وسلم) و دەفەرموێ: ((ئێمە تۆمان لەسەر شەریعەتێك داناوە، کە لە لایەن خۆمانەوە بۆمان ناردووی، شوێنی بکەوە و شوێنی ئارەزووی ئەوانە مەکەوە، کە نازانن. کەواتە: پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) لە بەرانبەر شوێن کەوتنی شەریعەت دا، هیچ مافی سەر پشك بوون و هەڵبژاردنی نەبووە و، دەبوو شوێنی بکەوێ، ئنجا غەیری ئەوە، کە خوا فەرموویەتی، وە لەشەریعەتی بەرجەستە لەقورئان و سوننەت دا، خۆی دەنوێنێ، ئەوەبواری حوکم و سیاسەت و ئیدارە، ئەصل تێیدا ڕەوایی و دەست کراوەییە، مادام لەگەڵ دەقێکی شەریعەت دا تێك نەگیرێ، بۆ وێنە:

١- چۆنیەتی پیادەکردنی ئەو شەریعەتە.

٢- چۆنیەتی هەڵبژاردنی کاربەدەستان.

٣- پاشان چاودێریی کردنی کاربەدەستان، داخۆ تا چ ڕاددەیەك پابەندن بەشەریعەتەوە.

٤- پاشان چۆنێتی ئیدارەکردنی وڵات.

٥- بەرژەوەندییەکان چۆن دابین بکرێن و، زەرەرەکان چۆن دوور بخرێنەوە.

٦- چۆن وڵات بەرەو پێشەوە ببرێ.

٧- بەختەوەریی چۆن بۆ خەڵك دابین بکرێ، چ بۆ تاك چ بۆ کۆمەڵ و ... هتد؟!

ئەوە هەمووی لە ئیسلامدا دەچێتە دەستی خەڵك و کۆمەڵگاوە، بەڵام خەڵك و

میللەت لەژێر سایە و، لە بازنەی شەریعەتی خوادا، هەروەها لێرەدا دەگونجێ فەرمودەی: (أنتم أعلم بأمر دنياكم) رواه مسلم: ٦٠٨١، بەبەڵگەبهێنرێتەوە[1].

بۆیەش خوای پەروەردگار شەریعەتێكی ناردوە، كە دەبێت لە پێغەمبەرەوە (عليه الصلاة والسلام) - یان ئەو كەسەی كە جێنیشینی پێغەمبەرە، كە (خەلیفە)ی پێدەگوترێ، یان: ئەمیری بڕواداران، یان سەرۆك كۆمار، یان پادشا (ملك)، یان: سوڵتان، هەر نازناوێكی هەیە، گرنگ نیە، گرنگ نێوەڕۆكەكەیەتی- لەوەوە تاكو خوارێ حوكمڕان و كۆمەڵگا، دەبێ هەموویان پابەندبن بەو شەریعەتەوە و، هیچ كەس لە سەرووی ئەو شەریعەتەوە نیە.

كەواتە: زۆربەی ئەو بنەمایانەی كە لە دیموكڕاسی دان، كە ئێمە زیاتر وەك (میكانیزم) تەماشایان دەكەین، ئیسلام هیچ گرفت و كێشەی لەگەڵیان نیە، بەڵام ئەوەی كە ئیسلام ڕەفزی دەكات، كاكڵ و جەوهەری دیموكڕاسییە، كە بریتیە لەوەی یاسادانان بەموتڵەقیی بخرێتە دەستی خەڵك، ئیسلام دەڵێ: ئەو كارە تەنها شایسەی خوایە و، دەبێ بەس هی خوا بێ (جل جلاله) وەك فەرموویەتی:

﴿إِنِ ٱلْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِ﴾ يوسف: ٦٧.

﴿أَمْ لَهُمْ شُرَكَٰٓؤُا۟ شَرَعُوا۟ لَهُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا لَمْ يَأْذَنۢ بِهِ ٱللَّهُ﴾ الشورى:٢١.

بەڵێ، شەرع دانان و حەڵاڵ و حەرام و چاك و خراپ دیاریی كردن، لە ئەصڵ دا هی خوای پەروەردگارە، وە ئەوە كە زانایانی ئیسلام و پسپۆڕانی شەریعەتیش بۆیان هەیە ئیجتیهاد بكەن و یاسا هەڵبهێنجن، بە تایبەت لە بوارەكانی سیاسی و ئیداریی و ئابووریدا، ئەوە یاسا دانانێكی جوزئیی و بەندار (مقيّد)ە، لە چوارچێوە و لەبەر ڕۆشنایی شەریعەت دایە.

- مامۆستا! جەنابت فەرمووت: لە بواری میكانیزم دا، ئیسلام خاڵی هاوبەشی زۆرە لەگەڵ دیموكڕاسیی دا.

بەڵێ .

---

(١) لەئاڵقەكانی پێشوودا، دەقی ئەو فەرموودەیەمان هێناوە و، قسەمان لەبارەوە كردوە.

- بەڵام لە دیموكڕاسی دا هیچ كەس بۆی نیە، تا سەر حاكم و كەسی یەكەم بێ لە وڵاتدا و، بە پێی یاساكانی وڵاتان: تەنیا سێ ساڵ، یان چوار ساڵ، یان پێنج ساڵ و، خولێك یان دوو خول بۆی هەیە بمێنێتەوە.

ڕاستە.

- بەڵام كوا لە ئیسلامدا وایە؟ بۆ نموونە: تەماشا دەكەین هەر چوار خەلیفەكان تا كۆتایی ژیانیان حوكمڕان بوون!

بەڵێ، ڕاستە هەر چواریان ماونەتەوە، تاكو یان شەهید بوون، یان وەفاتیان كردوە، ئنجا وەڵامی ئەوە بەو شێوەیە، كە ئێستا دەیخەمە ڕوو: دیموكڕاسی چەند میكانیزمێكی هەن، كە ئیسلام گرفت و كێشەی لەگەڵیان دا نیە، بەڵام جەوهەرەكەی لەگەڵ شەریعەت دا ناگونجێ، ئەویش ئەوەیە كە ماف بەپەرلەمان دەدات، یان ڕاستتر بڵێین : ماف بە خەڵك دەدات، كە پەرلەمانێك هەڵبژێرن و، ئەو پەرلەمانەش مافی پێدەدرێ، كە بە كەیفی خۆی چۆنی پێ چاك بوو: قەدەغەكان دیاریی بكات و، فەرزەكانیش و ئەو شتانەش كە موباحن، دیارییان بكات و، بەكورتیی: سەرجەم سنوورەكان دیاریی بكات، بێ گوێ دانە شەرعی خوا، ئنجا ئاشكرایە، كە ئەمە لەگەڵ ئەوەدا، كە دەبێ تەنها و تەنها خوای كاربەجێ، بەرنامە دانەر و حاكمی موطلەق بێت، زۆر بە توندی دژ دەوەستێ و تێك دەگیرێ، بەڵام جگە لەوە بۆ وێنە: مەسەلەی دەستاودەست كردنی دەسەڵات، وە هەڵبژاردن، وە ئەوە كە زۆرینە قسەی دەخوات بەسەر كەمینەدا، لە سەرجەم ئەو مەسەلە ئیجتیهادییانەدا، كە مشت ومڕ هەڵگرن و، زانا و پسپۆڕان ڕای جیاجیایان لە بارەیانەوە دەبێ، هەروەها مەسەلەی مافەكانی مرۆڤ و ئازادییەكان دا، ئەوانە هەموویان كە چەند موفرەدەیەكی دیموكراسیین، لە سیستمی حوكمڕانیی ئیسلامیشدا، زۆر بە ڕاشكاویی دانیان پێدا هێنراوە.

ئێستاش بابێینەوە سەر مەسەلەی: ماوەی حوكمڕانیی (مدة الحكم)، كە دیارە ئەوە لە ئیسلامدا نەدیاریی كراوە چەند بێ و، نەدیارییش كراوە چەند نەبێ، واتە: نەگوتراوە: دەبێ حەتمەن، تاكو مردن بابای حوكمڕان لە شوێنی

خۆی بێ و، نەگوتراویشە: ساڵێك، یان چوار ساڵ بێ، یان دە (١٠)ساڵ بێ، بەڵكو ئەم مەسەلەیە یەكێكە لەو مەسەلە موباح و مشتومڕ هەڵگرانە، كە بۆ ئیجتیهاد و، بیروڕا و تێڕوانینی پسپۆڕان و بۆ ڕای خەڵك و جەماوەر بەجێهێڵراون.

- مامۆستا! ئەوەتا پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێ: {عَلَيْكُمْ بِسُنَّتِي وسُنَّةِ الخُلَفاءِ الرَّاشِدِينَ المَهْدِيِّنَ} أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٧١٨٢)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٤٣)، وَالحَاكِمُ برقم: (٣٣١) ئایا ژیانی ئەوان نابێ بە بەرنامە بۆ ئێمە!!

نەخێر، ژیانی ئەوان (خوا لێیان ڕازی بێت)، نابێتە شەرعێكی پابەندكەر (مُلـزِم) بۆ ئێمە، چونكە ئەوانیش ئیجتیهادیان كردوە، بۆ ئەو مەسەلانەی كەدەقی شەرعیی ڕوونیان لەسەر نیە، چونكە جاری وا بووە ئەبوبەكر (خوا لێی ڕازی بێ) شتێكی كردوە، بەڵام عومەر (خوا لێی ڕازی بێ) ڕەخنەی لێگرتوە، دوایی كە عومەر دەستەڵاتی كەوتۆتە دەست، بەو شێوەیەی كە خۆی پێی چاك بووە، كاری كردوە! ئنجا پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) كە فەرموویەتی: (علیكم بسنتي و سنة الخلفاء الراشـدين من بعدي) بە گشتی ڕێبازی خەلیفە ڕاشیدەكان، بۆ ئێمە سەر مەشقە، نەك تاك تاكی بیروڕا و هەڵوێستەكانیان، چونكە ئەگەر لە مەسەلەیەكدا، كە ئەبوبەكر و عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) كەوتوونەتە كێشەوە، دەبێ ڕای كامیان بكەینە ڕێباز؟ یان ئەگەر لە مەسەلەیەكدا چواریان كەوتبنە كێشەوە، چۆن بكەین و، ڕای كامیان بكەینە ڕێباز؟

خۆ نابێ ڕای هەر چواریان لە یەك كاتدا جێبەجێ بكەین؟! كەواتە: ئێمە تەنیا دەقە شەرعییەكان دەمانبەستنەوە و، ڕاو ئیجتیهادی زانایان و ئیجتیهادی پێشەوایان، تەنانەت ئەگەر خەلیفە ڕاشیدەكانیش بن، (خوا لێیان ڕازی بێت)، هەروەك ئیجتیهاد تەماشا دەكرێن، كەواتە: بەگشتی ڕێبازی ئەو چوار خەلیفە ڕاشیدە، بۆ ئێمە سەر مەشقە، بەڵام مەرج نیە لە هەموو شتێك دا بۆ ئێمە پابەند (مُلزِمْ) بێت، هەڵبەتە پێغەمبەر خواش (صلی الله علیه وسلم)كە فەرموویەتی:

{...وَمَنْ يَعِشْ مِنْكُمْ فَسَيَرَى اخْتِلَافًا كَثِيرًا فَعَلَيْكُمْ بِمَا عَرَفْتُمْ مِنْ سُنَّتِي وَسُنَّةِ الْخُلَفَاءِ الرَّاشِدِينَ الْمَهْدِيِّينَ وَعَلَيْكُمْ بِالطَّاعَةِ وَإِنْ عَبْدًا حَبَشِيًّا عَضُّوا عليه ا بِالنَّوَاجِذِ} أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٧١٨٢)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٤٣)، وَالحَاكِمُ برقم: (٣٣١).

واتە: .. هەر كامێكتان تەمەنی هەبێت و لە ژیاندا بەردەوام بێت، بێگومان كێشە و مشت و مڕ و ڕاجیایی زۆر لە نێو ئۆممەت دا دەبینێ، ئنجا ئێوە ڕێبازی من و ڕێبازی جێنشینە سەر ڕاستە هیدایەتدراوەكانم، بگرن، مەهێڵن لە دەستتان دەربچێ، ئەگەر بە ددانەكانیشتان گرتبتان.

كەواتە: لە سیاقی فەرمایشتەكەوە دەزانین: مەبەستی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ئەوەیە، كە لە كاتی ڕاجیایی و مشت و مڕی نێو ئۆممەت دا، ڕێبازی خەلیفە ڕاشیدەكان، تەرازووی هەق و ناهەق و سەنگی مەحەكە، وە لەشێوازی حوكمڕانییدا و لە هێڵە گشتییەكانی دا، وەك:

١- هەڵبژێررانیان لە لایەن ئۆممەتەوە بە ڕاوێژ و بەیعەت پێكردنیان.

٢- پابەندیی موو بەموویان بە شەریعەتەوە.

٣- ڕاوێژكردنیان بە خەڵك و ڕەخنە قبووڵكردنیان.

٤- بەدادگەریی ڕەفتاركردنیان.

٥- دەست وەرنەدانە خەزێنەی ماڵ و.. هتد.

ئنجا لە مەسەلەی ماوەی حوكمڕانییشدا، كە دیموكڕاسی دەڵێ: با چوار ساڵ بێ، یان پێنج ساڵ بێ، یان شەش ساڵ بێ، یان دوو خول (دورة) بێ، یان سێ بێ، قوڕئان نیە، نەگونجێ دەستكاریی بكرێ، دیارە ئەبوبەكر (خوا لێی ڕازی بێ)، كە دوو ساڵ و سێ مانگ خەلیفە بووە، مسوڵمانان خۆزگەیان خواستوە، كە دە (١٠) ساڵیش حوكمڕانیان بوایە، ئنجا وەك چۆن سیستمی دیموكڕاسی ڕۆژئاوایی، بۆی هەیە بڵێ: دەبێ: یەك خول (دورة)ی حوكمڕانیی چوار ساڵ بێت، سیستمی حوكمڕانیی ئیسلامییش، بۆی هەیە بڵێ: با دەورەكە سێ (٣) ساڵ بێت، وە با سێ دەورە هەڵبژێررێ، گرنگ ئەوەیە هەڵبژاردنەكە لە لایەن خەڵكەوە بێ، ئنجا ئایا بۆ پێنج ساڵ دادیدەنێ، یان بۆ دە ساڵ، یان بۆ هەشت ساڵ، یان بۆ دەورەیەكە، یان دوو دەورە، یان بۆ سێ دەورە؟ دیارە كەس ناتوانێ بڵێ: حەتمەن دەبێ هەر بەو شێوەیە بێ، چونكە دیموكڕاسی بە هەموو موفرەدەكانیەوە، ئەزموونی خەڵكی ئەورووپایە

لە بواری حوکمڕانیی داو، ئەگەر سیستمی حوکمی ئیسلامییش بەو شێوەیە، کە خیلافەی ڕاشیدە لەسەری بنیات نرا، بەردەوام بوایە، ئەوە بە تەئکید ئێستا لە جیاتی ئەوەی چوار ئەزموونی حوکمڕانییمان هەبن، واتە: ئەزموونی (ئەبوبەکر و عومەر و عوسمان و عەلی) (خوا لێیان ڕازی بێ) هەروەها (عومەری کوڕی عبدولعەزیز) کە ئەویش بە پێنجەم خەلیفەی ڕاشیدی ئیسلام دادەنرێ، لە لایەن زۆرینەی زانایانەوە، ئەوە ئێستا دەیان شێوەی حوکمڕانییمان دەبوون و، هەمووشیان لە چوارچێوەی شەریعەت داو، هەمووشیان بە میکانیزمی ڕاوێژ (آلیة الشوری)، چونکە ئەو مەسەلانە هەموویان: هەڵبژاردن و، حوکمی زۆرینە و، دەستاو دەست پێکردنی دەستەڵات و .. هتد، هەموویان دەگەڕێنەوە بۆ سەر ئەصڵی ڕاوێژ:

﴿ وَأَمۡرُهُمۡ شُورَىٰ بَيۡنَهُمۡ ﴾ الشورى: ٣٨.

واتە: با کاروبارتان بە ڕاوێژ بێت .

- مامۆستا لە بواری میکانیزمەکان دا، ئەمجار مەسەلەی هەڵبژاردن دێتە پێشێ.
بەڵێ .

- ئەگەر سەیری مێژووی ئیسلامیی بکەین، هەڵبژاردن زۆر کەم بووە، ئایا هەر لە ئەصڵدا هەڵبژاردن هەیە، یاخود خەلیفە بۆی هەیە وەصیەت بکات بۆ دوای خۆی و، یەکێکی دیکە دابنێ، ئایا وایە؟ یاخود خەڵك خۆیان بۆیان هەیە، خەلیفە هەڵبژێرن؟!

خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ وَأَمۡرُهُمۡ شُورَىٰ بَيۡنَهُمۡ ﴾ الشورى: ٣٨.
واتە: کاروباری ئیمانداران بە ڕاوێژە، شایانی باسە ئەم ڕستە قورئانییە لە ئایەتێکدا هاتوە، کە بەم شێوەیە:

﴿ وَٱلَّذِينَ ٱسۡتَجَابُواْ لِرَبِّهِمۡ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَمۡرُهُمۡ شُورَىٰ بَيۡنَهُمۡ وَمِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ يُنفِقُونَ ٣٨ ﴾ الشورى: ٣٨.

لێرەدا خوا چوار وەصفان بۆ مسوڵمانان دیاریی دەکات:

١- سەرەتا بۆ یەکەمیان دەفەرموێ: ئەوانەی کە بە دەم بانگی پەروەردگاریانەوە دەچن، ئەمە وەك حاڵەتی گشتییان، ئنجا سێ کردەوە و خەسڵەتیان دەخاتە ڕوو.

٢- (وأقاموا الصلاة) نوێژ بەرپا دەکەن، دیارە نوێژ بناغەی لایەنی مەعنەوییە و تاکی مسوڵمان و کۆمەڵگایەکی مسوڵمان دەبێ پەیوەندیی مەعنەویی لەگەڵ خوای خۆیدا هەبێ و، بۆ پەروەردگاری سەجدە و ڕکووع بەرێ، دیارە نوێژ گەورەترین دروشمی مسوڵمانانە، چ وەك تاك، چ وەك کۆمەڵ.

٣- پاشان دەفەرموێ: ﴿وَأَمۡرُهُمۡ شُورَىٰ بَيۡنَهُمۡ﴾ الشورى: ٣٨. وە کاروباریان لە نێو خۆیاندا بە ڕاوێژە، ئەمەش بناغەی کاروباری کۆمەڵایەتیی و چالاکی سیاسییانە.

٤- وە بۆ چوارەم و کۆتاییان دەفەرموێ: ﴿وَمِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ يُنفِقُونَ ٣٨﴾ وە لەوەی پێمان داون، دەبەخشن، ئەمەش دروشمی لایەنی ئابوورییە، واتە ئەو سێ بوار و لایەنە: لایەنی ڕووحیی و، لایەنی کۆمەڵایەتیی و سیاسی، وە لایەنی ئابووریی و ژیان و گوزەرانی تاك و کۆمەڵی مسوڵمانان، دەبێ بەو شێوەیە بێ، کە خوای پەروەردگار دیاری کردوە و، لەسەر ئەو سێ بنەمایە بنیات بنرێ.

ئنجا لێرەدا کە ﴿وَأَمۡرُهُمۡ شُورَىٰ بَيۡنَهُمۡ﴾ کەوتۆتە نێوان: ﴿وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ﴾ و ﴿وَمِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ يُنفِقُونَ ٣٨﴾ ەوە، ئەوەی لێ دەفامرێتەوە، کە: وەك چۆن نوێژ بەرپاکردن و، زەکات دان و ماڵ بەخشین، پێویستن، بە هەمان شێوە: ڕاوێژ و پرس و ڕا کردنیش، فەرزە.

وە لە ڕۆژگاری پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) مەسەلەی ڕاوێژکردن (الشورى) زۆر چاك جێبەجێ کراوە، یەکێك لە هاوەڵان (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: [ما رأيت أحداً قط أكثر مشاورةً لأصحابه من رسول الله (صلى الله عليه وسلم)][1] واتە: هەرگیز هیچ کەسم نەدیوە زیاتر لە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، ڕاوێژ بە هاوەڵانی بکات، وە ئەگەر تەماشای سیرەی پێغەمبەر

---

(١) رواه أحمد والترمذي والشافعي عن أبي هريرة رضي الله عنه.

(صلى الله عليه وسلم) بكەین، دەبینین كە هەر شتێك دەقی لەسەر نەبوو بێت و، لە بارەیەوە وەحی بۆ نەهاتبێ، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ڕاوێژی بە هاوەڵانی كردوە و، پابەندیش بووە بەڕای زۆرینەوە.

- فەرمووت ڕاوێژكردن هەبووە، بەڵام ئایا پابەندیی بە ڕای زۆرینەوە چۆنە؟! واتە ئایا ڕاوێژ هەر ڕا وەرگرتنە، یان بۆ پێوە پابەند بوونیشە؟!

لەو بارەوە وردە كێشەیەك هەیە لە نێوان زانایاندا، كە ئایا ئەنجامی ڕاوێژ پابەندكەریشە، یان بەس بەرچاو ڕوون كەرەوەیە؟! (هل الشورى مُلْزِمةٌ أم مُعْلِمةٌ فقط؟!).

بەڵام بەڕاستیی، ئەگەر ئینسان تەماشای ئایەتەكان بكات، مەسەلەكە زۆر ڕوونە، چونكە خوای كاربەجێ ڕاوێژكردنی خستووەتە نێوان نوێژ و زەكاتەوە، تاكو بزانین كە: ئەگەر نوێژ پایەیەكی عیبادییەو، زەكات پایەیەكی ئابوورییە، شووڕاش پایەیەكی سیاسییە، ئەوە لە لایەك، پاشان خوای پەروەردگار بەپێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: (وشاورهم في الأمر) آل عمران -١٥٨-. وەك دەبینین بە ئەمر پێی دەفەرموێ: ڕاوێژیان پێبكە، لە كاروباردا.

- بەڵام مامۆستا! ئێمە دەزانین ڕاجیاییەك لەو بارەوە هەیە و هەركام لەم ئایەتانە بە پێی دوو تەفسیری جیا، شووڕا دەكەن بە ئاگاداركەرەوە (مُعْلِم)، یان پابەندكەر (مُلزِم)، بۆ نموونە: لە ڕۆژگاری ئەبووبەكردا، كە جەنابت زۆر وەصفی ئەبووبەكر دەكەی (خوا لێی ڕازی بێ) كە چاكترین كەسیشە دوای پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەبینین: ئەو خەلیفە ڕاشیدە لە جەنگی هەڵگەڕانەوە (ردة)دا، هەرچەندە زۆربەی هاوەڵان ڕایان وابوو، كە شەڕیان لەگەڵ نەكرێ، بەڵام ئەبووبەكر (ڕەزای خوای لێ بێ) گوتی: ئەگەر بە تەنهاش بووبم، خۆم ئەو جەنگە دەكەم!

زانایان بۆ ئەو مەسەلەیە دوو جۆرە وەڵامیان هەیە:

وەڵامی یەكەم: ئەوەیە كە ئەبووبەكر (ڕەزای خوای لێ بێ)، دەق (نص)ی بەدەستەوە بووە، ئەویش ئەو ئایەتەیە، كە دەفەرموێ:

﴿فَإِن تَابُواْ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُاْ ٱلزَّكَوٰةَ فَخَلُّواْ سَبِيلَهُمۡۚ﴾ التوبة:٥.

هەروەها هەر لە سوورەتی (التوبة)دا دەفەرمویٚ:

﴿فَإِن تَابُواْ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُاْ ٱلزَّكَوٰةَ فَإِخۡوَٰنُكُمۡ فِي ٱلدِّينِۗ﴾ التوبة:١١.

کەواتە: ئەگەر نەگەڕانەوە و، نویٚژیان نەکرد و، زەکاتیان نەدا، براتان نین لە دیندا، لە ئایەتەکەی پیٚشوودا دەفەرمویٚ: [فَخَلُّواْ سَبِيلَهُمۡ] یانی: بەپیٚچەوانەوە: ئەگەر نویٚژیان نەکرد و، زەکاتیان نەدا، لیٚیان مەگەڕیٚن، چونکە نویٚژی فەرز هەقی خوایە، زەکاتیش هەقی خەڵکە! ئنجا ئەبووبەکر (خوا لیٚی ڕازی بیٚ) دەقی قورئانی بەدەستەوە بوو، وە گوتی: خوای پەروەردگار نویٚژ و زەکاتی بەیەکەوە باس کردوون، منیش لە هیچ کەسیٚك قبووڵ ناکەم لە یەکیان جیابکاتەوە، نویٚژ هەقی خوایە و، زەکات هەقی خەڵکە، ئیدی هاوەڵانیش (خوا لیٚیان ڕازی بیٚ) دوای ئەوەی ئەبووبەکر ئاماژەی بۆ ئەو ئایەتانە کردوە و ئەو فەرمایشتەی بۆ باس کردن، کە دەفەرمویٚ:

{أُمِرْتُ أَنْ أُقَاتِلَ النَّاسَ حَتَّى يَشْهَدُوا أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللهِ، وَيُقِيمُوا الصَّلاَةَ، وَيُؤْتُوا الزَّكَاةَ، فَإِذَا فَعَلُوا ذَلِكَ عَصَمُوا مِنِّي دِمَاءَهُمْ وَأَمْوَالَهُمْ، إِلاَّ بِحَقِّ الإِسْلاَمِ وَحِسَابُهُمْ عَلَى اللهِ} أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ برقم: (٢٤)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٣٦).

واتە: فەرمانم پیٚکراوە کە لەدژی خەڵك بجەنگم، هەتا شایەتمان دیٚنن، کە: جگە لە خوا هیچ پەرستراویٚك نیە، وە کە موحەممەد پیٚغەمبەری خوایە، وە نویٚژ بەرپا دەکەن و زەکات دەدەن، ئنجا ئەگەر ئەوەیان کرد، ئەوە خویٚن و ماڵی خۆیانیان لە من پاراستوە، مەگەر بە هەقی ئیسلام، وە لیٚپرسینەوەیان لەسەر خوای بەرزە.

دیارە ئەو کاتە سەرانە (جزیة) دیاریی نەکراوە، یان پیٚغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بەوە ئیکتیفای کردوە، کە لە فەرمایشتەکانی دیکەیدا باسی کردوە.

شایانی باسیشە لە هەندێك ڕیوایەتدا هاتوە، کە هاوەڵان (خوا لێیان ڕازی بێ) ئەو فەرموودەیان بە بەڵگە هێناوەتەوە، لە بەرانبەر قسەی ئەبووبەکردا (خوا لێی ڕازی بێ)، ئەبووبەکریش لە وەڵامیان دا گوتوویەتی: پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: (إلاّ بحقهّا) یان (الاّ بحق الإسلام) ئنجا گوتوویەتی: (والزکاة من حقها) واتە: پاش شایەتمان هێنان، دروست نیە جەنگ لە دژی ئەو کەسانە بکرێ، کە خۆیان بە مسوڵمان دادەنێن، مەگەر بە چواندنی فەرزێك، کە هەقی شایەتمانە و، دەبێ جێبەجێ بکرێ و، زەکاتیش یەکێکە لە هەقەکانی..

دیارە ژمارەیەکی زۆریش لەوانەی، کە خەلیفەی یەکەم (خوا لێی رازی بێ) لە جەنگی هەڵگەڕانەوە (حرب الردة)دا جەنگی لە دژ بەرپاکردن، کەسانێك بوون کە دەیانگوت: مسوڵمانین، بەڵام زەکات نادەین! بۆیە هەندێك لە مێژووزانەکان، ناوی جەنگەکەیان بە: (قتال مانعی الزکاة) [جەنگ دژی زەکات نەدەرەکان] ناوزەد کردوە.

- یانی: ئەبووبەکر[1] دەق (نصّ) ی بەدەستەوەبووە!

---

(١) ئنجا بابۆ زیاتر ڕوونبوونەوەی مەبەست، گوێ بۆ ئەم وتووێژەی نێوان ئەبووبەکر و عومەر، بگرین لەبارەی فەرموودەی ناوبراوەوە و، لەکاتی جەنگی هەڵگەڕانەوە (حرب الرِّدّة)، یان جەنگی دژی زەکات نەدەران (قتال مانعی الزکاة)دا:

[عن أبي هريرة رضي الله عنه قال: لَمَّا تُوُفِّيَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) وَاسْتُخْلِفَ أَبُو بَكْرٍ بَعْدَهُ ، وَكَفَرَ مَنْ كَفَرَ مِنَ الْعَرَبِ , قَالَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ لأَبِي بَكْرٍ : كَيْفَ تُقَاتِلُ النَّاسَ ، وَقَدْ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): " أُمِرْتُ أَنْ أُقَاتِلَ النَّاسَ حَتَّى يَقُولُوا : لا إِلَهَ إِلا اللَّهُ , فَمَنْ قَالَ لا إِلَهَ إِلا اللَّهُ فقد عَصَمَ مِنِّي مَالَهُ وَنَفْسَهُ إِلا بِحَقِّه ، وَحِسَابُهُ عَلَى اللَّهِ؟! فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ : وَاللَّهِ لأُقَاتِلَنَّ مَنْ فَرَّقَ بَيْنَ الصَّلاةِ وَالزَّكَاةِ، فَإِنَّ الزَّكَاةَ حَقُّ الْمَالِ , وَاللَّهِ لَوْ مَنَعُونِي عِقَالا كَانُوا يُؤَدُّونَهُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ لَقَاتَلْتُهُمْ عَلَى مَنْعِهِ، فَقَالَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ : فَوَاللَّهِ مَا هُوَ إِلاّ أَن رَأَيْتُ اللَّهَ عزوجل قد شَرَحَ صَدْرَ أَبِي بَكْرٍ لِلْقِتَالِ ، فَعَرَفْتُ أَنَّهُ الْحَقُّ]. رواه البخاري: ٦٨٥٥، ومسلم: ١٢٤، وأبوداود: ١٥٥٧، والترمذي: ٢٦٠٧، والنسائي: ٣٩٨٥.

واتە: کاتێك پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) کۆچی دوایی کرد و ئەبووبەکر دوای وی کرایە جێنشین، وە خەڵکێك لە عەرەبەکان کافربوونەوە، عومەری کوڕی خەتتاب بەئەبووبەکری گوت: چۆن لەدژی ئەو خەڵکە دەجەنگی، ئەدی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) نەیفەرمووە: فەرمانم پێکراوە لە دژی خەڵك بجەنگم، هەتا دەڵێن: بێجگە

دەق(نص)ی بەدەستەوە بوو، ئەمە وەڵامێك.

وەڵامی دووەم: ئەوەیە، کە دەڵێن: ئەبووبەکر (خوا لێی ڕازی بێ) هاوەڵانی ئیقناع کردو هاتنە سەر ڕایەکەی وی، واتە: ئەوانەی، کە دەڵێن: ئەبووبەکر دەقی بەدەستەوە نەبووە، دەڵێن: ئەبووبەکر لە پێش دا عومەری ئیقناع کرد (خوا لێیان ڕازی بێ) بۆیەش عومەر گوتوویەتی: کە زانیم ئەبووبەکر لەسەر ئەو ڕایە سوورە، خوای پەروەردگار دڵی منیشی بۆ گوشاد و واڵا کرد، ئنجا دیارە هاوەڵانیش لەسەر ئەو ڕایە سوورە، متمانەیان بە ئەبووبەکر و عومەر هەبووە و، ئەوانیش هاتوونە سەر ڕایەکەی ئەو دوانە.

بۆ مەسەلەی (ڕاوێژ)یش ڕام وایە، کە ئەو ڕایە بەڵگەدارتر و بەهێزترە کە دەڵێ: ئەنجامی ڕاوێژ پابەند کەرە (مُلْزِم)، چونکە ئەگەر تەماشای دەقەکانی قورئان و سوننەت بکەین و، تەماشای سیرەی پێغەمبەر و چوار خەلیفەکانی بکەین، دەبینین: هیچ کاتێك نەبووە کە مسوڵمانان شتێکیان خستبێتە ڕاوێژەوەو، پاشان ڕای زۆربە لە لایەك بێت و، بە لای کەمینەدا شکابنەوە و، ڕای زۆربەیان فەرامۆش کردبێ!

- مامۆستا! فەرمووت لە مێژووی ئیسلام دا شتی وا نەبووە، ڕای زۆربە پشت گوێ بخرێ، ئایا دیلەکانی جەنگی بەدر، زۆرینە ڕایان وانەبوو بەر بدرێن؟!

من هیچ بەڵگەیەکم لەسەرئەوە پێ شك نایەت، کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەبارەی مەسەلەی دیلەکانی جەنگی بەدرەوە ڕاوێژی گشتی بەهاوەڵانی کردبێ، کە ئایا بەربدرێن، یان نا؟!

---

لە خوا هیچ پەرستراونین، ئنجا هەرکەس گوتی: (لا اله الا الله) ئەوە سامان و گیانی خۆی لەمن پاراستوە، مەگەر بەهەقی خۆی، وە لێپرسینەوەش عایدی خوایە؟!
ئەبووبەکریش گوتی: بەخوا دژی کەسێك دەجەنگم، کە نوێژ و زەکاتی لەیەك جیاکردۆتەوە، چونکە زەکات هەقی ماڵ و سامانە، بەخوا ئەگەر پەتێك کاتی خۆی - وەك زەکات - داویانە بەپێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) نەمدەنێ، لەسەری لەدژیان دەجەنگم.
عومەری کوڕی خەتتاب گوتی: بەخوا کاتێك دیتم خوا عز وجل سینەی ئەبووبەکری بۆ جەنگ گوشادکرد، زانیم کە ئەو (هەڵوێست)ە، هەقە.

وە هیچ بەڵگەیەك نیە، كە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) مەسەلەیەكی خستبێتە ڕاوێژی گشتییەوە، پاشان بەڕای زۆرینەوە پابەند نەبووبێ.

ڕاوێژكردنی پێغەمبەریش بەهاوەڵانی بەڕێزی (خوا لێیان ڕازی بێ) لەبارەی دیلەكانی جەنگی بەدرەوە، لەجۆری ڕاوێژكردن بوو، بەخەڵكی پسپۆڕ و شارەزا، چونكە ڕاوێژی بەكەسانێكی كەم كرد، لەپێش هەموانەوە: ئەبووبەكر و عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ)، وە پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) ڕای ئەبووبەكری بەلاوە پەسەند بوو،بەڵام ڕاستیی لە ڕایەكەی عومەر دابوو، خوای كاربەجێش بەوبۆنەوە ئەم ئایەتەی ناردەخوارێ:

﴿ مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَكُونَ لَهُۥٓ أَسْرَىٰ حَتَّىٰ يُثْخِنَ فِى ٱلْأَرْضِ ۚ تُرِيدُونَ عَرَضَ ٱلدُّنْيَا وَٱللَّهُ يُرِيدُ ٱلْـَٔاخِرَةَ ۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٦٧﴾ ﴾ الأنفال-٦٧-.

واتە: هیچ پێغەمبەرێك نابێ جەنگاوەرانی دوژمن بەدیل بگرێ و بیانهێڵێتەوە، هەتا لە پەل و پۆیان نەخات لەمەیدانی زەمین دا، ئێوە بەرژەوەندیی دنیاتان دەوێ و خواش دوارۆژی دەوێ، وە خوا زاڵی كاربەجێیە.

ئاشكراشە كە ئەنجامی ئەوجۆرە ڕاوێژكردنەش، بەڵگە یەكلایی دەكاتەوە، نەك زۆرینە.

بەڵێ، هەمیشە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بە پێی ڕای زۆرینەی كردوە، تاكو ئەو كاتەی هیچ دەقێكی قورئان لەو بارەیەوە نەهاتۆتە خوارێ، وە مەجالی ڕاوێژ و ئیجتیهادی تێدا هەبووە، كە ئەوە مەسەلەیەكی زۆر گرنگە، ئێمە بۆچی دەڵێین: زۆرجار دیموكراسی خەڵك تووشی زۆر كاری سەقەت و خراپ دەكات، چونكە هیچ شتێك بۆ خوای پەروەردگار ناهێڵێتەوە!! بەڵام زانایانی ئیسلام وەك بنچینەیەكی شەرعیی (قاعدة شرعیة) گوتوویانە: (لا اجتهاد في معرض النص) یان (لا اجتهاد في مقابل النص) [لەبەرامبەر دەق دا، كۆششكردن دروست نیە] بەڵێ، مادام خوای پەروەردگار شتێكی فەرموو بێت، یان پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) شتێكی فەرموو بێت، تازە ئەگەر خەڵك خۆی بە مسوڵمان بزانێت، مەجالیان بۆ نەماوەتەوە، كە ڕایەكی دیكە

بڵێین[١]، وەك خوای بەخشندە دەفەرموێ:

﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ ٱلْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ ۗ وَمَن يَعْصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَٰلًا مُّبِينًا ﴿٣٦﴾﴾ الاحزاب: ٣٦.

واتە: هیچ پیاوێکی بڕوادار و هیچ ئافرەتێکی بڕوادار بۆیان نیە، کە خوا و پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بڕیارێکیان دا، تێیدا سەرپشك بن، [بەڵکو دەبێ جێبەجێی بکەن] وە هەر کەسێك سەرپێچیی خواو پێغەمبەرەکەی بکات، ئەوە بە شێوەیەکی ڕوون و بێ چەند و چوون سەرگەردان بووە.

- مامۆستا! پرسیارەکە دووبارە دەکەمەوە: باشە ئەگەر دەقەکان ئەوها لات ڕوونن، خۆ ئێمە گومانمان لەوەدا نیە، کە تا زانایان نزیك تر بووبن لە ڕۆژگاری پێغەمبەری خواوە (صلى الله عليه وسلم)، زیاتر و چاکتر لە دەقەکان تێگەیشتوون، بەڵام زۆر باس لەوە دەکرێ، کە دەبێ ئێمە بە تێڕوانینی سەلەف ئایەت و حەدیس و دەقە شەرعییەکان سەیر بکەین، بە درێژایی مێژووی ئیسلامیی، یاخود مێژووی سیاسی ئیسلامیی، بۆچی ئەو حەقیقەتە، کە ئێستا لەلای جەنابت حەقیقەتێکە، لە خەڵکی گوم بووە؟! یانی: ئیش کردن بەڕای زۆرینە و بە ڕاوێژ، سەیر دەکەی، هەر لە سەردەمی ئومەوییەکان و عەبباسییەکانەوە، ئەوە کە جەنابت دەیفەرمووی، حەقیقەتێکی دیار نیە؟!

ئێستا وەڵامی ئەو پرسیارەت عەرز دەکەم: جارێ ئەوە، کە زۆرینە لە ئیسلام دا ڕێزی تایبەتی بۆ ڕایان دانراوە، ئەوە لە کاتێك دایە کە دەق (نص) نەبێ، بەڵام کاتێك کە خوا شتێکی فەرموو، لە بەرانبەریدا زۆرینە و کەمینە نیە، چونکە تاك، یان کۆمەڵ مادام خۆی بە بەندەی خوا زانی، دیارە لە شتە ڕوون و بەڵگە نەویستەکانی ئیمانە، کە خوا لە هەموو کەس زاناترە و، لە هەموو کەس بە تواناترە و، لە هەموو کەس کاربەجێترە و، لە هەموو کەس بە بەزەیترە،

---

(١) هەڵبەتە ئەوە لەکاتێك دایە کەدەق (نص)ەکە: هەم لەڕووی سەنەدەکەیەوە جێی متمانە و دڵنیایی تەواوبێ و، هەم لەڕووی واتا و مەبەستەکەشیەوە، ڕوون و یەکلایی کەرەوە بێ.

كەواتە: كاتێك خوا شتێك بفەرموێ، دەبێ هەموو لایەك بۆی تەسلیم بن، وە ئەگەر لە شتێك دا، لێی حاڵی نەبوون، دەبێ زیاتر لێی ورد بنەوە و عەقڵی خۆیان تۆمەتبار (متَّهم) بكەن، كە تێی نەگەیشتوە، نەك لە دەقەكاندا بكەونە دوو دڵییەوە، مادام بڕوایان وایە، كە ئەو دەقە خوا ناردوویەتی، یان پێغەمبەرەكەی (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی.

وە بە نسبەت ئەوەشەوە، كە تۆ گوتت، دەڵێم: دیارە خوای پەروەردگار ئەوە، كە خەڵك مل كەچ دەبن بۆ شەریعەت و پێوەی پابەند دەبن، یان نا؟ هەڵبژاردن (خیار)ی داوەتە دەست خۆیان و خوای كاربەجێ مەلائیكەی نەناردوون، ملی خەڵكی بسووڕێنن بە تۆبزیی و بە زۆر بیانخەنە سەر جادەی شەرع، چ ئەوەی، كە هەر ئیمانی پێ ناهێنێ، وە چ ئەوەی، كە بە لاریی مسوڵمانەتییەكەی دەكات، چونكە خوای زانا و توانا ژیانی دنیای هەڵخستوە بۆ تێدا تاقیكردنەوەی بەندەكان، وەك فەرموویەتی:

﴿ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْمَوْتَ وَٱلْحَيَوٰةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ﴾ الملك: ٢.

واتە: خوا مردن و ژیانی ڕەخساندوون، تاكو تاقیتان بكاتەوە، داخۆ كامتان كردەوەی چاكترە.

مرۆڤەكان ڕێیان پێدراوە، كە هەر لە ئەصڵ دا: بكەونە سەر جادەی ئیسلام، یان نا؟! وەك فەرموویەتی:

﴿ وَهَدَيْنَٰهُ ٱلنَّجْدَيْنِ ﴿١٠﴾ ﴾ البلد: ١٠، واتە: ئێمە دووڕێیەكانمان پێشان داون..

پاشان، كە دەكەونە سەر جادەی شەریعەتیش و مسوڵمان دەبن، دیسان بواریان پێدراوە و ئیرادەیان زۆری لێنەكراوەو جەبری لێنەكراوە، بەڵكو ئیرادەیەكی ئازادیان هەیە، داخۆ، تاكو چ ئەندازەیەك و بەچ نسبەتێك پابەند دەبن بەشەریعەتەوە؟ ئاشكراشە ئەو كاتەی كە مسوڵمانان بڕواداری باشبن، پابەندی باشیش دەبن و، كاتێكیش كە عەقیدەو ئیمانەكەیان بێهێز دەبێ، پابەندییەكەشیان بێهێز دەبێ، بەتایبەتی ئەوانەیان، كە دەستەڵاتدارن.

ئنجا لە سەردەمی پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) وە خەلیفە ڕاشیدەکانی دا (خوا لێیان ڕازی بێ) بەو شێوەیە بووە، کە باسمان کرد، جارێ پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ئەوە پێغەمبەری خوایە و خۆی ناردوویەتی، وە هەرکام لە (ئەبووبەکر و عومەر و عوسمان و عەلی) خوا لێیان ڕازیبێ، هەر چواریان خەڵك هەڵیان بژاردوون، بەڵام هەندێك کەس لەوە حاڵی نابێ، کە ئەبووبەکر (خوا لێی ڕازی بێ) وەسیەتی کردوە: لە دوای خۆی (عومەر) خەلیفە بێ، ڕەزای خوای لێ بێ، بەڵام زانایانی ئیسلام هەموویان دەڵێن: ئەوە بەس کاندیدکردن (ترشيح) بووە[1]، چونکە بێگومان، ئەگەر هاتباو مسوڵمانان دوایی بەیعەتیان بە عومەر نەکردبایە، ئایا تەنها بەو پێشنیارکردن (ترشيح)ەی وی دەبوو بە خەلیفە (خوا لێیان ڕازی بێ)؟ بێگومان نەخێر.

هەروەها (عوسمان) و(عەلی)یش هەروا (خوا لێیان ڕازی بێ)، چونکە (عەلی) لە یەکێك لە وتارەکانی (نهج البلاغة)دا، کە بەڵگە دێنێتەوە لەسەر شەرعیەتی حوکمڕانێتیی و خەلیفایەتییەکەی خۆی، لە بەرانبەر (معاوية)دا دەڵێ: ئەوانەی منیان هەڵبژاردوە بە خەلیفە، هەر ئەوانەن کە (ئەبووبەکر و عومەر و عوسمان) یان هەڵبژاردوون[2]، واتە: نوێنەرانی میللەت کە لە زاراوەی فیقهییدا پێیان دەگوترێ: (أهل الحل و العقد) وە بە زاراوەی ئەمڕۆ (مجلس الشورى) کەواتە: هەر چوار خەلیفە ڕاشیدەکانی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەسەر بناغەی شووڕا دانراون و، نوێنەرانی میللەت هەڵیان بژاردوون.

بەڵام دوای ئەوەی کە سەردەمی جێنشینایەتیی سەر ڕاستانە (الخلافة الراشدة) بەسەر دەچێ و، لە سەردەم و ڕۆژگاری حوکمڕانە میراتییە ئومەوییەکان بەملاوە، لادان (إنحراف) لەو مەسەلەیەدا کراوە، هەرچەندە بێگومان ئەو دەقە

---

(١) بۆ وێنە: بڕوانە: (منهاج السنَّة) لابن تيمية، ج١ص١٤١، ١٤٢.
کە گوتوویەتی: (...وكذلك عمر لما عهد إليه أبو بكر، إنما صار إماماً لما بايعوه وأطاعوه، ولو قدر أنهم لم ينفذوا عهد أبي بكر ولم يبايعوه، لم يصرْ إماماً).

(٢) نهج البلاغة، ص ٤٢١، [إنَّه بايَعني الذين بايعوا أبابكر وعمر وعثمان...].

شەرعییانە (النصوص الشرعية) هەر هەبوون!! هەربۆیەش كاتێك كە (معاوية) دەیەوێ بەزۆر بەیعەت لە مسوڵمانان وەربگرێ بۆ (یزید)ی كوڕی! واتە: جارێ بۆ خۆی هەر زیندووە و بە زۆر بەیعەت وەردەگرێ لە مسوڵمانان، بۆ ئەوەی (یزید) لە دوای خۆی ببێ بە حوكمڕان!!

دیارە ئێمە گومانی چاك بە (معاوية) دەبەین و ناڵێین: حەتمەن نیازو مەبەستی خراپی هەبووە، بەڵكو لەوانەیە بە ئیجتیهادی[1] خۆی بۆ چاكەی بووبێ و نیازی چاك بووبێ و گوتبێتی: ئەگەر مسوڵمانان بەر لەوەی بمرم، حوكمڕانێكیان هەبێ، چاكترەو گرفتیان بۆ دروست نابێ؟! بەڵام بە تەئكید لە ئیجتیهادە كەیدا نەی پێكاوەو، ئەو ڕەفتارەی لادانێك بوو لە ڕێبازی ئیسلام و، ڕێ و شوێنی پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) و خەلیفە ڕاشیدەكانی، هەر بۆیەش (عبدالرحمن بن أبی بكر) ڕوو بە (معاوية) گوتی: ئایا حوكمڕانێتیی ئیسلامیی پادشایەتیی ڕۆمەكانە، هەر هیرەقلێك ڕۆیی، یەكی دیكەبێ؟![2]

---

(١) بەڵام بێگومان (معاوية) بۆی نەبووە لەمەسەلەیەك دا ئیجتیهاد بكات، كە شەریعەت هەڵیبڕیوە، ئەویش ئەوەبووە كە بناغەی دەسەڵات پێ سپێران لەئیسلام دا، ڕاوێژ (شورى)ە، نەك میرات و لەجێی خۆدانان!

ئێستاش (٢٠١٥/٠٨/٢٣ز- ٨ ذي القعدة ١٤٣٦ك) دەڵێم: ڕەفتارەكەی (معاوية) لە (إشتهاء)ەوە نیزیكترە، تاكو (إجتهاد)، چونكە: هەر بۆچوونێك لەگەڵ ڕێبازی پێغەمبەردا دژبوەستێ، بناغەكەی (إشتهاء)ە.

(٢) بڕوانە: صحيح تأريخ الطبري، ج٤ص١١١، محمد بن طاهر البرزنجي، كە ئەمە دەقی ئەو بەسەرهاتەیە، كە ئەو قسەیەی (عبدالرحمن بن أبی بكر) لەسیاقەكەیدا هاتوە:

[أخرج البخاري في صحيحه (كتاب التفسير) [ح: ٤٨٢٧] عن يوسف بن ماهك قال: كان مروان على الحجاز استعمله معاوية، فخطب فجعل يذكر يزيد بن معاوية لكي يبايع له بعد أبيه، فقال لَهُ عبدالرحمن بن أبي بكر شيئاً، فقال خذوه، فدخل بيت عائشة، فلم يقدروا عليه، فقال مروان: إن هذا الذي أنزل الله فيه: ( والذي قال لوالديه أُفٍ لكما أتعدانني ان أخرج وقد خلت القرون من قبلي..) فقالت عائشة من وراء الحجاب: ماأنزل الله فينا شيئاً من القرآن، الا أَنَّ الله أنزل عذري.

قلنا: والشيء الذي قالَهُ عبدالرحمن بن أبي بكر هو ما بيَّنَتْهُ رواية ابن أبي حاتم عن عبدالله بن المديني قال:

جا دیارە قسەکەی (عبدالرحمن) دەربڕی هەست و نەستی سەرجەم مسوڵمانان بووە، وە بە تەئکید مسوڵمانان زانیویانە کە ئەوە حاڵەتێکی سەیر و نائاساییی و، حاڵەتێکی نا شەرعییەو بە دەقی فەرموودەی پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم)، ئەو هەڵوێست و ڕەفتار و لادانە، مەحکووم کراوە، وەك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرمویێ:

(خلافة النبوة ثلاثون سنة، ثم يؤت الله ملكه من يشاء) رواه أحمد والترمذي والنسائي وأبوداود.

---

إني لفي المسجد حين خطب مروان فقال:إنَّ الله قد أرى أمير المؤمنين في يزيد رأياً حَسناً، وإنْ يَسْتخْلِفْهُ فقد اُستخْلَفَ أبوبكرٍ عمَر.
فقالَ عبدالرحمن بن أبي بكرٍ: أهِرَقْليَّةٌ؟ إنَّ أبابكرٍ والله ماجعلها في أحَدَ من وَلَدِهِ ولا أحدٍ من أهل بَيْته، ولا جعَلَها معاوية في وَلَدِهِ الا رحمةً وكرامةً لِوَلَدِهِ.
تفسير ابن كثير، سورة الأحقاف، آية:١٧.]
واتە: (يوسف بن ماهك) گوتوویەتی: مەڕوان (ی کوڕی حەکەم) کە موعاویە کردبوویە والی بەسەر حیجازەوە، وتاریداو باسی یەزیدی کرد، تاکو دوای بابی بەیعەتی بۆ وەربگرێ، (عبدالرحمن بن أبی بکر)یش قسەیەکی پێگوت، ئەویش گوتی:
بیگرن، ئەویش چووە ماڵی عائیشەوە و نەیانتوانی بیگرن، مەڕوانیش گوتی: ئەمەبوو کە خوا ئەو ئایەتەی لەبارەوە ناردەخوار:
[وە ئەوکەسەی کە بەباب و دایکی گوت: ئۆف بۆ ئێوە! ئایا گفتم پێدەدەن کە لەزەوی بهێنرێمەوە دەرێ (پاش مردن) لەحاڵێك دا کە چەندان سەدە پێش من ڕابردوون؟!]
عائیشەش لەپشت پەردەوە گوتی: جگە لەدەرخستنی پاکیی من خوا، هیچ شتێکی لەقورئان لەبارەی ئێمەوە، نەناردۆتە خوارێ.
**دەڵێین**: ئەوە کە (عبدالرحمن بن أبی بکر) گوتوویەتی: ئەوەیە کە گێڕانەوەکەی (ابن أبی حاتم) لە (عبدالله بن المدینی)یەوە هێناویەتی، گوتوویەتی: لەکاتێك دا مەروان وتاریدا، من لەمزگەوتێ بووم، گوتی: خوا ڕایەکی باشی لەبارەی یەزیدەوە، پێشانی فەرماندەی بڕواداران (معاویة) داوە، وە ئەگەر بیشیکاتە جێنیشن، ئەبوبەکریش عومەری کردە جێنشین!
(عبدالرحمن بن أبی بکر)یش گوتی: ئایا هیرەقلایەتییە؟!
بێگومان ئەبوبکر حوکمڕانیی لەنێو کوڕەکانی دادانەنا، هەروەها لەنێو خزمەکانیشی دا دایەنەنا، بەڵام (معاویة) تەنیا لەڕووی سۆز و عاتیفەوە و بۆ ڕێزگرتن، کوڕەکەی دەکاتە جێنشین.

پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بە ڕوونیی دەفەرموێ: جێنشینایەتیی پێغەمبەرایەتیی سی (٣٠) ساڵ دەبێ، پاشان دوایی خوا حوکمڕانیی دەداتە هەرکەسێك کە بیەوێ. ئنجا با تەماشا بکەین: دوو (٢) ساڵ و سێ مانگی ئەبووبەکر (خوا لێی ڕازی بێ)، وە دە (١٠) ساڵ و شەش مانگی عومەر (خوا لێی ڕازی بێ)، پاشان دوازدە (١٢) ساڵی عوسمان (خوا لێی ڕازی بێ)، لەگەڵ چوار (٤) ساڵ و نۆ (٩) مانگی عەلی (خوا لێی ڕازی بێ)، لەگەڵ شەش مانگی (حەسەن)ی کوڕی عەلی (خوا لێیان ڕازی بێ) ئەو پێنج کەسە (دیارە حەسەن بە کردەوە خەلیفایەتیی بۆ نەکرا، بەڵام ئەو پێنج خەلیفانە، مسوڵمانان بۆ خۆیان هەڵیان بژاردن، کە ماوەی حوکمەکەیان سی (٣٠) ساڵی ڕێکە، ئنجا ئایا حوکمڕانیی دوای ئەوان چییەو چۆنە؟!

پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێ: (ثم یؤت الله ملكه من یشاء) واتە: پاشان خوا پادشایەتیی، دەدا بە هەر کەسێك کە بیەوێ! هەروەها فەرموویەتی: (ثم یكون مُلكاً عضوضاً) وە فەرموویەتی: (ثم یكون ملكاً جبرياً)، (عضوض) واتە: شتێك بە تۆبزیی و بەزۆر بیگری[1] و (جَبْرِي)[2]یش یانی: خۆسەپاندن، کەواتە: ئەمانە دەقەکان بوون، وە دەقەکان زۆر ڕوونن لەوبارەوە، کە دەبێ حوکمڕانانی مسوڵمانان بەڕاوێژی خۆیان و ئیرادەی ئازادیان، بیانکەنە کاربەدەستیان، نەك بەخۆسەپاندن و خۆفەرزکردن، بەڵام ئایا دەقەکان خۆیان کاردەکەن، ئەدی نابێ خەڵکی جێبەجێیان بکەن؟ لێرەدا بابۆ ڕوون بوونەوەی مەبەست لەو بارەوە بەسەرهاتێك بگێڕمەوە: لە شەڕی (صفین)دا سوپای (معاوية)، کە زانیان خەریکە بدۆڕێن، قورئانیان بەرز کردەوەو گوتیان: با قورئان حەکەم بێ، ئیدی کۆمەڵی (خوارج) فشاریان خستە سەر خەلیفە - عەلی - و گوتیان: دەبێ شەڕەکە ڕابگری، چونکە سوپای بەرانبەر دەڵێن: دەبێ قورئان حەکەم بێت! (عەلی) خوا لێی ڕازی بێ گوتی: ئێوە کۆمەڵێکی نەزانن، بەڵێ، هەر دەبێ قورئان حەکەم بێت و تەنها خوا (حاكم)ە، قسەکە هەقە، بەڵام بۆ

---

(١) ملك عضوض: فيه عَسْفٌ وظُلْم، المعجم الوسيط، ص٦٠٧.

(٢) جَبَرَه على الأُمر: أَلْزَمَهُ بفعله وأجبره: أكرهه وأَلْزمَهُ بفعله. المنجد: ص٧٨.

مەبەستێکی بەتاڵ بەکاردێ (كلمة حق أريد بها باطل)، چونکە خۆ خوا خۆی نایەتە خوار، لێرە ببێ بە حوکمڕان!!

قورئان حاکمەو خوا حاکمە، بەڵام لە ڕێی خەڵکەوە حاکمییەتەکەیان جێبەجێ دەبێ، دەبێ مسوڵمانان هەبن و، حوکمەکانی قوڕئان جێبەجێ بکەن و، کاربەدەستەکانی خۆیان هەڵبژێرن و، ئەوانیش شەریعەت پیادەبکەن.

- باشە ماموستا گیان! کەواتە: ئەو شتانەی کە لە دیموکڕاسی دا هەن: دەستاو دەست پێکردنی دەسەڵات (تداول السلطة)، هەڵبژاردن، ئیش کردن بە ڕاوێژ و، وەرگرتنی ڕای زۆربە، دابین کردنی ئازادییەکان، ئەمانە هەموویان لە ئیسلامدا هەن، کەواتە: ئایا لە ڕووی سیستمی حوکمەوە، ناکرێ بڵێین: سیستەمی فەرمان ڕەوایی لە ئیسلامدا، بریتیە لە دیموکڕاسی؟!

نەخێر، وە دەمەوێ لێرەدا ئاماژە بۆ ئەوە بکەم، کە بەداخەوە هەندێك لە خەڵکی ئیسلامییمان هەیە، کە من ڕێزم بۆ هەموو خوشك و برایەکی مسوڵمان هەیە، بەڵام ڕێزگرتنم بۆی، ڕێم لێ ناگرێ، کە ئەگەر ناتەواوییەك و کەم و کوڕییەك لە قسەیەکی و لە هەڵوێستێکیدا ببینم، پێشانی بدەم و بیخەمە ڕوو، ئنجا دەڵێم: بەداخەوە هەندێك خەڵکی ئیسلامییمان هەیە، کە لە ژێر فشار و تاووتینی ئەو هێرشە ڕاگەیاندنەی، وە ئەو هێرشە سیاسیی و ئابووریی و سەربازییەدا، کە ڕۆژئاوا بە سەرۆکایەتیی (ئەمەریکا) دەیکاتە سەر عالەمی ئیسلامیی، حاڵەتێکی بەزین و تێشکانی دەروونییان، بۆ دروست بووە و لەبەردەم ئەم زاراوەو سیستەمانەدا، کە ئێستا ڕەواجیان هەیە، سام و هەیبەتێکی زۆریان لێ نیشتوە، وە تەواو شەرمیان لێ دەکەن!!

بۆ وێنە: کە باسی ناسیۆنالیزم، یان باسی سیکۆلاریزم، یان باسی دیموکڕاسی، یان باسی (گلۆبالیزەیشن - العولمة) دەکرێ، ئەوانە دەیانەوێ، هەرچۆن بێ، مل بە ئایەت و حەدیسەکان بسوورێنن و، لەگەڵ هەموو ئەو زاراوە و بیردۆزانەدا بیانگونجێنن، باسی هەر شتێك دەکرێ، دەیانەوێ هەرچۆن بێ و بە (تأويل) و پینە و پەڕۆ ش بێ، بڵێن: ئیسلامیش هەروایە! بەڵام بەدڵنیاییی، بێگومان جۆرێك لە

بەزین و تێشكانی دەروونییە، جارێ دیموكڕاسی ماوەی (٢٠٠ - ٣٠٠) ساڵێكە لە ڕۆژئاوادا وەك سیستمی حوكم كاری پێدەكرێ، بەڵام ئیسلام (١٤٠٠) ساڵ لەمەوپێش وەك سیستمی حوكمڕانیی كاری پێكراوە و، زۆر بە سەركەتووییش كاری پێكراوە، وە ئەگەر دیموكڕاسی لەجوغزی وڵاتێك و دەوڵەتێك دا، كاری پێدەكرێ، ئەوە سیستمی حوكمڕانیی ئیسلامیی، لە سەردەمی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) وە لە سەردەمی خەلیفە ڕاشیدەكانی دا، لەوڵاتێكی بازنە فراوانی، كە چەندان دەوڵەتی ئێستای گرتبۆوە، كاروباری پێ بەڕێوەبراوەو، سەرپەرشتیی تێكڕای ئۆممەتی ئیسلامیی، بە هەموو نەتەوە و كۆمەڵگا جیاجیاكانیەوە: كردوە، كەواتە:

**یەكەم:** لە ڕووی زەمەنییەوە، ئیسلام زۆر لە پێش دیموكڕاسییەو، دەبێ بڵێین: دیموكڕاسیش فڵان شتەی تێدا هەیە، كە لەهی ئیسلام دەچێ، نەك ئیسلام فڵان شتەی لە هی دیموكڕاسی دەچێ!! واتە: دەبێ دیموكڕاسی هەڵسەنگێنین بە ئیسلام، وە دەبێ دیموكڕاسی خۆی قیاس بكات لەگەڵ ئیسلام دا، وە دەبێ بەژن و باڵای ئیسلام بێنین و دیموكڕاسی خۆی پێ بگرێ، داخۆ تا كوێی دێ؟!

**دووەم:** ئێمە ناتوانین بڵێین: سیستمی حوكمڕانیی ئیسلامیی كتومت سیستمی حوكمڕانیی دیموكڕاسییە، چونكە خوای پەروەردگار ناوی لە ئایین و بەرنامەی خۆی ناوە: (ئیسلام).

﴿وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلۡإِسۡلَٰمَ دِينٗاۚ﴾ المائدة -٣-.

واتە: وە ئیسلامم بە بەرنامە بۆ هەڵبژرادوون.

بەڵێ، ناوی ئایین و بەرنامەكەی خوا (تبارك و تعالی) ئیسلامە و، خواش ئەو ناوەی لێناوە، وەك فەرموویەتی: ﴿وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلۡإِسۡلَٰمَ دِينٗاۚ﴾ المائدة -٣-.

وە فەرمووشیەتی: ﴿وَمَن يَبۡتَغِ غَيۡرَ ٱلۡإِسۡلَٰمِ دِينٗا فَلَن يُقۡبَلَ مِنۡهُ﴾ آل عمران: ٨٥.

سێیەم: خاڵەکانی پێك گەیشتن (نقاط الإلتقاء)ی نێوان ئیسلام و دیموکراسی، لە میکانیزمەکانی دایە، بەڵام جەوهەر و کرۆکی دیموکراسی، کە بریتیە لە حوکم سپاردنی موتڵەق و بێمەرج بە خەڵك، کە بە کەیفی خۆی چاکە و خراپە و حەڵاڵ و حەرام دیاریی بکات و ئەدەب و ڕێ و ڕەسمەکان دیاریی بکات، ئا ئەوە - وەك باسمان کرد - دژایەتیی هەیە لەگەڵ ئەوەدا کە دەبێ خوای پەروەردگار، حاکمی ڕەها (مطلق) بێت، وە دیارە ئەمیش ڕاستەوخۆ پەیوەندیی بە خوا بەیەکگرتن (توحید)ەوە هەیە و، مەسەلەیەکی ڕیشەیی ئیمان و عەقیدەیە.

- مامۆستا گیان! سەبارەت بەو خاڵەی جەنابت باست کرد، دیارە پێت وایە کە دیموکراسی کۆمەڵێ خاڵی چاکی تێدان.

بەڵێ، بەڵام پێشم وایە، بەشێوەیەکی چاکتر لە ئیسلام دا هەن.

- باشە ئەدی ئایا لایەنە خراپەکانی دیموکراسی لەلای جەنابت کامانەن، ئایا ئەو خاڵە جەوهەرییەیە، کە حەڵاڵ و حەرام دیارییکردن بدرێتە دەستی گەل؟!

بەڵێ بێگومان ئەو مەسەلەیە، کە جەوهەر و کاکڵی دیموکراسییە، خراپترین پێکهێنەریشیەتی، چونکە وەك پێشتریش ئاماژەم پێکرد: یەکسەر لەگەڵ ئیمان و عەقیدەدا دژ دەوەستێ، چونکە ئیمان و عەقیدە بناغەی ئیسلامە و، کاکڵ و نێوەڕۆکی ئیمانیش، خوا بە یەکگرتن (توحید الله)ە، وە فەرمانڕەوایەتیی خوا (حاكِمِية الله)ش پەیوەستە بە هەر کام لە دوو بەشە گەورەکەی خوا بەیەکگرتنەوە:

١- خوا بەیەکگرتن لە پەروەردگارێتیی دا (توحيد الله في الربوبية).

٢- خوا بەیەکگرتن لە پەرستراوێتیی (توحيد الله في الألوهية)دا، هەر بۆیەش خوای بەرز و مەزن، دان پێداهێنان بە یاسا دانان (الإقرار بالتشريع)ی بۆ جگە لە خوا، بە هاوبەش بۆ خوا دانان (الإشراك بالله) داناوە، وەك فەرموویەتی:

﴿ أَمْ لَهُمْ شُرَكَٰٓؤُاْ شَرَعُواْ لَهُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا لَمْ يَأْذَنۢ بِهِ ٱللَّهُ ﴾ الشورى:٢١.

واتە: یان ئایا چەند هاوبەشێكیان هەن، كە بەرنامەیەكیان بۆ داناون، خوا مۆڵەتی نەداوە؟!

ئێستاش پاش ئەم ڕوونكردنەوەیە، بە چاكی دەزانم هەندێك قسە لە زانای ناودار (د.یوسف القرضاوي) یەوە بهێنمەوە، دیارە من ڕێزی زۆرم بۆ دكتۆر (د. یوسف القرضاوي) هەیەو، بە زانایەكی خزمەتگوزاری ئیسلامی دەزانم، بەڵام وەك گوتراوە: (لكل جواد كبوة)، وە من هەڵوێستی ناوبراو لە بارەی دیموكراسییەوە، بە هەڵە دەزانم، كە لە كتێبی: (من فقه الدولة في الإسلام) دا دەڵێ: (الواقع ان الذي يتأمل جوهر الديمقراطية يجد أنه من صميم الإسلام)[1] واتە : بەڕاستیی هەر كەسێك سەرنج لە جەوهەری دیموكراسیی بدات، دەزانێ كە لە ناخ و كاكڵەی ئیسلامەوەیە!!

- دیارە تۆ بە پێچەوانەوە دەڵێی !

بەڵێ، من بە عەكسەوە دەڵێم و پێشتریش، تا ڕادەیەك ڕوونم كردەوە، بەڵام من هەر لە قسەكانی (دكتۆر یوسف)ەوە خۆی، بۆت دێنمەوە، كە قسەكانی خۆی هەڵدەوەشێنێتەوە! بەڵام، با جارێ قسەكانی لەو بارەوە بهێنمەوە، كە وەك بەڵگە بۆ ئیسپاتی قسەی پێشووی كردوونی، كە گوایە جەوهەری دیموكراسی و ئیسلام پێكەوە كۆك و تەبان، گوتوویەتی: (إن جوهر الديمقراطية بعيداً عن التعريفات و المصطلحات الأكاديمية، هو أن يختار الناس من يحكمهم و يسوس أمرهم وأن لا يُفْرَض عليهم حاكم يكرهونه، أو نظـــام يكرهونه، وأن يكون لهم حق محاسبة الحاكم اذا أخطأ، وحق عَزْلِهِ وتغييره إذا انحرف، وأنَ لا يُساق الناس رغم أُنوفهم الى اتِّجاهات أو مناهج اقتصادية أو اجتماعية أو ثقافية أو سياسية لا يعرفونها و لا يرضون عنها)[2]. واتە: بێگومان نێوەڕۆكی دیموكراسی، دوور لە پێناسە و زاراوە ئەكادیمییەكان، ئەوەیە كە خەڵك حوكمڕان و سەرپەرشتیارانی خۆیان هەڵبژێرن، وە حوكمڕانێكیان بەسەردا نەسەپێنرێ، كە حەز لە چارەی ناكەن، یان ڕژێمێك

---

(١) ص٣٢.

(٢) من فقه الدولة في الإسلام، ص٣٢.

کە پێی قایل نین، وە کە مافی لێپرسینەوەی حوکمڕانی خۆیانیان هەبێ، هەر کاتێك هەڵەی کرد، وە بۆیان هەبێ، کە لە کاتی لاڕێ بوو و لایدا، لای بەرن، یان بیگۆڕن، وە کە خەڵکی بەرەو هەندێك ڕێڕەو و بەرنامەی ئابووریی و کۆمەڵایەتیی و کلتووریی و سیاسی، ڕاپێچ نەکرێن، کە پێیان ئاشنا نین و نایانەوێن.

بەڵێ (دکتور یوسف القرضاوي) ئا ئەو شتانەی بە جەوهەری دیموکڕاسی داناون، بەڵام بەڕاستیی ئەو شتانە هەموویان لە بازنەی میکانیزمەکان (آليات)ی دیموکڕاسیدان و، جەوهەرو کاکڵەی نین، ڕاستیشە ئەو شتانە مادام بە شەریعەتەوە بەسترابنەوە، هیچ جۆرە ناکۆکیی و تێك گیرانێکیان لەگەڵ سیستمی حوکمڕانیی ئیسلام دا نیە.

دواتر (دکتور یوسف القرضاوي) هەر لەو کتێبەیدا، کە باسمان کرد: (من فقه الدوله في الإسلام) ئەو قسانەی پێشووی هەڵدەوەشێنێتەوە و دەڵێ:

(كما أن الديمقراطية الغربية على مالها من محاسن، لا تحكمها أصول تُقَيِّدُها وتَضْبِط سيرَها، فتستطيع باسم ممثِّلي الشعب، أن تُلْغِيَ الفضائل و أن تقرِّر الرذائل، و أن تُقَنِّنَ المظالم و، ان تُحلِّلَ الحرام، و أن تحرِّمَ الحلالَ، حتى قيل في البرلمان الإنجليزي: انه يستطيع ان يقرر أي شيء، الاّ ان يُحَوِّل الرجلَ الى امرأة، أو المرأة الى رجلٍ).[1]

واتە: هەروەها دیموکڕاسی ڕۆژئاوایی، وێڕای چاکەکانی، کۆمەڵە بنەمایەکی نین، کە بیبەستنەوە و کۆنترۆڵی بکەن، بۆیە بە ناوی نوێنەرانی گەلەوە، دەتوانێ خەسڵەت و بەها بەرزەکان هەڵوەشێنێتەوە و، بڕیار لەسەر خوو و خدە نزمەکان بدات و، ستەم و خراپەکان بخاتە چوارچێوەی یاساوە، وە دەتوانێ حەڕام حەڵاڵ و حەڵاڵ قەدەغە بکات! تەنانەت لە بارەی پەرلەمانی ئینگلیزییەوە گوتراوە: دەتوانێ هەموو شتێك بکات و بڕیار بدات، جگە لە پیاوکردنە ژن و، ژن کردنە پیاو!

---

(١) ص٣٦.

ئنجا من نازانم دکتۆر (یوسف) مادام دەزانێ، دیموکراسی دەتوانێ چاکەکان بنەبڕ بکات و، خراپەکان بکاتە یاسا و، حەڕام حەڵاڵ و حەڵاڵ حەڕام بکات، چۆن چۆنی ڕێی بەخۆی داوە، کە بڵێ: جەوهەری دیموکڕاسی لەگەڵ ئیسلامدا دژ و ناکۆك نیە!!

پاشان (دکتور یوسف القرضاوي) لەسەر ڕەخنەلێگرتنی دیموکراسی بەردەوام دەبێ و دەڵێ:

(و لهذا رأينا الديمقراطية الأمريكية تُبيحُ الخَمْرَ شُرْباًو صِناعةً وأتّجاراً برغم ما ثبت من أضرارها المادية و المعنوية، على الأفراد و الأسر و المجتمعات، و على الإقتصاد و الأخلاق، و وجدنا بعض الديمقراطيات الغربية يبيح زواج الرجال بالرجال، و النساء بالنساء.

ان الديمقراطية الغربية تستطيع أن تتحللَّ من أي شيء، حتى من الديمقراطية نفسها، بأغلبية خاصة، أو باستفتاء شعبي، أو بغير ذلك من الحِيَل، حتى قال أحدِ حكام العرب يوماً: إنَّ للديمقراطية أنياباً و مخالِبَ و أنها يمكن أن تكون أشرسَ من الدكتاتورية!!)[١]

واتە: هەربۆیەش دیموکڕاسی ئەمەریکاییمان بینی، کە دروستکردن و بازرگانیی پێوەکردنی مەی (شراب)ی بەڕەوا داناوە، هەرچەندە زیانە ماددیی و مەعنەوییەکانیشی بۆ سەر تاك و خێزان و کۆمەڵگا و، بۆ سەر ئابووریی و، ڕەوشت و خوو، سەلمێنراون، وە بینیمان کە هەندێك لە دیموکڕاسییەکانی ڕۆژئاوا، شووکردنی پیاو بە پیاوو، ژن بە ژنی بەڕەوا داناوە!

بێگومان دیموکڕاسی ڕۆژئاوا، دەتوانێ دەستبەرداری هەموو شتێك ببێ، تەنانەت خۆیشی! بە هۆی زۆرینەیەکی تایبەت، یان ڕاپرسییەکی خەڵکی، یان هەر فێڵێکی دیکەوە! تەنانەت یەکێك لە دەستەڵاتدارانی عەرەب ڕۆژێکیان گوتوویەتی: بێگومان دیموکڕاسیی: کەڵبە و چڕنووکی تیژی هەن و، دەنگونجێ لە دیکتاتۆریی دڕتر بێت!

---

(١) هەمان سەرچاوە، ص٣٧.

**کەواتە:**

وەك بینیمان دكتۆر (یوسف) سەرەنجام هاتەوەسەر ئەو ڕایە، كە ئەو میكانیزمە باشانەی لە دیموكڕاسیدا هەن، ئیسلام هیچ كێشەو گرفتی لەگەڵیان نیە، بەڵام هەر ئەو میكانیزمە چاكانە: بە هۆی كاكڵ و جەوهەرە شیركییەكەی دیموكراسییەوە، كە بریتیە لە: (مافی حەڵاڵ كردن و، حەڕام كردن، بە جگەلە خوادان)، بەڵێ، ئەو میكانیزمە چاكانە بە هۆی ئەو جەوهەر و ڕووحە پیسەوە، وەك ئامرازێكی باش بە دەستی بابایەكی خراپەكار و ستەمكارەوە، سەرەنجام دەبنە خزمەتكاری خراپەكاران و، بەرژەوەندییە ستەمكارانە و ناشەرعییەكانی، دیكتاتۆر و سەرمایەدارە بێویژدانەكانیان پێ دابین و مسۆگەر دەكرێن!

دیارە هەر لێرەشەوە سادەیی ئەو كەسانەمان بۆ دەردەكەوێ، كە پێیان وایە دیموكڕاسی و (شوری)ی ئیسلامیی، یەك شتن!! لە حاڵێك دا كە جیاوازییان ئاسمان و ڕێسمانە و، چونكە دیموكڕاسی دەستی پەرلەمان و نوێنەرانی میللەت ئازاد و ئاوەڵا دەكات، بۆ هەر یاسادانان و هەر بڕیاردانێك كە حەزی لێ بێت، بەبێ ڕەچاوكردن و گوێپێدانی خواو پێغەمبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) و دین و شەریعەت و قیامەت و بەهاكان و ئەخلاق و ویژدان!

بەڵام وەك پێشتریش گوتمان: (شوری) و (إجتهاد) لە ئیسلام دا شەریعەتی خوا دەستی گرتوون و دەستی بەستوون، لە ئاست هەر بڕیار و یاسایەك دا، كە پێچەوانەی دەقێكی شەریعەت بێت. بگرە لە ئیسلامدا تەنانەت پێغەمبەری خواش (صلی الله علیه وسلم) لە بەرامبەر شەریعەتدا، هیچ مافێكی پێنەدراوە، بێجگە لە جێبەجێكردن (تطبیق)، وەك خوای پەروەردگار فەرموویەتی:

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ ٱتَّقِ ٱللَّهَ وَلَا تُطِعِ ٱلۡكَٰفِرِينَ وَٱلۡمُنَٰفِقِينَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا ١ وَٱتَّبِعۡ مَا يُوحَىٰٓ إِلَيۡكَ مِن رَّبِّكَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرًا﴾

الاحزاب: ١-٢.

واتە : ئەی پێغەمبەر! پارێز لە خوا بکە و فەرمانبەریی کافران و موونافیقان مەکە، بێگومان خوا زانا و کاربەجێیە، وە شوێن ئەو (بەرنامەی)ە، بکەوە کە لە پەروەردگارتەوە بۆت دەنێررێ، بێگومان خوا شارەزای ئەوەیە کەدەیکەن.
هەروەها فەرمووویەتی:

﴿ ثُمَّ جَعَلْنَٰكَ عَلَىٰ شَرِيعَةٍ مِّنَ ٱلْأَمْرِ فَٱتَّبِعْهَا وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَ ٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٨﴾ ﴾ الجاثية: ١٨.

واتە: پاشان تۆمان خستە سەر بەرنامەیەك لە ئايينى خۆمان، دەجا شوێنی بکەوە و، مەکەوە دوای ئارەزووی ئەوانە کە نازانن.

هەروەها فەرمووویەتی:

﴿ وَأَنِ ٱحْكُم بَيْنَهُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَهُمْ ﴾ المائدة: ٤٩.

واتە : وە بەوەی کە خوا ناردوویەتە خوارێ، حوکمیان لە نێوان دا بکەو بە دوای ئارەزووەکانیان مەکەوە...

- حەز دەکەم قسەی کۆتاییت لەو بارەوە ببیستم !

لە کۆتاییدا دەڵێم:

بێگومان سیستمی حوکمڕانیی لە ئیسلامدا، سەرجەم ئەو میکانیزم و لایەنە ئیجابییانەی کە لە دیموکڕاسیدا هەن، گرتوونیە نێو خۆی، یان دەتوانێ بیانگرێتە خۆی، ئەمە لە لایەکەوە، لە لایەکی دیکەشەوە: لە سۆنگەی ئەوەوە کە سیستمی حوکمڕانیی لە ئیسلامدا، وەك سەرجەم یاساو سیستمەکانی دیکەی، بەچوارچێوەی شەریعەتەوە بەستراونەوە، ئەو بەڵاو گرفتانەی کە بەسەر دیموکڕاسیدا هاتوون و دێن، لێیان پارێزراوو سەلامەتە، بەڵێ، سیستمی حوکمڕانیی ئیسلامیی، لە سایەو بەرەکەتی ئەو بنەماو کۆڵەکە گرنگانەوە، کە شەریعەت دیاریی کردوون، کە گرنگترینیان و گەورەترینیان بریتیە لە تەنها خوا (تبارك و تعالى) بە فەرمانڕەوای ڕەها (الحاكم المطلق) زانین و، سەروەریی ڕەها (السيادة المطلقة)

لەسەر شەریعەت (دەقەكانی قورئان و سوننەت) تاپۆكردن، بەڵێ، سیستمی حوكمڕانی ئیسلامیی لە بەرەكەتی شەریعەتەوەو، لە سایەی خۆ دوورگرتن لە بەپەرستراو دانان (تأْليه)ی جگەلە خواوە، بەپێچەوانەی دیموكراسییەوە، هەرگیز نابێتە بازیچە (ألُعوبة) بە دەست سەرمایەدار و خاوەن بەرژەوەندییە ناشەرعییە ملهوڕەكانەوە، كە بیكەنە چەرخ و فەلەك هەر جارە بە لایەك دا بیسووڕێنن و، بەرژەوەندییە ستەمكارانەكانی خۆیانی پێ دابین بكەن.

مامۆستا گیان! لە كۆتاییدا خوا پاداشتت بداتەوە، هەرچەندە پرسیارەكانم جارێ تەواو نەبوون، بەڵام ئەوانەی ماون بۆ ئاڵقەیەكی دیكەیان دادەنێم.

باشە بەسەر چاو، خوا پاداشتی ئێوەش بداتەوە.

## ئاڵقەی دووەم

بەڕێزان!

خۆشحاڵین، کە لە ئاڵقەیەکی نوێی بەرنامەی (سۆراغ)دا بە یەك دەگەینەوە، بەو هیوایەی بتوانین تەواوکەری بەرنامەی پێشوو بین، سەبارەت بەو بابەتەی کە لەگەڵ جەنابی (مامۆستا عەلی باپیر / ئەمیری کۆمەڵی ئیسلامیی)دا سازمان دابوو، دەربارەی (دیموکراسی و دیکتاتۆریی و هەڵوێستی ئیسلامییانە لە بەرانبەریان)دا

- بەڕێز مامۆستا عەلی باپیر! خۆشحاڵین جارێکی دیکە بە دیدارت شاد دەبین و بەخێر بێن سەرچاوان، حەز دەکەم لەو قسەیەی (د.یوسف القرضاوي)یەوە دەست پێبکەینەوە، کە جەنابت گلەییت لێی کردو فەرمووت: ناکۆکیی (تناقض)یەك لە قسەکانیدا هەیە. هەڵبەتە ناوبراو ئالیەتی دیموکڕاسی بەجەوهەر حیساب کردوە، وە بە پێچەوانەشەوە فەرمووت: لە لاپەڕە (٣٧)ی کتێبی: (من فقه الدولة في الاسلام) باس لە دیموکڕاسی دەکات، کە حەلاڵ حەڕام دەکات و، حەڕامیش حەلاڵ دەکات، بەلام من ئەوەم تێدا خوێندۆتەوە، کە ئەو دەڵێ: دیموکڕاسی ڕۆژئاوایی، ئاوایە، ئیتر وا تێگەیشتم لە (د. یوسف القرضاوي)، کە ئێمە دەتوانین دیموکڕاسی ڕۆژهەلاتیی یاخود دیموکڕاسی ئیسلامییمان هەبێ، بەلام ئەو دیموکڕاسییەی کە ئێمە پیادەی دەکەین، لە بواری تەشریع دا نەبێ، کە حەڕام حەلاڵ بکات و، حەلاڵ حەڕام کات، دیارە ئەو مەسەلانە کە دەق (نص)ی لەسەرە، ئێمە هیچ قسەیان تێدا ناکەین، بەلام تەنها لەو میکانیزمانەی سوودمەند دەبین، کەگوتمان لەئیسلامیش دا هەن، یان دەگونجێ بن، بۆیە ئێمە دەڵێین: دیموکڕاسی ئیسلامیی.

(بسم الله الرحمن الرحيم و به نستعين، زۆر سوپاستان دەكەم بۆ ئەم دیدارە، لەو بارەوە كە: ئایا ئێمە لە كاتێك دا لە شەرع لانەدەین، دەنگونجێ بڵێین: (دیموكڕاسی)ین؟ نێوەڕۆكی پرسیارەكەشت لە ڕاستیدا ئەوەیە كە باسم كرد، لەوەڵامیش دا دەڵێم: بێگومان بۆ هەڵسەنگاندنی هەر شتێك پێویستە سەرەتا وەك خۆی بیناسین، وە بە تایبەت ئەگەر ئەو مەسەلەیە لە شوێنێك دا پراكتیك كرابێ، دەبێ بەو شێوەیەی كە لەو شوێنەدا پیادە كراوەو بۆتە واقیعێك، لەبەر ڕۆشنایی بوونی واقیعییانەی دا سەرنجی بدەین. واتە: پێویستە لەبەر ڕۆشنایی بوونی واقیعییانەی ئەو شتەدا، پێناسەی بكەین، ئنجا ئەگەر تەماشای دیموكڕاسی بكەین، چی دەبینین؟! جارێ من زۆر بە ڕاشكاویی دەڵێم، وە هەموو ئەوانەش كە بە ئینصافەوە قسەیان كردوە، قسە دەكەن دەبارەی دیموكڕاسی، دەڵێن: ئەو وڵاتانەی ئێستا لە جیهانی ئیسلامیی دا، كە ناوی لێنراوە ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاست (ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاست بە نسبەت بەریتانیاوە، واتە: ئێران و زۆربەی عالەمی عەرەبی، كە بەنسبەت ئەوانەوە نێوەڕاستە، دیارە ڕۆژهەڵاتی دوورتر هەیە و ئەولاش هەیە، بە هەر حاڵ ئەوە ناوێكە كاتی خۆی ئیمپراتۆڕی بەریتانیی، بەسەر بەشێك لە عالەمی ئیسلامییدا بڕیوە)[1]، بەڵێ، هەموو ئەوانەی، كە ئینصافیان هەیە دەڵێن: دیموكڕاسی وەك حەقیقەت لەو شوێنانەدا بوونی نیە، بەڵكو هەر ناوەو نێوەڕۆكی نیە، بەڵام خۆ هیچ كەس ناتوانێ نكۆڵیی بكات، كە دیموكڕاسی لە ئەمەریكا و فەڕەنسا و بەریتانیادا هەیە، لە وڵاتانی ڕۆژئاوادا بە گشتی هەیە، ئنجا با تەماشا بكەین: داخۆ دیموكڕاسی لەو شوێنانەدا چۆنە؟ ئا ئەوە دیموكراسییە، نەك تۆ بڵێی: ناهێڵم دیموكڕاسی لە شەرع لا بدات و، بێ دڵیی مسوڵمانان بكات و، ناهێڵم هیچ شتێكی تێدابێ، كە پێچەوانەی قورئان و سوننەت بێ و، ناویشی لێ دەنێم دیموكڕاسی!! چونكە ئەو كاتە تۆ بوختان بەدیموكڕاسی دەكەی، ئەگەرنا ئەوە دیموكراسی نیە، بەڵكو ئەوە ئیسلامە، ئنجا ئەگەر بگوترێ: ئەدی ئەوە نیە

---

(١) هەروەها بوونی قەوارەی زایۆنی لەجیهانی ئیسلامیی دا هۆكارێكی دیكەی بەكارهێنانی ئەو زاراوەیە، تاكو كە گوترا:
(ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاست) ئەویش بگرێتەوە و باسی ئیسلامیش نەكرێ!

میكانیزمەكانی دیموكڕاسی بەكارهێنراون!! لە وەڵام دا دەڵێین: لە ڕاستیدا میكانیزمی سیستمی حوكمڕانیی دیموكڕاسی، ماڵی كەس نیە، چونكە میكانیزمی حوكمڕانیی، وەك لایەنی ئیداریی، ماڵی كەس نیە و كەلەپووریكی بەشەریەتەو، ئێستا لە دەستی ڕۆژئاوا دایەو، ڕۆژێك لە ڕۆژهەڵات، لە دەستی مسوڵمانان دابووە.

وە هەندێك كەس دەڵێن: ڕاوێژ (شوری)ی ئیسلام، یانی: دیموكڕاسیی!! بەڵام بێگومان شووڕاو دیموكڕاسیی جیاوازییان هەیە، جیاوازییەكی گەورەو ڕیشەییش، چونكە شووڕای ئیسلامیی پابەندە بە شەریعەتەوە، بەڵام دیموكڕاسی ڕۆژئاوا، پابەند نیە بە هیچ شتێكەوە.

- بەڵام ئایا دیموكڕاسی پابەند نیە بە دەستوورەوە؟

با، بەڵام دەستووریش هەر خەڵك دایدەنێ، كەواتە: وەك گوتراوە: هەموو ئاوەكان لە كەنداو كۆدەبنەوە، هەمووی دەچێتەوە دەستی خەڵك، ئیدی خەڵك چۆنی پێ باش بوو، ئاوا دەكاو بڕیار دەدا (د. یوسف القرضاوي)یش لەو بارەوە گوتوویەتی: (من هنا يمتاز نظام الشورى الذي تقوم عليه الدولة المسلمة، لأن للشورى حدوداً لا تتعداها: فعقائد الإسلام الإيمانية، و أركانه العملية، و أسسه الأخلاقية، و أحكامه القطعية، و هي المقومات الأساسية التي ارتضاها المجتمع و أقام عليه نظام حياته، لا مجال فيها للشورى)[1]. بەڵێ شووڕای ئیسلامیی جیاوازییەكەی ئەوەیە لەگەڵ دیموكڕاسی ڕۆژئاوادا، كە شووڕا لە ئیسلام دا، لە شتێك دایە، كە دەقی لەسەر نەبێ، وە شووڕاو ئیجتیهاد لە ئیسلام دا، لە چوارچێوەی شەریعەت دایە، ئنجا وەك مامۆستا (یوسف) دەڵێ: سیستەمی شووڕا، كە دەوڵەتی ئیسلامیی لەسەر بنیات دەنرێ، چەند سنوورێكی هەن، كە نابێ ئەو سنوورانە ببەزێنرێن و، شەریعەت چەند قەدەغەیەكی دیاریی كردوون، نابێ ئەو قەدەغانە بشكێنرێن، بۆ وێنە: عەقیدە ئیمانییەكان و پایە و بنەڕەتە كردەییەكانی: (نوێژ و زەكات و ڕۆژوو حەج و جیهاد ...) هەروەها بنچینە و بنەما ئەخلاقییەكان،

---

(١) بڕوانە: ( فقه الدولة في الاسلام ) ص ٣٧.

وە یاسا قەطعییەکان [بۆ وێنە: سوود (ربا) حەڕامە، (دزیی) حەڕامە، ئەوە بە هیچ کەس دەستکاریی ناکرێ، هەزار ساڵ خەڵك کۆبێتەوە و هەڵبژاردن بکات و، پەرلەمان دابینشێ، ئەگەر خۆی بە مسوڵمان بزانێ، نابێ قسە لەوە بکات، کە خوا بڕیویەتەوە، خوا دەفەرموێ: حەڕامە، کەواتە حەڕامە! هەروەها شتێکیشی، کە حەڵاڵ کردوە، بە هەمان شێوە، بۆ وێنە: پیاوێك بۆی هەیە زیاتر لە ژنێك بهێنی لە سنووری شەرع داو، بە ئەدەبی شەرعییەوە، ئیدی ئەوە پەنجا (٥٠) پەرلەمان کۆبێتەوە، ئەگەر خۆی بە مسوڵمان بزانێ، نابێ باسی قەدەغەکردنی بکات، هەر کەسێك تاك، یان کۆمەڵ، خۆی بە مسوڵمان بزانێ، نابێ شتێك کە خوای پەروەردگار حەڵاڵی کردوە، لە خەڵکی قەدەغە بکات، یان شتێك کە خوا لە خەڵکی قەدەغە کردوە، بۆ خەڵکی ڕەوای بکات!][1] کە ئەوانە بریتین لەو پایە بنەڕەتییانەی، کە کۆمەڵگا پەسەندی کردوون و، ژیانی خۆی لەسەر بنیات ناون و، بواری ڕاویژیان تێدانیە.

ئنجا قسەیەکی دیکەی (د . یوسف القرضاوي) زۆر جوانە، کە دەڵێ:(و لا يملك برلمان و لا حكومة إلغاءَ شيء منها، لأن ما أثبته الله لا ينفيه الإنسان، و ما نفاه الله، لا يُثْبِتُه الإنسان)[2]. واتە: پەرلەمان و حکوومەت لە ئیسلامدا، ناتوانێ هیچ شتێك لەغو بکاتەوەو لاببات (وە ناتوانێ هیچ شتێك بڕیار بدات، کە شەرع قەدەغەی کردوە)، چونکە ئەوەی خوا چەسپاندوویەتی، مرۆڤ پێی لانابرێ، وە ئەوەی خوا لایبردوە، مرۆڤ پێی ناچەسپێ.

ئێستاش پێم وایە زۆر باش ناکۆکیی و پێکەوە دژیی (تناقض)ی قسەکانی (دکتور یوسف القرضاوي) دەرکەوت، چونکە لە لایەکەوە دەڵێ: جەوهەر و کرۆکی دیموکڕاسی لەگەڵ ئیسلام دا ڕێکەو، لە لایەکی دیکەشەوە دەڵێ: دیموکڕاسی بە هۆی نەبوونی چوارچێوە و شیرازەیەکەوە، کە بیپارێزێ لە لادان (إنحراف) سەری لە شتی زۆر خراپ و ناقۆلا و ناماقووڵەوە دەردەچێ!!

---

(١) ئەوەی نێوان کەوانەکان زیادکردنی خۆمە، بۆ ڕوونبوونەوەی مەبەست.

(٢) سەرچاوەی پێشوو، هەمان لاپەڕە.

- مامۆستا گیان! لە کاتێك دا جەنابت دەفەرمووی: کە دەبێ ئێمە پابەند بین بەدەق (نص) شەرعییەکانەوە، ژیانیش لە گۆڕانکارییەکی بەردەوام دایە.

بەڵـــێ!

- وەك هەمووومان ئاگادارین ساڵ بۆ ساڵ جیاوازیی هەیە و، لەوە دەچێ ئەم ساڵ و چوار ساڵی دیکە زۆر جیاوازیان هەبێ، دەقە شەرعییەکانیش (١٤٢٠) هەزار و چوار سەدو بیست ساڵە ماونەوە بۆ ئێمە، ئەم گۆڕانکاریی یانە، پێویستمان بە کۆمەڵێك شت هەیە کە داهێنانن، ئەگەر ئێمە پابەند بین بەدەقە شەرعییەکانەوە، ئایا ئەوە نابێتە فاصیلە و دیوارێك لە نێوان ئێمە و ئەو گۆڕانکارییانەی لە جیهاندا هەن؟!

کاك تۆفیق! بە کورتیی دەتەوێ بڵێی: چۆن دینێکی وەستاو بە فریای ژیانێکی گۆڕاو دەکەوێت؟! چونکە عەلمانییەکان زۆرجار ئەوە دەڵێن: دیارە تۆش لەسەر زاری ئەوان ئەم پرسیارەت کردوە، عەلمانییەکان دەڵێن: دین (دۆگما)یەو دینێکی (دۆگما) و وەستاویش چۆن فریای ژیانێکی گۆڕاو دەکەوێت؟!

- بەڵێ ئەو پرسیارە پرسیاری عەلمانییەکانە، ئنجا ئایا وەڵامەکەی چۆنە؟!

وەڵامەکەی بەو شێوەیە: هەموو سیستەمەکانی ئیسلام: حوکمڕانیی و ئابووریی و کۆمەڵایەتیی و جیهادیی و عیبادیی و ئەخلاقیی، خوای پەروەردگار (جل جلاله) کە دایناون بوون(کینونە)ی مرۆڤ و سروشت و فیطرەتی ئینسانی لەبەرچاو گرتوە، چ وەك تاك چ وەك کۆمەڵ، بۆ وێنە: ئەو شتانەی، کە پەیوەندییان بە عەقیدە و ئیمانەوە هەیە، یاخود پەیوەندییان بە عیبادەتەوە، یان بەئەخلاقەوە هەیە، لە سۆنگەی ئەوەوە کە ئەو سێیانە هەر سێکیان: هەم ئیمان و، هەم عیبادەت و، هەم ئەخلاق پەیوەندییان بە ڕووحی ئینسان و بە جەوهەری مرۆڤەوە هەیە، کە بێگومان ئەویش حەقیقەتێکی نەگۆڕ و چەسپاوە، دەبینین خوای پەروەردگار یاسای نەگۆڕی بۆ داناون، بۆ وێنە: لە بواری ئیمان و عەقیدەدا: خوای پەروەردگار تاك و تەنهایەو، ئەوە ناویەتی و، ئەوە سیفەتی و، خوا ئاوا لەگەڵ بەندەکانیدا ڕەفتار دەکات، هەروەها پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) کێن و،

فریشتەکان چۆنن و، قیامەت و بەهەشت و دۆزەخ ...هتد، ئەمانە هیچیان دەستکاریی ناکرێن، بۆچی؟! چونکە پەیوەندییان بە کۆمەڵێك ڕاستییەوە هەیە، کە لە بوون (وجود)دا ڕیشەیان قووڵە و ناگۆڕێن، وە لە فیطرەتی ئینسان دا ناگۆڕێن، وە لەبواری عیبادەت دا، ئینسان چۆن بەندایەتیی بۆ خوا بکات؟! ئەوە تەنها خوا دەیزانێ و، هەر خۆی دیاریی کردوە، من نموونەیەکتان بۆ بهێنمەوە: (دەست نوێژ) کە شتێکی زۆر بچووکە لە عیبادەت دا، خوای پەروەردگار دەست نوێژی بۆ پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) بەجێنەهێشتوە، بەڵێ، پێغەمبەریش لە سوننەتی عەمەلیی خۆیدا فەرموویەتی: دەست نوێژ ئاواو ئاوا بگرن، بەڵام خوای میهرەبان لە ئایەتێکی سوورەتی (المائدة) دا، هەموو پایەکانی دەست نوێژی ڕوون کردوونەوە، کە بێگومان شتێکی زۆر جوزئییە، بۆچی؟! چونکە بابەتی عیبادەت، لە سەرووی ئاست و بڕستی عەقڵەوەیە، ئایا چۆن مامەڵە لەگەڵ خوادا (جل جلاله) دەکرێ و، چۆن بەندایەتیی بۆ دەکرێ؟! بەس خوا دەزانێ، هەر بۆیەش خۆی دیاریی کردوە، خوای زانا دەربارەی دەست نوێژ دەفەرموێ:

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا قُمۡتُمۡ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ فَٱغۡسِلُواْ وُجُوهَكُمۡ وَأَيۡدِيَكُمۡ إِلَى ٱلۡمَرَافِقِ وَٱمۡسَحُواْ بِرُءُوسِكُمۡ وَأَرۡجُلَكُمۡ إِلَى ٱلۡكَعۡبَيۡنِ﴾ المائدة: ٦.

زانایانی شەرعزان دەڵێن: دەست نوێژ شەش (٦) پایەی هەن، بەم شێوەیە: نیەت هێنان، شۆردنی دەم وچاو، شۆردنی دەستەکان لەگەڵ ئانیشکەکان، مەسح کردنی سەر، هەمووی، یان هەندێکی، شۆردنی هەردوو پێ لەگەڵ گوێزینگەکانی پێ، وە ڕیز (ترتيب)، ئنجا خوای کاربەجێ بەڕیز، هەر شەش (٦) پایەکانی، لەم ئایەتەدا باس کردوون.

بەڵێ، مەسەلەکانی عیبادەت و بەندایەتیی، خوای پەروەردگار هەمووی لەقورئان دا باس کردوون، پاشان پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) بە درێژیی ڕوونی کردوونەوە و، هیچیان بۆ ئیجتیهاد و هەڵهێنجانی زانایان بەجێ نەهێڵراون، بابەتی ئەخلاقیش هەر وایە، بۆ وێنە: هەرکام لە: (ڕاستیی) و

(ئەمانەت پاراستن) و (داوێن پاکیی) خەسڵەتی بەرز و باشن، بۆیە فەڕزن، بەڵام (درۆ و زوڵم و خوێن ڕێژیی) خراپن، بۆیە حەڕام و قەدەغەن و، ئەو سیفەتە باش و خراپانە گۆڕانیان بەسەردا نایەت، چونکە ئەوانە پەیوەندییان بە سروشت (فطرة) و پێکهاتە (کینونة)ی بەشەرەوە هەیە.

- ئەدی ئەگەر زۆرینەی ئەو خەڵکە شتێکی داواکرد، کە پێچەوانەی ئیسلام بێت، وەك داوێن پیسیی، کە داوێن پاکیی لە ئیسلام دا گرنگییەکی تەواوی هەیە، بەڵام ئایا ئێستا زۆرینەی ئەو خەڵکە (لەسەر ئاستی جیهان) باوەڕی بە داوێن پاکیی هەیە؟

کاك تۆفیق! دوو شت هەن نابێ تێکەڵ بکرێن: فیطرەت هەیە و، عادەت هەیە، ئنجا ئایا جیاوازیی نێوان فیطرەت و عادەت چییە؟ عادەت ئەوەیە، کە لە نێو کۆمەڵێك دا هەیە و، لە نێو کۆمەڵێکی دیکەدا نیە، بەڵام فیطرەت هەرگیز هەڵاواردن (استثناء)ی تێدانیەو، لە نێو هەموو خەڵك دا دەبێت، شتی فیطریی، چونکە پەیوەندیی بە سروشتی ئینسانەوە هەیە و هەموو ئینسانەکان تێیدا بەشدارن، بەڵام شتی عادەتیی، لە شوێنێك هەیە و، لە شوێنێکی دیکە نیە، بۆ وێنە: ئەو ڕووتیی و بێبەندوباریی و داڕووخانی ئەخلاقییە، کە لە ڕۆژئاوا هەیە، هەڵقوڵاوی فیطرەتی ساغ نیە، بەڵکو عادەتێکی خراپە و سەری هەڵداوە، چونکە کاتی خۆی خۆیشیان نەیان بووە، وە ئێستا خۆیشیان لێی بێزارن، کەواتە: ئەوە عادەتێکی خراپە و هیچ پەیوەندیی بە فیطرەتەوە نیە و، بگرە پێچەوانەی فیطرەتیشە!

- مامۆستا، کابرایەکی سەد (١٠٠) ساڵ بەر لە ئێستا، ئەگەر دیتبای نامەحرەمێك لەگەڵ خێزانیدا وەستاوە، ئەوە چ هەرایەکی گەورەی دروست دەکرد؟ بەس من باس لە ئەورووپا ناکەم، لە کوردستانی خۆماندا لەم ماوەیەدا بینیم، وەزیری ڕۆشنبیریی فەرەنسیی هاتبوو سەردانی کوردستانی کرد، لە ڕێگا گەیشتە بووك و زاوایەك، ئەملاو ئەولای زاوا و بووکەکەیشی ماچ کرد، کابراش زۆر پێی ئیعتیادی بوو و پێدەکەنی!!

تەفسیری ئەو دیاردەیەی نەمانی غیرەت و داڕووخانی ڕەوشت، ئەوەیە کە خەسڵەتە فیطڕییەکان، بە هۆی پەروەردەوە گەشە دەکەن، بە هۆی فێرکردن (تعلیم)ەوە گەشە دەکەن و نەشونما دەکەن، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ:

﴿ وَنَفۡسٖ وَمَا سَوَّىٰهَا ﴿٧﴾ فَأَلۡهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقۡوَىٰهَا ﴿٨﴾ قَدۡ أَفۡلَحَ مَن زَكَّىٰهَا ﴿٩﴾ وَقَدۡ خَابَ مَن دَسَّىٰهَا ﴿١٠﴾ ﴾ الشمس: ٧- ١٠.

(تزكية) یانی: گەشە پێدان و پەروەردەکردن و نەشونما پێدان، ئەو دیمەنەی کە تۆ بینیوتە، شتێکی فیطڕیی نیە، بەڵکو ئەوە کەوتنە ژێر کاریگەریی عادەتی میللەتێکی فیطڕەت تێك چوویە، کابرا ویستوویەتی خۆی لەگەڵ ئەو جەووەدا بگونجێنێ، من دەزانم ئەو زاوایە لە ناخی نەفسی خۆیدا پێی ناخۆش بووە، هاوسەرەکەی بە بەرچاویەوە ماچ بکرێ! بەڵام بۆ ئەوەی ڕەخنەی لێ نەگیرێ، بێ دەنگ بووە، وەك گەلێك لە ئافرەتان هەن، کە بەرگ و پۆشاکی سەیر و عەجایەب لەبەر دەکەن، هەیانە دەڵێ: ئێمە لە دڵی خۆمان دا نامورتاح و نا ئاسوودەین، بەڵام ئەوە عادەت و باوە و، ئەگەر وا نەکەین ڕەخنەمان لێ دەگیرێ.

- بابێینەوە سەر مەبەستەکەمان.

کە ئیمان و عیبادەت و ئەخلاق، چەند یاسایەکی نەگۆڕیان بۆ دانراون!

بەڵێ، خوای کاربەجێ دەقی ڕوونی بۆ داناون و، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)یش کۆمەڵە دەقێکی بۆ داناون، کە بواری ئیجتیهادیان تێدا نیە، مەگەر لە چۆنیەتی جێبەجێکردنیاندا، ئەگەرنا شەریعەت خاڵی تێدا خستوونە سەر پیتان.

بەڵام ئەو دەقانەی کە پەیوەندییان بە لایەنی ماددیی ئینسانەوە هەیە، وانین، چونکە ڕووح نەگۆڕە، بەڵام لایەنی ماددیی دەگۆڕێ، لە حاڵێکەوە بۆ حاڵێکی دیکە، بۆیە ئەو دەقانەی شەریعەت (الكتاب و السنة)، کە پەیوەندییان بەلایەنی حوکم و سیاسەتەوە هەیە، یان بەلایەنی ئیدارەوە، یان پەیوەندییان بەلایەنی ئابووریی و لایەنی کۆمەڵایەتییەوە هەیە، دەبینین لە حاڵێك دا، کە لە بواری عیبادەت دا، تەنانەت پایەکانی دەست نوێژیش لە قورئان دا باس

کراون، لە بواری حوکم و سیاسەت دا، خوای پەروەردگار شێوەو شکڵی دەوڵەتی لە قورئان دا بۆ باس نەکردووین، بەڵکو قورئان و سوننەت کۆمەڵێك پایەو بنچینەیان خستوونەڕوو، کە دەبێ سیستمی حوکمڕانێتیی ئیسلامیی لەسەریان بنیات بنرێ، هەروەها لە بواری ئابووریيدا، خوای بەرز ومەزن لە لایەکەوە: خاوەندارێتیی (الملكية) دەسەلمێنێ، وەك دەفەرموێ:

﴿لَهَا مَا كَسَبَتْ وَعَلَيْهَا مَا ٱكْتَسَبَتْ﴾ البقرة: ٢٨٦.

یان دەفەرموێ:

﴿فَلَكُمْ رُءُوسُ أَمْوَٰلِكُمْ لَا تَظْلِمُونَ وَلَا تُظْلَمُونَ ﴿٢٧٩﴾﴾ البقرة: ٢٧٩.

لەو لاشەوە دەفەرموێ: ﴿كَىْ لَا يَكُونَ دُولَةًۢ بَيْنَ ٱلْأَغْنِيَآءِ مِنكُمْ﴾ الحشر: ٧.

واتە: تاکو ماڵ و سامان لەدەستی دەوڵەمەندەکانتان دا کورت هەڵنەیەت.
کەواتە: ئیسلام لە ڕوی ئابوورییەوە، تەنها چەند پایەو بنەمایەکی سەرەکیی دیاریی کردوون! لە لایەکەوە: ئینسان بۆی هەیە بەرهەمی ڕەنجی خۆی بخوات، بەڵام لە لایەکی دیکەشەوە دەڵێ: نابێ لەسەر حیسابی خەڵك و جەماوەر، ماڵ و سامان وە سەریەك بنێ، ﴿كَىْ لَا يَكُونَ دُولَةًۢ بَيْنَ ٱلْأَغْنِيَآءِ مِنكُمْ﴾ واتە: نابێ ماڵ و سامان و دارایی لە دەست دەوڵەمەندەکان دا کۆبێتەوە، کەواتە: سیستمی سەرمایەداریی لە ئیسلام دا ناڕەوایە و، پەیدابوونی چینی (بورژواز) ناڕەوایە، کە ئێستا لە سیستمی سەرمایەداریی دا هەیە، بەڵام لەولاشەوە: واش نا، کە مرۆڤ زۆریش خۆی ماندوو بکات، بەڵام دیسان هەر یەکسان بێتەوە لەگەڵ کەسێك دا، کە هیچ خۆی ماندوو نەکردوە، وەك (سۆسیالیزم) دەیڵێ !!

بەڵێ، ئیسلام لەو بوارانەدا کۆمەڵێك پایەی دیاریی کردوون، بەڵام، بۆشاییەکی زۆری بەجێهێشتوە، لەبواری گەشەکردنی زەمان و پەرەستاندنی ژیان دا، بۆ ئیجتیهادو هەڵهێنجانی زانایان و پسپۆڕان، کە سەرجەم ئەو بۆشاییانە بە حوکم و یاسای هەڵهێنجراوی گونجاو پڕ بکەنەوە.

ئنجا ئایا ئیجتیهادی شەرعزانان (الفقهاء) و پسپۆڕان، لە بواری بازرگانیی و مامەڵە (التجارة والبیع والمعاملة) و، لە بواری حوکم و سیاسەت و، جەنگ و ئاشتیی و، پەیوەندیی نێوان دەوڵەتان دا، لەچییەوە پەیدا بووە؟ بێگومان لەوە پەیدا بووە، کە خوای پەروەردگار کۆمەڵێك ئایەتی فەرمووەو، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) کۆمەڵێك فەرموودەی فەرمووە، لەو بوارانەدا، بەڵام لە ڕووی حیکمەتەوە بۆشاییەکی زۆر بەجێهێڵراوە، بۆ ئەوەی کە لەبەردەم گۆڕانی زەمان و گەشەکردنی ئینسان دا، دەست و پێی خەڵکی بەکۆمەڵێك دەقی دیارییکراو نەبەستریّ، بەڵکو بواریان هەبیّ، بە ئیجتیهادی خۆیان و بە پێی داخوازیی بەرژەوەندییەکانیان، ئەو کەلێنانە پڕ بکەنەوە.

جا من لێرەدا لەو بارەوە، دەقێکت بۆ دەخوێنمەوە، کە زانای پایەبەرز (ابن قیم الجوزیة) لە کتێبی: (الطرقُ الحُكْمية في السياسة الشرعية) لە لاپەڕە (١٣-١٤) دا هێناویەتی، کە هەندێکیان لە زانای ناودار (ابن عقیل)ەوە نەقڵ دەکات و دەڵێ: (فقال ابن عقيل: السياسة ماكان فعلاً يكون معه الناس أقرب الى الصلاح و أبعد عن الفساد ،و إن لم يضَعْهُ الرسول و لا نزل به وحي).

واتە: سیاسەت (مەبەست سیاسەتی شەرعییە) بریتیە لە کردەوەیەك کە خەڵك بە هۆیەوە لە بەرژەوەندیی نزیکتر بن و، لە زیانیش دوورتر بن، با پێغەمبەری خواش (صلی الله علیه وسلم) داینەنابیّ و دەقیشی لەسەر نەهاتبیّ، یانی: هەر شتێك ببێتە هۆی دابین کردنی بەرژەوەندیی خەڵك، ئەوە سیاسەتێکی شەرعییە.

دواتر لەوەڵامی قسەیەکی زانایەکی شافیعیی مەزەب دا، کە گوتوویەتی: (لا سياسه الاّ ما وافق الشـرع) واتە: تەنها ئەوە بە سیاسەت دادەنریّ، کەبە پێی شەرع بیّ، بەرپەرچی دەداتەوەو دەڵیّ: (فإن أردت بقولك: [الا ما وافق الشرع]، أي: لم يخالِفْ ما نَطَق به الشرعُ، فصحيحٌ، و إن أردت: لا سياسة الا ما نطق به الشرعُ، فَغَلَطٌ و تغليطٌ للصحابة) واتە: ئەگەر لەو قسەیەت دا کە دەڵێی: (لا سياسه الاّ ما وافق الشـرع) مەبەستت پێی ئەوە بیّ، کە پێچەوانەی شەرع نەبیّ و لەگەڵ دەقێکی شەریعەت دا تێك نەگیریّ، ئەوە ڕاستە، بەڵام ئەگەر مەبەستت پێی ئەوە بیّ، کە دەبیّ حەتمەن دەقێکی شەریعەتی لەسەر بیّ، ئەوە غەڵەتە و بەغەڵەت دانانی هاوەڵان (أصحاب)یشە.

دوایی چەند وێنەیەك دێنێتەوەو دەڵێ: (فقد جرى من الخلفاء الراشدين من القتل و التمثيل ما لا يَجحَدُهُ عالم بالسنن...) چەند وێنەیەك دێنێتەوە لە خەلیفە ڕاشیدەکان (رضي الله عنهم) کە چەند شتێکیان کردوە، کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) نەیکردوون، بۆ وێنە: سووتێنرانی قورئان (مصحف)ەکان لە ڕۆژگاری خەلیفەی سێیەم دا، (خوا لێی ڕازی بێ)، دوای ئەوەی کە هەموو خەڵکیان کۆکردەوە لەسەر (مصحف)ی (عثمان) (خوا لێی ڕازی بێ)، دیارە هەر هاوەڵێك، کە بۆخۆی و بەسەلیقەی خۆی (مصحف)ێکی نووسیبۆوە، بەئیجتیهادی هەموو هاوەڵان کۆیان کردنەوەو هەموویان سووتاندن[1]. هەروەها خەلیفەی چوارەم عەلی (خوا لێی ڕازی بێ)، کە زەندیقەکان ئەوانەی کە (علی)یان بە پەرستراو (إله) دەزانی، سووتاند!

هەروەها خەلیفەی دووەم عومەر (خوا لێی ڕازی بێ)، کە (نصر بن الحجاج)ی لە شاری مەدینە نەفی کرد، کە گەنجێکی زۆر جوان بوو، ڕۆژێك گوێی لێ بوو ئافرەتێك پێی هەڵ دەگوت، ئنجا عومەر بانگی کرد و گوتی: مادام وایە، تۆ خۆت جوان و بەرچاو مەکە، وە فەرمانی پێکرد پەرچەمی، کە هێشتبوویەوە، بیتاشێ، بەڵام کاتێك پەرچەمی لابرد و سەری کورت کردەوە، جوانتریش هاتە بەرچاو! ئەوجار عومەر (خوا لێی ڕازی بێ) گوتی: نابێ لە مەدینەی پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم) حاڵەتێکی وا هەبێ، ئافرەتان خۆزگە بۆ گەنجێك بخوازن بە حەڕامیی، ئەوەبوو نەفی کرد بۆ شارێکی دیکە.

ئنجا دیارە ئەو جۆرە حوکمانە ڕاستەوخۆ لە هیچ دەقێکی قورئان و سوننەت دا نین، بەڵکو چەند یاسایەکی بواری سیاسەتی شەرعیین. دوایی (ابن قيم الجوزية) قسەیەکی زۆر جوان دێنێ و دەڵێ: (ان الله أرسل رُسُلَه و انزل كُتُبَهُ ليقوم الناس بالقسط، وهو العدل الذي قامت به الأرض و السموات) واتە: خوا پێغەمبەرانی

---

(١) چونکە موصحەفەکانی دیکە، بە ئیجتهادی شەخسیی و هەر کەسە بە شێوەیەك نووسیبوویەوە و هەیانبوو تەفسیری وشەیەك، یان جۆرە خوێندنەوەیەکی ڕێزپەڕ، یان فەرموودەیەکی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)ی ڕەگەڵ موصحەفەکەی خستبوو، یان ڕیزبەندیی (ترتيب)ی سوورەتەکانی بەپێی کاتی هاتنەخوار (نزول)یان ڕیزکردبوو.

خۆی (عليهم الصلاة والسلام) ناردوه و کتێبەکانی ناردوونە خوار، تاکو خەڵك بە دادگەریی بەڕێوەچن، ئەویش بریتیە لەو دادگەرییەی، کە ئاسمان و زەوی بەهۆی ئەوەوە ڕاوەستاون، پاشان دەڵێ: (فإذا ظـــهرت أَمارات العدل و أسفر وجْهَهُ بأي طريق كان، فَثَمَّ وجْهُ الله و دينُهُ) واتە: ئنجا لە هەر شوێنێك نیشانە و سیمایەکانی دادگەریی دەرکەوتن و ڕووی گەش و جوانی دادگەریی دەرکەوت، بە هەر شێوەیەك بێ، ئەوە شەرعی خواش لەوێیە و دینی خواش لەوێدایە، پاشان دەڵێ: (فأي طريق استخرج به العدلُ و القسط فهي من الدين ليست مخالِفةً له، فلا يقال: إن السياسة العادلة مخالفة لما نطق به الشرعُ ،بل موافقة لما جاء به ،بل هي جزء من أجزائه ،و نحن نُسَمِّيه سياسةً تبعاً لمصطلحكم ،و إنما هي عدل الله و رسوله، ظـــهر بهذه الأَمارات و العلامات)[1] دەڵێ: کەواتە چۆن دادگەریی بچەسپێ و چۆن بەرژەوەندیی خەڵك بێتە دی، مادام پێچەوانەی دەقێکی شەرعیی نەبێ، ئەوە لە ئایینە و دژی نیە، بۆیە نابێ بگوترێ: سیاسەتی دادگەرانە پێچەوانەی ئەوەیە کە شەریعەت گوتوویەتی، بەڵکو لەگەڵ ئەوەدا ڕێکە، کە شەریعەت هێناویەتی، بگرە بەشێکە لەبەشەکانی، وە ئێمە لەبەر زاراوەی ئێوەبەسیاسەتی ناودەبەین، ئەگەرنا ئەوە بریتیە لەدادگەریی خوا و پێغەمبەرەکەی و بەو نیشانە و دروشمانەوە ئاشکرابووە.

بۆ وێنە: دیاریکردن (تحدید)ی ماوەی حوکمڕانیی، کە ئێستا لە وڵاتانی دیموکڕاسیی دا باوە و - پێشتریش ئاماژەمان بۆ کرد - چوار ساڵ بێ، یان پێنج ساڵ بێ، هەرچەند بێ، مادام خەڵك بە چاکیان زانی و گوتیان: ئەوە شتێکی باشە، بۆ ئەوەی هیچ کەس نەیکاتە میرات، یان بۆ ئەوەی زۆر ڕەگ و ڕیشە دانەکوتێت، ئەوە مادام خەڵك بە باشی دەزانن، وە هیچ دەقێکی شەرعییشی لەسەر نیە، کە قەدەغەی بکات، وە داگەریی پێ جێبەجێ دەبێ و، بەرژەوەندیی خەڵکی پێ دابین دەکرێ، ئەوە مەسەلەیەکی ڕەواو چاکە.

- وەك سیستمی کۆماریی!

---

(١) سەرچاوەی پێشوو، هەمان لاپەڕە.

بەڵێ، سیستمی کۆماریی، کە جەماوەری خەڵك حوكمڕانەكانیان هەڵ دەبژێرن، لەگەڵ ئامانجەكانی شەریعەت دا ڕێكە.

**بە کورتیی:** چۆن بەرژەوەندیی خەڵك دابین ببێ و، چۆن خراپە و زیان لە خەڵك دووركەوێتەوەو، بەرژەوەندییەكانی خەڵك دابین بن، شەریعەتی خوای پەروەردگار هیچ نكووڵیی لێی نیە، مادام پێچەوانەی دەقێكی شەریعەت نەبێ، بێگومان هیچ كاتێكیش دەقەكانی شەریعەت، لەگەڵ قازانج و بەرژەوەندییە ڕاستەقینەكانی تاك و كۆمەڵ دا، تێك نەگیراون و تێك ناگیرێن.

- کەواتە دەتوانین بڵێین: داهێنان (إبتداع) لە دین دا حەڕامە؟! لەو سێ بوارەدا کە باسمان کردن و دەقی شـەرعییان لەسەرە: (ئیمان و عەقیدە، عیبادەت، ئەخلاق)؟

بەڵێ، بەڵام لە بوارەكانی دیكەی كاروباری دنیاییدا وەك: سیاسەت و حوكمڕانیی و ئابووریی و كاروباری ئیداریی و زۆرشتی دیكە، ڕێگا كراوەتەوە، بەپێی ئەو بنچینە شەرعییانە، كە بۆیان دانراون، ئیجتیهادیان تێدا دەكرێ.

وە من قەناعەتم وایە كە پەیداكردن و داهێنان (الإحداث و الإبتداع) لە دین دا چەندە خراپە، بەپێچەوانەوە: تازەگەریی و داهێنان (التجدید و الإبداع) لە ژین دا هێندە پێویستە، واتە: بە پێچەوانەن، بەڵام دەبێ ئەوە بزانیـن كە ئیسلام تەنها بریتی نیە لە: (ئیمان و عیبادەت و ئەخلاق)، بەڵكو من دەڵێم: لە بواری ئیمان و عیبادەت و ئەخلاق دا، دەقەكانی شەریعەت باسی وردە بابەتەكانی ئەو بوارانەشیان كردوە، ئەگەرنا ئیسلام وێڕای ئەو سێ بوارە، سیاسەت و حوكمیشەو، ئابووریی و داراییشەو، سیاسەتی نێو دەوڵەتانیشە، وە ئیسلام لەو بوارانەدا، كە ئینسان عەقڵی پێیان دەشكێ، وە ژیان و گوزەرانیش لەو بوارانەدا زۆر بە خێرایی گەشە دەكات و، بەرەو پێش دەچێ، دەقگەلی (نصوص)ی كەمی داناوە، بۆ ئەوەی دەست و پێی خەڵك نەبەسترێ و بۆشاییی زۆری هێشتۆتەوە، تاكو بە ئیجتیهادی پسپۆڕان و شارەزایانی دین و ژین پڕ بكرێتەوە. دیارە هەر لێرەشەوەیە، كە زانایان لەبەر ڕۆشنایی واقیعی شەریعەت دا ئەم

بنچینەیان داناوە: [إجمالٌ في المتغيِّرات، تفصيلٌ في الثوابت] واتە: شەریعەت بۆ بوارە گۆڕاوەکان بەکورتیی دواوە و، بۆ بوارە چەسپاو و نەگۆڕەکان، بەدرێژیی و ڕوونیی.

ئەگەرنا ئیسلام هەر ئەو سێ بوارەی نین، بەڵام ئەو سێ بوارەی زیاتر پەیوەندییان بە تاك (فرد)ەوە هەیەو، زیاتر پەیوەندییان بە ڕووح و کەینوونەی ئینسانەوە هەیە، ئەگەرنا ئیسلام لە بوارەکانی دیکەش دا، هەر دەیەوێ حاکم بێ و، هەموویان ئاڕاستە (توجیه) بکات.

- مامۆستا! با بڕۆینە سەر تەوەرەیەکی دیکە: هەر لەو قەزیەی حوکمڕانییەدا، زۆرجار گلەیی لە ئیسلام یاخود لە ئیسلامییەکان دەکرێ و دەڵێن: مێژووی ئیسلامیی شاهیدە، کە ئیسلام لە دیکتاتۆرییەوە نزیکە تاکو دیموکڕاسی، هەرچەندە جەنابت بە دوورو درێژیی باسی ئەوەت کرد لە ئاڵقەی پێشوودا، کە ئیسلام ئیسلامە، نە دیموکڕاسییەو، نە دیکتاتۆریی، ئنجا ئایا دەتوانین بڵێین: کۆمەڵێ خاڵی هاوبەش هەن، لە نێوان ئیسلام و دیموکڕاسی دا؟!

بەڵێ.

- ئەدی خاڵی هاوبەش چییە لە نێوان ئیسلام و دیکتاتۆریی دا؟!

هیچ خاڵێکی هاوبەش لەنێوان ئیسلام و دیکتاتۆریی دا نییە، چونکە هەرچۆن بێ، تا ڕاددەیەك دیموکڕاسی ڕێزگرتنی میللەت و جەماوەری تێدایە - وەك باسمان کرد - دەجا هەموو شەریعەتەکانی خوای پەروەردگاریش هاتوون، تاکو لەسەر خەڵك بکەنەوەو لەسەر میللەت و جەماوەر وەدەنگ بێن، لە بەرانبەر دەستەڵاتداران دا، هەر بۆیەش دیکتاتۆریی و فیرعەونایەتیی و طاغووتایەتیی، بە درێژایی مێژوو گەورەترین دوژمنی پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) و سەختترین کۆسپ و لەمپەری سەر ڕێیان بووە! ئەوە (نوح)ە (عليه الصلاة و السلام) کە (ملأ) واتە: ئەو ئەشراف و زلەزلانەی کە خۆیان بە زل گرتبوو، بەڵێ، ئا ئەوانەی دژی دەوەستنەوە! بەڵام کێن کە دەبنە پشتیوان و شوێنکەوتوانی (نوح)؟! ئەوانەن کە خۆ بە زلگرەکان (ملأ) بە لاواز و نەزان و فامکاڵ ناویان دەبەن، وەك خوا فەرموویەتی:

﴿ فَقَالَ ٱلْمَلَأُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِن قَوْمِهِۦ مَا نَرَىٰكَ إِلَّا بَشَرًا مِّثْلَنَا وَمَا نَرَىٰكَ ٱتَّبَعَكَ إِلَّا ٱلَّذِينَ هُمْ أَرَاذِلُنَا بَادِيَ ٱلرَّأْيِ ﴾ هود: ٢٧.

بەڵێ، خۆبەزلگرەکان بە شوێنکەوتوانی (نوح) دەڵێن: (أراذل) واتە: هەرچی و پەرچیی، وە هەمیشە خەڵکی سادە و هەژار و ڕەش و ڕووت، شوێنکەوتوانی پێغەمبەران بوونە، دیارە حیکمەت و فەلسەفەی ئەو دیاردەیەش ئاشکرایە: بۆیە هەمیشە بەزۆریی پەیڕەوان و لایەنگرانی پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) ڕەش و ڕووت و چەوساوەو بەش خوراوەکان بوون، چونکە زانیویانە: پێغەمبەران لەسەر مافەکانیان بە جوابن.

ئنجا ئایا کێبوون، ئەوانەی دژی پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) بوون؟! خوای پەروەردگار لە چەندان ئایەتدا پێناسەی ناحەز و دوژمنانی پێغەمبەران دەکات، بۆ وێنە: لە سوورەتی (سبأ)دا فەرموویەتی:

﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَا فِي قَرْيَةٍ مِّن نَّذِيرٍ إِلَّا قَالَ مُتْرَفُوهَآ إِنَّا بِمَآ أُرْسِلْتُم بِهِۦ كَٰفِرُونَ ﴿٣٤﴾ ﴾ سبأ: ٣٤.

واتە: وە هیچ ئاگادارکەرەوەیەکمان لە هیچ ئاوەدانییەك دا ڕەوانە نەکردوە، کە خۆشگوزەرانەکانی نەیانگوتبێ: ئێمە بەوەی ئێوەی پێڕەوانەکراون، بێبڕواین.

- مامۆستا ! (مترفوها) یانی چی؟

واتە: خۆشگوزەرانەکان، ئەوانەی کە نەیارانی پێغەمبەرانن (عليهم الصلاة والسلام)، خوای پەروەردگار بە چەند شێوەیەك پێناسە و ناوزەدیان دەکات، بۆ وێنە: (مترفوها، الذين استكبروا، الذين طغوا في البلاد) چونکە هەمیشە ئەوانەی، کە خۆشگوزەران و خۆبەزلگر و یاخیی و سنوور بەزێنن، ئەوانەی کە خۆیان بەسەر خەڵك دا فەرز دەکەن و ستەمیان لێ دەکەن و، مافە سیاسیی و ئابووریی و فەرهەنگییەکانیان لێ زەوت دەکەن: ئەوانە دژ و ناحەزی ئایین و بەرنامەی خوای دادگەرن، چونکە دڵنیان، کە ئەگەر پێغەمبەران سەربکەون، ئەو بازاڕەیان لێ تێك دەچێ، بۆیە بە شێوەیەکی ڕەها (بصورة مطلقة) و بە هیچ جۆرێك هیچ

خاڵێکی هاوبەش لە نێوان ئیسلام و دیکتاتۆریی دا نیە، چونکە دیکتاتۆریی، پێش ئەوەی لەگەڵ شەریعەتدا دژ بێ، لەگەڵ خودی (عەقیدەو ئیمان)دا دژ دەوەستێت، چونکە ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی، کاکڵەکەی بریتیە لە خوا بەیەکگرتن (التوحید)، خوای پەروەردگار لەو بارەوە دەفەرموێ:

﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِيٓ إِلَيۡهِ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱعۡبُدُونِ ٢٥﴾

الانبیاء: ٢٥.

واتە: وە هیچ پێغەمبەرێکمان پێش تۆ نەناردوە، مەگەر پێمان ڕاگەیاندوە کە: جگە لە من پەرستراوێکی دیکە نیە، ئنجا بەندایەتیی بەس بۆ من بکەن.

بەڵێ، بەندایەتیی بۆ خوا کردن و تەنها خوا بەپەرستراو (إله) زانین و پەرستنی، بە مانای فراوان و گشتگیری پەرستن و بەندایەتیی (العبادة و العبودیة)، ئا ئەو خوا بە یەکگرتن (توحید)ە، کاکڵە و جەوهەری عەقیدەی ئیسلامییە، دەجا ئاشکرایە، کە دیکتاتۆریی و خۆ لە خەڵك کردنە پەرستراو و خۆ بەسەر خەڵك دا فەرزکردن و، حەڵاڵ و حەرام دانان بۆ خەڵك و، حوکمڕانیی موتڵەق کردن بەسەر خەڵك دا، یەکسەر لەگەڵ ئەو خوابەیەکگرتن (توحید)ە دا دژ دەوەستێت، تەماشا دەکەین (فرعون) لە بەرانبەر وەڵامی (موسی)دا علیه الصلاة السلام) چی دەڵێ، لە کاتێك دا کە، مووسا دەچێ بۆ ئەوەی گەلی چەوساوەی خۆی (بني اسرائیل) لە بن دەستی دەربێنێ و قوتاری بکات و پێی دەڵێ:

﴿فَأَرۡسِلۡ مَعَنَا بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ وَلَا تُعَذِّبۡهُمۡ﴾ طه: ٤٧.

واتە: بەنی ئیسڕائیلمان لەگەڵ بنێرە و چی دیکە ئازاریان مەدە و مەیان چەوسێنەوە! فیرعەون دەڵێ :

﴿لَئِنِ ٱتَّخَذۡتَ إِلَٰهًا غَيۡرِي لَأَجۡعَلَنَّكَ مِنَ ٱلۡمَسۡجُونِينَ ٢٩﴾ الشعراء:٢٩.

واتە: ئەگەر بێجگە لەمن پەرستراوێکی دیکەت هەبێ، لەگەڵ گیراوانت دەخەم!! یانی: دەتگرم وەك زۆر خەڵکی دیکەشم گرتوە!

هەروەها سەرنج بدە! فیرعەون چی بە خەڵك و جەماوەری وڵاتەکەی دەڵێ:

﴿ فَقَالَ أَنَا۠ رَبُّكُمُ ٱلۡأَعۡلَىٰ ﴿٢٤﴾ ﴾ النازعات: ٢٤.

واتە: من پەروەردگاری هەرە بەرزتانم!

دیکتاتۆر و طاغووتێکی دیکەی مێژووش (نەمرود)ە، وەك خوای کاربەجێ دەفەرموێ:

﴿ أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِي حَآجَّ إِبۡرَٰهِـۧمَ فِي رَبِّهِۦٓ أَنۡ ءَاتَىٰهُ ٱللَّهُ ٱلۡمُلۡكَ إِذۡ قَالَ إِبۡرَٰهِـۧمُ رَبِّيَ ٱلَّذِي يُحۡيِۦ وَيُمِيتُ قَالَ أَنَا۠ أُحۡيِۦ وَأُمِيتُۖ ﴾ البقرة: ٢٥٨.

وەك دەبینین ئەویش بە هەمان شێوەی فیرعەون و هەر طاغووت و دیکتاتۆرێکی دیکە، لافی پەروەردگارێتیی و پەرستراوێتیی لێدەدات! ئەوەتا کاتێك (إبراهیم) - علیه الصلاة والسلام - دەفەرموێ: پەروەردگاری من دەژێنێ و دەمرێنێ، نەمردووی دیکتاتۆر و طاغووت دەڵێ: منیش خەڵك دەژێنم و دەمرێنم!! دەڵێن: نەمروود دوو کەسی لە بازاڕی هێنان، یەکێکیانی کە هیچ خەتای نەبوو، کوشت و، ئەوی دیکەشی ئازاد کرد، ئنجا گوتی: ئەوە منیش ئەمەیانم زیندوو کردەوە و ئەمەشیانم مراند!

کەواتە: فیرعەون و نەمروود و طاغووتەکان بە درێژایی مێژوو دوژمنی سەرسەختی پێغەمبەران (علیهم الصلاة و السلام) بوون، چونکە پێغەمبەران فەرموویانە: دەبێ تاکە حاکم، خوا بێ، ئەوانیش گوتوویانە: نەخێر ئێمە حاکمین، پێغەمبەران گوتوویانە: دەبێ هەموومان بەندەی خوابین، کەچی ئەوان گوتوویانە: نەخێر، دەبێ خەڵك کۆیلەی ئێمە بێت!! بۆیە وەك گوتم، هیچ خاڵێکی هاوبەش لە نێوان ئیسلام، یاخود سیستمی حوکمڕانیی ئیسلام و، دیکتاتۆریی دا نیە، بەڵکو ئەو دووانە زۆر دژ و پێچەوانەی یەکدین، ئیسلام دەڵێ: دەبێ بەندەکان هەموویان بەس بەندەی خوا بن و، هەر خوا پەرستراو بێ، بەڵام دیکتاتۆریی دەڵێ: دەبێ یەکێك لە بەندەکان کۆیلایەتیی بۆ بکرێ و بپەرسترێ و، وەك خوا (جل و علا) بگرە بەرێزتریش تەماشا بکرێ!!

- مامۆستا گیان! جەنابت دەڵێی: هیچ خاڵێکی هاوبەش لە نێوان ئیسلام و دیکتاتۆریی دا نیە، بەڵام ئەگەر سەیری مێژووی مسوڵمانان بکەین، هەرچەندە لە ئاڵقەی پێشوودا جەنابت فەرمووت: ئیسلام بەرپرس نیە لە لادانی ئەو خەڵکە کە لە دین لادەدەن، بەڵام لەگەڵ ئەوەش دا دەبینین: زۆرێك لەو کەسانەی کە خۆیان بە خەلیفە، یاخود بە (أمیر المؤمنین) ناوبردوە، لادانێکی زۆریان هەیە و بەرەو دیکتاتۆریی ڕۆیشتوون، لە نێویان دا، یەکێکی وەك (حجاج) ئەگەر ئەو قسانەی کە لە بارەیەوە دەکرێن، هەر هەندێکیشیان ڕاست بن، بێگومان دیکتاتۆر بووە.

ئنجا ئایا لە ئیسلام دا زەمانەت چییە، بۆ ئەوەی سیستمی حوکمڕانیی بەرەو دیکتاتۆریی نەڕوات؟ چونکە دیموکراسی تا حەددێك زەمانەتێکی بۆ خۆی داناوە، بۆ وێنە: دەستووری داناوە، ڕای گشتی داناوە، جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکانی داناوە، بۆ ئەوەی ئەو دیکتاتۆرییە دروست نەبێت، ئنجا ئایا ئێمە لەئیسلام دا چیمان هەیە بۆ ڕێگریی لە دیکتاتۆریی؟!

لەو بارەوە کە ئایا ئیسلام چ گرەنتیی و (ضمانة)ێکی هەیەو داناوە، بۆ ئەوەی دەستەڵاتی جێبەجێکردن (السلطة التنفیذیة) لا نەدات؟ من لە پێشدا ئەوە تەئکید دەکەمەوە، کە ئیسلام تەنها لەو قۆناغە بەرپرسیارە، کەبە کردەوە مێژووی حوکمڕانیی، ئیسلامیی بووە، کە سەردەمی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و چوار خەلیفە ڕاشیدەکانە، هەروەها ئەو ماوە کورتەی حوکمڕانیی (عمر بن عبدالعزیز) کە بە پێنجەمین خەلیفەی ڕاشید دانراوە، وە ناوبەناویش هەندێك لە دەستەڵاتدارانی دیکەش، وەك (نورالدین محمود زنکی) و (صلاح الدین الأیوبي) ڕەحمەتی خوایان لێ بێت، هەروەها ژمارەیەکیش لە حوکمڕانانی (عوسمانیی)ش، کە پیاوی باش و ئەهلی تەقوا و پابەند بوون بە شەرعەوە، ئیسلام تەنها لەو قۆناغانە بەرپرسیارە، کە حوکمڕانەکان تێیان دا پابەند بوونە بە شەریعەتەوە.

- واتە : تەنها لەو قۆناغانە بەرپرسیارە کە شەریعەت تێیاندا جێبەجێکراوە؟!

بەڵێ، چونکە ئەو حوکمڕانانە بە شێوەیەکی شەرعیی چوونەتە سەر کورسی حوکم، بەڵام کەسێك بە زۆرداریی خۆی سەپاندبێ و خۆی کردبێتە حوکمڕان،

ئەوە ئیسلام لە کردەوەکانی بەرپرسیار نیە، هەرچەندە بە ناوی ئیسلامەوەیە، بەڵام بوختانە بە حوکم و سیاسەتی ئیسلامەوە.

ئنجا لێرەدا دەمەوێ ئاماژە بۆ مەسەلەیەك بکەم: کە شەرعزانان (فقهاء)ی ئیسلام، لە کتێبەکانی سیاسەتی شەرعییدا لەژێر ناوونیشانی: (حكم المتغلِّب) یان (حاكمية المتغلِّب)دا هێناویانە، واتە: حوکمڕانی بە زۆرەملێ و خۆسەپێنەر، جا زانایانی ئیسلام لە بارەی ئەو جۆرە حوکمڕانییەوە بوونەتە دوو بەشەوە: هەندێکیان گوتوویانە: حوکمڕانیی و ویلایەتەکەی بەسەر موسڵمانان دا دروست و ڕەوایە، هەندێکیشیان دەڵێن: ئەو جۆرە حوکمڕانییە دروست نیە، دیارە من لەگەڵ ئەو ڕایەدام کە دەڵێ: دروست نیە، بەڵام ئەوانەش، کە دەڵێن: دروستە، دەڵێن: بە ناچاریی دروستە، واتە: شەرعیی نیە و دەیشەرعێنن، و گوتوویانە: چونکە: (حكم غشوم، خير من فتنة تدوم) ئەم پەندەیان وەك قاعیدەیەك بەکارهێناوە، یانی: حوکمێك کە زۆریی تێدایە و ستەم و جەور و خراپەی تێدایە، باشترە لە ئاشووبێك کە بەردەوام بێ و ئاژاوەیەك، کە نەبڕێتەوە.

بەڵام بێگومان هەر کەسێك بە شێوەی شەرعیی نەچووبێتە سەر کورسی حوکم، شەرعییەتی نیە، هەر بۆیەش (حسين بن علي بن أبي طالب) خوا لێیان ڕازی بێ، پاشان (زید) ی کوڕی (علي بن حسين بن علي)، پاشان (محمد) و (إبراهيم) کوڕانی (عبدالله)، پاشان (عبدالرحمن بن الأشعث)وە .. وە...هتد، لە ستەمکارانی ئومەویی و عەبباسیی، ڕاپەڕیون.

هەڵبەتە زۆرێك لە زانایانی ئیسلامیش، بە تایبەت هەردووك پێشەوای گەورە: (أبو حنيفة) و (مالك) پشتگیرییان کردوون و فەتوایان بۆ داون، وە کاتێك پرسیاریان لێکراوە لەو بارەوە و پێیان گوتوون: ئێوە چۆن فەتوا دەدەن، کە خەڵك پشتگیریی (زيد) بکەن، یان پشتگیری (محمد) و (ابراهيم) ی برای بکەن، کە یەکەمیان دژی (هشام)ی ئومەویی و، ئەوانی دیکەش دژی (أبو جعفر المنصور)ی عەبباسی ڕاپەڕیون؟!

لە وەڵام دا گوتوویانە: (هشام) و (أبو جعفر) هەقیان نیە، وە ویلایەتیی شەرعییان بەسەر مسوڵمانان دا، نیە.

بەڵێ، هەر ئەو ڕایە ڕاستەو بەڵگەش زۆرن، یەکیان ئەوەیە کە خوای پەروەردگار بە (ابراهیم - علیه الصلاة والسلام) دەفەرموێ:

﴿إِنِّي جَاعِلُكَ لِلنَّاسِ إِمَامًا قَالَ وَمِن ذُرِّيَّتِي قَالَ لَا يَنَالُ عَهْدِي الظَّالِمِينَ ﴿١٢٤﴾﴾

البقرة: ١٢٤.

واتە: من تۆ دەگێڕم بە پێشەوا بۆ خەڵکی، گوتی: ئەدی لەوەچەکەم؟! فەرمووی: بەڵێن و پەیمانی من ستەمکاران ناگرێتەوە.

واتە: لەوەچە (ذرية)ی تۆش، هەر کەسێك شایستە بێ، مافی حوکمڕانیی هەیە، بەڵام کەسێك ستەمکار (ظالم) بێ، خوای پەروەردگار دەفەرموێ: بەڵێنی من بەوە کە ببێتە پێشەوای مسوڵمانان، نایگرێتەوە.

ئنجا بێگومان مەسەلەی هەڵبژاردنی حوکمڕان و (بيعة) لەگەڵدا کردنیشی، بەڵگەیەکی دیکەی پتەوە لەو بارەوە، چونکە پەیمان و بەیعەت پێدان یانی چی؟! دیارە وشەی (بيعة) لە وشەی (بيع)ەوە هاتوە، یانی وەك چۆن تۆ پارە دەدەی بەبابایەکی دووکاندار و ئەویش کەل وپەلێکت دەداتێ، بەیعەت پێدان و پەیمانبەستن لەگەڵ بابای حوکمڕانیش دا بەوشێوەیە و، ئەو بەڵێن دەدا پابەندی شەریعەت بێ و دادگەر بێ و، خەڵکیش پەیمانی دەدەنێ فەرمانبەریی بۆبکەن، ئنجا ئایا (مبايعة) یانی چی؟! سەرجەم زانایانی سیاسەتی شەرعیی لە بارەی (مبايعة)ەوە دەڵێن: (مبايعة) ئەوەیە کە مسوڵمانان دەست دەخەنە نێو دەستی ئەو دەستەڵاتدارەوە، کە شەریعەتی خوایان بەسەردا جێبەجێ بکات و، بە دادگەریی حوکم بکات و، ئەوانیش بە قسەی بکەن، وە پاشان پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کاتێك کە دەفەرموێ: (إنما الطاعة في المعروف) کە لە (صحيح البخاري)دا هاتوە: واتە: گوێڕایەڵیی بۆ حوکمڕانان، تەنها لە چاکە دایە، واتە: ئەگەر ناشەرعیی بێ، نابێ بە قسەیان بکرێ، بەڵکو دەبێ دەستیان بگرن و لە دژیان ڕاپەڕن.

- ئەدی لە بارەی (ضمانات)ەوە چییان گوتوە؟!

بە کورتیی دەڵێم: هەرجۆرە گرەنتیی (ضمانة)یەك لە دیموکڕاسیی دا هەبێ، ئەوە لە ئیسلام دا هەموو ئەوانە بەشێوەی چاکتر هەن و، جگە لەوانەش شتی دیکە هەیە:

١- یەکەمین زەمانەت (ضمانة) بۆ جێبەجێکردنی سیستمی حوکمڕانیی ئیسلامیی، بۆ دەست گرتنی دەستەڵاتدار، کە لا نەدات، ئەوەیە کە هیچ حاکمێك ڕەوایەتیی نیە، تاکو میللەت خۆیان هەڵینەبژێرن و پەیمانی لەگەڵ نەبەستن (لا شرعية بدون انتخاب و بيعة) هەر بۆیە زانایانی ئیسلام و مێژوونووسان بە: (أبوبكر، عمر، عثمان، علي) خوا لێیان ڕازی بێ دەڵێن: خەلیفەی ڕاشید، بەڵام لە دوای ئەوانەوە پێیان دەڵێن: پادشا (ملك).

٢- پاشان ئەو ئیمان و عەقیدەو، مسوڵمانەتیی و عیبادەتەی، کە مسوڵمانان لەسەری پەروەردە دەکرێن، کەدەبێ مسوڵمان، جگە لە خوا سەر بۆ کەس نەوی نەکات و، بێجگە لە ئایینی خوا، هیچ شتێکی دیکە بە بەرنامە نەزانێ و، بێجگە لە ڕازی کردنی خوا، مەبەستی شتێکی دیکە نەبێ، ئا ئەو جۆرە پەروەردە ئیمانییە، وا لەهەرکام لەخەڵك و جەماوەر و حوکمڕانان دەکات کەلانەدات.

٣- فەرمان بە چاکە و نەهی لە خراپە و قسەگوتنی هەق لە لای حوکمڕانی لادەر (قول الحق عند سلطان جائر)یش کە لەلایەن پێغەمبەری خواوە (صلى الله عليه وسلم) بە گەورەترین جیهاد دانراوە[1]، دیسان زەمانەتێکی دیکەی لانەدانی حوکمرانانە.

٤- لەیەك جیاکردنەوەی دەستەڵاتەکان، (فصل السلطات) لە کاتێك دا، کە حوکمڕانێتیی ئیسلامیی (شووراییی)ش نەبووە، دەستەڵاتەکان هەر لە یەك جیابوونە، چونکە دەستەڵاتی یاسادانان (السلطة التشريعية) کە لە زانایان دا خۆی بینیودتەوە، چ موجتەهیدان (مجتهدين) و چ موفتییەکان، تەماشا دەکەین، مەگەر تاك و تەرایەك زانای خۆفرۆش، کە ناونراون: (وعاظ السلاطين) یان

---

(١) (أفضل الجهاد كلمة حق عند سلطان جائر) رواه أبو داود: ٤٣٤٤، والترمذي: ٢١٧٤، وقال: حديث حسن. عن أبي سعيد الخدري.

وعن أبي عبدالله طارق بن شهاب البَجليِّ الأحمسيِّ أن رجلاً سأَلَ النبيَّ (صلى الله عليه وسلم) وقد وضع رِجْلَهُ في الغَرْزِ: أي الجهاد أَفْضَلُ؟

قال: ((كلمةُ حق عند سلطان جائرٍ)) رواه النسائي بإِسنادٍ صحيح: ٤٢٢٠.

وەك: (أبو حامد الغزالي) بە (زانایانی خراپ/ علماء السوء) یان ناو دەنێ، ئەگەرنا زانایانی بەرجەستە، بۆ وێنە: هەر چوار سەر مەزهەبەکان( أبو حنیفە، مالك، شافعی، أحمد) ڕەحمەتی خوایان لەسەر بێ، وە (سفیان الثوري) و (سعید بن الجبیر) و (أبو جعفر الطبري) و (زید بن علي) و( جعفر الصادق) و (ابن حزم) و (داود الظاهری) کە هەموویان زانا و پێشەوای بەرجەستەو گەورە گەورەبوون، ئامادە نەبوون، تەنانەت فەتوایەکیش بدەن بۆ ڕازی کردنی حوکمڕانێك و، سجنیان هەڵبژاردوە و کوژران و ئاوارەییان هەڵبژاردوە، بۆ وێنە: (سعید بن جُبیْرْ) شەهید کراوە، (إمام أحمد) فەلاقە کراوە، (إمام شافعي) دەرکراوە، (إمام أبو حنیفە) ئامادە نەبووە ببێتە (قاضي القضاة) و سجن کراوە، وە (إمام مالك) دارکاریی کراوە، هەموویان دیفاعیان کردوە لەوە، کە خوا فەرموویەتی و پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم) فەرموویەتی، وە هەوڵیان داوە، کە بە موو لانەدەن و، فەتوایەکی غەڵەت نەدەن و، لەو پێناوەش دا هەموو باجێکیان داوە.

ئنجا لە بواری (السلطة القضائیة)دا زۆرجاران خەلیفە پەلکێش کراوە بۆ بەردەم (قاضي) چ لە سەردەمی خەلیفە ڕاشیدەکاندا و، لە ڕۆژگاری دەستەڵاتدارانی (ئومەویی و عەبباسیی و عوسمانیی)شدا چەند جارێك ڕوویداوە، کە حوکمڕان کاتێك کە کێشەیەکی بووە لەگەڵ کابرایەکی سادە، یان لەگەڵ پیرەژنێکدا، هێنراوە بۆ لای (قاضي) و ئەویش حوکمی ڕەوای خۆی داوە!

- مامۆستا! دەتوانین بڵێین: ئەگەر دەستەڵاتدارێك زوڵمی کردبێ، یاخود خەلیفەیەك زوڵمی کردبێ، لەسەر فەتوایەك زوڵمی نەکردوە، وە ئەگەر شوێنێکی داگیر کردبێ، وەك زوڵم داگیریی کردوە، نەك لەسەر فەتوای زانا و پێشەوایەك، یان بڕیارێکی شەرعیی بەدەسەتەوە بووبێ، ئایا وا نیە؟!

با، وایە هیچ کاتێك ئەو جۆرە حوکمڕانییەی کە لە ئەورووپادا بووە، کە ئەوان پێی دەڵێن: حوکمی خوایی (ثیۆکراسیی) کە حوکمڕان خۆی بە سێبەری خوا زانیوە، وە پاپاش لەگەڵیدا شەریکە دز بووە، واتە لەگەڵ حوکمڕان دا،

وە حوکمڕان لە یەك کات دا هەم دەستەڵاتی یاسادانان (السلطة التشريعية)ی بەدەست بووە و، خۆی قانوونی داناوەو، هەم دەستەڵاتی ڕاپەڕاندن (السلطة التنفيذية) و خۆی یاساکانی جێبەجێکردوە و، هەم دەستەڵاتی قەزایی (السلطة القضائية)شی بەدەست بووەو، خۆیشی دادوەریی کردوە!!

بەڵام لە ئیسلام دا دەستەڵاتی قەزایی هەرگیز نەهاتۆتە ژێر دەستەڵاتی یاسادانان (السلطة التشريعية)ەوە، کە لە زاناو موجتەهیداندا بەرجەستە بووە، بۆیە ڕاستە ئەگەر زوڵمێکیش کرابێ دەستەڵاتی ڕاپەڕاندن کردوویەتی، لەبەرئەوە هەمیشە موسوڵمانان زانیویانە، کە ئەوە شتێکی ناشەرعییەو، بەردەوام ئەو هەموو شۆڕش و ڕاپەڕینانەی هەبوون، لە مێژووی ئیسلام و مسوڵمانان دا، زانایان سەرمەشقیان بوون کە لە بەرانبەر دەستەڵاتداراندا هەڵگیرساون، هەتا ئەو کاتەی کە نائومێد بوون لەوەی کە دەستەڵاتدار و حوکمڕانەکان لابدرێن، لە سۆنگەی ئەوەوە کە زۆر خۆیانیان مەحکەم کردبوو، چونکە سوپایەکی جەرڕاریان هەبوو، بەڵێ، زانا و پێشەوایان زانیان، کە ڕاپەڕینەکەیان بێ سوود دەبێ و، بۆیان دەرکەوت، کە بێ ئاکام دەبێ، گوتیان: خەڵکینە! لەبەرئەوەی کە زیان و خراپەی زیاترە، ڕامەپەڕن و دروست نیە ڕاپەڕن، لەبەرئەوەی مەفسەدەی زیاترە، نەك لەبەرئەوەی کە لە ئەسڵدا دروست نیە!

**وە لەکۆتایی قسە وباسمان لەبارەی دیموکڕاسییەوە، دەڵێم:**

ئێمە هیچ کاتێك لە دیموکڕاسی ناترسین، بەڵکو ئێمە لە دیکتاتۆریی و لە (إستبداد) دەترسێین، لە حوکمی تاکڕەوانەو حوکمی فیرعەونایەتیی دەترسین، ئەگەرنا، ئێمە هیچ باکمان لە دیموکڕاسی نیە، بە مەرجێك ڕاست بێ، نەك هەر بایی ئەوەندە دیموکڕاسی بێ، قسە بە خواو پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بگوترێ!! هەربایی ئەوەندە دیموکڕاسی بێ، شتی پێچەوانەی بەها و ئەخلاقی ئیسلامیی ئەنجام بدرێ و، هەر بایی ئەوەندە خەڵك ئازادیی هەبێ، تاکو قسە بە ئیسلام دەگوترێ و، بە موقەددەساتی مسوڵمانان دەگوترێ!! بەڵام ڕێگا نەدرێ بە خەڵك، کە ڕەخنە بگرێ لە سیستمی حوکم و، لە هەڵس و

کەوتی حوکمڕانەکان و، لە شێوەی دابەشکردنی ماڵ و سامان و، لە ڕەوتی سیاسی و لە سیاسەتی دەرەکیی و سیاسەتی نێوخۆ، ئەمانە هەموویان حەڕام و قەدەغەبن و، تەنها دیموکڕاسی و ئازادییەکە لەوەدا کورت بێتەوە، کە قسە بە خوا بگوترێ و، قسە بە ئیسلام بگوترێ و، تۆمەتی خراپ بدرێتە پاڵ مسوڵمانان و لای ئیسلامییەکان!!

بەڕاستی ئەوە شتێکە قبووڵ ناکرێ، ئەگەرنا ئێمە هەتا زەمینەی قەوارەیەکی ئیسلامییمان بۆ دەڕەخسێ، سەرڕاستانە مامەڵە لەگەڵ دیموکڕاسیدا دەکەین، هەڵبەتە دواییش هەرپابەند دەبین بە میکانیزمەکانی: ڕاوێژ و هەڵبژاردن و، دەستا و دەستی دەستەڵات بەئاشتییانە و، خەڵك بەسەرچاوەی ڕەوایەتیی (شرعیة) دانان، کە هەموویان پشت ئەستوورن بەڵگەی شەرع و عەقڵ، بۆیەش وادەڵێم، تاکو ڕێ لەو گومان و تۆمەتەی هەندێك لەناحەزانی تەوژمی ئیسلامیی بگرم، کە دەڵێن: ئیسلامییەکان تەنیا وەك ئامراز (وسیلة) مامەڵە لەگەڵ دیموکڕاسی دا دەکەن و دوایی لێی پاشگەز دەبنەوە! بەڵام بە تەئکید، جگە لە ئیسلام بەهیچ بەرنامەیەکی دیکە ڕازی نین و، هەوڵیش دەدەین میللەتەکەمان حوکم و سیستمێکی بەسەرەوە حاکم بێ، کە لەسەر بناغەی دینەکەی بنیات نرابێ.

واتە: وەك چۆن دینەکەی ئیسلامە، حوکمەکەشی ئیسلامیی بێ، کە بە تەئکید ئەو کاتە سەرفرازی دنیاو دوارۆژ دەبێ، وە هەموو ئەو لایەنە چاکانەی، کە لە (دیموکڕاسی)دا هەن، وە کاتی خۆی لە (سۆشیالیزم)دا هەبوون، وە لە هەر فیکرەو بیرو بەرنامەیەکی دیکەدا هەن، لە (ئیسلام)ی ئێمەدا بە شێوەی چاکتر هەن، وە ئاشکرایە پێش ئەوەی ئەوانە پەیداش ببن ئیسلام هەبووە.

وە ئێمە لەبواری ئیدارەوە، هیچ پەرچ و ڕێگرێکمان لە بەردەم دانیە، کە لە هەر کەسێك سوود وەربگرین و، لە هەر سیستمێك بەهرەمەند بین، وەك چۆن (عومەری کوڕی خەططاب) خوا لێی ڕازی بێ، لە سەردەمی خۆی دا، کاتێك کە خەلیفەی مسوڵمانان بووە، لە ڕووی ئیدارییەوە سوودی بینی لە سیستمی حوکمڕانیی ( فارس و ڕۆم) بۆ ئەوەی، کە سیستمی حوکمڕانیی ئیسلامیی گەشە پێ بدا: دیوانی (جند) وە دیوانی (خراج) و دیوانی (زکاة)و ئەوانەی

داهێنا، هەروەها پۆستە (برید)ی داناو، بەندیخانە (سجن) ی داناو، زۆر شتی ئیداریی لە فارس و ڕۆم وەرگرت و داهێنا، بێ ئەوەی كە ناوی دەوڵەتەكەی خۆی بگۆڕێ و بڵێ: دەوڵەتەكەمانمان گۆڕیوە، بۆ سیستمی فارسیی، یان ڕۆمیی!! بەڵكو هەرئیسلامیی بوو، ئەو ( میكانیزم )انەشی ئیستفادە لێكردن، چونكە لەسەر بناغەی ئیسلام و پابەندیی بە شەریعەتەوە، ئەو شتە ئیداریی و (میكانیزم)انە، بە باشترین شێوە بەكاردەهێنرێن و بەهرەیان لێ وەردەگیرێ، بۆ گەشەپێكردن و پەرەپێدانی ئەو دەوڵەتە ئیسلامییە.

- خوای گەورە پاداشتی خێرت بداتەوە مامۆستا گیان.

خوای پەروەردگار پاداشتی ئێوەش بداتەوەو، عاقیبەتی هەموو لایەكمان خێر بكات.

# بەرهەمەکانی دانەر

**تێبینی: بەپێی ڕیزبەندیی کاتی چاپکرانیان، ڕیزکراون.**

١- پوختەیەك دەربارەی ئیسلام. چاپی ١/١٩٨٤، چاپی ٢/ ٢٠٠٦.

٢- دەبەرێك ڕاچوونی ئیسلام و ڕێچکان. چاپی ١/١٩٨٥، چاپی ٣/ ٢٠٠٦.

٣- یادی خوا، گرنگی یادی خوا لە ژیانی مرۆڤ دا. چاپی ١ /١٩٨٧

٤- کۆمەڵی خوا. چاپی ١ / ١٩٨٨

٥- پێشمەرگەی ئیسلام، یان مسوڵمانی موجاهید کێیەوچۆنە؟ چاپی ١/١٩٨٨، چاپی ٣ /٢٠٠١.

٦- دەردو دەرمانی بزووتنەوەی ئیسلامیی. چاپی ١ /١٩٨٩

٧- ڕێگای صالح بوون و بەرەو خوا چوون. چاپی ١/١٩٩٠، چاپی ٥ /٢٠١٢.
تێبینی: وەرگێڕدراوە بۆ زمانی عەرەبی و فارسییش.

٨- کوردستان بۆ وێران بوو و چۆن ئاوەدان دەبێتەوە؟!. چاپی ١ / ١٩٨٩

٩- حوکمی گەڕانەوە ژێر نیری طاغووت. چاپی ١/ ١٩٩٠، چاپی ٢ /٢٠٠٥

١٠- سۆزی نەتەوایەتی و بیری ناسیۆنالیزم لە تەرازووی ئیسلامدا. چاپی ١/١٩٩٠، چاپی ٣ /٢٠٠٥.

١١- چارەسەری کێشەی کورد لە نێوان ئیمان و پەرلەمان دا. چاپی ١ /١٩٩٢

١٢- بزووتنەوەی ئیسلامیی لە دووڕیانی مان و نەمان دا. چاپی ١ /١٩٩٣

١٣- بزووتنەوەی ئیسلامیی و ئایندەیەکی گەش و ڕوون. چاپی ١ / ١٩٩٥

١٤- پرۆژەی بەرنامەی فیکریی کاری ئیسلامیی. چاپی ١ / ١٩٩٦

١٥- چەند ڕێڕوونییەك بۆ ئیسلامییەکانی کوردستان. چاپی ١ /١٩٩٦

١٦- ئیسلام و کێشە هەنووکەییەکان. چاپی ١ /١٩٩٨

١٧- با وریا بین! داڕووخانی ڕەوشت کۆمەڵگاکەمان بەرەو هەڵدێر دەبات. چاپی ١٩٩٩/١، چاپی ٢ /٢٠٠٧.

١٨- مەوسووعەی: خواپەرستیی ئیسلامیی ١-٤. چاپی١/ ٢٠٠٠، چاپی ٢٠٠٩/٢.

١٩- گەڕانەوە بۆ لای خوا "عز وجل". چاپی١/٢٠٠١، چاپی٥ /٢٠١٠.

٢٠- زانایانی ئیسلام کێن و چۆنن ؟!. چاپی١/٢٠٠٢، چاپی ٣ / ٢٠١١

تێبینی : بۆ زمانی عەڕەبیش وەرگێڕراوە.

٢١- بنچینە گرنگەکانی هەڵس وکەوتی شەرعییانەو ژیرانە لەگەڵ وردە بابەتە خیلافییەکاندا. چاپی ١ / ١٩٩٩ .

تێبینی: بۆ زمانی عەرەبیش وەرگێڕراوە.

٢٢- مزگەوتەکانی کوردستان لەنێوان ئاوەدانکردنەوەو وێران کردن دا. چاپی ١ /٢٠٠٠

٢٣- تاقیکردنەوەی خوا بۆ بەندەکانی چی یەو چۆنە؟ چاپی١/٢٠٠١، چاپی ٢ /٢٠١٢.

٢٤- بنەما شەرعییەکان و هێڵە گشتییەکانی کۆمەڵی ئیسلامیی. چاپی١ /٢٠٠١، چاپی٣ /٢٠١٤

تێبینی: وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبییش.

٢٥- کۆمەڵی ئیسلامیی: ئامانج و هەڵوێستەکانی.، چاپی ١ /٢٠٠١.

٢٦- ئافرەتی مسوڵمانی کورد مافە شەرعییەکانی و ئەرکە گرنگەکانی. چاپی ١ /٢٠٠٣.

٢٧- مەوسووعەی: ئافرەت و خێزان لە سایەی شەریعەتدا، بەرگی یەکەم چاپی١/٢٠٠٢، بەرگی ١و٢ چاپی ٣/ ٢٠١٣

٢٨- چەند مەسەلەیەکی باوی سەردەم. چاپی١/٢٠٠٢، چاپی ٦ / ٢٠١٦

تێبینی: وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی و تورکیی و فارسییش.

٢٩- چەند ڕێڕوونییەك بۆ خوشك و برایانمان لە هەندەران. چاپی ١ /٢٠٠٢

٣٠- سنووره قەدەغەکان مەشکێنن! (چاوپێکەوتنی دکتۆرحسین محمد عزیز). چاپی١/ ٢٠٠١، چاپی ٢ / ٢٠٠٣

٣١- چۆن هەڵس وکەوت لەگەڵ خەڵکی دا بکەین؟! چاپی ١ / ٢٠٠٢

تێبینی: وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی.

٣٢- شەهید کێیەو چ پلەوپایەیەکی هەیە ؟! چاپی ١ / ٢٠٠٢

٣٣- جیهاد لە ڕێی خواداو چەند سەرنج و ئاگادارییەك.چاپی ١/ ٢٠٠٢

٣٤- بۆئەوەی لەسەر جیهادکردنمان قەرزدار نەبینەوە! چاپی ١ / ٢٠٠٢

٣٥- جیهاد لە ڕێی خوادا چی یەو بۆچی دەکرێ و چۆن دەکرێ؟ چاپی ١/ ٢٠٠٢.

٣٦- ئەشکەنجەو زیندان (چاوپێکەوتنی هاوژین عومەر). چاپی١/٢٠٠٥، چاپی ٣/ ٢٠٠٩ .

تێبینی: وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی، هەروەها دوو تەرجەمەی فارسیشی کراوەو چاپ و بڵاوکراوەتەوە، هەروەها بۆ زمانی ئینگلیزیش وەرگێڕراوەو چاوەڕێی چاپە.

٣٧- کارو پرۆژەی ئیسلامییمان (وتاری کۆنگرەی یەکەمی کۆمەڵی ئیسلامیی ) چاپی١/ ٢٠٠٥، چاپی ٢ / ٢٠٠٦.

٣٨- ئیسلام و مسوڵمانەتیی و کاری ئیسلامیی، لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا. چاپی ١ / ٢٠٠٦ .

٣٩- مەوسووعەی: ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی ١-٦، چاپی ١/٢٠٠٦-٢٠٠٨، چاپی٢/٢٠١٦.

٤٠- تەوژمی ئیسلامیی و عەلمانیی و خاڵە هاوبەش و جیاوازەکانیان، چاپی ٢٠٠٨/١، چاپی ٢٠١٥/٣.
تێبینی: زۆربەی بە (٢٤) ئاڵقە لە هەفتەنامەی (هاووڵاتیی)و ئەوەی دیکەش بە (٩) ئاڵقە لە هەفتەنامەی (ئاوێنە)دا بڵاوکراوەتەوە.

٤١- گەنجەکانمان لە نێوان ڕەسەنایەتیی و لاسایی کردنەوەدا، چاپی ١/ ٢٠٠٦.
تێبینی: بۆ زمانی فارسییش وەرگێڕاوە.

٤٢- بەدوورخستنەوەی ئافرەت لە ئیسلام چ زیانێك دەكەین؟، چاپی ٢٠٠٧/١.

٤٣- سیاسەتی ئیسلامیی و چەند ڕوونکردنەوەیەك، چاپی ٢٠٠٧/١.

٤٤- چۆنیەتی بوونە پێشەنگ و بنیاتنانی بنکەی جەماوەریی، چاپی ٢٠٠٧/١.

٤٥- چەند بنەمایەکی گرنگی وتاربێژیی، چاپی ٢٠٠٦/١.
تێبینی: بۆ فارسییش وەرگێڕاوە.

٤٦- قوتابیانی زانیاری شەرعیی و چەند سەرنج و ڕێنماییەك، چاپی ٢٠٠٧/١.

٤٧- خوو ڕەوشتی بەرزو پەسند سەنگی مەحەکی مسوڵمانەتییە، چاپی ٢٠٠٧/١.

٤٨- بانگەواز بۆ لای خوا، چاپی ٢٠٠٧/١.

٤٩- قوتابییان لەم هەل و مەرجەدا، پێویستە چۆن بن و چی بکەن؟!، چاپی ٢٠٠٨/١.

٥٠- خواناسیی، ئایین، ئیمان، چاپی ٢٠٠٢/١، چاپی ٢ / ٢٠٠٩.

٥١- واقیعی هەرێمی کوردستان، دیدێکی ئیسلامییانە، چاپی ١/ ٢٠٠٨.

٥٢- چەند بابەتێکی هونەریی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا، چاپی ٢٠٠٨/١، چاپی ٢٠١٥/٢.
تێبینیی: بۆ زمانی فارسییش تەرجەمە کراوە.

٥٣- با لەخزمەت قورئاندابین، {کۆی هەردووك کتێبی: (چۆن باشتر لەقورئان

بەهرەمەند دەبین؟) وە (ئەرکی سەرشانمان بەرانبەر بەقورئان)ە}، چاپی ١/٢٠٠٨و ٢٠١١، چاپی ٢/٢٠١٥

٥٤- سروشت و پایەکانی خێزان و مەسەلەی چەند ژنیی لە تەرازووی شەرع و عەقڵدا، چاپی ١/٢٠٠٩.

تێبینی: ئەم نامیلکەیە بە(١٤) ئاڵقە لە ڕۆژنامەی (ڕۆژنامە)دا بڵاوکراوەتەوە.

٥٥- پوختەی ژیاننامەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، چاپی ١/٢٠٠٩، چاپی ٣/٢٠١٣.

٥٦- چەند بابەتێکی سیاسی هاوچەرخ لەبەر ڕۆشنایی عەقڵ و وەحییدا، چاپی ١/٢٠١٠.

٥٧- وتاری کۆنگرەی دووەمی کۆمەڵی ئیسلامیی/٢٠١٠.

٥٨- گەنج لە پرسە هەنووکەییەکاندا (چاوپێکەوتنی ناجیح حەمە فەرەج). چاپی ١ ٢٠١٠.

٥٩- کاری ئیسلامیی و ڕەواندنەوەی چەند تەم و مژێك، چاپی ١/٢٠١١.

٦٠- حوکمی لە ئیسلام هەڵگەڕانەوەو هەڵسەنگاندنێك، چاپی ١/٢٠١١.

٦١- چەند بنەمایەکی گرنگی ماڵ و سامان بەخشین لەڕێی خوادا، چاپی ١/٢٠١٣.

٦٢- خاتوون مەلاژن: ئافرەتێکی هەڵکەوتوو و هاوسەرێکی ناوازە. چاپی ١/٢٠١٢.

٦٣- ڕەوەندی کورد لە هەندەران و ئەرکی سەرشانی. چاپی١/٢٠١٢.

٦٤- مەلای گەورە کۆیەو تەفسیرەکەی و چەند سەرنجێك، چاپی ١/٢٠١١.

٦٥- هەڵسەنگاندنێك لەبارەی: هەبوون و نەبوونی نەسخ لە قورئاندا، چاپی ١/٢٠١٢.

٦٦- یادو بۆنەو جەژنەکان و هەڵسەنگاندنێك، چاپی ١/٢٠١٢.

٦٧- ڕوونکردنەوەی بنەما شەرعییەکان و هێڵە گشتییەکانی کۆمەڵی ئیسلامیی، چاپی ١/٢٠١٢، چاپی ٣/٢٠١٤.

٦٨- مەوسووعەی: ئیسلام و دەوڵەتداریی: ١-٤، چاپی ٢٠١٤/١-٢٠١٦.

٦٩- تەرجەمەی عەقیدەی طەحاویی، چاپی ٢٠١٤/١.

٧٠- تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی یەکەم: سوورەتەکانی: (الفاتحة) و (البقرة)، چاپی ٢٠١٢/١.

٧١- تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی دووەم، سوورەتی: (آل عمران)، چاپی ٢٠١٢/١.

٧٢- تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی سێیەم: سوورەتی: (النساء)، چاپی ٢٠١٣/١.

٧٣- تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی چوارەم: سوورەتی: (المائدە)، چاپی ٢٠١٤/١.

٧٤- تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی پێنجەم: سوورەتی: (الأنعام)، چاپی ٢٠١٥/١.

٧٥- تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی شەشەم: سوورەتی: (الأعراف)، چاپی ٢٠١٦/١.

٧٦- تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی حەوتەم: سوورەتی: (الأنفال)، چاپی ٢٠١٦/١.

٧٧- هەڵوەشاندنەوەی بیروڕاو ڕەفتارە پەڕگیرانەکانی ڕێکخراوی (داعش)، چاپی ٢٠١٤/١.

٧٨- با هەڵەو لادانی پەڕگیران، بەرانبەر بەئیسلام نەمانخاتە دوودڵیی و گومان، چاپی ٢٠١٥/١.

٧٩- پەڕگیریی: هۆکارەکانی، شوێنەوارەکانی، چارەسەری، چاپی ٢٠١٥/١.

٨٠- ڕوونکردنەوەی عەقیدەی طەحاویی، چاپی یەکەم/٢٠١٥.

٨١- سوننەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەنێوان تێپەڕاندن و بەزایەداندا، چاپی ٢٠١٥/١.

٨٢- چەند مەڵۆیەك لەخەرمانی تەمەنم، چاپی ٢٠١٥/١.

٨٣- بینینی خوای بەرزو مەزن لەدنیاو دوارۆژدا، چاپی ٢٠١٥/١.

٨٤- گیانی ژیان، چاپی ٢٠١٥/١.

٨٥- چاوپێداگێڕانەوەیەکی بارودۆخی نێوخۆمان و واقیعی دەرەکییمان (وتاری کۆنگرەی سێیەمی کۆمەڵی ئیسلامیی)، ٢٠١٥/٥/٣٠.

٨٦- مەوسووعەی: ڕەوشت و ئاکاری ئیسلامیی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا.

٨٧- دیبەیتی ساڵ: سیکۆلاریزم و دیموکراسیی لەکوردستاندا، چاپی ٢٠١٦/١.

٨٨- ڕوانینێکی ئیسلامییانە بۆ واقیعی هەرێم، گرفت و چارەسەر.

**کتێبە عەرەبییەکان:**

موسوعة: الإسلام كما يتجلى في كتاب الله.

كە لەچاپی یەکەمدا (٨) بەرگەو، لەچاپی دووەمیدا لە (١٢) کتێبدا دەبێ، بەم شێوەیە:

٨٩- الكتاب الأول: الإسلام: معرفة صحيحة بالخالق والخلق.

٩٠- الكتاب الثاني: تعريف الإيمان.

٩١- الكتاب الثالث: الإيمان بالله تعالى: الخالق الرب المالك الإله...

٩٢- الكتاب الرابع: الإيمان بالملائكة وبالجن.

٩٣- الكتاب الخامس: الإيمان بكتب الله الحكيم.

٩٤- الكتاب السادس: القرآن العظيم.

٩٥- الكتاب السابع: الإيمان برسل الله وأنبيائه الكرام.

٩٦- الكتاب الثامن: خاتم النبيين محمد (صلى الله عليه وسلم): موجز سيرته وبراهين نبوَّته.

٩٧- الكتاب التاسع: إهتداء الإنسان بهدى الله، أو الإلتزام الفردي بشريعة الله.

٩٨- الكتاب العاشر: إلتزام المجتمع بشريعة الله تعالى.

٩٩- الكتاب الحادي عشر: تطبيق المجتمع للشريعة و معالم الدولة في الإسلام.

١٠٠- الكتاب الثاني عشر: الإسلام نظرة سديدة تجاه الناس وتعامل صحيح معهم.

١٠١- نقض فكرة التطرف. ط٢٠١٦/١.

١٠٢- ضيف و قضية (مقابلة مع قنـاة العربية)، ط٢٠٠٦/١.

١٠٣- حوار خاص (مقابلة مع قناة العالم)، ط٢٠٠٦/١.

**ئەو کتێبانەی لەژێر چاپن:**

١٠٤- تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی هەشتەم: سوورەتی: (التوبة).

١٠٥- قەیرانە نێوخۆیی و دەرەکییەکانی هەرێمی کوردستان (پانێڵی ئەنیستیۆتی ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاست)، ٢٠١٤/١١/٦.

١٠٦- كلمتان موجزتان حول مايجري على الساحة العراقية، (٢٠١٤ و ٢٠١٥).

# نێوەڕۆك

پێشەکی چاپی شەشەم..................... ..................................... ٥
پێشەکیی ..................... ..................................... ٨
پێشەکی چاپی پێنجەم ..................... ..................................... ٩
ئەم زنجیرەیە بۆ؟!..................... ..................................... ١٢
سێ ئاگاداریی:..................... ..................................... ١٨

**ئاڵقەی یەکەم..................١٩**

**بنەمایەکانی تەبایی و پێکەوەژیان لە قورئانی بەڕێزدا.........................١٩**

ڕێ خۆشکردن ..................... ..................................... ٢١
١- خوا سبحانە و تعالی تەنیا خۆی بەدیهێنەر و پەروەردگار و خاوەنی جیهانەکانە:............................................................................... ٢٤
٢- مرۆڤایەتیی هەمووی هی خێزانێکە: ..................................... ٢٦
٣- هەموو بەشەر بۆیەك حیکمەت دروستکراون، کە پەرستنی خوای بەرزە: ........ ٢٩
٤- ژیانی دنیا جێگای تاقیکرانەوەیە، نەك پاداشت و سزا:........................ ٣٠
٥- خوای کاربەجێ بەویستی خۆی، خەڵکی بۆ خاوەنانی بڕوا و خاوەنانی کوفر دابەشکردوە:..................... ..................................... ٣٣
٦- خوا سبحانە وتعالی پاداشتی ئیمان و چاکە و سزای کوفر و سەرپێچیی خستۆتە ڕۆژی دوایی یەوە:..................... ..................................... ٣٥
٧- مرۆڤ لەلای خوای بەرز و مەزن بەرز و ڕێز لێگیراوە:........................ ٣٧

٨- هەموو پێغەمبەران عليهم السلام بۆ چەسپاندنی دادگەریی هاتوون:....... ٤١
٩- تۆبزیی کردن و ناچارکردن نیە لەبواری بیروڕا و دیندارییدا:............. ٤٣
١٠- بناغەی مامەڵەی مسوڵمانان لەگەڵ ئەوانی دیکەدا، ئاشتییە:............... ٤٦
١١- چاکەکاریی، بناغەی هەڵس وکەوتیمسوڵمانانە لەگەڵ نامسوڵمانان دا:... ٤٩
١٢- هاوکاریی و دەستبارگرتن لەگەڵ هەرکەسێك دا، کە بۆ هێنانەدی بەرژەوەندیيە گشتییەکان و ئامانجە هاوبەشەکان تێدەکۆشێ:.................. ٥٣
١٣- ئیسلام تاکە ئایینی پەسندکراوی لای خوای بەرزە بۆ تێکڕای بەشەر، بۆیە دەبێ سێبەرەکەی هەموو خەڵکی بگرێتەوە:....................................... ٥٦
١٤- خوای بەرز و مەزن ڕەوانەکراوی هەرە مەزنی خۆی و پێغەمبەری کۆتایی خۆی، بەڕەحمەت بۆ هەموو جیهانییان ناردوە: ................................ ٥٩
١٥- هێنانەدی حەوت بەرژەوەندیيە گەورەکان بۆسەرجەم هاووڵاتییان:...... ٦١
١- پاراستنی ئایین (**حفظ الدِّن**):........... ................................ ٦١
٢- پاراستنی ژیان (**حفظ الحياة**): .......... ................................ ٦١
٣- سەلامەتیی و پاراستنی عەقڵ و هۆش (**سلامة وصيانة العقل**):......... ٦٢
٤- سەلامەتیی و پاراستنی وەچە (**سلامة النسل وصونه**):....................... ٦٣
٥- پاراستنی هێمنیی و ئاسایيش (**حفظ الأمن**):....................................... ٦٣
٦- پاراستنی ئابڕوو (**صيانة العِرض**):................................................ ٦٤
٧- پاراستنی ماڵ و سامانی خەڵك (**حفظ أموال الناس وممتلكاتهم**): ........... ٦٥
بنچینەیەکی کۆکەرەوە:.......................................................... ٦٧

**ئاڵقەی دووەم.................٦٩**

**مافەکانی مرۆڤ لەنێوان ئیسلام و ڕۆژئاوادا...........................................٦٩**

ئـەم ئاڵقـەیە.............................................................. ٧١
دەسـتپێك ............................................................... ٧٢
بەشی یەکەم: مافەکانی مرۆڤ لەڕوانگەی ڕۆژئاواوە....................................... ٧٥

باسی یەکەم: سەرنجێکی مێژوویی لەبارەی جووڵانەوەی داواکردنی مافەکانی مرۆڤەوە:........................................ ٧٧
باسی دووەم : چەند تێبینییەك لەسەر ڕەوتی جووڵانەوەی مافی مرۆڤ و، جەوهەری مافەکانی مرۆڤ، بەتێگەیشتنی ڕۆژئاواییانە................................ ٨٣
بەشی دووەم: مرۆڤ و ئەرك و مافەکانی لەئیسلام دا.............................. ٨٩
باسی یەکەم:- بنەمایەکانی ئەرك و مافەکانی مرۆڤ لەئیسلام دا................ ٩١
بناغەی ئەرك و مافەکانی مرۆڤ لەئیسلامدا............................................ ١٠٠
بنەمای یەکەم: تەنیا خوا -جل جلالە- بەدیهێنەر و پەروەردگار و خاوەنی هەموو شتێکە: ......................... ............................................ ١٠٠
بنەمای دووەم: ئینسان درووستکراوێکی ناوازەی هەڵبژاردەیە و، بەجێنشینی خوا دانراوە لەسەر زەوی: ............ ............................................ ١٠١
١- ئینسان بەندەی خوایە:............ ............................................ ١٠١
٢- ئینسان جێنیشین (خليفة)ی خوایە: ............................................ ١٠٢
٣- خوای پەروەردگار ئینسانی بەشێوەیەکی تایبەت خوڵقاندوەو لەڕووحی تایبەتی خۆی فووی بەبەرداکردوە: ........ ............................................ ١٠٣
٤- خوا - جل جلالە - بەفریشتەکانی فەرمووە: سەجدەی ڕێزگرتن بۆ ئادەم بەرن و، سەجدەیان بردوە:............ ............................................ ١٠٤
٥- خوای پەروەردگار سپاردەیەك، کە بەئاسمانەکان و زەوی و شاخەکان هەڵنەگیراوە، بەمرۆڤی سپاردوە و ئەویش هەڵیگرتوە: ............................ ١٠٤
٦- خوای پەروەردگار ئاوەدانکردنەوەی زەوی بەئینسان سپاردوە:............. ١٠٥
٧- خوا هەرچی لەئاسمانەکان و زەویدایە، بۆ مرۆڤی ڕام کردوە:.............. ١٠٥
٨- خوا ڕێزی لەوەچەی ئادەم گرتوە و، لەوشکانیی و دەریادا هەڵیگرتوون و، بەسەر زۆر لە دروستکراوەکانیدا هەڵیبژاردوون: ............................................ ١٠٦
٩- خوا مرۆڤی لەباشترین شێوە و پێکهاتەدا دروستکردوە:........................ ١٠٧
١٠- خوا مرۆڤی ئازاد و سەرپشك کردوە لەنێوان ئیمان هێنان و کافربوون دا:.......... ١٠٧
بنەمای سێیەم: یەکسانیی مرۆڤەکان لەماددە و لەسروشت و لەمافەکانیان دا:.......... ١٠٨

باسی دووەم: ئەرك و مافە بنەڕەتییەكانی ئینسان لەئیسلامدا ........................ ١١٠
یەك: دابین كردنی ژیانێكی ئازادانە:........................................................ ١١٠
دوو: مسۆگەر كردن و پاراستنی حەوت (٧) ئامانجە مەزنەكە (**تضمين وحماية المقاصد السبع العظيمة**): ................................................ ١٢٤
١- پاراستنی ئایین (حفظ الدين):................................................ ١٢٥
٢- پاراستنی ژین (حفظ الحياة): ................................................ ١٢٥
٣- پاراستنی وەچە (حفظ النسل):................................................ ١٢٦
٤- پاراستنی ئابڕوو (حفظ العرض): ................................................ ١٢٦
٥- پاراستنی ئاسایش (حفظ الأمن): ................................................ ١٢٧
٦- پاراستنی عەقڵ (حفظ العقل): ................................................ ١٢٨
٧- پاراستنی ماڵ و سامان (حفظ المال):. ................................................ ١٢٨
سێ: مافە شەخسیی و تایبەتییەكان. ................................................ ١٣٠
چوار: مافە ئابوورییەكان: ................................................ ١٣٢
پێنج: مافە كۆمەڵایەتییەكان: ................................................ ١٣٣
شەش: مافە سیاسییەكان: ................................................ ١٣٤
الإعلان العالمي لحقوق الإنسان ( جاڕنامەی جیهانیی بۆ مافەكانی مرۆڤ )......... ١٣٨
إعلان القاهرة حول حقوق الإنسان في الإسلام ( ڕاگەیاندراوی قاهیرە بۆ مافەكانی مرۆڤ لە ئیسلامدا ) ................................................ ١٤٣

**ئاڵقەی سێیەم.................١٥١**

**تیرۆرو تۆقاندن لە تەرازووی شەریعەتدا.................................١٥١**

ئەم ئاڵقەیە................................................ ١٥٣
ڕێ خۆشكردن................................................ ١٥٤
بەشی یەكەم: پێناسەی تیرۆر................................................ ١٥٧
ئەو وشەیە كەی پەیدابووە؟!................................................ ١٦١

بەشی دووەم: نێوەڕۆکی تیرۆر، دیاردەیەکی جیهانیی و گشتیی و لە مێژینەیە ........................................ ١٦٣
بەشی سێیەم: تیرۆر و تۆقاندن لەنێوان مسوڵمانان و نامسوڵماناندا ........... ١٧٧
بەشی چوارەم: تیرۆر لەشەریعەتدا جێی نابێتەوە........................................ ١٩٥
یەکەم: حیکمەتی ژیانی دنیا:....... ......................................... ١٩٧
دووەم: فیطرەت و سروشتی ئینسان: ..... ......................................... ١٩٨
سێیەم: نێوەڕۆك و سروشتی ئیسلام: ...... ......................................... ١٩٨
١- قۆناغی بانگەواز: ......................................... ......................................... ١٩٩
٢- لە حاڵەت و قۆناغی دەوڵەتیشدا:...... ......................................... ١٩٩
پێغەمبەری خوا چۆن چۆنی کۆمەڵگا و دەوڵەتی ئیسلامیی بنیاتنا؟! .......... ٢٠٥
قۆناغی یەکەم:......................................... ......................................... ٢٠٩
قۆناغی دووەم: ......................................... ......................................... ٢١٠
قۆناغی سێیەم:......................................... ......................................... ٢١١
بەشی پێنجەم: وەڵامدانەوەی سێ ئیشکال و پرسیار......................................... ٢١٥
یەکەم : مەسەلەی جەنگ و جیهاد: ...... ......................................... ٢١٧
دووەم: مەسەلەی ئیغتیال (پەنهانکوژیی): ......................................... ٢٢٣
سێیەم: مەسەلەی کوشتنی خەڵکی بێ دیفاع و لاشەڕ: ......... ............ ٢٢٥

**ئاڵقەی چوارەم....................٢٢٩**

**جیهانگیریی ڕۆژئاوا و جیهانێتیی ئیسلام ......................................٢٢٩**

ئەم ئاڵقەیە ......................................... ......................................... ٢٣١
ڕێ خۆشکردن ......................................... ......................................... ٢٣٢
بەشی یەکەم: پێناسەو سەرگوزشتەو ئامانج و بەرهەم و شوێنەوارەکانی جیهانگیریی (عەولەمە) ......................................... ......................................... ٢٣٥
١- پێناسەی جیهانگیریی:......................................... ......................................... ٢٣٧
٢- ئامانج و مەبەستی جیهانگیریی:........ ......................................... ٢٤٠

٣- پاساو و بیانووی جیهانگیریی:........ ........................ ٢٤٦
٤- بەرهەم و شوێنەوارەكانی جیهانگیریی: ........................ ٢٤٨
یەك: لەڕووی سیاسییەوە:........................ ........................ ٢٤٩
دوو: لەبواری ئابوورییەوە:........................ ........................ ٢٥٣
سێ: لەڕووی كۆمەڵایەتییەوە، بەتایبەت لە بواری خێزان دا:........................ ٢٥٦
چوار: لەڕووی فیكریی و فەرهەنگییەوە: ........................ ٢٦٠
بەشی دووەم: جیهانێتیی ئیسلام ....... ........................ ٢٦٧
پێنج بنەمای بنەڕەتیی جیهانێتیی ئیسلام ........................ ٢٧٣
بەشی سێیەم: بەراوردێك لەنێوان جیهانگیریی رۆژئاوا و جیهانێتیی ئیسلامدا....... ٢٧٩
(( ذوالقرنین )) وێنەیەكی گەشی جیهانێتیی........................ ٢٨٣
(( فیرعەون )) نموونەیەكی دزێوی جیهانگیریی........................ ٢٨٦
بەشی چوارەم: هەڵوێست وەرگرتنی ڕاست و دروست لەبەرانبەر جیهانگیرییدا....... ٢٨٩

**ئاڵقەی پێنجەم................... ٢٩٣**

**سیكۆلاریزم (عەلمانییەت) سەرنجێكی واقیعییانە و هەڵسەنگاندنێكی شەرعییانە .......... ٢٩٣**

ئەم ئاڵقەیە ........................ ........................ ٢٩٥
ڕێ خۆشكردن ........................ ........................ ٢٩٦
بەشی یەكەم: پێناسەی سیكۆلاریزم (عەلمانییەت)........................ ٢٩٩
بەشی دووەم: (سیكۆلاریزم) كەی و لەكوێ و چۆن و بۆچی سەری هەڵدا؟!....... ٣٠٥
ئەو شتانەی كڵێسا لە ئایینی مەسیحیی دا دایهێنان؟!:........................ ٣٢٠
١- دروستكردنی چین (طبقة)ی (كەهەنووت): واتە پیاوانی ئایینی (ئەكلیرۆس) .......... ٣٢٠
٢- لادانی كڵێسا لەڕووی ڕووحییەوە:..... ........................ ٣٢٤
أ- گۆشە نشینی (الرهبانیە):........................ ........................ ٣٢٤
ب- قوربانیی پیرۆز: ........................ ........................ ٣٢٥
ج- پەیكەرتاشیی و بت دروستكردن: .... ........................ ٣٢٥
د- داهێنانی پسوولەی لێخۆشبوون:........ ........................ ٣٢٦

٣- لادانی کڵێسا لەڕووی سیاسییەوە: .... ........................................... ٣٢٧
٤- لادانی کڵێسا لەڕووی ئابوورییەوە: ... ........................................... ٣٢٨
بەشی سێیەم: بەرهـەم و شوێنەواری سیکۆلاریزم، لە ژیان و گوزەرانی خەڵکی خۆرئاوادا............................................................... ٣٣١
١- لەڕووی فیکری و ڕووحییەوە:...... ........................................... ٣٣٤
٢- لەڕووی حوکم و سیاسەتەوە: ...... ........................................... ٣٣٥
٣- لەڕووی ئابوورییەوە: .......... ........................................... ٣٣٦
٤- لەڕووی کۆمەڵایەتییەوە:........................................................ ٣٣٩
٥- لەڕووی زانستییەوە:........................................................... ٣٣٩
بەشی چوارەم: ئایا بوونی سیکۆلاریزم لە نێو خەڵکێکی مسوڵماندا، پاساوی هەیە؟.................................................................. ٣٤١
سێ ڕاستیی گرنگ................................................................ ٣٥٢
یەکەم: با لەلاسایی کردنەوە وریابین: .. ........................................... ٣٥٢
دووەم: با پەند لەغەیری خۆمان -عەرەب و تورك و فارس- وەربگرین:........... ٣٥٤
سێیەم: عەلمانییەت لە ئیسلام دا جێی نابێتەوە:..................................... ٣٥٦

**ئاڵقەی شەشەم.................. ٣٥٩**

**دیموکڕاسی لەبەر تیشکی عەقڵ و شەرع دا.............................. ٣٥٩**

ئەم ئاڵقەیە .................................................................... ٣٦١
ڕێ خۆشکردن.................................................................... ٣٦٢
تەوەری یەکەم: پێناسە و بنەماکانی دیموکڕاسی.................................... ٣٦٥
١- باڵا دەستیی گەل (حاكمية الشعب): ........................................... ٣٦٧
٢- سەروەریی یاسا (سيادة القانون):.............................................. ٣٦٨
٣- مافەکانی مرۆڤ و ئازادییە گشتییەکان........................................... ٣٦٨
(حقوق الإنسان والحريات العامه): ....... ........................................... ٣٦٨
٤- لەیەك جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان (الفصل بين السلطات):................. ٣٦٩

تەوەری دووەم: دیموکڕاسی کەی و چۆن سەری هەڵدا؟ .......................... ٣٧١
أ- مافی ماڵ گواستنەوە: ................................................ ٣٨٠
ب- مافی ئیشکردن:.................................................... ٣٨٠
ج- مافی فێربوون (**حق التعلُّم**): ........................................... ٣٨١
د- مـافی سـیاسـیی: .................................................... ٣٨٢
هـ- زەمانەتی دادوەریی: ................................................ ٣٨٣
تەوەری سێیەم: دیموکڕاسی لە تەرازووی عەقڵ و واقیع دا...................... ٣٨٥
بنەمای یەکەم: باڵادەستیی گەل (حاکمیة الشعب):............................ ٣٨٧
بنەمـای دووەم: سـەروەریی یاسـا (سیادة القانون):............................ ٣٩٠
بنەمـای سێیەم: مافەکانی مـرۆڤ و ئـازادییە گشتییەکان:........................ ٣٩٠
بنەمای چوارەم: لەیەك جـیاکردنەوەی دسـتەڵاتەکان:............................ ٣٩١
تەوەری چوارەم: هەڵسەنگاندنی دیموکڕاسی لەبەر ڕۆشنایی شەریعەت دا........ ٣٩٣
بنەمای یەکەم: باڵادەستیی گەل (حاکمیة الشعب):............................ ٣٩٥
بنەمای دووەم: سەروەریی یاسا (سیاده القانون):............................ ٤٠٥
بنەمـای سێیەم: مافەکانی مرۆڤ و ئازادییە گشتییەکان:........................ ٤٠٧
١- دیاریی کردنی میکانیزم بۆ چۆنیەتی دابین کردنی ماف و ئازادییەکان:........... ٤٠٧
٢- دانانی پشتیوانە (ضمانة)ی جۆراو جۆر، بۆ پارێزران و جێبەجێ کردنیان:....... ٤٠٧
٣- دیارییکردنی چوارچێوەی بۆماف و ئازادییەکان: ............................ ٤٠٩
بنەمای چوارەم: لەیەك جیاکردنەوەی دەستەڵاتەکان: ............................ ٤١٢
تەوەری پێنجەم: ئەنجـام گـیریی ............................................ ٤١٥
یەکەم: هەڵسەنگاندنی شتەکان بە دادگەریی: ................................ ٤١٧
دووەم: شووڕای ئیسلامیی، یەکسان نیە بەدیموکڕاسی:............................ ٤٢٠
سێیەم: سێ ڕاستیی گرنگ:................................................ ٤٢٢
دوو ئاڵقە چاوپێکەوتنی (بەرنامەی سۆراغ)سەبارەت بە دیموکڕاسی................. ٤٢٥
دیموکڕاسی و دیکتاتۆریی و هەڵوێستی ئیسلامییانە .............................. ٤٢٥

ڕێ خۆشکردن ........................................ ٤٢٧
ئاڵقەی یەکەم لە بەرنامەی (سۆراغ) ........................................ ٤٢٨
دەستپێك ........................................ ٤٢٨
ئاڵقەی دووەم ........................................ ٤٦٠
بەرهەمەکانی دانەر ........................................ ٤٨٥
نێوەڕۆک ........................................ ٤٩٣